فاتیح مەلا ڕەسوڵ شارستێنی

# ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشەم هەیە!

٢٩ وانە بۆ چارەسەری گیروگرفتە خێزانیی‌و کۆمەڵایەتییەکان‌و
چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ خێزان‌و هاوسەرەکانمان

# هەیە

# کێشەم

# پێغەمبەری خودا

# ئەی

نوسینی

فاتح مەلا ڕەسول شارستێنی





ناوی کتێب: ئەی پێغەمبەری خودا کێشەم هەیە

نوسینی: فاتیح مەلا ڕەسول شارستێنی

نەخشاندنی نوسین و سەرپەرشتی: مەریوان ئەحمەد

نەخشاندنی بەرگ: قەیدار ڕەحیم

تایپ کردن: ئیحسان ئەحمەد

ساڵی چاپ: ١٤٣٥ک-٢٠١٤ز

نۆبەی چاپ: یەکەم

لەبەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارە(١٤٦١)ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە



# پێڕستی بابەتەکان

# پێشەکی

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس ستایش بۆخوای باڵادەستی جیهانیان. درووود و صڵاوەت لە پێغەمبەری پێشەوامان، شافیعی مەحشەرمان، چارەسەر کاری کێشەکانمان، محمد المصطفیﷺ .. ڕەزا و ڕحمەتی خوا لە صەحابە ئازیزەکان و شوێنکەوتوان و سەرجەم ئیمانداران بێت تا ڕۆژی قیامەت..

خوێنەری ئازیز، مامۆستای بەڕێز: ئەم نوسراوەی لەبەر دەست و دیدی جەنابتدایە، ئەمە سەر گوزەشتەکەیەتی: مانگی ڕەمەزان، لە عەسران و شەواندا دوای نوێژی عیشا و تەراویح لەمزگەوتەکەماندا، لەگەڵ ئەهلی مزگەوت دادەنیشین و وتارێکی پێویستمان بەو کاتە دەبێت، بەویست و پشتیوانی خوای گەورە..

جارێکیان بیرم کردەوە کە ئەم خەڵکە ڕۆژانە کێشەو گرفتی هەیە، ژیانیش هەر وایە.. ئێرە چونکەدونیایە و بەهەشت نیە، دەبێ کێشە و گرفت هەبێ. جا بێگومان مرۆڤیش کاتێك کێشەیەکی دێتە پێش، بەدوای چارەسەردا دەگەڕێت.. بەندەش بە فەزڵی خوای گەورە، بیرم کردەوە کە بۆ مانگی پڕ بەرەکەتی ڕەمەزان، زنجیرەباسێك دابنێم تایبەت بێت بەو کێشەو گرفتانەی، کە ڕۆژانە چونەتە بەردەم پێغەمبەری خواوﷺ داوای چارەسەریان کردوەو، پێغەمبەری دڵسۆزیش چارەسەری بۆ داناون..

ئەمرۆش هەمان کێشە ڕوو لە مسوڵمانان دەکات و دوبارە دەبێتەوە.. بۆیە ئێمەش پێویستە بچینە خزمەت پێغەمبەری خواو بڵێین: ئەی پێغەمبەری خواﷺ بەقوربانت بم، هاتومەتە خزمەتت کێشەو گرفتم هەیە و داوای چارەسەر دەکەم. هەر ئەمەش بو بەناو نیشانی زنجیرە باسەکە و دوای چەند مانگ کۆکردنەوەی بابەتەکان.. بەپشتیوانی و کەرەمی خوای گەورە لەشەوانی ڕەمەزاندا پێشکەشمان کردو، تۆمار کراو، دواتر بەدەنگ و ڕەنگ بڵاو کرایەوە و بەسەدان دانەی لێ بڵاو بوەوە..

بەتەماش بوم بەشێوازی نوسین بیکەمە کتێب، چونکە دەیان کەس داوایان دەکرد.. بەڵام بەهۆی بابەتی ترو نوسینی تری بەر دەستم، ئەمەم بۆ نەڕەخسا.

تاڕۆژێکیان برای بەڕێز و گەنجی دڵسۆز کاکە مەریوان، باسی ئەوەی کرد کەبابەتەکە زۆر پێویستە و ئەگەر بنوسرێتەوە و، بکرێت بە کتێب، زۆرتر سودی لێوەر دەگیرێت، بۆیە منیش ئەوەم باس کرد کە شێوازی دەر بڕین و قسەکردن جیاوازە لەنوسینی کتێب بەشێوازی نوسین، بەڵام دوای دوعای خێر و دەست خۆشی بەباشم زانی کەبکرێتە کتێب بۆ ئەوەی ئەم دەرفەتە لەدەست نەدەین و چاپ بکرێت و بڵاو بکرێتەوە، وە هەردوو تازە لاوی تەمەن کەم، بەڵام هیمەت بەرز و دڵسۆز کاکە (ئیحسان)و کاکە(میران) ئەرکی گواستنەوەی وانەکانیان لە (cd)، دەنگەوە بۆنوسین، گرتە ئەستۆو نوسیانەوە.. هەر سەرکەوتوبن..

بۆ ئەوەش بابەتەکە ئەکادیمی و زانستی بێت، هاتم لەپێشەکی هەموو ووتارێکدا، ئەو ئایەت و فەرمودانەی لەو وتارەدا هاتون ، نوسیومن. وەئەو سەرچاوانەی کە ووتارەکەم لێوەرگرتون ئاماژەم پێ کردن.. بۆ ئەوەی بۆ بانگخوازان و مامۆستایانی بەڕێز، کار ئاسانی بێت ئەگەر ویستیان ووتاری لەسەر بدەن.

تۆی خوێنەریش دوعایەکی خێرمان بۆ بکە و، خوای گەورە لەهەموو لایەکی قبوڵ بکاو، لە کێشەو گرفت بمان پارێزێ و، چارەسەری کێشە و گرفتەکانمان بۆ بکات.. بەڕحم و بەزەیی بێ سنوری خۆی... وآخِرُ دَعوانا أنِ الحَمدُ لِلهِ رَبِّ العالَمين..

﴿رَبَّنَا ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا* رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ*﴾ اللّهُمَّ آمين...

## پێشکەشە بە:

١- پێغەمبەری سەروەرمﷺ ئەو کەسەی کەخوا کردی بە ڕەحمەت، بۆ هەموو عالەم و لابەری هەموو زەحمەتێك.

٢- باوك و دایکی خۆشەویستم.

٣- هەموو ماموٚستاکانم.

٤- هاوسەر و هاوژینم (سێوە خان) کەهەمیشە هاوکارم بوە.

٥- جگەر گۆشەکانم: (محمد و ئیبراهیم و ئاسودە و ئەڤین) خوای گەورە قبوڵیان بفەرموێت بە خزمەتکاری ڕێبازەکەی پێغەمبەری خواوﷺ، لە کێشە و گرفت لەگەڵ ڕۆڵەی مسوڵمانان بیان پارێزێت.. ئامین..



# وانەی یەکەم



## بابەت

## بەچی لە کێشە و گرفت ڕزگار دەبین ؟



# وانەی یەکەم:

## بەچی لە کێشە و گرفت ڕزگار دەبین؟

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝٥ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝٦﴾ الشرح.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (عَجَباً لِأَمرِ المؤمِنِ ، إنّ أمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ ، وَ لَيْسَ ذاكَ لِأحَدٍ إلاَّ لِلمؤْمِنِ : إنْ أصابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكانَ خَيْراً لَهُ ، وَإِنْ أَصابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فَكانَ خَيْراً لَهُ) ـ رَواهُ مسلم : (٢٩٩٩).

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ :(مَنِ التَمَسَ رضا اللهِ بِسَخَطِ النّاسِ ، كَفاهُ اللهُ مُؤْنَةَ النّاسِ، وَمَنِ التَمَسَ رِضا النّاسِ بِسَخَطِ اللهِ ، وَكَلَهُ اللهُ إلى النّاسِ) ـ صحيح سُنَن الترمذي :(١٩٦٧) وَ هُوَ في الصَّحيحة : (٢٣١١).

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إنَّ اللهَ تَعالى يُحِبُّ مَعالِيَ الأُمُورِ ، وَ اشْرافَها ، وَ يَكْرَهُ سَفْسافَها) ـ صَحيح الجامع للألباني : (١٨٨٦) وَهوَ في الصَّحيحة : (١٣٨٨) .

## سەرچاوەکان :

١) موسوعةَ نَظْرَةَ النَّعيم ، ج ٧ ، ص ٢٩٩٣ ، ج ٦ ، ص ٢١٢١ ، ط : ٨ ، ٢٠١٢ ، دارُ الوَسيلَة .

٢) وەرچەرخان ، ژ : ١٦٨ ، لە ١٦ / ١٠ / ٢٠١١ ،ل ٥ .

٣) کارگێڕی بە چیرۆك ، عادل شێخانی ، ل ٧٢ .

٤) گۆڤاری بڕیار ، ژمارە : ٤٨ ، ئایاری ٢٠١٢ ن ل ٢٩ ، بابەتی : کارگەی ورە بەرزی .
لە ئامادەکردنی : ئەمیر ئەحمەد عبدالقادر .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیمانداران و خواداناسانی بەڕێز : لەم ڕەمەزانە پیرۆزەدا، ڕەمەزانی ساڵی (١٤٣٣) کۆچی ئەم ساڵیش خوای پەروەردگار ڕەحمی پێ کردین، لەماڵی خوای پەروەردگاردا لەیەکەم شەوی مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا لەدوای نوێژی تەراویح لەم مزگەوتە خنجیلانەدا، بۆ خۆمان ئاوا بەبرایەتی وخۆشەویستیەوە (الحمد لله) لەژێرسایەی ئاینی ئیسلامدا کۆبوینەتەوە، دانیشتنەکانمان بەصەڵاوات دان لەسەردیداری (محمد) دەست پێدەکەین :

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

خۆشەویستان و بەڕێزان، خوشکان و برایان، ئەم ژیانی دونیایەی ئێمەی تێدا دەژین، بەنەصی قورئان موشکیلەی تێدا زۆرە ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ﴾ البلد:٤. ئەم ئینسانە خوای پەروەردگار هەرلەڕۆژێك کە نوتفەیە و دەچێتە ناو ڕەحمی دایك و لەپشتی باوکدا دادەبەزێت، خۆشەویستان گەلێك موشکیلە و ناڕەحەتی و قۆناغی زۆرسامناکی بەسەردێت، مانگی ڕەمەزانە و ئێستا ئەمە یەکەم شەومانە لە مزگەوتدا دانیشتوین، باوەڕتان بێ گەلێك خەڵك هەیە دڵی پڕ لە غەمە گەلێك خەڵك هەیە موشکیلەی هەیە، بەوە نیە بەدەم وچاویەوە دیار نیە یان خەڵك هەیە هاوار ناکات یان لای خەڵك دەری نابڕێت، ئەو موشکیلانە زۆرن، کاتێ کە بیرم لێ کردەوە ئێمە کە لە ناو مزگەوتدا دادەنیشین، هەرئەوە نیە بێین بۆ نوێژ بەڵکو موراعاتی حاڵی یەکتر دەکەین

موعاناتەکانی یەکتر دەخوێنینەوە، پێم باش بوو ئەم ساڵ زنجیرە باسێك لەگەڵ جەنابتاندا لەخزمەت پێغەمبەری خودا بین ﷺ بەناونیشانی:

﴿ئەی پێغەمبەری خودا کێشە و موشکیلەم هەیە﴾ ،ئێمە هەر شەوێك دەچینە خزمەت یەك لەو موشکیلانەی کەخەڵك هەیەتی، خەڵکێکی دڵ پڕ لە غەم، ماڵ وێران، کەساس و داماو، بە ئەوپەڕی مەحزونیەوە هاتووە وتویەتی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشەیەکم هەیە بۆم حەل بکە، ئەو کێشانە کە سەیرم کردووە رێك لەناو ئێمە دا هەن، جارێکی تر لە ماڵەکانی ئێمەدا، لە ئەولادەکانی ئێمەدا، لەخۆماندا دووبارە، دەبنەوە جا بەو باسانە ئینسان سوکنای دێت، من کەبۆ خۆم دەیانخوێنمەوە.. یەعنی سەبوریەك بەدڵ و فەرەحیەکت بۆ دێت، بەو ئومێدەم کە (إنشاءالله) بۆ جەنابیشتان و گوێبیسان و بینەرانی ئەم بەرنامانەش (إنشاء الله) بەهەمان شێوە بێت، ئەو موشکیلانە کەدێنە رێگامان ئەمە پێشەکی ئەو زنجیرە باسەیە، لابردنی ئەو خەمانە بە چەند شتێك دەبێت کە باسیان دەکەین..

## کەخەمت زۆر بوو ئەم چەند خاڵە جێبەجێ بکە:

### یەکەم: خوداناسی

بزانە خوایەك هەیە کەلابەری خەمەکانە، زۆر کەس بیر دەکاتەوە باشە کەئەو خوایە (أرحَمُ الرَّاحِمِينَ) هەیە بۆ من ئەمەندە خەمم هەیە بۆئەم خەمانە، بۆئەم ناخۆشیانە دێنە رێگەی بەندەکانی خوای پەروەردگار، ئەو بەندانەی عەبدایەتی دەکەن ، پیاوێکی زۆر زانا هەبووە پێیان وتووە (ئەنیشتاین) زۆربەتان قوتابیان و خوێندکاران ناویتان بیستووە، لەکتێبە زانستیەکاندا بەناوبانگە. (ئەنیشتاین) قوتابی دەبێت بەس قوتابیەکی زۆر زیرەك بوو، رۆژێ ماموستاکەیان لەکاتی وانە وتنەوەدا دەڵێت: من (نَعوذُ بِالله) دەڵێم خوا نیە، ئەوانیش (قوتابیەکان) دەڵێن: نەخێر ماموستا خودا هەیە، دەڵێت ئەی ئەگەر خوای پەروەردگار هەبێ کەواتە بۆ (نَعوذُ بِالله) خوای پەروەردگار خراپەی هەیە ئەڵێن نابێت

شتی واهەبێ، مامۆستا دەڵێت پێتان دەسەلمێنم ئەگەر خوای گەورە هەبێت ئەم هەموو خراپەی بۆ دروست کردووە؟! ئەی ئەم هەموو شەڕ و فیتنە و ئاژاوە و خەمە بۆهەیە؟ (ئەنیشتاین) بە بەڵگەی زانستی پێی دەڵێت مامۆستا تۆ بڕوات بەزانست هەیە؟

دەڵێت: دەی من مامۆستای زانستم ،دەڵێت: مامۆستا بڕوات بەوە هەیە کە تاریکی هەبێت؟! ئەڵێ: جا ئەی چی چۆن تاریکی نیە، ئینجا کێ هەیە دەڵێت تاریکی نیە؟ دەڵێت نا بەعەکسەوە مامۆستا، لە زانستی فیزیادا شتێك نیە ناوی تاریکی بێت، ئەوە نەبونی ڕوناکیە تاریکی دادێت ئەسڵ وایە بەردەوام ڕوناکی هەبێت، کە تۆ پەردەت بەسەر ڕوناکیەکاندا دا، ئەمجا تاریکی دروست دەبێت، کەواتە: ئەسڵی تاریکی وجودی نیە.. ئەی مامۆستا بڕوات بەوە هەیە کە ساردی هەیە؟

دەڵێت: بەڵێ، ئەی ئەوە نیە سەرمامان دەبێت، پاڵتۆ لەبەر دەکەین، چاکەت لەبەردەکەین، دەڵێ: دەی بە زانستی فیزیا بێت ساردیش بوونی نیە، ئەوە تەنەکان گەرمیان تێدا نامێنێت گەرمیەکانیان داوەتەوە بوونی گەرمی نەماوە ئەمجا ساردی دروست بووە، ئەڵێ :مەبەستت لەو قسانە چیە؟! دەڵێت مەبەستم لەوەیە خەڵك ڕوو ناکەنە خالقیان، ئەوە خەڵكن پشتییان لەبەرنامەی خودا کردووە ئەمجا ناخۆشیەکان پەیدا بوون، ئەگینا ئەو مەنهەجەی خودا بۆئەم بەشەرەی داناوە بڕواتان بێت یەك ناخۆشی نایەتە ڕێگامان ، فعلا ئەوقسەیە زۆر ڕاستە، بەزانست ئەسەلمێنرێت ئێمە لە مەنهەجی خودا دوردەکەوینەوە، خودا وەکو پێویست ناناسین، بۆیە توشی موشکیلە دەبین .

## دووەم: خۆناسین

یەکێك لەو شتانەی ئینسان لە بەلا و موسیبەت لادەدەن، لە موشکیلە دوری دەخاتەوە، خۆ ناسینە، ئینسان دەبێ خۆی بناسێ بۆنمونە: من بەقەدەر چەند پێویستم بەڕەفیق هەیە، برا من دەڵێم ناسیاو زۆر بێت باشە، ئێستا دەتوانی ئەم

مزگەوتە هەموومان ناسیاوی یەك بین، بەلام بەرێزان با هەموومان ئەهلی مزگەوتیش بین، ناتوانین هەموومان هاوڕێی یەکتر بین، زانایەك بە کوڕەکەی دەڵێ:

ڕۆڵەگیان ئەوەندە دۆست و برادەر و ڕەفیق و هاوەڵ بگرە لە کاتی فەرەحی و تێری و هەبوونیدا، بیری ئەوە بکەوە کە ڕۆژێك برسیت بوو، هەژار بویت، گیرفانت خاڵی بوو، هیچ لە ماڵتدا نەبوو، هاتن شەرمەزار نەبیت.. ئەها چەند وشەیەکی جوانە، خۆت بناسە بایی چەندی، بایی چەند لە مەجلیسدا دەچیتە پێشەوە، لە پێش خەڵکەوە دەڕۆیت و سەرکردە دەبی، چونکە کە سەرکردە بووی پێشەوابووی ئەرکت قورس دەبێت، دەی بزانە تاچەند تەحەمولی دەکەیت.

کەسێك دەڵێت توشی داوێن پیسی بووم پەنا بە خودا، مامۆستا سەرگەردان بووم، ئەوە ئەوکەسە خۆی نەناسیووە، چونکە ئەگەر خۆی بناسیایە لە ئافرەت نزیك نەدەبویەوە.. چونکە دەبوو خۆی بناسیایە ئینسان چەند لاوازە بەرامبەر جنسی بەرامبەر، لێی نزیك نەبوایەتەوە توشی ئەو خەتەرە نەدەبوویەوە، خۆی نەناسیوە بای چەندە، ئینسان کە لوتبەرزی لێی ئەدات باڵەکانی دەکاتەوە، ئەڵێی ئەو ئینسانانە نابینێت، ئەوە خۆی نەناسیوە، ئەگەر بیری لێ بکردایەتەوە کە یەکەم جار نوتفەیەکی مەنی، بوو ئینسان قێزی لێدەکردەوە، دوای کە پارچەگۆشت پارەیەکە کە لە باردەچێت کەس سەیری ناکات ،کە منداڵێکیشە لە دایك دەبێت.. بێ توانا، لە جوجکەی مەل بێ هێزترە، وەکو مامۆستا (هەژار) دەڵێت، ئەگەر ئەم ئینسانە ئاواخۆی بناسێ چی لە ناخ و ورگیدا هەڵگرتووە –دور لە ڕوتان– وەلا قەت تەکەبور بەسەر خەڵکدا لێنادات، ئەوە خۆ نەناسینە تووشی ئەو هەموو بەلایەت دەکات.

## سێهەم: تێکەڵبوون

بەلام بەحەدی خۆی، قەت گۆشەگیر مەبە، ژن و پیاوی گۆشەگیر توشی غەمباری دەبن، بەلام خوای پەروەردگار لەو گۆشەگیریە ڕزگاری کردووین، واجبە ڕۆژانە (٥) جار

بێیت بۆ مزگەوت.. بۆ نوێژی جەماعەت، حەفتەی جارێك بێیت بۆ نوێژی جومعە، ڕەمەزان ئەم هەموو تەراویحە، مانگێك تێکەڵی خەڵك دەبیت.. لە وەرزەکاندا لەساڵەکاندا، دەچی بۆ عەمرە، دەچی بۆ حەج، ئەها بۆئەوەی تۆ گۆشەگیر نەبیت ئەمەت پێ ئیلزام دەکات، ئیسلام بۆ ئەوەی لە گۆشەگیری ڕزگارت بێت.

## چوارەم: داوای میسالیەت مەکە

مەڵێ ئەو کەسەی کە مەرحەبای دەکەم نابێت غەڵەتی هەبێت، ئێستا زۆر ژن و مێرد موشکیلەیان هەیە، ئەوەیە پیاوەکە دەڵێ: نابێت قەت ژنەکەم غەڵەتی هەبێت، ژنەکەش دەڵێت: نابێت قەت پیاوەکەم بەحەیاتی هەڵەیەکی هەبێت، ئەمەش کێشەت بۆ دروست دەکات، ئەو برادەرەی کە دەڵێت کە دەبێت ئەم فلان کەسە ڕەفیقم بێت نابێت قەت هەڵەم بەرامبەر بکات، ئەمە میسالیەتە، شتی وادەست ناکەوێت، ئەو دونیایەی تۆ دەڵێیت ئەوە لە بەهەشتدایە، ئێرە بەهەشت نیە ئێرە (دار الأمتحان)ە (دار الجزا) نیە کە بە بەهەشت دەستی پێ کردبێت، بەڵێ خۆشەویستان .

## پێنجەم: ووریایی

قسەیەکی زۆر جوانم بەرچاوکەوت بۆ جەنابتانم نوسیووەتەوە دەڵێت:(بۆ ترساندنی گورگ شێر بە، بەلاَم بۆ ناسینەوەی تەڵە ڕێوی بە)، ئەگەر گورگ بەرامبەرت هات عەیبە هەڵبێیت وەك شێر بەرامبەری بوەستە، بەلاَم کە تەڵەت بۆ نرایەوە یەکسەر خۆتی پێدا مەکە مەڵێ من دەبێت لە هەموو مەیدانێکدا دەبێت شێرم، چونکە تەڵەکەت پێدا دەتەقێتەوە، ئەو کاتە دەبێت ڕێوی بیت، خەڵك زۆر پێی عەیبە ڕێوی بێت دەڵێت من هەر دەبێت شێرم، بەلاَم هەموو جارێك شێربوون نەجاحەت نیە جاری واهەیە دەبێت وەکو ڕێوی فێڵبازبیت بۆ ئەوەی ئەو تەڵەیەی بۆت دانراوە پێتدا نەتەقێتەوە، هەموو کاتێك سنگ بردنە پێشەوە و سەر بردنە پێشەوە ئازایەتی نیە، چونکە هەموو کاتێك شێربوون مانای مەردایەتی نیە و، ڕزگاری بونی پێوە نیە..

## شەشەم: پەند وەرگرتن لەکێشە

ئەو کێشانەی کە لە ژیانتدا توشی بوویت دەرسی لێ وەربگرە، ئێمە زۆر جار گرفتمان توش دەبێ هی ئەوەیە دەرسمان لە ڕابردوو وەرنەگرتووە، ئەکتەرێکی کۆمیدی هەبوو کۆچی دوای کرد.. ناوی (چارلی چاپلن) بوو ساڵەکانی (٨٠) لەوانەیە زۆربەتان فلیمە کۆمیدیەکانیتان بینیبێ، دەڵێت برادەرێکم هەبوو، مەحەلی هەبوو، دەڵێت چووم بۆ مەحەلەکەی سەیردەکەم ڕەسمی کابرایەکی سمێڵ بابڕی برۆ هاتووە یەك، کڵاوێك لەسەر ناوچاوانی، وتم: برا ئەم پیاوە بە تۆ ناچێت ئەمە باوکتە بەو ڕەسمە گەورە وا لە چوارچێوەی گوڵدا لە پشتی سەرتەوە داتناوە وتی: نەوەڵا وتم خاڵتە؟ وتی: نەوەڵا، وتم: مامتە؟ وتی: نەوەڵا، وتم: ئەی چیتە؟ وتی: ئەوە بەسەرهاتی دورە..

من منداڵ بووم هەتیوو بووم، خستمیانە بەردەستی ئەم پیاوە کە ڕەسمەکەی هەڵواسراوە، ئەوە خاوەن کار بوو، ڕۆژی واهەبوو دوو جارداخی دەکردم، زۆرجار پارەی نەدەدامێ، زۆرجار بەبرسیەتی ڕەوانەی ماڵەوەی دەکردمەوە، چونکە بێکەس بووم کەسم نەبوو پەنای بۆ بەرم، ڕۆژگار هاتوو چوو من خۆم ناسی، لە هەتیووی ڕزگارم بوو، خوادا ڕەحمی پێکردم پارە و پولم دەسکەوت ئەم مەحەل و جێگایەم پێکەوە نا، چووم ڕەسمی ئەو پیاوەم بە پارە لە برادەرێکی کڕی، هەموو جارێ کە ئاوا ئاوڕم دایەوە ماندوو دەبم دەڵێم ئیتر کاسپی ناکەم، ئیتر وەڕەس بووم لەسەر ئەم مێزە، کە ئاوادەکەم سەیری ئەو پیاوە دەکەم، دەڵێم نا ئەگەر بێتو ماندوو ببم، واز لەکار بهێنم، وەك فەقیری جارانم لێ بێتەوە، ئەها سمێڵ بابڕەکەم بەرامبەر دانیشتووە چی لێ دەکردم، هەموو ڕۆژێ چەندجار سەیری دەکەم، کاتێ کە سەیری دەکەم بەبیرم دەکەوێتەوە ئەو پیاوە چی پێ کردم، هەموو ئاوڕدانەوەیەکم هێز و گوڕم دەداتێ، جارێکی تریش لەسەر کارەکەم سورتر دەبم!!

ئێمە لە ژیاندا زۆر ناڕەحەتیمان هاتۆتە پێش، زۆر گرانیمان بینی، زۆر گیرفان بەتاڵیمان بینی، کەچی حەیفە ڕۆژێ ئەو وێنانە نایەنینەوە بەرچاومان، بڵێین: خودایە

حەمد بۆ تۆ ئەم ئێوارەیە لەسەر چ سفرەیەکدانیشتم، کە ڕۆژگارێکی ڕەمەزان هەبوو، بڕوام پێبکەن خەڵك نانی وشکی دەست نەدەکەوت لەگەڵ دەنکێ خورما بەربانگی پێ بکاتەوە، ئەها ئەو دەرسە لە بیرچوونەوەیە زۆرخراپە.

## حەوتەم: گرفتەکان بنیادنەرن

ئەو گرفتانەی، ئەو موشکیلانەی دێنە ڕێگای ژیان، وەکو ئەو میکرۆبانە وان بەڕێزان ،کە دێنە لەشمانەوە، هەر میکرۆبێك هاتە لەشەوە ئەگەر زۆر بەهێز نەبێ، ژێرپەنجەی نەبێت خانەکانی لەشت بەئاگادێننەوە، خڕۆکە سپیەکان دەوروژێنن، بەرگریەك پەیدا دەکەیت بە چۆکدا نایەیت، ئەو کەسەی کەهیوا هەیە بە عومری خۆی نەخۆشی نەگرتووە، یەك نەخۆشی گرت دەی کوژێت، ڕاست دەڵێن فلان کەس لە عومریدا نەخۆشی نەبوو، کە ئەم نەخۆشیەی گرت لە ژێریدا دەرنەچوو.. چونکە قەت میکرۆبەکان نەهاتونەتە ناو لاشەی تا بەئاگای بهێننەوە، خڕۆکە سپیەکان، پێشمەرگە گیان فیداکان پارێزگاری لەش بەچۆکدا هاتوون.

زۆرجار بۆم باس کردوون (یابان) وڵاتێکی شاخاوی بێ واریداتی، بێ نەوتی، خەڵکێکی زۆر لە مەساحەیەکی زۆر بچوکدا، لەسەر چی دەژین؟ کێ دەزانێ یابانیەکان بەهەرمی ساڵانەیان زۆربەی کات لەسەر چیە؟ کێ دەزانێ....بەڵێ ...نەخێر، ناوچەکانیان زۆر بێ پیتە نەوتیان نیە، لەکشتوکاڵیشدا هیچ زەوی زەراعیان نیە، پاشان لەپیشەسازیدا چەند ساڵێکە چوونەتە بواری پیشەسازیەوە،ئەی لە دێر زەمانەوە ئەمانە بەچی خۆیان ژیان؟ بەچی پێشکەوتن؟

بەڕێزان: بەڕاوە ماسی ئەوان، لەسەر کەناری دەریاکانن بەردەوام ڕاوە ماسی دەکەن ئەوەندەیان ماسی گرتبوو، ئەوەندەیان ماسی گرتبوو ماسی کەنارەکان نەمابوو، چونە بوونە قوڵاییەوە، بۆ ئەوەی بچنە قوڵاییەوە کەشتی گەورە گەورەیان دروست دەکرد، بەڵام ئەم جارە کە ماسیەکانیان ڕاو دەکرد.. چەند ڕۆژ دەمانەوە دەبوو سەهۆڵ و شت

بەرن، چونکە ماسیەکانیان دەخستە سەهۆڵەوە، کە دەیان هێنایەوە بۆ بازاڕ ئەو پارەی نەدەکرد، چونکە ماسیەکان کۆن بووبوون .. ماسیەك نەبوو زیندوو بێت لەبەر چاوی خەڵکدا، بۆیە بەچۆکدا نەهاتن، حەلی ئەم موشکیلەیان بەچی کرد؟ هاتن حەوزی گەورە گەورەیان لەناو کەشتیەکاندا دروست کرد و پڕیان دەکرد لە ئاو، ماسیەکانیان تێدەخست، ئەمجا ماسیەکەیان دەهێنا لە قەراغ دەریاکە کە موشتەریەکانی لێیە، بەزیندووی لەبەر چاوی موشتەریەکە دەریان دەهێنا، بەڵام دیسانەوە ماسیەکان موشتەریان کەم بویەوە.. بۆ؟

تامی ماسیەکان خۆش نەبوو، هەمووومان ماسی زێی دوکان و دەریاشمان خواردووە، ئەها ماسی زێ زۆر بەتام ترە، ئەم ماسیانە کە لە بەحرەکە دەریان دەهێنان لە جموجۆڵ دەکەوتن، چونکە لە حەوزێکی بچوکدابوون، جموجۆڵیان نەدەما، بۆنی ماسیە کە ناخۆش دەبوو، بۆنی خنك و بۆنی قوڕاو و ئەوانەیان لێ دەهات، ئەم یابانیانە ئەوەندە زیرەك بوون، کێ دەزانێت ئەو موشکیلەیان بەچی حەل کرد؟ کێ دەزانێت بە چی حەلیان کرد؟! ...بەڵێ ...بەچکە قرشێکیان هێنا خستیانە ناو حەوزی ماسیەکان ئیتر ئەم بەچکە قرشە دوژمنی ئەو ماسیانەیە، هەندێکی لێ بریندار دەکردن، بەڵام ئەمە موشکیلە نیە، هێندەی دەهێنان و دەبردن، کەدەیان هێنایە دەرەوە ئەوەندە جوڵابوون چەند قاتی جاران پارەیان دەکرد، چونکە ئەوەندە جوڵابوون تامی ماسیەکان خۆش بووبوون.

لەبەر ئەوە ئێمەش موشکیلەکانی ژیان ئەو ماسیە قرشانەن بەدوامانەوە، گرنگ ئەوەیە هەڵت نەلوشێت ئەینا ئەوەندەت دێنێ و دەجوڵێنێ، سەرەنجام بەهێزت دەکات، سەرەنجام تامت خۆشتر دەکات، سەرەنجام دەتکاتە کوڕی مەیدان، بۆیە چۆك دامەدەن بەرامبەر بەو موشکیلانەی دێنە ڕێگامان ئەمە بابەتی ئەمشەومان بوو.. لەبەرئەوە زیاتر درێژەی پێ نادەم لەبەر کاتەکە،لەسبەی شەوەوەبابزانین چ کەسێك ،چ صەحابەیەك، چ

ژنێك، چ پیاوێك، چ گەنج و پیرێك، موشكیلە و كێشەی بۆ دروست بووە.. پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن ڕێنمای كردوون..

یارەبی خوایە ئەم ڕەمەزانە بەخێر و خۆشی بەسەرماندا بێت، بەبەرەكەت و ڕەحمەتی خۆت ئەوەی كە دەیلێین و دەیكەین و ئەنجامی دەدەین خوادایە لێمان قبوڵ بكەی، خوای پەروەردگار بیكەیت بە زەخیرەی قیامەتمان..ئامین ..

(وَصَلَى اللهُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَ آخِرُ دَعوانا أنِ الحَمدُ لِلّهِ رَبِّ العالَمِين) .

## وانەی دووەم

## ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هاوسەری ژیانم خۆش ناوێت

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦ) البقرة ٢٢٩ .

* عَنْ إبْنِ عَبّاسٍ ، أَنَّهُ قالَ : جاءَتِ امْرأةُ ثابت بن قَيْس بنِ شَمّاس إلى النَبِيِّ ﷺ فَقالَتْ : يا رَسُولَ اللهِ إنّي لا أَعْتِبُ على ثابِتٍ في دينٍ وَلا خُلُقٍ ، وَلكِنّي لا أُطيقُهُ ، فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَتُرَدِّينَ عَلَيْهِ حَديقَتَهُ؟ قالَتْ : نَعَمْ ، قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إقْبَلِ الحَديقَةَ ، وَ طَلِّقْها تَطليقَةً . ـ رواهُ البُخاري : (٥٢٧٣) ، (٥٢٧٥) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (أَيُّما إمْرَأةٍ سَألَتْ زَوْجَها الطَّلاقَ مِن غَيرِ ما بَأْسٍ فَحَرامٌ عَلَيْها رائحَةُ الجَنَّةِ) ـ صَحيحٌ ، رَواهُ الترمذي : (١١٨٧) . وَ صَحَّحَهُ الألباني .

* عَنْ إبْنِ عَبّاسٍ ، أَنَّهُ قالَ (إنَّ زَوْجَ بَريرَة كانَ عَبْداً ، يُقالُ لَهُ : مُغيثٌ ، كَأَنّي أنْظُرُ إلَيْهِ يَطوفُ خَلْفَها يَبْكي وَ دُمُوعُهُ تَسيلُ على لِحْيَتِهِ ، فَقالَ النَبِيُّ لِعَبّاسٍ : يا عَبّاسُ الا تَعْجَبُ مِنْ حُبِّ مُغيثٍ بَريرَةَ ، وَ مِنْ بُغضِ بَريرَةَ مُغيثاً ؟! فَقالَ النَبِيُّ ﷺ لَوْ راجَعْتِهِ ، قالَتْ : يا رَسُولَ اللهِ أتَأْمُرُني ؟ قالَ : إنَّما انا أَشْفَعُ ، قالَتْ لا حاجَةَ لي فيهِ ) ـ رواهُ البُخاريُّ : (٥٢٨٣) .

* عَنْ كَثير بن عبدالله : (أَنَّ إمْرَأةً نشزت مِنْ زَوجِها في إمارَة عُمَر ابن الخَطّابِ ، فَأمَرَ بها إلى بَيْتٍ كَثيرالزبل ، فَمَكَثَتْ فيهِ ثلاثة أيَّامٍ ، ثُمَّ اخْرَجَها ، فَقالَ لَها : كيفَ رَأيْتِ ؟ قالَتْ : ما وَجَدْتُ الرَّاحَةَ إلّا في هذهِ الأيّام ، فَقالَ عُمَر : إخلعْها وَلَوْ مِنْ قرطِها) - اخْرَجَهُ إبنُ ابي شَيْبَة : (١٨٨٤٣) .

**سەرچاوەکان :**

١) فتح الباري شرح صَحيح البُخاري ، لِلأمام الحافِظ أحمد بن على بن حَجَر العَسْقَلاني . ج٩ ، ص٤٨٩ ، ص٥٠٥ ، ط : ٣ ، ٢٠٠٠ ، دارُ الفَيْحاء ، دمشق .

٢) زەواج لە قورئان و فەرموودە صەحیحەکاندا ، محمد مەلا فایەق شارەزوری ، ل ٢٠٧ ، ل ١٦٨ .

٣) زَوجات وَ صَحابيات حَوْل الرَّسُول ﷺ ، سَعْد يوسف أبو عَزيز ، ص ٥١٢.

٤) گۆڤاری (چارە) ، ژمارە : ٢١ ، حوزەیرانی ٢٠١٢ ، ل٣٨ . بابەتی: مرۆڤ دیلی ژیان نیە ، نوسینی : عادل محمد .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیمانداران و خوداناسانی بەڕێز: لە دووەم شەوی مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا، لە زنجیرە باسەکەماندا بەناوی ﴿**ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشەو گیر و گرفتم هەیە**﴾ باسەکەمان دەست پێدەکەین بە شعری شاعیرێکی فارس کەوتویەتی:

( دەرین دونیا هیچ کەس بیٚ غەم نەباشد ئەگەریاشد بەنی ئادەم نەباشد ) قسەیەکی زۆر جوانە دەڵیٚ: کەسێك هەبێت لەم دونیایە کەسێکت پیٚ شك نایە، دڵنیابە ئەی ئینسان بیر بکەوە، وامەزانە ئەگەر خەفەتێکت بوو وابزانی هەر تۆ خەفەتت هەیە، لەسەرتاسەری ئەم گۆی زەویەدا، کەسێك شك نابەیت بیٚ خەفەت و بیٚ موشکیلە بێت ئەگەر هەبێت ئەوا لە بەنی ئادەم نیە، ئەوا ئینسان نیە ئەگەر ئینسانێکی ژیر و عاقڵ و تێگەشتوو خاوەن هەم و خەم بێت، ئیلا کێشە و گرفتی هەیە.

بەیەکەوە ئەمشەو لەم شەوە پیرۆزەدا ئەچینە خزمەت شارە پیرۆزەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ، شاری مەدینەی پیرۆز، کوڕێکی گەنج وەکو ئەم گەنجە جوانانە (إنشاءالله)ئەم گەنجانەمان لەسەر ڕێی ڕاستن، هەروەکو ئەو گەنجانەی زەمانی پێغەمبەر ﷺ (إنشاءالله) ئەمانە ماونەوە،ئەم کوڕە ناوی (حنظله إبن أبی عامر) بوو کچێکیش هەبوو، هەتا بڵێیت ئافرەتێکی ڕێك و پێك بوو ناوی (جمیله بنت عبدالله بن اُبی بن سلول) بوو، ئەم کوڕە ،ئەم (حنظله) ناردیە خوازبێنی.. ئەوانیش (جمیله)یان پێشکەش کردوو ژیانی هاوسەریان پێك هێنا، پێغەمبەری خوداش ﷺ بەم خێزانە نوێیە، بەم کچ وکوڕە زۆر شادومان بوو، (سبحان الله) ئەو شەوەی کە بوکەکە گواسترایەوە بۆ ماڵی (حنظله)، خاتوو (جمیله) گواسترایەوە، بۆ بەیانی شەڕی (ئوحود) دەستی پێکرد، کاتیٚ کە ئەم گەنجە هەستا بەیانی خۆی بشوات بڕوات بۆ مزگەوت گوێی لێبوو (بیلالی

حەبەشی) لەسەر بانی مزگەتەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ بانگی فەرموو بەلاّم لە جیاتی بڵێ (حيّ على الصّلاه) فەرمووی (حيّ على الجهاد) خەڵکینە، ئەی گەنجان، ئەی ئەوانەی دەستیان سیلاح و شمشێر دەگرێت، راپەڕن، دەوری شاری مەدینە گیراوە..

ئەم گەنجە بیری لەوە کردەوە تاوەکو سەتڵێك ئاوی بۆدەبەنە دەست شۆر و خۆی دەشوات و حەمامێك دەکات.. دەترسێت پێغەمبەری خودا ﷺ بڕواتە دەرەوەو ئەم لەم غەزایە بەجێ بمێنێت ئەم بەشداری شەڕی (بەدر)یشی کردووە پێشتر، لەبەر ئەوە زۆر بەپەلە ڕۆشت و بەخێزانەکەی وت: بە خودا من فریای خۆشۆردن ناکەوم بابگەمە سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت و جەنگ دەستی پێکرد (سبحان الله) هەر لە بەرەبەیانی ئەم جەنگە شەهید بوو..

کاتێك کە پێغەمبەری خودا ﷺ شەهیدانی جەنگی (ئوحود)ی بەسەر کردەوە قسەیەکی فەرموو، فەرمووی: (إِني رَأيتُ المَلائكةَ تُغَسِّلُ حنظلَةَ بن عامر بَينَ السَماءِ وَ الأرْضِ بِماءِ المُزنِ فِي صِحافِ الفِضةِ) .واتە: (دڵنیابن بەم چاوانەی خۆم بینیم فریشتەکان هاتن و لاشەی (حنظله إبن عامر)یان بەرز کردەوە لە بەینی ئاسمان و زەویدا ڕایان گرت و بە ئاوی بارانی ئاسمان جەستەکەیان لە تەشتێکی زیوینا شت!!

صەحابەکان ڕایان کرد بزانن (حنظله) لەکوێیە، دەبێ شەهید بوو بێت، چی لێ بەسەر هاتبێ، کە دۆزیانەوە (أبو أسیدی الساعدی) دەفەرموێ (فَذَهَبْنا وَ نَظَرنا إليه فَأذا رَأسَهُ يَقْطُرُ ماءً!!) واتە: (چووین و دۆزیمانەوە، لە ڕیزی شەهیدەکاندا بوو، وەلاّ قەترە ئاوەکان بەقژە خاوەکەیەوە مابوویەوە) (سبحان الله) ڕێك ئاوەکەی پێوە بوو، کە جەستەیەك چۆن ئینسان لە حەمام دێتە دەرەوە خاولی لە سەری نەدابێت، قەترە ئاوەکان دێنە خوارەوە ئاواجەستەی تەڕبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

ئەمە لێرەدا بابەتێك هەیە بڕۆن بۆ لای خێزانەکەی، بۆ لای ئەو (جمیله) خانە، کاتێك چوون وتیان: پێغەمبەری خودا ﷺ شتێکی وای فەرموو، بینیمان ئەم جەستەیە شۆردراوە زیاد لەهەموو شەهیدان خەبەرێك، قسەیەك، دەنگ و باسێکی ئەم پیاوەت

لانیە؟! فەرمووی: وەلاهی ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم بەیانیە بە لەش گرانیەوە چووە بۆ غەزا، فریای خۆ شۆردن نەکەوت پێش ئەوەی بیخەنە ناو قەبرەوە مەلائیکەتەکان هاتن لە بەینی ئاسمان و ئەرزدا بە ئاوی باران شۆردیان!!

ئەم ئافرەتە، ئەم (جمیلە)یە، کەخێزانی ئەم صەحابەیە، ناو و ناوبانگی دەرکرد، مێردەکەی شەهید بووە لە پێناوی خودادا، ژنە شەهیدێکە کە فریشتەکان لە بەینی ئەرز و ئاسماندا بە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ بینیویانە و ئاساری شتنەکەیان پێوە بینیوە، صەحابەکان، لەبەرئەوە گەنجانی تر خواخوایان بوو هاوسەرگیری لەگەڵ ئەم ژنە شەهیدەدا پێکبهێنن، ئەو بەرەکەتە بێتە ماڵیانەوە..

لەوانە گەنجێکی زۆر رێك و پێك هەتا بڵێی قۆز، ئەوەندە ئینسانێکی دیندار و خوداناس بوو، ناوی (ثابت بن قیس بن شماس) بوو چووە خوازبێنی ئەم ئافرەتە کە بێوە ژن کەوتبوو مێردەکەی شەهید کرابوو، ئەویش زۆر بە حوبی دڵی خۆی شوی پێکرد، پێغەمبەری خودا ﷺ لە مەجلیسی مارەکردنەکەیدا بەشداری کرد، و صەحابەکان هەمویان بەشداریانکرد، و نانی بوك گواستنەوە ئامادەکراو پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەی (ثابت) چیت هەیە؟ فەرمووی ئەی پێغەمبەری خودا لە ماڵی دونیا بەس ئەو باخچەیە- ئەو حەدیقەیە ئەو باخە- شك دەبەم ئەوە مارەیی بێت، پێشکەش بێت بەو (جمیلە)یە، لەسەر ئەوە لێی مارەکراو چونە ماڵی خۆیانەوە، بەلاّم ئالێرەدا موشکیلەکە دەست پێدەکات، ئێمە باسی موشکیلە دەکەین هەر شەوە و یەکێك موشکیلەیەکی هەیەو دێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، بەلاّم با ئێمەش لەگەڵ ئەم کابرایەدا، ئەم گەنجە غەمبارە دڵ پڕحەزینەدا، با بچینە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بەلاّم پێش ئەوەی بگەینە خزمەتی دیاریەکەی شەوانمان کە سلاّوات دانە لەسەر دیداری پیغەمبەر ﷺ ، بینێرین بۆ ڕۆحی خۆشەویستمان:

(اللّهُمَّ صَلی عَلی سَیِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلی عَلی حَبیبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلي عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سلّم).

## بەبێ هۆ ڕقی لە مێردەکەیەتی!!

پێغەمبەری خەم خۆر هەموو ڕۆژێك سەیری ئەم (ثابت)ەی دەکرد، ئەو گەنجە جوانەی جاران، ئەو ڕووخۆشە دڵ گەشە ئێستا لەناو صەفی جەماعەتدا لەناو ڕیزەکاندا دەبینرێت، دایمە ڕوویەکی خەمناك، چاو بە فرمێسك، زۆر جار مەحزونە پێغەمبەری خودا ﷺ یەکسەر هەستی پێکرد، ئەم گەنجە زۆر غەمبارە، ڕۆژێك جیای کردەوە لە خەڵك و فەرمووی: ئەبینم زۆر غەمت هەیە، تۆ ئەو گەنجەی جاران نەمایت، ئێستا دەبوو زیاتر بەختەوەر بیت، جاران ژنت نەبوو ئاوا گەنجێکی ڕێك و پێك و ڕووگەش بوویت، ئەی ئێستا بۆ وایت؟! فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هەر لێم بگەڕێ، وەڵاهی لە ماڵێکدام دەڵێی جەهەننەمە، ئەم ژنە بە هیچ شێوەیەك ڕووی لێم نیە، ڕوویەکی خۆش، نانێکی خۆش، قسەیەکی خۆشم لەگەڵدا ناکات، منیش ئەوەندەم پێ عەیبە نازانم چۆن بەو کەس و کارەی بڵێم، ئەمە ژنە شەهیدێك بووە من وامزانی بەختەوەر دەبم لەگەڵیدا، کە زەواجم لەگەڵیدا کردووە، بەڵام بەداخەوە ژیانم گەلێك ناخۆشە سەرەتای زاوا و بوکێنیمانە کەچی ئەم ژنە ئاوادەکات..

پێغەمبەری خودا ﷺ ناردی بەدووی خێزانەکەیدا، نابێت ئەم موشکیلەیە ئاوا بمێنێتەوە،هات، فەرمووی: کچی خۆم (جميلە)خان ئەم (ثابت)ە چ خراپەیەکی هەیە؟! ئەم گەنجە قۆزەی جاران بۆ وا چەمیوە لەژێر باری خەفەتدا؟!هەست دەکەم گلەیی لە تۆ هەبێت، دەی پێمان بڵێ عەیبی ئەم گەنجە چیە ؟ لێرەدا ئەم ژنە هاتە جواب فەرمووی:

(والله يا رَسُول الله ﷺ ما أعتُبُ على ثابتٍ في دِينٍ وَلا خُلُق) واتە: وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەی گلەیی بێت لە بارەی دین و ڕەوشتی ئەم (ثابت)ە بێت گلەیم نیە، وەڵاهی تا بڵێیت گەنجێکی دیندارە، تابڵێیت خوداناسە، قورئان خوێنە، شەو

نوێژکەرە، وەڵاهی تا بڵێیت بەڕەوشت و ئەخلاقە، هەتا بڵێیت ڕێك و پێکە، زمان شیرینە، سەخی تەبیعەتە، پیاوانەیە، حەز بە ماڵ و میوان دەکات، وەڵاهی ڕێزم لێدەگرێت، خودا لێم هەڵناگرێت، ئەم گەنجە هاوسەرمە هەرچی عەیب بێت نیەتی، نەدین و نە ئەخلاق..

(وَلَكِنِّي أَكرَهُ الكُفرَ فِي الأِسلامِ)،واتە: وەڵاهی من هاتومەتە دینی ئیسلامەوە ئەمەوێت بەهەشتم هەبێت، باوەڕتان بێت دەترسم ئەی پێغەمبەری خودا ئەوەی دینداری و عیبادەتیشە دەیکەم، بەهۆی خراپیم لەگەڵ ئەم مێردەدا هەمووی دانێمەوە..

(لا أُطيقُهُ بُغظاً)،واتە: بەخودا بەدەست خۆم نیە، ئەو دڵەم پڕبووە لە ڕق و قین بەرامبەر بەم کابرایە (سبحان الله) خراپەی نیە! بۆ خۆی دانی پێدادەنێت، نەدینی خراپەی هەیە، نە ئەخلاقی هەیەتی.. کەچی ئەی پێغەمبەری خودا ئەو دڵەم، واسینەم پڕە لە غەرەز و بوغزە بەرامبەر بەم (ثابت)ەی مێردم وتی:(لا أنا ولا ثابت بن قيس) بەخودا من و ئەو ناتوانین لە ماڵێکدا بەیەکەوە بژین..

ئیتر ئەوە دەنگ و باسەکە ئاشکرابوو ئەی پێغەمبەری خودا، من ڕقم لێیەتی، پێغەمبەری خودا ﷺ، ئیتر سەیری کرد ئەم ژنە لە ناخەوە کە قسە دەکات، کێم و جەراعەت لە دەمیەوە دێتە دەرەوە، کە خەریکە قسە دەکات ئیتر دەڵێت ناتوانم لەگەڵیدا بژیم، پێغەمبەر ﷺ هەر ئەوەندەی فەرموو، بە غەمبارییەوە فەرمووی:

(أَتُرَدِّينَ عَلَيهِ حَدِيقَتَهُ)،واتە: ئەو باخەی لەکاتی مارەیدا پێشکەشی کردی دەیدەیتەوە؟! (قالَتْ: نَعَمْ)، وتی: ئەرەوەڵا ئەگەر خودا دەکات دەستی لەدەستم دەبێتەوە ئەوە خۆی و باخی و مارەیی و هیچم ناوێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

ئەی (ثابت) تۆیش باخەکەی خۆت وەرگرەوە و هیچ زیاتریش لەوەی لێ نەستێنی، نەکەی داوای پارەی لێ بکەی، بڵێی تەڵاق نامە و نازانم چی، (وَطَلِّقيها) کاکە تەڵاقی بدە، و هەرکەس بۆ ماڵی خۆی، ئەم خێزانە بە تەڵاق کۆتاییان پێ هات..

ئەمە کێشەی کەسانێکە، بڕواتان هەبێت بڕواتان هەبێت کچی واهەیە بە شوودراوە دەستی باوك ماچکراوە، دایك دڵخۆش بووە کچەکەی بە بوکی براوە، کەچی سەیر

دەکەی جاری وا هەیە هێشتا نەگواستراوەتەوە، جاری واهەیە گواستراوەتەوە منداڵیان نیە، جاری واهەیە منداڵێك دوو منداڵیان هەیە، ئەنجا ژن و پیاوەکە ناحەوێنەوە، جاری واهەیە ژنەکە دەڵێت بە هیچ شێوەیەك ئەم پیاوەم خۆشناوێت و ئیدارەم نەکردووە لەگەڵیدا، ئێمە لەم بەسەرهاتانەدا کێشەکانی ئەمڕۆ دەبینین ، باوەڕتان بێت باوك هەبووە وتویەتی مردنی خۆمم پێخۆشترە کە کچەکەم ئاوادەکات ، بەلآم چی بکەم ئەوە بزانە زەمانی لە پێغەمبەردا ﷺ، موشکیلەی ماڵی صەحابەکان بووە ! !

## چەند دەرسێك لەم فەرموودەدا:

یەکەم: ئەوە واتای وانیە هەر ژن و مێردێك بەیەکەوە نەگونجان مێردەکە خراپ بێت، ئەم (ثابت بن قیس) هەتا بڵێیت پیاوێکی دیندار و خوداناس بوو.

دووەم: سەیری ویژدانی مسوڵمانانە بکە، ئەم ژنە کە لەگەڵ ئەم پیاوەدا نەگونجا بوختانی بۆ دروست نەکرد، ئەها هی واهەیە مێردەکەی خۆش ناوێت، لەگەڵیدا نەگونجێت، هەزار و یەك شتی بۆ هەڵدەبەستێت، ڕەزیلە و دڵپیسە و فلآنە، کەچی بەپێچەوانەوە ئەم ژنە وتی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ،وەلآهی ئەم (ثابت)ە نە لە دینیدا و نە لە ئەخلاقیدا، هەرچی کەم و کوڕی بێت نیەتی، خۆزگە ئافرەتانی ئێمەش وادەبوون، خۆشت ناوێ لە دڵەوە خۆشت ناوێ، بەلآم بوختانی بۆ مەکە، یا پیاوی واهەیە لە ژنەکەی بێزارە ئیتر موحیبەتەکەی لە دڵیدا نەماوە، پێویست ناکات بوختانی بۆ بکەیت.

پیاوێك دەیویست ژنەکەی تەلآق بدات، هەر لەزەمانی پێغەمبەردا ﷺ ، لێیان پرسی کاکە بۆ ژنەکەت تەلآق دەدەیت؟! عەیبی هەیە؟! وتی: زۆر عەیبە پیاو باسی ژنی خۆی لەلای خەڵکدا بکات.. ئەوە حەلآڵی منە، ئەوە مەحرەمەکەمە، تەلآقیدا.. وتیان تۆ لە پێشدا قسەت نەکرد ئەی ئێستا بۆ تەلآقت دا؟! وتی ئێستا عەیبە پیاو باسی کەسێك بکات کە لە ژێر نیکاحدا نەمابێت و ڕۆژێك ببێت بە خێزانی کەسێکی تر، باسی ناکەم،

کۆتایی بەو مەسەلەیە هاتووە.. ئەها ئەمە ویژدانە.. بۆیە کوڕ و کچەکانمان پێویستە فێری ئەوەبێن ئەگەر خودانەخواستە زانیت گرفتی خێزانیت هەیە بوختان بۆ هاوسەرەکەت مەکە، ڕاست و ڕەوان ئەوەی لە دڵتدا هەیە بیڵێ، بڵێ خۆشم ناوێت.

سێیەم: ئەم خۆشەویستیەی بەینی ژن و مێرد بەس خودا دەیبەخشێت،﴿.. وَجَعَلَ بَيْنَكُم﴾ چی و چی کێ دەزانێت؟!﴿مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً..﴾ ئەم کوڕە لە ماڵێکدا، لەپەروەردەیەکدا، لەخانەوادەیەکدا، ئەم کچە لەخێزانێکی تر، لەپەروەردەیەکی تر، لەژیان و ژینگەیەکی تر، (سبحان الله)! وەکو هێزی موگناتیس خودای گەورە مەیلیان دەکات بەلای یەکدا﴿.. وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً..﴾الروم: ٢١. واتە: خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانیان دەخاتە بەینەوە. وەڵاهی بەس بە خودا دەکرێت، ئەها خوای پەروەردگار بە حیکمەتی خۆی کارێکی وای لەگەڵدا کردن ئەم خۆشەویستیە نەما، هێز نیە بتوانێت دروستی بکاتەوە.

## ناخۆشترین شوێنی هەڵبژارد:

لە زەمانی حەزرەتی (عمر)دا، ژنێك زۆر شەکوای لە مێردەکەی دەکرد کە لەگەڵیدا ناگونجێت، داوای تەڵاقی کرد، حەزرەتی (عمر) کەچوو بۆ ماڵیان سەیر دەکات، خانوو، شای خانوویان هەیە، خەڵك لەسەر حەسیر دادەنیشێت، ئەم لەسەر فەرشی کاشان دادەنیشێت، فەرشی ئاوریشمی هەیە، هەموو فەرشەکان بە دیوارەکان هەڵواسراون.. چراو ڕوناکی هەڵواسراوە.. حەزرەتی (عمر) فەرمووی با ئەم ژن و مێردە لەیەك نەبن، با ئەم ماڵە هەڵنەوەشێت، بەڵام من تەگبیرێك دەکەم، ئەم ژنە بەرن لە ماڵی کابرایەکدا دایبنێن کە ژنێکی ڕێك و پێك و موسوڵمانی هەبێت، بەڵام چ ماڵێك لە مەدینەدا لە هەموویان پیس و پۆخڵترە؟ وتیان: وەڵا ماڵی فلان کەس هۆدە و هەیوانێکیان هەیە،

مانگاکانیان لە ژورەوە دەبەستنەوە، خۆشیان لە هەیوانەکەن، بۆنی ڕیخ لە ژورەوە کوێرت دەکات.. –لە کوردەواریدا ئەوە هەبووە کابرا هەر ماڵاتەکە بەسەر هەیوانەکەدا هاتووە، لە کوردەواری خۆشماندا ئاوا بووە، ئەو ماڵەش ئاوا بووە هەر بۆنی ڕیخ و بۆنی زبڵ کوێرت دەکات..– فەرمووی دوو سێ شەو ئەو ئافرەتە بە میوانی بەرن بۆ ئەو ماڵە موسوڵمانە، کە بردیان سێ شەو کەس نەیتوانی بچێتە ئەو ماڵە بەس خۆیانی لێ دەژیان..

کە هاتەوە حەزرەتی (عمر) فەرمووی: (كَيفَ رَأَيتِ) خوشکەکەم ئێستا چۆنیت؟! ئێستا بۆت دەرکەوت تۆ لەچ خەڵاتێکدایت؟! لە ماڵێکی خۆشدایت؟ ئێستا پەشیمان بویتەوە بۆ ماڵی مێردەکەت؟ (قالَتْ ما وَجَدْتُ الرَّاحَةَ إلا في هذهِ الأيام)

وتی: وەڵاهی ئەی ئیمامی (عمر) بە تەمەنی خۆم لەوەتەی کە ژنی ئەو پیاوەم ئەم سێ شەوە تێر خەووتوم لە ماڵی ئەو پیاوەدا، بۆنی ئەو ڕیخەم لە بۆنی عەتری ماڵی مێردەکەم پێخۆشترە!! حەزرەتی (عمر) فەرمووی: تەواو سودی نیە قسە کردن، ئا لەویادا بڕیاری لەیەك جیا بوونەوەی ئەو ژن و مێردەی دا.. ئەو ماڵە جەهەنەمە بۆن ڕیخەی لەو ماڵی گوڵ و گوڵزار و عەترەی ماڵەکەی خۆی پێ خۆشترە، ئەها ئەو دڵە دەبێت پەروەردگار ڕامی بکات کەئەم ژن و مێردە ئەو خۆشەویستیەیان دەکەوێتە بەینەوە.

چوارەم: فەرمووی: (أَتُرَدِينَ عَلَيهِ حَدِيقَتَهُ) باخەکەی دەدەیەوە؟ یەکێك ڕەنگە ڕەخنە بگرێ وبڵێ: باشە جا بۆ خۆ ئەم ژنە گواستراوەتەوە، چۆتە ماڵە مێرد، ئیتر دوایی بە دەست خۆی نیە، دڵی خۆشەویستی نەبووە بۆمێردەکەی، بۆ باخەکە بداتەوە بە مێردەکەی؟! ئەمە لەبەر ئەوەیە:

ئیسلام هەمو کارەکانی پڕ حیکمەتن، ئەگەر ئەمە نەبوایە، لە هەر وەختێکدا ژن بە مێرد ڕازی نەبوو، بەبێ ئەوەی هیچ عەیبێکی هەبێت، بەبێ ئەوەی هیچ نوقسانیەك لەم پیاوەدا هەبێت، واجبە چی مارەیی داوەتێ بیداتەوە، ئەگەر ئەم یاسایە لە ئیسلامدا

نەبوایە، وای لێدەهات ژنی فێڵباز شووی بە پیاوێك دەکرد بۆ ئەوەی سەروەت و سامانەکەی لێ داگیر بکات، دوای مانگێك خۆی پێ تەلاق دەدا و دەستی بەسەر سامانەکەیدا دەگرت، دوای دەچوو پیاوێکی تریشی والێدەکرد، نا ئەوە نابێت، گەر یاری کردن بەماڵی خەڵك، بە شەرەفی خەڵك، بە ڕێزی خەڵك، ئەگەر ڕاست دەکەیت تۆ موحیبەتت لەگەڵیدا نیە کەواتە ماڵەکەیشیت نەوێت، نەك بڵێ پیاوەکەم ناوێ بەڵام هەموو شتەکانی لێ دەستێنم، ئەگەر ناتەوێت دەبێت ماڵەکەیشی بدەیتەوە، هەرکەسە و بۆ ماڵی خۆی ئەوەش یاسای ئیسلامە.

ئەم ژنە کە ناوی (جمیلە)بوو جا لە کتێبەکاندا دەفەرموێت: شەونوێژ کەر بوو.. بەردەوامی ساڵ ڕۆژووی سونەتی دەگرت.. چەند جارێك حەج و عەمرەشی کردبوو.. یەعنی هەتا بڵێیت بەدین بوو.. (سبحان الله) ئەم کارەشی بەسەرهات، لە دوای مێردی یەکەمی شەهید بوو، ئەم پیاوە تەلاقی دا.. لەدوای (ثابت) شووی بە کوڕێك کرد ناوی (مالیك) بوو، بە خودا لەگەڵ ئەویش نەگونجا.. دیسان ئەویش تەلاقی داو، شووی کرد بە پیاوێك ناوی (حبیب) بوو، لەگەڵ ئەویشدا نەگونجا، (سبحان الله) لەویش جیابویەوە،، دوای چوار مێرد ئەمجا وەفاتی کرد.. کەچی نابینی یەك دێڕی خراپە نوسرابێت لەسەر ئەم ئافرەتە، لە مێژوودا هەر دەڵێ: (صەوامەی قەوامە)بووە مێژوونوسان دەڵێن: پەیوەندیەکی خێزانیە ناتوانی بڵێیت ئەم ژنە بەدبەختە، چارەڕەشە، شوومە، هەزار و یەك قسەی بەدوو بخەی، نا لێیبگەڕێ ئەمە پەیوەندیە خێزانیەکانن، بۆ من و بۆ تۆ نیە، مێژوو نوسێك، کەسێك، دەمی تێوە بدات..

پێغەمبەری خودا ﷺ نەچوو دوعا و نوشتەیان بەسەردا بخوێنێت، ئەمە خاڵێکی ئەساسیە، پێغەمبەری خودا ﷺ نافەرمووێت: ئەم ژنەم بۆ دابنێن لەوانەیە جنۆکە چوبیەتە لەشیەوە، ئادەی سەتڵێك ئاوبکەن بەسەری دا بەڵکو جنۆکەکان بچنە دەرەوە، دوعایەکی بۆ بهێنن، دوعای ترش و شیرین، تا لە دڵی مێردەکەیدا شیرین بێت، ئەها ئێمە دەبێت وشیار بین، ئەم باسانە بۆیە بۆ جەنابتانی باس دەکەم، خەڵك دین لە پێغەمبەر

ﷺ فێربێت، ئەگەر دوعا بۆ مەسەلەی زەواج سودی هەبوایە پێغەمبەری خودا دەیکرد، یان نا؟ بێگومان دەیکرد، چونکە نەیدەویست ئەم ژن و مێردە لەیەك جیاببنەوە، بەلام پێغەمبەری خودا ﷺ دوعایەکیان بەسەردا ناخوێنێت، جنۆکە لە لەشدا دەرناکات، هیچی بەسەردا ناخوێنێت..

ئەمە دەزانێت گەشتۆتە قەناعەتێك کە ئەم ژنە جێگای ئەم پیاوە لەم دڵەدا نەماوەتەوە، جێگای خۆشەویستی ژن و مێردیش پێش ئەوەی خانوو کۆیان بکاتەوە دەبێت لە دڵی یەکدا کۆببنەوە کە لە دڵدا نەمان، لە ماڵدا سودی نیە، لە ژێر چەتری خانوویەکدا ئەوە پێی ناوترێت ژیان ئەوە هەر جیابوونەوەیەکە بەلام زۆر بە ئاشکرا نیە، بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ هیچی نەفەرموو، تەکلیفی لە خێزانەکەش نەکرد، ئەم حەدیسانە زۆرن کە ژن هاتووە وتوویەتی:بە مێردەکەم ڕازی نیم..

## پیاوەکەی زۆر شەیدای بوو.. ژنەکەی بەپێچەوانەوە !!

پیاوێك هەبوو ناوی (موغیث)بوو ژنەکەی ناوی(بەریرە) بوو ئەم (بەریرە)یە خزمەت کاری ماڵی پێغەمبەر ﷺ بوو، دەهات نانی بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ دەکرد، کە میوانیان هەبوایە، قاپی بۆ ماڵی خاتوو (عائیشە) دەشۆرد، دایمە لەخزمەت (عائیشە)و پێغەمبەری خودا دابوو ﷺ، یەعنی پەروەردەکەی هی ماڵی پێغەمبەری خودا بوو ﷺ..

بە دڵی خۆی شووی کرد بە پیاوێ ناوی (موغیث)ە، کەچی (سبحان الله) هەموو مانگێکی نەبرد، لەیەك کەوتنە تەقە، بەلام ئەم (موغیث)ە شێت و شەیدای ئەم (بەریرە)یە بوو، ئەم ژنەش کون بە کون خۆی لێ دەشاردەوە، دەڕۆشتەوە بۆ ماڵی باوکی، دەهاتەوە بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ، دەیگووت: ئەی پێغەمبەری خودا تاقەتم نیە و نامەوێت چاوم پێی بکەوێت، (موغیث) هات بە گریانەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تو خودا تکام بۆ بکە، بەڵکو ئەم (بەریرە)یە لێم جیانەبێتەوە..

گەنجێك زۆر دڵ پڕ لە غەم، -ئەها گەنجی وامان هەیە ئێستا لەم زەمانەدا بەخودا دەگریا، دەڵێت تو خودا خۆزگە دەستگیرانەکەم لێ جیانەبوایەتەوە، خۆزگە وازم لێ نەهێنێت، خۆزگە هاوسەری جاران بین،- پێغەمبەری خودا ﷺ بانگی (بەریرە)ی کرد، فەرمووی: ئەچیتەوە بۆ لای مێردەکەت، دەستگیرانەکەت، کە (موغیث)ە، فەرمووی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم قسەی تۆ تەکلیفە، یان شەفاعەت و ئەمرە؟ئەمرم پێدەکەیت یان شەفاعەت و تکایە بۆی دەکەیت؟!

فەرمووی نەوەڵا ئەمر ناکەم من ناڵێم ئەمرت پێدەکەم شەفاعەت و تکایە (إِنَّما أنا شافِع) بە خودا من بەس تکاکارم ئەوە پەیوەندی بە خۆتەوە هەیە، ناتوانم بڵێم لەبەر دڵی من بچۆوە، لەبەر دڵی من سودی نیە، نابێت تەکلیفیان لێ بکرێت لەبەر خاتری فلان کەس و ئەو مەجلیسە و ئەوانە، ئێمە ئەو غەڵەتانە زۆر دەکەین، لەبەر خاتری ئێمە بچۆوە.. نا، لەبەر خاتری خۆت بچۆوە، چونکە ژیان بۆ خۆتە..

دەفەرموێت: بەخوا من بەس تکاکارم، (بەریرە) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەمرم پێبکەیت بچمە ئاگرەوە دەچم، بەخودا بە قەد هەموو دونیا رقم لەو مێردەمە، ئەگەر ئەمر دەفەرمووی دەچمەوە بۆ لای، فەرمووی: بە خودا من ئەمرت پێ ناکەم، من بەس تکام هەیە، فەرمووی: بە خودا نامەوێت.. جا دەفەرموێت بە کۆڵانەکاندا ئەم (بەریرە)یە دەڕۆی گۆزەیەك ئاوی دەهێنا ئەم (موغیث)ە هۆڕە هۆڕ بە دوایدا دەگریا، هاواری دەکرد: تو خودا ئەم جارە وەرەوە بۆلام..

جا دەفەرمووێت: ڕۆژێك پێغەمبەری خودا ﷺ دانیشتبوو (عبداللە ی إبن عباس)ی ئامۆزای لە تەنیشتیەوەبوو، فەرمووی: (عبداللە)، توخودا وەرە سەیر بکە لەکاری خودا سەرم سوڕماوە، ئەم هەموو خۆشەویستیەی (موغیث) بۆ ئەم ژنە، ئەو هەموو بوغزەی (بەریرە)یش بۆ ئەم پیاوە، (سبحان اللە) ئەو (١٠٠) پلە خۆشی دەوێت، ئەم (١٠٠) پلە رقی لێیەتی، بەڵام ئەوە پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیە، ناکرێت ئێمە تەداخولی تێدا بکەین.

**پێنجەم:** ئەوەیە کەس گاڵتەی بەم پیاوە نەکرد (ثابتی إبن قیس) گەنجان، خزمان، کەس و کار، بڵێن: ژنەکەت پێت ڕازی نەبوو، تەلاقی وەرگرت.. نا یەك بەشەر بۆی نیە تەداخول لەم شتەدا بکات، بەداخەوە ئێمە کۆمەڵگایەکین زوڵم لە هاوڵاتیانی خۆمان دەکەین، دەچین دەڵێین ئەوە پێی ڕازی نەبوو، ئەوە بۆ وایان کرد..

نەء، بڵێ: خودایە، منیش حاڵم لێ تێك نەچێت، بڵێ خودایە: کچەکەی منیش بەدبەخت نەبێت.. خودایە ژنەکەم لێم هەڵنەگەڕێتەوە..، ژن بڵێ خودایە مێردەکەم منی لەبەر چاو نەکەوێت.. دوعا بۆخۆت بکەیت کە کارێکی وات بینی، زمانت ببەستی لە ئاستی کێشە و ناخۆشیەکانی خەڵکدا..

یارەبی خودایە ڕەحمان پێبکەیت، خودای پەروەردگار هەموو ئەو کەسانەی کێشە خێزانیەکانیان هەن یارەبی خودایە ڕەحم و سۆز و مەوەدە و ڕەحمەت بخەیتە نێوان کچ و کوڕەکانەوە، دەستگیرانەکانەوە، ژن و مێردەکانەوە، ناکۆکیەکان لەم مانگی ڕەمەزانەدا لەم شەوە موبارەکەدا بەخێر و خۆشی بە ئیصلاح کۆتای بێت.. یارەبی خودایە زمانمان پاك بکەیت کەوا تەداخولی کێشە خێزانیەکانی خەڵك نەکەین.. ئیلا بەدوعای خێر نەبێت، لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لە بە هەشتی بەریندا هەموو لایەکمان کۆبکەیتەوە..

تا شەوی داهاتوو لەخزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، لە کێشەیەکی تردا هەموو لایەکتان بەخودا ئەسپێرم..

(وَالسَّلَامُ عَلَيكُم و رَحمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ) .



# وانەی سێیەم



## بابەت

## ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ مێردەکەم ناهێڵێ نوێژی درێژ و ڕۆژووی سوننەت بگرم



## وانەی سێیەم:

# ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ مێردەکەم ناهێڵێ نوێژی درێژ و ڕۆژووی سوننەت بگرم !

* عَنْ ابي سَعيدٍ ، قالَ : جاءَتْ امْرَأةٌ إلى رَسُولِ اللهِ ﷺ ، وَنَحْنُ عِنْدَهُ ، فَقالَتْ : زَوجي صَفوان بن المعطَّل ، يَضْرِبُني إذا صَلَّيتُ ، وَ يَفطِرُني إذا صُمْتُ ، وَلا يُصَلِّى الفَجرَ حَتَّى تَطلِعِ الشَّمسُ ، قالَ : وَ صَفوانُ عِنْدَهُ ، فَسَأَلَهُ عَمّا قالَتْ ؟

قالَ يا رَسُولَ اللهِ : امّا قَوْلُها : يَضرِبُني إِذا صَلَّيتُ ، فَإِنَّها تَقرأُ بِسورَتَيْنِ ، وَقَدْ نَهَيتُها ، فَقالَ لَها رَسولُ اللهِ ﷺ (لَوْ كانَتْ سورةٌ واحِدَة ، لكفتِ النّاسُ) .

قالَ : وَامّا قَوْلُها : يَفطرني إِذا صُمْتُ ، فَإِنَّها تَنطَلِق تصومُ ، وَ أنارَجُلٌ شابٌ ، فَلا اصبِرُ!

فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (لاتَصُومُ امرأَةٌ ، إلاّ بِإِذْنِ زَوْجِها) .

وَ أَمّا قولها : إِنّي لا أُصَلّي حَتَّى تَطلع الشَّمْسُ ؟ فَإِنّا أَهل بَيْتٍ قَدْ عرفْتَ عَنّا ذاكَ ، لا نَكادُ نَسْتَيْقِظُ حَتَّى تطلع الشَّمْسُ .

قالَ : فَإِذا اسْتَيْقَظْتَ يا صَفْوان فَصَلِّ ! ....

ـ رَواهُ ابو داود وَ إبْنُ ماجَة ، حَديثٌ صَحيحٌ.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (أَيُّما إمْراةٍ ماتَتْ زَوْجَها عَنْها راضٍ ، دَخَلَتِ الجَنَّة) .

ـ رَواهُ الترمذى ، حَديثٌ صَحيح.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمينَ وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیمانداران و خوداناسانی بەڕێز: ئەمشەویش لە زنجیرە باسەکەماندا بە ناونیشانی: **﴿ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشە و موشکیلەم هەیە﴾**، لە خزمەت بابەتێکی تردا گرفت و موشکیلەی کەسێکی تردا ،کە ئەوموشکیلانە لەناو ئومەتی ئیسلامدا دەمێنن و ئەوەی لەزەمانی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕوویداوە، بەبێ گومان بۆیە ڕووی داوە، بۆ ئەوەی کەوا بەرچاو ڕوونی بێت بۆ هەموو ئومەتی ئیسلام کاتێك کە گرفت و موشکیلەیەکیان هاتە پێش، بگەڕێینەوە بۆ مەرجەعەکەی خۆیان، بۆ سەردار و سەروەرەکەی خۆیان، کە پێغەمبەری خودایە ﷺ..

بزانن ئەو لەو زەمەنەدا چی فەرمووە، چۆن موشکیلەکانی حەل کردووە، ئێمە کە ئەم باسانە بۆ جەنابتان، بۆ خۆمان باس دەکەین، ئەبێت لەو حەقیقەتە تێبگەین کە: پێغەمبەری خودا ﷺ هەر ڕابەرێکی ڕۆحی نەبووە بۆ خەڵك، هەر پێغەمبەرێك نەبووە لە میحراب و میمبەردا، بەڵکو بەڕاستی و بە کردەوە پێشەوابووە ، پێغەمبەری خودا ﷺ لە وەختی جەماعەتی نوێژەکاندا ئیمام بووە.. لە ڕۆژانی جومعەدا خەتیبی مزگەوت بووە.. لە کاتێکدا هێرشی دوژمن هاتووە فەرماندەی عەسکەری و سەربازی بووە..

لە کاتێکدا لەناو صەحابەکاندا دانیشتووە قازی و دادوەر بووە.. بۆیە ئەم پێغەمبەری ئێمە ﷺ ستەمە، ناڕەواییە بەرامبەری ئەگەر خەڵکێك وابزانێت هەر ڕابەرێکی ڕۆحی بووە، پەیوەندی خەڵکی داوە بەخوداوە، نەخێر، لەگەڵ ئەو کارە گەورەشدا کەوا زەمین و ئاسمانی بەیەك ئاشنا کرد، پەیامی خودای بە مرۆڤایەتی گەیاند، چارەسەری کێشەی یەك بەیەکی ئەو خەڵکەی دەکرد، بە جوانترین چارەسەر..

ئەچینە شارەی مەدینەی پیرۆز، شاری مەدینەی مونەوەرە، کە بە چوونی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ناوی مونەوەر بوو ،(یثرب)ی ناو بوو دواتر ناونرا مەدینە، یەعنی ئەگەر شار هەبێت هەر ئەوە قابیلە شاربێت، ناونرا (مونەوەر) یەعنی: بەڕاستی پرشنگدار، پرشنگی خێر و خۆشی و هیدایەت و ڕەحمەتی خودای لێوە بڵاو دەبویەوە، شاری پێغەمبەرە ﷺ، صەحابەکان لەدەوری دانیشتبوون..

ئەمجارە ئافرەتێك موشکیلەی هەیە، بەڵام بائێمەش بچینە مەجلیسەکەی پێغەمبەری خوداوە ﷺ، چونکە خۆشەویستانم، بەڕێزانم: ئیمامی (مالیك) دەفەرمووێت لە هەر شوێنێکدا باسی پێغەمبەر کراو ﷺ حەدیس خوێندرایەوە دەبێت ئینسان وابزانێت واقعەن لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ دانیشتووە، بۆیە ئێمەش لەم شەوەدا، لەم شەوی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزەدا، لەم ماڵی خودایە و لە دوای نوێژی تەراویحەوە، لەگەڵ جەنابتاندا دەچینە خزمەت مەجلیسەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ، بۆ ئەوەیش کەوا مەجالمان ببێت و ڕومان بێت بچینە خزمەتی، با دەست و دیاریەکمان پێبێت کە صەلاوات دانە لەسەر ئەو خۆشەویستە :

(اللّهُمَّ صَلی عَلی سَیِّدنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلی عَلی حَبیبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلی عَلی شَفیعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

## من کێشەم لەگەڵ مێردەکەم هەیە..

گوێبیست دەبین، خۆشەویست لە ناو صەحابەکاندا دانیشتووە لەناو مزگەوتی مەدینەدا، ئەو مزگەوتەی کە(١) یەك نوێژ تێیدا بە عیبادەتی (١٠٠٠) نوێژی ئەم مزگەوتانە خێری هەیە، صەحابەیەکی بەڕێز ئەم حەدیسە دەگێڕێتەوە ناوی (أبی سعید)ە، دەفەرموێت: (جاءَت إمرَأةٌ إلی رَسُولِ الله ﷺ وَنَحنُ عِندَهُ)،واتە: ئێمە هەموومان

لە خزمەتی پێغەمبەری خودادا ﷺ دانیشتبوین، بە هەموو صەحابەکانی ئەو کاتەوە، ئافرەتێك بە حەیا و حورمەتەوە هاتە ناو مەجلیسی پێغەمبەرەوە ﷺ..

سەیری ئەوانەی دەڵێن ئیسلام ئازادی نەداوە بە ئافرەت، یان ئافرەتی مەحروم کردووە، یان ئیسلام هەر دینی پیاوانە، بە پێچەوانەوە، وەرن گوێ بگرن ئافرەتێك بێتە مزگەوتی پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەم هەموو گەورە پیاوەی صەحابە لە خزمەت فەخری عالەم، ڕەسولی ئەکرەم ﷺ دانیشتوون، ئافرەتەکە دێت و خۆی دەناسێنێت و سەلام دەکات و دەڵێت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ (زَوجی صَفوان بن المُعَطّل)،

واتە: ئەی پێغەمبەری خودا من خێزانی پیاوێکم ناوی (صَفوان بن المُعَطّل) صەحابەی پێغەمبەرە ﷺ، ئەی پێغەمبەری خودا من سێ کێشەی گەورەم هەیە، سێ موشکیلەم هەیە، سەیری ئەم ئافرەتە ژیرە، نەچووە بۆ ماڵی باوکی بگێرێتەوە، نەچووە بۆ خوشکەکانی باس بکات، نەچووە بۆ دەر و دراوسێکانی لەبەر دەرگا باس بکات، هاتووە ئەو شوێنە دەدۆزێتەوە کە حەلی موشکیلەکەی لێدەبێت، ئافرەتی وا هەیە لەگەڵ ڕێزمدا کە موشکیلەیەکی دەبێ لەبەر دەرگا هەموو دراوسێکان و هەموو خەڵکی تێ دەگەیەنێت، بەڵام ئەمە نەك هەر سودی پێ ناگەیەنێت، زیاتر قوڕەکەی بۆ خەست دەکاتەوە، زیاتر کێشەی بۆ گەورەتر دەکات، هەریەکە بە لایەکدا بوختانێکی بۆ هەڵدەبەستێت، ئەم دێتە ئەو جێگایەی کە چارەسەری گرفتەکەی بۆ دەکات، کە پێغەمبەری خودایە ﷺ، دێت و دەڵێت ئەی پێغەمبەری خودا من سێ موشکیلەم هەیە، بزانین ئەم سێ موشکیلەی ئەم ئافرەتە چیە؟! دەڵێ:

یەکەم گرفتم لەگەڵی ئەوەیە: (يَضْرِبُني إِذا صَلّيتُ)،واتە: هەر وەختێك کە نوێژ دەکەم لێم دەدات..ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، بەڕاستی ئەمە موشکیلەیەکی گەورەیە، نوێژکردن گەورەترین عیبادەتی خوا، گەورەترین کات ئەو کاتەیە کە ئینسان لە نوێژدایە، پێغەمبەری خودا کەلە نوێژدام ئەم (صفوان)ە دێت لێم دەدات، نوێژەکەم لێ دەبڕێت، نایەڵێ نوێژەکەم تەواو بکەم!!

دووەم گرفتم ئەوەیە: (وَ يَفطرني إِذا صُمْتُ) ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من بەرۆژووم، ڕۆژوو ئەو عیبادەتە گەورەیە کە پێغەمبەری خودا دەفەرموێت ﷺ :(مَن صامَ يَوماً فِي سَبيلِ الله) کەسێك لە پێناو ڕەزامەندی خودای گەورە ڕۆژوویەك بگرێت نەفسی خۆی بشکێنێت، خوای پەروەردگار (٧٠) ساڵ لە ئاگری جەهەنم دەم و چاوی دوردەخاتەوە، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من دەمەوێت (٧٠) ساڵ ڕێگا لە ئاگری جەهەنم بەدووربم، پەنام بۆ عیبادەتی ڕۆژوو بردوە بەڵام وەڵاهی کە ئەم پیاوە دێتەوە بە زۆری زۆر داری ڕۆژوەکەم پێ دەشکێنێت، نایەڵێت ڕۆژوەکەم بەرمە سەر! !

سێهەمیان (وَلا يُصَلي الفَجْرَ حَتى تَطْلِعَ الشَمْسُ) وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم پیاوە نوێژی بەیانی ناکات هەتا ڕۆژ هەڵنەیەت، پشتە سەری گەرم نەکات ئەم پیاوە هەڵناسێت نوێژی بەیانی بکات، دەی نوێژی بەیانی کاتی بەرەکەتە، هەر کەسێك نوێژی بەیانی لە کاتی خۆیدا بکات لە زەمانەتی خوای پەروەردگاردایە، کەسێك خوای پەروەردگار ڕەحمی پێبکات نوێژی بەیانی لە مزگەوتدا بکات، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: (مَن صَلى الصُبحَ فِي جَماعَةٍ فَكَأنما قامَ نِصفَ اللَيلْ)،واتە: هەر کەسێك نوێژی بەیانی بە جەماعەت لە مزگەوتدا بکات ئەجر و پاداشتی ئەو کەسەی هەیە کە شەو بکەی بە دوو بەشەوە نیوەی سوجدەی برد بێت لە شەو نوێژدا، (سبحان الله)! !

بە دوو ڕکەعاتی نوێژی بەیانی، خۆ ئەو کەسە ئەگەر نوێژی عیشاشی بە جەماعەت کردبێت وەکو ئەو کەسانە حیسابی بۆ دەکرێت لای خودا، کە ئەو شەوە بەس لەسەر بەرماڵ بووە، نەنوستووە، تۆ بە نوێژی عیشای جەماعەت و نوێژی بەیانی بە جەماعەت لە مزگەوتدا کردبێت، لە ئەهلی ئەو کەسانەی کە ئەو شەوە نەچوبێتە سەر سەرین، بەس لە شەو نوێژدا بوو بێت، (سبحان الله) ئەم دینە چ ئاسان کاریەکە،

بەڵام ئەی پێغەمبەری خودا ئەم پیاوەی من، ئەم مێردەی من، هەتا هەتاو سەری گەرم نەکات، هەڵناستێت نوێژبکات، ئەوە خەفەتێکی گەورەیە بۆ من، ئافەرین بۆ

ئافرەتی ئەو زەمانە، لە جیاتی موشکیلەی، هەموو هیوا و ئاواتی، کەوانتەرەکەی وابێت و.. مەعرەزەکەی وابێت.. دیکۆری خانووەکەی وابێت.. بیری قیامەتی هەیە، ئا ئەم ماڵۆچکەیەی دونیا لە پێناوی ئەم دوو سێ ڕۆژەدا، ئەو قیامەتە گەورەی لە بیر نەچۆتەوە، وەڵاهی ئەمە موشکیلەیە، وانیە بەڕێزان؟!

ئەی پیاوێك نەیەڵێت ژنەکەی نوێژ بکات، نەیەڵێت ڕۆژوو بگرێت، هەڵنەستێت لەکاتی خۆیدا نوێژی بەیانی بکات، بەڵام حیکمەتی پێغەمبەری خودا لە چیدایە؟!

دەفەرموێت: ئەرێ (صفوان) کوا؟ ئەڵێن: وەڵا (صفوان) ئا ئەوەتا بۆ خۆی دانیشتووە، ئەوە خۆشی گوێی لێیەتی بەردەوام، لە خزمەت پێغەمبەردایە ﷺ، ئەم پیاوە (سبحان الله) لە کاتی نازڵبوونی قورئاندا لەوێیە، صەحابیە ، دەی پێغەمبەری خودا ﷺ یەکسەر بڕیار نادات، ئەها ئێمە جاری واهەیە یەکێك دوو فرمێسك دەڕێژێت دەڵێین بەخودا ڕاست دەکات، نا ئەبێت گوێ لە بەرامبەرەکەی بگریت، بزانیت ئەویش بەرگری لە خۆی دەکات، چونکە دادوەر وایە، کەوتی وا ،تۆ یەکسەر بڵێیت قوربان ڕاست دەکەیت ، دەفەرمووێت ئەی (صفوان)؟! دەڵێن : ئا ئەوەتا ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، (وَ صَفوان عِنْدَهُ) لەحەدیسەکەدا دەفەرمووێت (صفوان)یش لە خزمەتی پێغەمبەری خودا دانیشتبوو، (فَسَألَهُ عَمّا قالَتْ) فەرمووی وەرە (صفوان) ئەمە دادگایە، ئەم ژنە سێ شەکوای گەورەی لەتۆ هەیە سێ موشکیلەی گەورە فەرمووی تۆش بەرگری لەخۆت، بکە بۆ وادەکەیت؟!

## منیش سێ کێشەم هەیە لەگەڵ خێزانەکەم..

(قالَ یا رَسُول الله ﷺ ) ئەی پێغەمبەری خودا، منیش مەجالی قسەکردنم هەیە؟ فەرمووی: ئەی چۆن! فەرمووی: دەتۆش گوێ بگرە، (أما قَولُها) یەکەم خاڵی:

من یەك یەك پێیاندا دێم ئەو کە پێم دەڵێت (یَضرِبُني إذا صَلَّیتُ) کاتێك نوێژدەکەم نایەڵێت و دارکاریم دەکات، نایەڵێت نوێژەکەم بکەم، سواری شان و ملم دەبێت و لەچکەکەم لادەبات، نایەڵێت.. وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەم نوێژ دەکات

(فَأنها تَقْرَأُ بِسُورَتَينِ وَقَدْ نَهَيتُها) نوێژ دادەبەستێت سورەتی (فاتحه) لەسەر چاومە و فەرزە، دەست پێدەکات سورەتێکی تر لە قورئان دەخوێنێت، دەڵێم باشە سورەتێکت خوێندووە دەبچۆ بۆ ڕکوع، وەلاَ سورەتێکی تریش بەدوایدا دێنێت، حەزی لە نوێژێکی درێژە، وامن چاوەڕێم ئەو بێتە ناو جێگاوە، ئەم لە نوێژ نابێتەوە، وەلاَ لە داخان هەڵدەستم لەچك و مەچکی لێدەکەمەوە..

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ یەك سورەت بخوێنێت بەسە، بابە (فاتیحە) و (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ ﴿١﴾) یەك، تۆ بۆ سورەتی (البَقره) دەخوێنیت؟! من واچاوەڕێم لە ناو جێگادا تۆ بۆ ئەم سورەتە وادرێژ دەکەیتەوە؟! بە خودا نایەڵم ئەو نوێژە درێژە بکات، لە ناو ماڵی مندا، سەیری ئەمیش بەڵگەی پێیە، بزانین پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەم دادوەرە حەقانیە، ئەم تەرازوە عەدلەی پێیە،ئایا دەفەرموێت: دەك خوا بت گرێت..

باشە هەرکەس یەك سورەتی قورئان، یەك پیتی قورئان، هەرکەسێ بڵێت: (الٓمٓ) سی چاکەی بۆ دەنوسرێت، یەك پیت بە دەچاکە، ناڵێم (الٓمٓ)، یەك پیتە هەر (الٓمٓ ﴿١﴾ ) ئەوەڵی سورەتی (البَقَرَه) خودا سی چاکەی بۆ دەنوسێت، دەڵێیت:

(بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم) خودا سەد و نەوەد چاکەت بۆ دەنوسێت.. دەڵێی بگەڕێ با چاکەتان زۆر بێت، هەی بێ تەماع بۆ قیامەت، هەی تەماع باز بۆ ماڵی دونیا، نا، پێغەمبەر ﷺ وانافەرموێت، بەڵکو ڕودەکاتە ژنەکە و دەفەرموێت:

خوشکی خۆم (لَو كانَت سُورةً واحدة لَكَفَت الناسُ) وەلاَهی ئەگەر ئەم قورئانە یەك سورەتی بچکۆلانە بوایە، بەس بوو بۆ خەڵکی، لەبەر ئەوە تۆ حەقت نیە، تۆ ئەم مێردە چاوەڕوانت دەکات لەناو جێگا، ئەم سورەتە درێژانە دەخوێنی، یەك سورەت بخوێنەوە بەسە، کەواتە مێردەکە لەوەیا ڕاستدەکات بۆ ئەم نوێژە درێژە دەکەیت؟!

ئەگەر ئەم قورئانە یەك سورەت بووایە بەسمان بوو، چونکە ئێستا ئێمە لە تەراویح داین،هی واهەیە بەنوێژێ نیو سەعاتی پێدەچێ، باوەڕتان بێت دوو ئایەت بخوێنی، بەڵام

هۆشت بە سەریەوە بێت باشترە، چونکە ئەو ئایەتە هێندە پڕ بەرەکەتە، ئەگەر قورئان بەس هەر ئەو ئایەتە بوایە بەسمانی دەکرد، چونکە کەلامی (رَبُّ العالَمين)، یەك وشەی خودا بۆ هەموو ئومەتەکە کافیە، ئەوە لە ڕەحمەتی خودایە، ئەوە لە ڕەحمەتی خودایە ئەو بەرەکەتە گەورە، ئەم قورئانە کاملەی بەسەردا باراندووین، فەرمووی: خاڵی یەکەم خەتای تۆیە کچم، خوشکم (وَأما قَولُها) وتی دەی قوربان مەجالم هەبێت ڕەدی قسەی دووەمیش بدەمەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی:

(وَ يُفطِرُني إذا صُمتُ) وەلاّ ڕۆژوەکەم دەشکێنێت، بە زۆر ئاو دەکات بەقوڕگمدا کە بە ڕۆژوم، ڕۆژووی سونەتە.(فَأنَها تَنطَلِقُ تَصُومُ) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ژنەی من زۆر حەزی لە عیبادەتی ڕۆژووە، (وَ أنا رَجُلٌ شابٌ) من کوڕێکی گەنجم تاقەت وتوانام زۆرە (فَلا أصبِرُ) شەو ڕۆژم بۆ نیە، من ڕۆژ دێمەوە دەڵێم بۆم پاڵکەوە، دەڵێ وەلاّ بە ڕۆژووم، ئاوەکە دەکەم بەناو قوڕگیدا هەتا ڕۆژۆکەی پێ دەشکێنم..

(وَلا أصبِرُ) من تاقەتم نیە ڕاوەستم هەتا ئەو بەریانگ دەکاتەوە ڕۆژۆکەی دەشکێنێت، (أنا رَجُلٌ شابٌ) من پیاوێکی گەنجم من بە توانام، سەیری دیفاع لە خۆی دەکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

(لا تَصُومُ المرأةُ إلا بِإذنِ زَوجِها) کچی خۆم، خوشکی خۆم، وەلاّهی ژن بۆی نیە ڕۆژوی سونەت بگرێ مێردەکەشی ئاوا موشتاقی بێت، ئیلا دەبێت مێردەکەی ڕازی بێت، واتە لە مەشیاندا تۆ خەتاتە.. ئەها پێغەمبەر ﷺ ئاوا ئاڵێت: وەلاّهی حەقی خۆی بوو چۆن ڕۆژووی پێ دەشکێنێت..

ئەمە تەرازووە لێرەدا ئەم پیاوە، حەقی ئەم نەفسە پێش حەقی خودا دەکەوێت، چونکە ڕۆژووی ڕەمەزان ئەوە کەس مافی نیە، بەلاّم کە چووە سەر ڕۆژووی سونەت نابێت حەقی خەڵك لەگەڵ حەقی خوادا لە پێناوی حەقێکی خودای گەورەدا حەقی خەڵك پێشێلبکەیت، عیبادەت وایە، ئەم دینە ئەوە جوانیەکەیەتی، ئەوە جوانی ئەم دینەیە کە

مافی کەس پێشێل ناکات..وتی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ قەولی سێیەمی ژنەکەم کە دەڵێت:

(إنّي لا أُصلي حَتى تَطلَعُ الشّمسُ) هەتا ڕۆژ هەڵنەیەت نوێژی بەیانی ناکات (فإنّا أهلَ بيتٍ قد عَرَفتَ عَنّا ذاك) ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خۆت بنەماڵەی ئێمە چاك چاك دەناسیت، (لا نَكادُ نَستَيقِظ حتى تَطلَع الشّمسُ) بە خودا ئێمە لە باو باپیرمانەوە وامان هێناوە، هەزار ئیشمان هەبێت، تا هەتاو هەڵنەیەت لە خەو هەڵناسین، بە خودا ئێمە بەو مەرجە مسوڵمان بووین.. تاقەتی نوێژی بەیانیمان نیە لە کاتی خۆیدا..

ئەها ئەمە سەرەتا مسوڵمان بوونی ئەم بنەماڵەیە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بە خودا ئێمە لە باب و باپیرانمانەوە واهاتووین هەزار ئیشمان هەبێت، بازرگانیمان هەبێت، دەستمان لە ناو ئیشدا بێت، هەتا ڕۆژ هەڵنەیەت تاقەتمان نیە بەو بەیانیە زوەی کە تۆ دەڵێیت هەستین نوێژی بەیانی بکەین، بە خودا من عادەتی خۆم تێك نادەم ..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی (فإذَ استَيقَظتَ يا صفوان فصَلّ)، ئەی (صفوان) گیان، لە مەودوا هەرکاتێك بە خەبەریویەوە، نوێژی بەیانیەکەت بکە، مەیبەرە لای نیوەڕۆ بڵێی نیوەڕۆ دەیگێڕمەوە، هەر کە خەبەرت بویەوە هەستە نوێژەکەت بکە، بەڵام مەیکەیەنەرە هەتاو هەڵهاتن، (فإذَ استَيقَظتَ) قەیناکە من ناڵێم وەرە بۆ نوێژی بەیانی، من ناڵێم وەرە بۆ جەماعەت، من ناڵێم سەعات سێ و نیو نوێژ بکە، قەیناکە هەستە سەعات پێنج نوێژەکەت بکە، کە خەبەرت بوویەوە..

ئەها پێغەمبەر ﷺ لەبەر چاوی ژنەکەی زەمی مێردەکەی ناکات، با ئەمجا ئەمیش داشی بەسەری دا سوار نەبێت، بڵێت: ئەها پێغەمبەری خودا ﷺ چی پێ وتی، نا با ئەم خێزانە کەسێك نەکەوێتە بەینیانەوە، کوڕی خۆم هەر کاتێك کە خەبەرت بوویەوە نوێژی خۆت بکە، لەوە زیاتر لەسەری ناڕوات، جا سەیری پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمە موشکیلەی ئەم ژنە بوو، ژنە کە وتی: ئاوا ئەی پێغەمبەری خودا؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئاوا یەك سورەتی بچکۆلە بخوێنە و خێرا حازربە بۆی، ئەگەر حەزی لێبوو بەڕۆژوویە، کە هاتەوە بڵێ ئەگەر تۆ ئارەزووی من بکەی بڵێ من  بە ڕۆژوو نیم، کێشەکە کۆتای هات، پیاو و ژنە دەستی یەکتریان گرت و بەخێر و خۆشی چونەوە ماڵەوە، ڕەحمەتی خودا بەسەریان باری..

ئا لێرەدا ئێمە لەوە تێدەگەین کە زۆر ژن هەیە خودا پەرستە بە حیساب، خودا پەرستێکی ئارەزووانە، دین ئەو دینەیە کە بەڕێبازی پێغەمبەری خودا ﷺ جێبەجێ بکرێت، زۆر ژن هەیە زیکری خوا دەکات، تەسبیحات دەکات و سلاوات لێدەرە، شەو نوێژ کەرە، کەچی ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو سەرەی بە خۆشی نەبردە سەر سەرینی هاوسەرەکەی، دە بە خودا ئەمە لە دینی ئیسلامدا جێی نابێتەوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ حەدیسێکی هەیە بۆ خوشکان و دایکانی بەڕێز موژدەیەکی گەورەیە: (المرأةُ إذا صلت خَمسَها) هەر ژنێك پێنج فەرزەی نوێژی کرد، نوێژ بەس پێنج فەرزەکەی کرد، (وصامَت شَهرَها) لە ساڵەکەدا بەس مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بوو، (وَأحصنَت فَرجَها) داوێن پاك بوو، خیانەتی هاوسەری نەکردبوو، دەستی بە نامەحرەمێك نەکەوتبوو، جگە لە مێردەکەی خۆی (وَ أطاعت زَوجَها) گوێڕایەڵی مێردەکەی بوو، ئەو مێردەی چی بگوتایە دەیووت بەسەرچاو پیاوەکە تا دڵی تۆ ڕازی نەکەم ناچمە سەر سەرین، (فَلتَدْخُل مِن أي أبوابِ الجَنةِ شاءت) لە ڕۆژی قیامەتدا بانگ دەکرێت:

ئەی ئەو ژنەی، ژنی فلان کەس، کە پێنج فەرزەی نوێژت بە ڕێك و پێکی دەکرد، مانگی ڕەمەزانان بە ڕۆژوو دەبوویت، گوێڕایەڵی مێردی خۆت دەکرد و مێردەکەت گەلێك لێت ڕازی بوو، ئەی ئەو ژنەی زۆر داوێن پاك بوویت، قەت دەستی نامەحرەمت، خیانەت کارێکت بەردەست نەکەوت، ئەوە هەر هەشت دەرگای بەهەشتت بۆ کراوەتەوە لە کامیانەوە ئارەزووت لێیە بڕۆرە ژورەوە..

بە خودا ئێمەی پیاوان هەزاران پرسیارمان لێ دەکرێت، دیفاعت لەم دینە کردوە؟! جیهادت نەکردووە؟! بانگەوازت نەکردووە؟! ئەمرت بەچاکە نەکردووە؟! نەهیت لە

خراپە نەکردووە؟! نەهاتووی بۆ نوێژی جەماعەت؟! نەهاتووی بۆ نوێژی جومعە؟! نەچووی بۆ حەج؟!

بەڵام ئافرەتان ئەم پرسیارانەیان نیە، پێنج فەرزەی نوێژ، ڕۆژوی ڕەمەزان، گوێڕایەڵی مێرد، داوێن پاکی، هەر هەشت دەرگای بەهەشت بۆ تۆ کراوەتەوە، فلاَن کەس بڕۆرە ژورەوە.. بەڵام بە داخەوە هەیە پێنج فەرزەی نوێژ و شەو نوێژیش و ڕۆژووی دووشەمان و پێنج شەمانیش دەگرێت، بەڵام (وَ أطاعَت زوجَها) نیە، ئەو مێردەی قسەیەکی خۆشی لێ نابیستێت، ئەو مێردەی ڕویەکی خۆشی لێ نابینێت، ئەمە لە دینی ئیسلامدا جێی نابێتەوە..

ئەو بەسەرهاتەی کە باسمان کرد، ئەو دایکە، ئەو خوشکە بەڕێزە بوو لەخزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ موشکیلەی حەل بوو ، پێی وتین ئیسلامی ئێمە ئیسلامی دونیایە، ئیسلامی قیامەتە، ئیسلامی مزگەوتە، ئیسلامی ناو ماڵە،ئیسلامی سەر بەرماڵە، ئیسلامی سەر جێگای ژن و مێردایەتییە، بە هەمووی ئیسلام دەبێت، بە هەموویەوە لە خزمەت دینەکەدا بین.. تا شەوێکی تر و باسێکی تر و موشکیلەیەکی تر لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ هەموو لایەکتان بە خودای گەورە دەسپێرم .

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم و رَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ)

## وانەی چوارەم:

## هاوسەرەکەم بژێوی ژیانمان دابین ناکات .

* عَنْ عائيشَةَ رَضي اللهُ عَنْها قالَتْ : قالَت هِنْدُ إمْرأةُ أَبي سُفيان : يا رَسُولَ الله : إنَّ أَبا سُفيان رَجُلٌ شَحيحٌ ولَيْسَ يُعْطيني ما يَكفيني وَولَدِي إلاّ ما اخَذْتُ مِنْهُ وَ هُوَ لا يَعْلَمُ ، فَقالَ : خُذي ما يكفيكِ وَوَلَدَكِ بالْمَعروُف. ـ رَواهُ البُخاريُّ : (٥٣٦٤) وَ مُسْلِم: (١٧١٤/ ٧) .

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ البَقرة : ٢٣٣.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَ كِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعروُف). ـ رَواهُ مُسْلِم : ١٢١٨.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (كَفَى بالْمَرْءِ إثْماً انْ يضيعَ مَنْ يَقُوت). ـ رَواهُ احمد : ٦٤٩٥ . إسْنادُهُ حَسَن ، وَ صَحَّحَهُ الألْباني ـ صَحيح الترغيب ـ : ١٩٦٥.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (دينارٌ انْفَقْتَهُ في سَبيلِ اللهِ ، وَ دينارٌ انْفَقْتَهُ في رَقَبَةٍ ، وَ دينارٌ تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلى مِسكينٍ ، وَ دينارٌ انْفَقْتَهُ عَلى اهلِكَ ، اعْظَمُها اجْراً ، الّذي انْفَقْتَهُ عَلى اهْلِكَ). ـ رَواهُ مُسْلِم .

* قالَ رِسُولُ اللهِ ﷺ : (إذا انْفَقَ الرَّجُلُ عَلى اهْلِهِ نَفَقَةً ، وَهُوَ يَحْتَسِبُها كانَتْ لَهُ صَدَقَةٌ). ـ رَواهُ البُخاري وَ مُسْلِم.

* وَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً ، تَبْتَغي بِها وَجْهَ اللهِ ، إِلَّا أُجِرتَ عَلَيْها . بِها. حَتَّى ما تَجْعَلُ في فِيِّ امْرَأتِكَ). ـ رَواهُ البُخاري : ٥٦، وَمُسْلِم : ١٦٢٨.

* عَنْ عِرْباض بنِ سارِيَةَ ، قالَ ، قالَ رَسُولُ للهِ ﷺ : (إذا سَقَى الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ الماءَ أجِر) قالَ عِرْباض : فَأَتَيْتُها فَقُمْتُ إِلَيْها ، فَسَقَيْتُها وَاَخبَرْتُها بِما سَمِعْتُ) .

ـ رَواهُ احمد في المُسْنَد : ١٧١٥٥، وَ حَسَّنَهُ الألْباني في الصَّحيحَة : ٢٧٣٦.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إِنَّ اعْظَمَ الصَّدَقَةِ لُقْمَةٌ يَضَعَها الرَّجُلُ في فَمِّ زَوْجَتِهِ) .

ـ رَواهُ البُخاريُّ وَ مُسْلِمْ .

سەرچاوەکان :

١) زەواج لە قورئان و فەرموودەصەحیحەکاندا ، محمد مەلا فائق ، ل١٤٥ ، ١٤٦ .

٢) ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر ، محمود مهدی إسلامبولی ، و : ئەوا محمد سعید ، ل١٧١ ، ل١٦٩ .

٣) پوختەی فقهی ئافرەتان ، ئەبو بەکری صدیقی ، (٤١٩ ـ ٤٣٠) .

٤) پایزە برا ، مەلا ئەحمەدی شەریعە ، ل٢٨ ،ل٣٠ .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیمانداران و خوداناسانی بەڕێز: ئەمشەویش دەچینەوە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ لە زنجیرە باسەکەماندا بە ناوی ﴿**ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشە و گرفتم هەیە**﴾، سەردەمی سەعادەتەو زەمەنی بەختەوەریەوە، زەمەنی بەختەوەری ئەو کاتەی کە وەحی ئاسمان ڕاستەوخۆ دەهاتە سەر ئەم زەویە..

پێغەمبەری خودا لە ناو صەحابەکاندا بوو.. چەند بەختەوەربوون ئەو صەحابانەی پێغەمبەری خودایان ﷺ بە چاوی سەریان بینیبوو.. ئومێدەوارم کە (إنشاء الله) ئێمە کە نەگەشتووینەتە زەمەنی پێغەمبەر ﷺ ئێمە کە هەزار و چوارسەد و ئەوەندە ساڵە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوداش ﷺ هاتووینەتە سەر ئەم زەویە، لەو کەسانە دەبین کە پێغەمبەری خودا ﷺ خۆزگەی خواستووە کە براکانی ببینێت، صەحابەکان فەرموویانە: ئەی ئێمە برای تۆ نین، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟!

فەرمووی: ئێوە هاوەڵی منن، ئێوە هاوڕێیاز و هاوسەفەری منن، ئێوە هاودەمی شەوان و ڕۆژانی منن، ئێوە ئەو کەسانەن هەموو کاتێکتان لەگەڵ مندا دەژین، بەڵام براکانم، خوشکەکانم، ئەو پیاو ژنانەن لە ئومەتم بە چاوی سەر منیان نەبینیوە، هەزاران ساڵ کەوتۆتە نێوان من و ئەوانەوە، بەڵام ئەوەندە بە یەقین و دڵنیایەوە ئیمانیان پێ هێناوم، کاتێك فەرموودەیەکی من دەبیستن، وادەزانن بە چاوی سەر دەمبینن، ئەوانە برای منن، ئەو ئافرەتانەش خوشکی منن، ئەوە ئێمە (إنشا الله) ئەو شەرەفەمان گەورەمان پێ براوە کەلە برایان و خوشکانی پێغەمبەر ﷺ دەبین..

ئەمشەویش دەچینەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، لە مزگەوتی مەدینەدا دانیشتووە و صەحابە بەڕێزەکان لە خزمەتیدان، ئێمەش بۆ ئەوەی ئەو مەشهەدە ببینین، بزانین ئەمشەو کێ موشکیلەیەکی هەیە، بزانین ئەو موشکیلەیە ئەمڕۆ لە ناو خێزانەکانی ئێمەدا ڕووی داوەتەوە؟! بەبێ گومان بەڵێ، دەچینەوە خزمەتی و وەکو سەلام کردنێك لە خزمەت پێغەمبەری خودادا ﷺ، ئێمە سەلاواتی بۆ دەنێرین و دەڵێین:

(اللّٰهُمَّ صَلی عَلی سَیِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلَّم)

(اللّٰهُمَّ صَلی عَلی حَبیبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلَّم)

(اللّٰهُمَّ صَلی عَلی شَفیعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلَّم)

## مێردەکەم ڕەزیلە

ئافرەتێك داپۆشراو، بە حەیا و حورمەت، دێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، ئافرەتێك کە پێویستی بە خۆ ناساندن نیە، ناڵێت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من فلان کەسم، چونکە کەسێك نیە لە ناو شاری مەدینەدا و لە ناو شاری مەککە و لە دەوروبەریدا ئەم ئافرەتە نەناسێت، ئافرەتێکی ناسراو ،کە لە کاتی جەنگدا ڕۆڵی پیاویشی بینیوە، ئەو ئافرەتەش (هند) بوو (هند)، ئەو ئافرەتەی لە جەنگی (ئحود)دا جەرگی حەزرەتی (حَمزَە)ی دەرهێناوە.. بەڵام لە دوایدا (سبحان الله) لە دوایدا مسوڵمان بوو ، بوو بەیەکێك لە شێرە ژنانی ئیسلام..

زۆر دوژمنی پێغەمبەر بوو ﷺ، بەڵام دواتر (١٨٠) پلە ژیانی وەرچەرخا، بوو بە یەکێك لە خۆشەویستانی پێغەمبەر ﷺ ، ئەم ئافرەتە خێزانی یەکێك لە سەرکردەکانە، یەکێك لە پیاوە ناودارەکانە یەکێك لە پیاو ماقوڵانی شاری مەککەیە، وە پاشانیش لە سەردەمی ئیسلامدا یەکێکە لەو کەسانەی کە خەزوری پێغەمبەرە ﷺ، ئەم (هندە) ژنی ئەبوو (سوفیان)ە (أبوو سوفیانی إبن حَرب) جەنابتان زۆرتان ناوتان بیستووە..

دێته خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ، ژنی ئەم پیاوە گەورە، ئەم ئافرەتە ناودارە، بزانین موشکیلەی چیە؟! خۆشەویستان دەڵێت: (یا رَسول الله) ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا پێغەمبەر ﷺ دانیشتووە، شەکواکەی ئا ئەمەیە:

(إنَّ أبا سُفيان رَجُلٌ شَحيحٌ) ئەی پێغەمبەری خودا ئەبو سوفیانی هاوسەرم پیاوێکی چروکە، زۆری پارە خۆشدەوێت، (وَ لَيسَ يعطني ما يَكفيني وَ وَلَدي) بەخودا قەت ئەوەندە پارەمان ناداتیٚ، قەت ئەوەندە کەل و پەل و زەخیرەمان بۆ ناکڕێت، کە دەچێت بۆ سەفەر هیچ پارەمان بۆ جێناهێڵێ..

ئاخر من ئافرەتێکم کۆمەڵێ منداڵم هەیە، ئاخر میوانێك ڕومان تێدەکات، ئاخر پێویستیەکمان دەبێت، ئەم (أبو سوفیان)ە زۆر پارە خۆشەویستە، هەشێتی، بونیشی هەیە، کەچی وەلاهی پیاوێکی چروکە، (إلا ماأخذتُ منهُ)، بەلاَم من کێشەکەم لەوەدایە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ناچار بووم، لە ناچاریدا جاری واهەیە بە دزیەوە پارە لە گیرفانی ئەو دەردەهێنم، (وَ هوَ لا يعلَم) ئەویش نازانێت، پارەکانی زۆرن هەر هەستیش ناکات، چەندم لە پارەکانی دەرهێناوە..

بەلاَم بە خودا ناچاری کردم بە دزی ئەوەوە پارە دەربهێنم، چونکە خۆی ئەوەندە پارەمان بەش نادات کە بەشی من و منداڵەکانم بکات، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئایا ڕەوایە؟! ئایا چیبکەم من ناچارم ناچارە؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی (خُذي ما يكفيكي وَ وَلَدِه بِالمَعروف ) خوشکی خۆم کچی خۆم لە مەودوا بۆت هەیە پارە لە گیرفانی (أبو سوفیان)ی مێردت دەربهێنی بە قەدەر ئەوەندەی کە کیفایەتی ژیانی خۆت و منداڵەکانی (أبو سوفیان) بێت، ئەها منداڵەکانیش هەر هی تۆ نین، هی ئەویشن، تۆ ئەوانیش بەخێو دەکەیت، (بالمعروف) بەلاَم ئاگات لێی بێت، بە چاکە، بەلاَم ئاگات لێی بێت لە مەعروفدا پارە لە گیرفانی دەربهێنیت، (بالمعروف) یەعنی چی؟! یەعنی:

یەکەم: زیادە مەسرەف نەکەی، ئەو پارەیە تۆ بچی ئەو پارانە دەربهێنی کۆمەڵێ کەمالیات و شتی زیادەی ناو ماڵی پێ بکڕی، وەلا فلان دراوسێمان ژنەکەی ئەوەی کڕی و منیش فریا بکەوم بچم خێرا بیکڕم، بەلام ئەو مێردەی ئەوەندەی پارەی ناداتێ، بەلام تۆ بچی بیدزی، ئەوەیان (بالمعروف) نیە، نەفەقاتی ڕۆژانەی پێویستی ژیان بێت.

دووەم: ئاگات لەواریدات وداهاتی مێردەکەت بێت. (بالمعروف) ئەوەیە: تۆ چاوت لێی بێت، کابرایەك ڕۆژی (١٠) وەرەقەی دەستکەوێت، ئەمیش لە مانگێکدا (٢) وەرەقەی دەست دەکەوێت، نابێت تۆ وەکو ئەوەی (١٠) وەرەقەی دەست بکەوێت مانگانە ڕەفتار بکەی، (بالمعروف) ڕەفتار بکە بە چاکە..

سێهەم: بزانە بە دز نەناسرێیت، ئەم پیاوە هەر پارە خۆشەویستە، بەلام بوختان کەر نیە، ڕۆژێك ئەگەر لێت ئاشکرابێت نەچێت یەکسەر تەلاقت بدات، حەیات بەرێت، موشکیلەیەکی گەورەتر ڕوویدات، ئەها ئێمە دەبێت لەم حەدیسانەوە وریا بین، وشەی (بالمعروف) لە حەدیسەکەدا هەیە، یەعنی: ژنێك ئێستا چەند ژن هەبووە باسی شەکوای خۆی کردووە وتویەتی: لەم زەمانەدا، بەڕاستی لێمان قەوماوە، ئەو پیاوە پارەکانی کەس نازانێت لەکوێ دایان دەنێت، موعامەلەیان پێوە دەکات چیان پێوە دەکات، ئێمە دەمێکە موحتاجین، ژنی واهەیە دەڵێت ئەگەر پێنج هەزاری مۆلیدە داوابکرێ، دەبێت بچم لە دراوسێکانی قەرز بکەم، ئەم پیاوە ڕۆژێك دە هەزار دانانێت..

بڵێ: ئەگەر ڕۆژێك لە ماڵ نەبووم، ئەوا میوانێکمان هات، فەقیرە ژنی واهەیە ئێستاش قەرزداری سەوزەی بازاڕی خەڵکیە، بچێت دوو دەسك کەرەوز بهێنێت، ئەم پیاوە ڕۆژێك نەیوتووە: ئەمە بیست و پێنج هەزارە بالات بێت، ئەگەر من لەماڵ نەبووم سەر بەرزانە میوانێك هات بەڕێی بکەی..

بەلام دەبێت وریا بین (بالمعروف) ئەمە پیاوی واهەیە هەر پارە خۆشەویستە، هەر چروکە، بەلام بوختان بە ژنەکەی ناکات، نەچێت سندوقەکە بشکێنێت، نەچێت قاسەکە

بشکێنێت، دوایی کابرا بیکات بە هەرا و بڵێت وەڵا (١٠) دەدەفتەر دۆلاری تێدابوو، بچێتە ماڵە خەزورانی بڵێت وەڵا ژنەکەم پارەکەی لێ دزیوم، ئەوە نەچیت بڵێیت پێغەمبەر ﷺ ئەم حەدیسەی فەرمووە، منیش وادەکەم، (بالمعروف) ئاگات لێی بێت توشی خراپە نەبیت، لەسەر ئەمە..

کەواتە: موشکیلەی ئەم شەومان کە باسی دەکەین لە زەمانی پێغەمبەر ﷺ روویدا، بریتیە لە چروکی پیاو، ئەو پیاوانەی کە نەفەقەی ژن و منداڵەکانیان بە چاکی ناکێشن، خۆشەویستان: بە تایبەتی چینی پیاوان ئەو ژنە کێی تری هەیە ئەگەر ئەم هاوسەرە نەبێت، تا لە ماڵی بابی بووە نەهاتووە دینارێك لە تۆ داوابکات، کە هاتە ماڵی تۆ و لەماڵی باب و کەس و کاری دابڕا، ئەمجا خۆ خەڵك خێری پێناکات، ئەمجا دەڵێت مێردی هەیە، ئەگەر بێوەژن بێت، هەتیو باربێت، خەڵك خێری پێدەکات، ژنی واهەیە، منداڵی واهەیە، باوکیشی هەیە، بەحیساب مێردیشی هەیە، خەڵك خێری پێناکات زۆریش بە نەداری دەژیا، چونکە پیاوەکە بەڕاستی مەسرەفی ماڵەکە ناکات، ئەم پارانە نازانم بۆ کێ هەڵدەگرێت؟! ئەوە موشکیلەی زۆرە کە بەڕاستی ئەوە گەورەترین گوناحە، پێغەمبەری ئێمە ﷺ دەفەرموێت:

(کفی بالمرأ إثماً أن يُضَيعَ من يقوت) بەسە بۆ ئەوەندەی ئینسان بەم گوناحەوە بچێتەوە بارەگای خودا، یەعنی: ئەگەر ئینسانێك هەرچی گوناحە لەسەر زەویدا نەی بێت، بەس ئەم گوناحەی بەسە بۆ ئەوەی بچێتە جەهەنم!! ئەویش ئەوەیە: نەفەقەی ماڵ و منداڵی بە ڕێك و پێکی نەکردووە، ماڵ و منداڵی ئیحتیاج و موحتاج، هەیشیەتی و بۆیان سەرف ناکات، ئەوە گەورەترین گوناحە لە شەرعدا.

خۆشەویستان دەفەرموێت ئەگەر ژنێك ژیانی ئەوەندە ناڕەحەت بوو، مێردەکەیشی هەیبوو، کەچی نەیدەدانێ دروستە لای قازی ئەم ژنە خۆی بەتەڵاق بدات بڵێت من هیچی تر ئاوا ئیدارە ناکەم، ناکرێت من نەخەڵك خێرم پێدەکات، نە ڕووم یەت جارێك دووجار لە

ماڵی باوکمی داوابکەم، ئەم منداڵە ڕەش و ڕوتانە بەکێ بەخێو بکەم، ئەمە یەکێکە لەو هۆکارانەی ژن وپیاوی پێ لەیەکتر جیا دەکرێتەوە..

(سبحان الله) ئەوەندە خاڵەکە گەورەیە، بەڵام ئەی ئەو کەسەی لە دڵێکی پاکەوە نەفەقەی بۆ ژن ومنداڵەکەی بکات، موحتاجی و ئیحتیاجیەکان دەفع دەکات، بە ڕوویەکی خۆشەوە شتیان بۆ دێنێتەوە خێرێکی زۆر گەورە دەکات..

## خەرجی بۆ ماڵ و منداڵ صەدەقەیە!

دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ لە صەحیحی موسلیمدا فەرموویەتی: موژدەی داوە دەفەرمووێ ڕۆژێ پارە کۆکرایەوە بۆ جیهادی( فی سبیل الله) بۆ سەرکەوتنی ئەم ئیسلامە، تۆ دەستت کرد بەگیرفانتدا و (١٠) هەزاریشت دا.

ڕۆژێکیش کابرایەك داوای کرد، خەڵکینە: لە ڕێی خودا کۆیلەم، جاران ئەوە هەبووە پارەم بۆ کۆبکەنەوە، بۆ ئەوەی گەردنی خۆم لە کۆیلایەتی ئازاد بکەم، خاوەنەکەم دەڵێ: ئەگەر دەفتەرێك دۆلارم بەیتێ لە کۆیلایەتی ئازاد بە، تو خوا خێرێکم پێبکەن، یارمەتیم بەن، بۆ ئەوەی گەردنم لە کۆیلایەتی ئازاد بێت، بۆ ئەوەی وەکو ئینسانێکی ئاسایی بژیم، تۆ دەست دەکەیت بە گیرفانتدا و (١٠) هەزار دەدەی بەویش، گەردنێك لە کۆیلایەتی ڕزگاری دەکەی..

فەقیرێکیش لە دەرگا دەدات.. تەق تەق، تو خودا زۆر فەقیرم، موستەحەقیشە، دەست دەکەیت بە گیرفانتدا و (١٠) هەزاریش دەدەی بەو..

(وَ دینارٌ أنفقتهُ علی أهلِك) هەر لەو ڕۆژەدا (١٠) هەزاریشت بۆ ماڵ و منداڵەکەت سەرف کردووە بە هەر پێداویستیەکی ژیان بێت، لە میوە بێت، لە خواردن بێت، لە جل و بەرگ بێت..

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت (أعظمُهُما أجراً الذي أنفقتهُ علی أهلِك) لەم چل هەزار دینارەدا لەم چوار بەخشینەدا، ئەوەی بۆماڵ و منداڵی خۆت خەرجت کردووە، لای

خودا پاداشتی لە هەموویان زیاترە، (سبحان الله) چەند دینار ڕۆژانە بۆ ئەم ماڵ و منداڵە خەرج دەکەیت، وەڵاهی یەقینت هەبێت لەسەر تای تەرازوی قیامەتدا دەی بینیتەوە، ئەوەی بۆ ئەم مزگەوتەی دادەنێی، ئەوەش بۆ ئەو منداڵانەی خۆت خەرجی دەکەی،هی ماڵ ومناڵەکەت خێری زیاترە (سبحان الله) هیچی بە فیڕۆ ناچێت هەمووی دەچێتە تای تەرازوی خێرتەوە..

(إذا أنفَقَ الرَّجلُ على أهلِهِ نفقةً، و هوَ يَحتَسِبها كانَتْ لهُ صَدَقَه) ئیمامی (بوخاری) و (موسلیم) فەرموودەکەیان ڕیوایەت کردوە، خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموویێت: هەر پیاوێك کە خودای پەروەردگار ڕەحمی پێ کرد، ژن و منداڵی دایە، ئەمیش چوو مەسرەفی ماڵی کردن، خزمەتی کردن، بەڵام: (و هوَ يَحتَسِبُها) (سبحان الله) ئەم فەرموودە زێڕینانەی پێغەمبەر ﷺ ،یەك وشەیەك چەندین مەعنا دەگەیەنێت، (يَحتَسِبُها) یەعنی: کاتێك کە شتەکەی دەکڕی، عەلاگەکەی دەبردەوە بۆ ژن و منداڵی، لە ناخەوە خۆش حاڵ بوو، دەیوت: خودایە حەمد و سەنا بۆ تۆ، ئەوە من ئەو کوڕە سەڵتەی جارانم ئێستە ژنم هەیە، ئەو کوڕە عازەبەی جارانم و ئێستە ژنم هەیە، ئێستە خودا ڕەحمی پێ کردووم منداڵم هەیە، ئای خودایە لێت بە زیاد بێت پارەشم هەیە، لە خودا بە زیاد بێت نەفەقایان بۆ دەکێشم، مەسرف دەکەم، لە ناخەوە خۆشحاڵبوو..

نەك هی واهەیە شتەکەش دەکڕێت بەڵام دەڵێت دەك بە سندانتان بێت، کوڕە ئەمانە دەڵێی مێروون ،من پێیان ڕاناگەم، ئەوەنا، لە ناخەوە خۆشحاڵیان بکە، ئەم شتە پێشکەش بەماڵ و منداڵەکەت دەکەیت وابزانی ئەوە هەر هەمووی تۆ دەیخۆیت کە ئەو منداڵە جوانانە، ئەو ژنە بەڕێز و حورمەتدارە لە ماڵەکەتدا دەیخوات، (كانت له صدقه) ئەوە بوو بە بەخشش و بە بە خشینی ڕێگای خودای گەورە بۆت حیساب دەکات..

لە خودا بە زیاد بێت، لەبەر ئەوە پیاوی واهەیە زۆر مەسرەفی لەسەرە، دڵنیابە تۆ بەردەوام لە خێردایت، ئەگەر پیاو دەست کورت بوو هەموو ڕۆژێك نەیتوانی چەند

عەلاگەیەك بەرێتەوە، بەرێزان لەسەر سفرەیەکی بچوکدا دەتوانێت لە خواردنێکی کەمدا وابکات، مەعنەویەن بە ماڵ و منداڵەکەی ببەخشێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ (سَعدی إبن أبی وَقاص)ی لەلا بوو فەرمووی: هەر شتێك لە پێناوی خودای گەورەدا ببیەخشیت، خودای گەورە لێت قبوڵ دەکات و ئەجر و پاداشتت دەداتەوە، (حتی ما تجعَلُ فِي فِيٍّ إمرأتك) لە صەحیحی (بوخاری)دا ئەم فەرموودەیە هاتووە، تەنانەت ئەو پارووەی لەسەر سفرە هەڵی دەگریت و دەیکەیتە ناو دەمی خێزانەکەت، چ پیاوێك لە ئێمە ئەو سونەتە زیندوو دەکاتەوە، شەرت نیە تۆ مریشك و گۆشت بخۆیت، ئەمە خێزانە لەوانەیە نان و ماست بخۆیت بەڵام ئەم ژنە چەند خۆشحاڵ دەبێت، ئەم ژنە چەند بەختەوەر دەبێت، ئەگەر پیاوەکە بڵێت ئادەی ئافرەت دەم بکەرەوانێ باپاروە ناوساجی و ماستێك بکەمە دەمتەوە، ئەم ژنە خۆشحاڵ دەبێت، ئەمە مەعنەویە، ئەمە تێربوونی ڕۆحی پێدەڵێن، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی ئەو پاروەی بە دەستی خۆت دەیخەیتە ناو دەمی ژنەکەتەوە، ئەوەش خودا بە چاکە بۆت دەنوسێت، یەعنی پیاوی موسوڵمان دەبێت ئاوابێت، ئەم مەسەلانە ئێمە باسیان دەکەین، خۆزگە وەکو صەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕەفتارمان بکردایە:

(عیرباضی إبن ساریە) صەحابی بووە، دەفەرمووێت: لە خزمەت پێغەمبەری خودا بووم ﷺ، ئەم حەدیسەی بۆ خوێندمەوە: (إذا سَقى الرَجُلُ إمرأتَهُ الماء أجرٌ) فەرمووی: ئەگەر پیاوێك لەسەر سفرەیەك زانی ژنەکەی تینویەتی، بێدەنگ هەستا چوو پەرداخێك ئاوی بۆ هێنا، وتی ژنەکە ها ئەوە پەرداخێك ئاوە، شەرت نیە هەموو جارێك پیاو بڵێت ئافرەت برۆ پەرداخێك ئاوم بۆ بهێنە، قەیچێکە دەبا جارێك تۆ بۆ ئەوی بەریت..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (أجرٌ) بە قەدەر ئەو دڵۆپە ئاوانەی لەم پەرداخەدایە، خودای گەورە ئەجر و پاداشت دەخاتە تای ترازووی ئەم پیاوە کە پەرداخێك ئاوی بۆ ژنەکەی بردووە..

(عیرباض) دەفەرمووێت: کە ئەوەم لە پێغەمبەری خودا ﷺ، بیست یەکسەر چوومە ماڵەوە گەرمابوو وەکو ئەم ساتانە، چووم یەك پەرداخ ئاوی ساردم لە گۆزە بردوو بە دەمی ژنەکەمەوە کرد، وتم بە خودا زۆرت تینووە وتی بە خودا زۆرم تینوو بوو، بەس ئەمە چیە ئەم ڕەفتارە؟!

وتم: ئەو فەرموودەیەم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بیست ویستم یەکسەر جێبەجێی بکەم، ئەها صەحابەکە یەکسەر جێبەجێی کردووە، نەك هەر لە مزگەوتدا ببیستێت لە مەیدانی عەمەلدا جێبەجێی کردووە، بەلاّم کەسیش هەیە لە ژیاندا خۆشەویستان ئەم دەست کورتیە و هەژاریەش نایەڵێت، پێی خۆشەو پیاوێکی سەخیە، وەلاّهی پیاوێکی بەڕێزە، دەبێت خوشکی بەڕێزیشمان ئاگای لەوەبێت، حەزدەکات وەلاّهی سێ چوار عەلاگەی پیێ بێت، بەلاّم ئەی ئەگەر گیرفان تێیدا نەبوو، ئەی ئەگەر موچە نەبوو، ئەی ئەگەر پارە و کرێکاریەکە دەست نەکەوت، ئا لەو کاتەدا هاوار بۆ خودای گەورە بەرە، بڵێ: خودای گەورە ڕزق و ڕۆزیەکم بۆبنێرە (انشاءالله) خودای گەورە مەحرومت ناکات.

## سێ مانگ گۆشتیان نەخواردبوو..

پیاوێك دەڵێت: منداڵەکانم سێ مانگ داوای گۆشتیان دەکرد لە ساڵی نەوەدەکاندا، وەلاّهی چەند جارێك دەچووم بۆ دەرگای خەڵك بۆ قەرزێك لە دەرگاکەدا دەگەڕامەوە ڕووم نەدەهات.. لەبەر ئەوە منداڵەکانیش هەموو شەوێك دەیان گوت خەریکە کوێر دەبین بۆ گۆشت، خواردن هیچ نەبوو، ڕۆژێك دەست نوێژم هەڵگرت چومە سەر بەرماڵ، زۆر گریام، وتم: خودای أرحم و ڕاحیمین ئەی خودایە کە یەکێك لە ناوەکانت (الرزاق)ە، من هیچ دەسەلاّتم نیە، ئەم منداڵانەش نەفەقەیان لەسەر منە، دەی پەروەردگارا من هانام بۆتۆ هێناوە.. ڕزقێکمان بۆ بنێری..

فەرمووی یەك تەق و تۆق لە ئاسماندا دەستی پێکرد، وتیان وەلاّ تەقەی خۆشیە، کەسیش نەیزانی بۆ چی؟ وتی یەك مراویە کێوی– ئەمەی کە بەئاسماندا قاز و قوڵنگ

دەفڕن– یەك باوەش گۆشت کەوتە ناو حەوشەکەی ئێمەوە، لە باڵی درابوو هەر خێرا منداڵ وتیان باوکە ڕابکە.. پەلامارمدا و سەرم بڕی..

یەك دانە مەنجەڵ گۆشتی ئاژەڵی کێوی، باڵندەی کێویمان لێناو، خودای پەروەردگار دڵی خۆشکردین، منداڵ تێری لێخوارد.. دوایی زۆرم پرسی ئەم تەقەی خۆشی بۆچی بوو؟!کەس نەیزانی بۆچی بوو..!! وتم ئەم تەقەیە بەس بۆ ماڵی ئێمە دامەزرا، وەخودای گەورە لەو کاتەدا دوعای منی گیرا کردوو، خودای پەروەردگار بۆی ناردین..

## گۆشتی دەعوەتی بردەوە بۆمناڵەکانی !!

پیاوێکی بەڕێزیش باسی خۆی دەکات، نمونە بێت بۆ ئەو پیاوانەی هی واهەیە دەڕوات بۆ خۆی لە کەبابخانە تێر دەخوات، ماڵ و منداڵیش لە ماڵەوە نان و دۆ دەخۆن، یان نان و ساوەر دەخۆن، هەر بە خەیاڵیشیدا نایەت، زۆر ناچار نەبیت بەڕێزان بەبێ ماڵ و منداڵ هیچ نەخۆیت، چونکە ئەوانە نەفەقەیان لەسەر تۆ واجبە ، ئەو پیاوە بەڕێزە دەڵێت: ساڵی (١٩٩٤) بوو ئەوپەڕی گرانی، ئەم گەنجانە لەوانەیە تەمەنیان کەم بێت، بیری نەیەت، بەس بەڕاستی گرانی بوو.. دەڵێت جەژنی قوربان بوو، بە خودا سێ مانگ چوار مانگ بوو گۆشتمان نەخواردبوو.. لە ڕەمەزانیشدا گۆشتمان نەخواردبوو.. دوو مانگ و دەڕۆژی بەسەرداهات، قوربان هات وتم: (انشاء الله) جەژنی قوربانە، خەڵك حەیوان سەر دەبڕێت، بەڵام داخی گرانم ئەو گەڕەکەی ئێمە یەك کەس توانای کڕینی یەك حەیوانی نەبوو، قوربانی نەکرا، یەك پشك دابەش نەکرا..

لەو کاتەدا زۆر بەزەیم بە خۆماندا هاتەوە، ماڵ و منداڵ دایمە داوایان دەکرد، دایمە باسیان دەکرد، نەمدەتوانی بچم بۆ بازاڕ بۆنی گۆشت و کەبابیان دەکرد، ئەوە بەڕاستی هەموومان لێمان بەسەردا هاتووە، ئەم پیاوە دەڵێت: کە نیوەڕۆ چووم بۆ مزگەوت زۆر مەحزون بووم، برادەرێکی زۆرخۆشەویستم بینی وتی ئەم نیوەڕۆیە هیچ ئیشکاریەك

ناکەیت دەچین بۆ ماڵی خۆمان.. گۆشتی قوربانیمان بۆ هاتووە، برژاندوویانە پارویەك نان بەیەکەوە دەخۆین..

دەڵێت: منداڵەکانم بەبیر هاتەوە، خودایە من چۆن دەچم لەگەڵ ئەو پیاوەدا دەچم، گۆشتی برژاو دەخۆم، بەڵام سوێندی خوارد وتی نابێت دڵم بشکێنیت.. ناچار بەشوێنی کەوتم، یەکسەر سینی گۆشتی برژاو، پەراسوی برژاویان بۆ دانابووین.. دەڵێت کابرا دوو سێ پاروی خوارد و وتی: بۆ ناخۆیت؟!

وتم: وەڵا ئەخۆم با تۆزێك ئاو بخۆمەوە، هەندێك ئاوم بۆ بهێنن دەڵێت هەرچی دەمکرد ئەو گۆشتە نەدەچویە دەممەوە، ئەی ئەو منداڵانە؟ من گۆشتی برژاو بخۆم، ئەو منداڵانەی ناتوانم بۆشیان بکڕم، من گیرفانم خاڵیە..

دەڵێت: وتم خودایە گیان چی بکەم؟! وەڵاهی بەینی خۆم و خودا قسەم دەکرد، لەو کاتەدا لە تەقەی ماڵی کابرا درا کابرایان بانگ کردە دەرەوە.. وتیان کابرایەکە ڕەفیق موعامەلەیە و شتی بۆدێنێ و زەمانی ئێران و ئەوانە.. کابراکە هات و لێیان بوو بە موناقەشە، کابرای برادەرم وتی: تۆ نانی خۆت بخۆ من زۆرم پێدەچێت لەگەڵ ئەم پیاوەدا، وتم: فرسەتێکی زێڕینە، سێ چوار نان دانرابوو نانی تەنور، هەر خێرا هەرچی لەوێ بوو بە ئێسقان و گۆشتەوە خستمە نانەکەوە، لە باخەڵم هاویشت، بیست دەقەی زیاتر پێ چوو، خەمی ئەوەم بوو دوای ئەوە ژن و منداڵەکەی بڵێن باشە واگۆشتە برژاوەکە خوراوە، ئەی ئێسقانی پەراسوەکان چی یان لێهاتووە، ئەی نانەکە؟ئەو هاتە ژورەوە وتی کوڕە دەزانیت وەڵاهی شەرمەزارم..

وتم: وەڵا ئەزانی منیش مەوعیدێکم هەیە میوان و شتمان دێت، بەو خودایە ماڵی خوشکم و فلان کەس دێت، تکام وایە ئیزنم بدەیت، چایەکە بەرمەوە بۆ ماڵەوە، خۆ بە خودا چاشمان نەبوو..

وتی: وەڵاهی من خەجاڵەتی تۆم، نەیان هێشت نانەکە لەگەڵ تۆدا بخۆم، کاکە حاڵی ئێمەش ئاوایە، بازرگان و موعامەلەچی ئاوایە ژیانی، بۆی دەرچووم.. بە گەرمی گۆشتەکەم گەیاندە ماڵەوە..

وتم: منداڵ وەرن بخۆن، خودا ناردویەتی، منداڵەکان لە خۆشیدا باوەڕیان نەدەکرد ئەم گۆشتە خۆشە برژاوە، دەڵێت لەوکاتەدا هەزار جار شوکری خودام کرد..

بەڵام پاش (دە) ساڵ ڕێك ساڵی (١٩٩٤) ئەمە ڕووی دا ساڵی (٢٠٠٤)، بەو پیاوەم وت: تو خودا گەردنم ئازاد بکە، من ڕۆژێك میوانتان بووم.. وتی وەڵاهی نایەتە خەیاڵم، کوڕە وەڵاهی دەساڵ لەمەوپێش، وتی کورە من دەهەزار جار میوانم هاتووە..

وتم: ژنەکەت هیچی باس نەکرد لە دوای نان خواردنەکە، ئەها ئەو ڕۆژە تۆ نانەکەت نەخواردوو بیرت کەوتەوە، وتی: نەبە خودا..

وتم: دە بە خودا من هەرچەندە ئەوە لەڕووی شەرعەوە دروست نەبوو، بەس وەڵا لەتاوی منداڵەکانم پارەوەکەم پێ ڕۆنەچوو، هەر خواردنەکەم خستە باخەڵم و بردمەوە بۆ منداڵەکانم وتی هەزار جار گەردنت ئازاد بێت..

سەیری پیاوی شەریف، پیاوی دڵسۆز، پیاوی بەبەزەیی، ئەو پارەوەی بۆ نەخورا، بەبێ منداڵەکانی، جا لەبەر ئەوە ئەو کەسەی وەکو پێویست نەفەقەی بۆ ماڵ و منداڵی نەکێشاوە، با بەم فەرمودەیە بەئاگابێتەوە، وەکو ژنەکەی (أبو سوفیان) ئەگەر پێغەمبەر لە ناوماندا بمایە، چەند ئافرەت شەکوای حاڵی خۆیان دەکرد، ئەمە بابەتی ئەمشەومان بوو هەتا بەرنامەیەکی تر و کێشەیەکی تر بەخوداتان ئەسپێرم..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم و رَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ)



# وانەی پێنجەم



## بابەت

## کێشەو گرفتی ناوماڵی پێغەمبەری خودا ﷺ



# وانەی پێنجەم

## كێشەو گرفتی ناوماڵی پێغەمبەری خودا ﷺ

* قالَ اللهُ تَعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾﴾ الاحزاب .

* عَنْ جابِرِ بنِ عَبْدِاللهِ ـ رَضي اللهُ عَنْهُما ـ قالَ ، دَخَلَ أَبوبكر يَسْتَأْذن على رَسُولِ الله ﷺ فَوَجَدَ النّاسَ جُلُوساً بِبابِهِ لَمْ يُؤْذَنْ لِأَحَدٍ مِنْهُمْ . قالَ : فَأَذَن لِأبي بَكْرٍ فَدَخَلَ ، ثُمَّ جاءَ عُمَر، فَسْتَأْذَنَ فَأَذَنَ لَهُ ، فَوَجَدَ النَبِي ﷺ جالِساً حَوْلَهُ نِساءُ وهُ ، واجِماً ساكِتاً ، فَقالَ عُمَر : لَأُكَلِّمَنَّ النَبِيَّ ، لَعَلَّهُ يَضْحَك ، فَقالَ عُمَر : يارَسُولَ اللهِ لَوْ رَأيْتَ ابْنَةَ زَيْدٍ ـ امْرَأَة عُمَر ـ سَأَلَتْني نفقة ، فَقُمْتُ إِلَيْها فوجأتُ عُنُقَها . فَضَحِكَ النَبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ نَواجِذُهُ ، وقالَ : هُنَّ حَوْلي يَسْأَلنني النَّفَقَةَ ، فَقامَ أَبوبكر إلى عائِشَةَ يَجأ عُنُقَها ، وقامَ عُمَر إلى حَفْصَةَ يَجا عُنُقَها ، كِلاهُما يَقُولُ : تَسْألَن رَسُولَ اللهِ ﷺ ما لَيْسَ عِنْدَهُ ، ثُمَّ اعْتَزَلَنَ شَهْراً كامِلاً ، أوْ تِسْعاً و عِشْرِينَ يَوْماً ، ثُمَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِ هذهِ الايَة : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ﴾ حَتَّى بَلَغَ ﴿لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ . قالَ : فَبَدَأ بِعائِشَةَ فَقالَ : يا عائِشَة إِنِّي أُريدُ انْ اعرض عَلَيكَ امْراً ، أُحِبُّ اَلاّ تَعْجَلي فيهِ ، حَتَّى تَسْتَشيري أَبَوَيْك ، قالَتْ : وَما هُوَ يا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَرَأ عَلَيْها الايَة : قالَتْ أفيكَ يا رَسُولَ اللهِ أَسْتَشيرُ أَبَوَيَّ ، بَلْ اختار

اللهَ وَ رَسُولَهُ ، وَالدَّارَ الآخِرَة ، وَ اسأَلُكَ ألّا تُخْبِرَ إمْرَاةً مِنْ نِسائِكَ بالّذي قُلْتَ لي . قالَ : لاتَسأَلْني مِنْهُنَّ إمْرَأَةٌ إلّا أخْبَرْتُها ، إنَّ اللهَ لَمْ يَبْعَثْني معنِتاً ، وَلا مُتَعَنِّتاً ، وَلكِنْ بَعَثَني مُعَلِّماً مُيَسِّراً). ـ صَحيح مُسْلِمْ بِرَقَمْ : ٣٦٩٠ كِتاب الطّلاق.

* وَ تَذْكر بَعْض الرِّوايات : (أنَّ عُمَر ابن الخَطّاب ، دَخَلَ عَلى النَبيِّ ﷺ . في هذا المَوقِف ، فَنَهَى حَفْصَةَ قائلاً : لا تَراجعى رَسولَ الله ﷺ . وَلا تَسْأَليهِ شَيْئاً ، وَ سليني ما بَدا لَكِ وَلا يغرنَّكِ إنْ كانَتْ صاحِبَتُكِ اوسمُ مِنْكِ وَ أَحَبُّ إلى رَسُولِ اللهِ ﷺ . قالَ : فَتَبَسَّمَ النَبيُّ ﷺ قالَ عُمَر : فَقُلْتُ يا رَسُولَ اللهِ أَسْتَأْنَس ؟ اي انْبَسِطْ في الحَديْثِ ؟! قالَ : نَعَمْ . قالَ فَرَفَعْتُ رَاسي فَما رَأَيْتُ في البَيْتِ إلاّ أهبَة ثَلاثَة ، فَقُلْتُ : يا رَسُولَ اللهِ : أُدْعُ اللهَ أنْ يوسع عَلى أُمَّتِكَ ، فَقَد وَسِعَ عَلى فارس وَالرُّوم ، وَهُمْ لا يَعْبُدُنَهُ ، فاسْتَوى جالِساً ، فَقالَ : أَفي شَكٍّ أنْتَ يا ابْنَ الخَطّاب ؟ أُولائِكَ قَوْمٌ عجلت لَهُمْ طَيِّباتهمْ في الحَياةِ الدُّنيا...). ـ رَواهُ الترمذي بِرَقَمْ : ٣٥٣٨٩، كِتاب التَّفسير ، باب سُورَة التَّحريم ، وَ قالَ : هذا حَديثٌ حَسَنٌ صَحيحٌ غَريب .

## سەرچاوەكان :

١) رَقائِق العريفي ، د. محمد عبدالرَّحْمان العريفي ، ص٣٤٩ ...

تێبینی : ئەم وتارە لە کاتی پێشکەش کردنیدا . لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە ، بەلاّم لە کاتی پاکنوسی و ئامادەکردندا . ئەم سەرچاوانەی تریشم لەسەر هەمان بابەت هاتنە بەردەست و مامۆستا و بانگخوازی بەڕێز دەتوانێت لێیان سودمەند ببێت.. إنْشاءَ الله .

٢) العَجَلَة وَالأناة ، في حَياةِ النَبيِّ ﷺ وَ صَحابَتِهِ الكِرام . الدكتور : عماد علي عَبْدُ السَّميع ، ص٦٦ ـ ٦٩ .دارُالإيمان ـ الأسْكَنْدَريَّة . ط : ١ ، ٢٠٠٦

٣) في ظِلالِ القُرْآن ، سَيد قُطب ، ج٥ ص٢٨٥٣ ـ ٢٨٥٥ . ط : دارالشروق ، القاهِرة : ١٩٨٥.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلِهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیمانداران و خوداناسانی بەڕێز: ئەمشەویش ڕەنگە لە خەیاڵی زۆربەتاندا بێت کەزنجیرە باسەکەمان کە ناونیشانەکەی بریتیە لە: ﴿ئەی پێغەمبەری خودا کێشە و موشکیلەم هەیە﴾، وابزانین کە کەسێك دێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ باسی موشکیلەی خۆی دەکات، بەڵام نەخێر، ئەمشەو پێغەمبەری خودا بۆ خۆی کێشەی خێزانی هاتوەتە ڕێگا، ئەمشەو ماڵی پێغەمبەری خودا ﷺ گرفتی تێدا پەیدا بووە، دڵناڕەحەتیەکی گەورەی تێدا پەیدا بووە، کە ئەو کاتەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشەو گرفتی هەبوو، دڵنارەحەتی هەبوو، هەموو مسوڵمانان هەیانە..

## خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ داوای ماڵی لێدەکەن

لە دانیشتنی ئەم شەومان بریتیە لەوەی کە تەواوی مسوڵمانانی شاری مەدینە ئەوەی کەوا لە دەوروبەریشیدایە، هەواڵەکەی ماڵی پێغەمبەری خودایان ﷺ زانیووە، دەڵێن ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمەش هاوبەشین و ئێمەش شەریکی ئەو خەم و پەژارەی تۆین و ئێمەش ناڕەحەتیمان هەیە، خۆشەویستان: ئیمامی (عمر) کە خەزوری پێغەمبەری خودا بووە ﷺ، کەسێکی زۆر نزیك و خۆشەویست بووە، ئەم شەو باسەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە.. با بچینە خزمەتی بزانین ئەو گرفتەی ماڵی.خۆشەویستمان چۆن بووە؟ ئیمامی (عمر) دەفەرموێت:

من ماڵەکەم لە دەرەوەی شاری مەدینە بوو، بەهۆی زەرعات و کشتوکاڵ و هەندێك باخە خورماوە، ماڵەکەم زۆر دوور بوو لەچەقی شاری مەدینە، لەسەر موچە و زەرعات و شتی وابووم لەبەر ئەوەی ماڵەکەمان ئەوەندە دوور بوو، ئێمەش ئەو شەش حەوت ماڵە

بۆ خۆمان مزگەوتێکی بچکۆلەمان دروست کردبوو، جەماعەتی ڕۆژانەمان تێدا دەکردوو، بۆ جومعان دەهاتینەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، بەڵام لەبەرئەوەی نەمان دەتوانی لە پێغەمبەری خودا بەدوور بین، بۆیە من و دراوسێکەم کە ماڵەکانمان بە تەنیشت یەکەوە بوو، کەپرەکانمان و زەرعاتەکانمان بەتەنیشت یەکەوە بوو..

وتم: وەرە بابەیەکەوە ڕێك کەوتنێك بکەین، ڕێکەوتن نامەیەك ببەستین..

وتی: چۆن؟ وتم: ڕۆژێك تۆ بچۆ بۆشاری مەدینە بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا لە بەیانیەوە لەوێبە هەتا ئێوارە، ئەو ڕۆژە چی قورئانێك هاتبوو لەو شەو و ڕۆژەدا لەبەری بکەو بینوسە و بیهێنەوە وەبزانە دەنگ و باسی مەدینە چیە، چونکە دەنگ و باسی گەرمی ڕۆژانە، کە هەموو خەڵك چاوەڕێیان دەکرد، ئەوە بوو ڕۆمەکانی غەساسینە خۆیان ئامادە کردبوو پەلاماری شارەکەی پێغەمبەر بدەن ﷺ، لەبەرئەوە .هەموو کاتێك دەنگ و باسیان ئەوە بوو، کەدەبێت کەی ئەم شەڕە دەست پێبکات، کەی پەلامارمان بدرێت، کەی ئەم ڕۆمە نەصرانیانە بێنە سەرمان؟. دەفەرموێت:

ڕۆژێکیش من دەچمە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ دەنگ و باسی ئەو ڕۆژە دێنمەوە و چی قورئانە هاتۆتە خوارەوە لەو شەو و ڕۆژەدا دەینوسمەوە، دەیهێنمەوە و بەیەکەوە لەبەری دەکەین و ئەگەر کەل و پەلێك و پێداویستیەکی بازاڕیشمان هەبێت، من شتی هەردوو ماڵەکە دەکڕم تۆ ئەو ڕۆژە زەرعاتی هەردووکمان سەرپەرشتی بکە.. (سبحان الله) زۆر بیرێکی جوان بوو، ڕۆژێك تۆ هەرچی زەرعاتی من و تۆ هەیە سەرپەرشتی بکە، من دەچمە ناو شار، ڕۆژێکیش تۆ بچۆ من سەرپەرشتی دەکەم، بەم شێوەیە هەردووکمان لە خزمەت پێغەمبەری خودا بەهرەمەند دەبین، وەکار و باری دونیاو باخ و باخاتیشمان نافەوتێت.. دەفەرموێت:

ڕۆژێکیان ئیمامی (عمر) دەفەرموێت، لەگەڵ خێزانەکەمدا دانیشتبووین، خێزانەکەم قسەی دەکرد، دەنگی بەرز کردەوە، ئێمەی قورەیش لە مەککەدا فێری ئەوە نەبووین ژن دەنگمان بەسەردا بەرز بکاتەوە، بەڵام کاتێك چوینە شاری مەدینە ژنی مەدینەی (أخذُ

عَطا) یان هەبوو لە قسەکردندا، واتە: دەفەرمووێت: ئێمە لە مەککە بە خێزانەکانی خۆمان دەوت بێدەنگ بە، یەکسەر بێدەنگ دەبوو.. بەڵام ژنە مەدینەیەکان وانەبوون ئەگەر بتوتایە بێدەنگ بە جوابی دەدایتەوە (عَطائیش) هەبوو، دەیوت بۆ بێدەنگ ببم (إسمَعْ مِنِي) تۆش گوێم لێبگرە منیش قسەم هەیە، دەفەرمووێت:

ڕۆژێك کە ژنەکەم دەنگی بەسەردا بەرز کردمەوە، وتم: جارێکی تر دەنگ بەرز نەکەیتەوە، چاو لە ژنە مەدینەیی نەکەی، ئەینا من قبوڵی ناکەم، وتی: هی وا لە ئێمە دەنگی بەرز کردۆتەوە لە کەسێك کە لە تۆ گەورەترە.. وتم: ڕوونی بکەوە..

وتی: خێزانەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ، لە ئێمە گەورەترن، دایکانی هەموو ئیماندارانن، دەی ئەوان دەنگیان بەرز کردۆتەوە بەسەر کەسێکدا کە پێغەمبەری خودایە ﷺ، لە ئێوە گەورەترە.. وتم: شتی وانابێت!

وتی: کوڕە چۆن شتی وانابێت، وەڵا پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەندە عاجز بووە لێیشیان توڕە بووە.. وتم: ئەی هاوار بە ماڵم خۆ یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ، کچی منە، کەواتە (حَفصَە) ئەگەر دەنگی بەسەر خۆشەویستدا بەرز کردبێتەوە ئەوا بەهیلاکدا چووە.. ئەو ڕۆژە کە بۆ بەیانی سەرەی من بوو هاتمە ناو شاری مەدینە و چوومە ناو مزگەوت و دواتر سەرم لە ماڵی (حَفصَە)ی کچمدا، کە ماڵی پێغەمبەری خودایە ﷺ.

وتم: ئەی (حَفصَە) خێزانەکەم شتێکی وای وتووە، وتوویەتی: ئێوە دەنگە دەنگتان لەگەڵ پێغەمبەری خودا کردووە ﷺ.. دەنگتان بەسەردا بەرز کردۆتەوە، شتی واهەیە؟

وتی: ئەرەوەڵا شتی واهەبووە، پێغەمبەر ﷺ بە توڕەیی ڕۆشتە دەرەوە لە ماڵەوە،

وتم: جا لەسەر چی؟

وتی: سەیری ئەم ماڵەمان بکە، جاران ئەی باوکە کۆمەڵێك شت نەبوو، نەداری بوو، ئێستە یەك خەزێنە پارە هاتۆتە بەر دەستی (بیت المال) وە، خەزێنەی حکومەتەوە، کەل و پەل زۆرە، خۆراك زۆرە، نوێن زۆرە، دەی ئێمەیش داوامان کردووە ئەی

پێغەمبەری ﷺ لەو ماڵی حکومەتەی لە ژێر دەستتدایە، بیهێنە بەشی ئێمەش بدە، بائێمەش ژیانمان خۆش بێت، پێغەمبەری خودا ﷺ لەوە توڕە بووە، فەرموویەتی: ﴿ئەو ماڵە هی من نیە، ئەو ماڵە ماڵی مسوڵمانانە، چۆن من بەئارەزوی خۆم پارەی لێ دەربهێنم، بۆ ژن و منداڵی خۆم سەرفی بکەم؟!﴾

لەبەر ئەوە دەنگە دەنگمان لێ بەرز بوویەوە، پێغەمبەر ﷺ بە تووڕەییەوە ڕۆشتە دەرەوە، حەزرەتی (عمر) فەرمووی:

(یا حَفصَه) کچی خۆم (حَفصَه) گیان، (لا تَسْتَكثري من رَسول الله ﷺ)، تو خودا داوای زۆری لێ مەکە، وەکو خۆت داوا لە پێغەمبەر ﷺ مەکە، داوای زۆری مەخەرە سەر، داوای لێمەکە، ناڕەحەتی مەکە، پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی لەدەسەلاتدایە، ڕاستدەکات ئەو ماڵە هی ئەو نیە، ئەو پێغەمبەری خودایە ﷺ ئەوە ماڵی مسوڵمانانە و ئەو دابەشی دەکات..

(وَسَأليني مِن مالي ما شِئتِ) چەندت دەوێت، وەلاهی ئەوەندەی لە توانامدا بێت کچی خۆم بۆت جێبەجێ دەکەم، من لە ماڵی خۆم چیم لە تواناداا بێت بۆت دەکرم، تۆ چیت دەوێت.. بەلام (وَ ما تَصنَعي مِن مُشكِلةٍ للنَبيِّ ﷺ) تو خودا کێشە و ئاژاوە لە ماڵی پێغەمبەردا ﷺ دروست مەکە، پێغەمبەری خودا ﷺ ئازار مەدە..

ئەمە هەڵوێستی باوکێکی مەردە، دەفەرموێت: ڕۆڵە گیان لە ماڵی خۆم بەشت دەدەم، بەلام مێردەکەت ئازار مەدە، با کێشە و گرفت نەکەوێتە نێوانتانەوە، وتی: باوە گیان بە قسەت دەکەم..

## هەواڵی تەلاق بڵاو دەبێتەوە

حەزرەتی (عمر) دەفەرموێت:

هاتمەوە بۆ ماڵەوە، چەند ڕۆژ دوای ئەوە لەسەرەی برادەرەکەمدا، دراوسێکەمدا، سەرەی بوو بچێتە شاری مەدینە، ڕۆیشت و بوو بە ئێوارە هەر نەهاتەوە.. بوو بە نوێژی عیشا هەر دیار نەبوو.. دڵم کەوتە ناڕەحەتیەوە، وتم: خودایە توشی موشکیلەیەک

نەبوبێت، دەفەرموێت: کە هاتەوە خەو بەلایدا بردبووم، هاوین بوو، زۆر گەرما بوو، منیش ئەو هەموو زەرعاتەم هی دوو ماڵم ئاودا بوو، ئاوم گواستبوەوە، پەرژینم چاك کردبوەوە، بژارم هەندێك کردبوو زۆر ناڕەحەت بووبووم، خەوم لێکەوت بوو.. دەفەرموێت: لە دەنگی کابرای دراوسێ خەبەرم بویەوە.. وتی: (یاعمر یاعمر) وتی: ئەی (عمر) هەستە، دەڵێت: یەکسەر هەستام پەلاماری شمشێر و چەکەکەمدا، وتم:

غەساسینە دەوری مەدینەیان گرت؟ لەشکرە کەهات؟ کە ئێمە چاوەڕێمان دەکرد؟

وتی: (الخبَرُ أكبرُ مِن ذلك)،وتی: هەواڵەکە زۆر گەورەترە، خۆزگە غەساسینە پەلاماری بداینایە.. وتم: هەواڵ جا دەبێت لەوە گەورەتر چی بێت؟! چی تر بووە؟

وتی: پێغەمبەری خودا ﷺ هەموو خێزانەکانی تەڵاق داوە.. من بۆیە وادرەنگ گەڕامەوە ناو شاری مەدینە یەك پارچە دەگریان،پێغەمبەری خودا ﷺ عاجز و مەلول و غەمبارە، قسە لەگەڵ کەسدا ناکات.. دەڵێت: ئەی خودایە یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کچی منە کەواتە (حَفصَە)ی کچم بە هیلاك چوو..

دەفەرمووێت: ئەو شەوە زۆر ماندوو بووم بەڵام بەو شەوە تاریکە لە تاوی پێغەمبەری خودا ﷺ و بە هیلاك چونی کچەکەم، خەم خۆریم.. خەم خۆری (عمر) دوو دانە بوو، یەکەم: وەکو مسوڵمانێك. دووەم: وەکو خەزورێك.

دەفەرمووێت: بەو شەوە لەو دوورەوە هاتم بۆ ناو شاری مەدینە، چومە مزگەوت، لە ڕووم نەهات بچمە ماڵی پێغەمبەری خودا ﷺ، هەتا بانگی بەیانی من نەخەوتم، دانیشتبووم لە مەراقدا، خودایەگیان ڕەحممان پێبکەی.. ئەم جارە ئەم موشکیلەیەی ماڵی پێغەمبەر ﷺ حەل ببێت، ئەم کچەم سەرگەردان نەبێت.. ئەها باوك چەند بە خەمە کاتێك کچەکەی لەگەڵ مێردەکەیدا موشکیلەیەکی دەبێت!

دەفەرمووێت: وەڵاهی بەو هەموو ماندوو بوونەوە، خەو نەچووە چاوم، تەنانەت ڕاشنەکشام بەس بە دانیشتنەوە لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ دانیشتم، پێغەمبەری خودا ﷺ لە ژوورەکەوە هاتە ژووری میحرابەکەوە، (بیلال) بانگی فەرموو، قامەتی فەرموو،

نوێژی بەیانیمان کرد.. بەڵام هەر کە سەیرم کرد ئەوە دەم و چاوی پێغەمبەر ﷺ نیە، ڕۆژان دوای نوێژی بەیانی، ڕووی لەو خەڵکە دەکرد و دەیفەرموو:

(هَل رَأىَ أحَدُكُم رُؤيا)،واتە: کێ ئەمشەو خەوێکی بینیوە؟ خەوێکی حەق و ڕاست..

با بۆی لێك بدەمەوە.. کێ ئەمڕۆ پرسیارێکی هەیە؟ پێغەمبەری خودا ﷺ خێمەیەکی بچکۆلانەی لە گۆشەی مزگەوتەکە دانابوو، ئەم خێمانەی دەڵێی قارچکن بچکۆلەن، قسەی لەگەڵ کەسدا نەدەکرد، دەم و چاوی ڕەش داگەڕابوو، ئەو دەم و چاوە نورانیە، وەڵاهی پیاو کە موشکیلەی هەبوو لەگەڵ خێزانیدا ئەو ڕوە خۆشەی نامێنێت، گەورەترین بەلایە موشکیلەی ناو ماڵ، بەڵێ..

دەفەرمووێت: چووە ناو خێمەکەیەوە، کابرایەکی ڕەش پێستیش، کوڕێکی گەنج لەبەر دەرگای خێمەکە وەستابوو، دەڵێت: ڕۆشتم ویستم بچمە ژوورەوە..

وتی: بوەستە، سەری کرد بە خێمەکەدا و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە (عمری إبن خطاب)ە، دەیەوێت بێتە ژوورەوە.. ئیزنی دەدەیت..

دەفەرمووێت: سێ جار وای وت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ جوابی نەدایەوە.. واتە کەس نەیەتە ژوورەوە.. دەفەرمووێت: وتم ڕێگانیە..

دەفەرمووێت: ڕامکرد بۆ ماڵی (حَفصَە) بینیم دەگریا.. وتم: بەخودا شتەکە ڕاستە، وتم: (حَفصَە) شتێکی وا هەبووە پێغەمبەری خودا ﷺ تەڵاقی داون؟!

وتی: بۆ تەڵاق نازانم، بەڵام بەڕاستی ناڕەحەتمان کرد.. بە هەر هەموومان دەممان لێکرد بوویەوە.. هەموومان داوای شتمان دەکرد.. پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە توڕە بوو لێمان وازی لێهێناین و چوو بۆ ئەو خێمەیەی لەو گۆشەی مزگەوتەدا هەڵیداوە..

دەفەرمووێت: کە هاتمەوە مزگەوت صەحابەکان هەموویان دەگریان.. یەکێك دوعای دەکرد دەیوت خودایە ڕەحممان پێبکەیت، خودای گەورە ماڵی پێغەمبەر ﷺ تێك نەچێت.. خودای گەورە ئەمجارەش ئەو ئاژاوە بە کۆتابهێنیت..

دەفەرموویێت: دیسان چوومەوە وتم ئیزنم بۆ بخوازە، دیسان بۆ ئەوەی بچمەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، دەفەرموویێت: کابرا بانگی کردەوانیٚ، ئەو کوڕە گەنجە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ (عمر)ە، داوای هاتنە ژوورەوە دەکات..

پێغەمبەر ﷺ هیچ جوابی نەبوو واتە با نەیەتە ژوورەوە..

دەفەرموویێت: منیش دوور کەوتمەوە، وەکو ئەو خەڵکە دەستە و ئەژنۆ دانیشتبووم لە مەراقدا، گوێم لێبوو ئەو گەنجەی لەبەردەم خێمەکەی پێغەمبەر ﷺ بوو، حەرەسی بوو.. وتی: (یاعمر یاعمر ارجع)، وتم: چیە؟!

وتی:بگەڕێوە پێغەمبەری خودا ئیزنی دایت بێیتە ژوورەوە..

دەفەرموویێت: وتم: (لَأُضحِكَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ)، فەرمووی: دە وەڵاهی دەبێت پێغەمبەری خودا ﷺ بهێنمە پێکەنین.. ئەها زۆرخۆشە ئینسانێك لە ئەو پەڕی مەراقدایە، تۆ جاریٚ پێش هەواڵ پرسین بچیت دوو سیٚ قسەی خۆشی بۆ بکەیت.. ئەو ڕووە گرژەی لەسەر لابەریت.. ئەوە گەورەترین حیکمەتە، یەکەمجار بیهێنەرە پێکەنین، بیهێنە زەردەخەنە..

دەفەرموویێت: چوومە ژوورەوە سەلامم کرد و پێغەمبەر ﷺ جوابی سەلامەکەی دامەوە.. وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم ئیسلامەتیە هەمووی ڕەحمەت بوو، وەڵاهی هەمووی بەرەکەت بوو، ئەم هیجرەتە لە دەستی ئەو کافرانەی مەککە ڕزگاری کردین، بەڵام دەزانی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ توشی موشکیلەی گەورەبووین، ئێمە لە مەککە فێری ئەوە بووین کە ژن قسەی بکردایە دەمان کێشا بە دەمیدا، گەردنمان دەشکاند.. ئەها ئێستە ئەمانە، ئەم مەدینە بیانە لە ژن دەترسن، ژنەکانی ئەوان فێری ئەوە بوون.. چاوت لێیە، وەڵا ئێستا قسە بکەین لە گەردنمان دەدەن و دەممان دەشکێنن.. ئەمە حاڵە؟! هەر هیجرەتمان نەکردایە باشتر بوو..!!

دەفەرموویێت: (فَضَحِكَ النَّبي)، پێغەمبەری خودا ﷺ پێکەنی، زۆر گەشایەوە، حەزرەتی (عمر) فەرمووی: ئیتر ئەوە دەرگاکە کرایەوە پێغەمبەر ﷺ پێکەنی ئیتر

مەجالی قسە هەیە وتم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ توخودا (طَلَّقتَ نِساءَكَ؟) ژنەکانت تەلاق داون؟ (قال: لا)، فەرمووی: نەوەلا، ژنەکانم تەلاق نەداوە.. وشەی تەلاقێك بە دەممدا نەهاتووە..

دەفەرمووێت: وتم (الحمد لله) ئەوە ئیتر هەمووی چارەسەر دەبێت..

دەفەرمووێت: سەیرم کرد پێغەمبەر ﷺ لەسەر حەسیر دانیشتووە، حەسیرێك کە لە لقی خورما بەستراوە..

دەفەرمووێت: هەمووی چووبووە لاشەیەوە پێغەمبەر ﷺ نە پشتیەك، نە دۆشەکێك،

دەفەرمووێت: دڵم پڕبوو، دەفەرمووێت: وتم (أُدعُ اللهَ أن يُوَسِّعَ عَلَيك) ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە حاڵی پاشاکانی فارس و ڕۆمە، دەی داوا لە خودا بکە خەزێنەی دونیات بەسەردا برژێنێت.. تۆش لەم حاڵە ڕزگارت بێت و ئەم ژنانەش دَەم کوت ببن، لەم فەقیریە ڕزگارت بێت.. کاسەی پڕت ئاشتی ماڵت بێت..

پێغەمبەر ﷺ سەیری کردم و توڕە بوو.. فەرمووی: (أفي هذا يا عمر أولئكَ قومٌ عَجَلَ لَهُم طَيباتٌ في دُنيا ) ئەوە تۆ چویتە سەر قسەی ژنەکان (عمر)؟ تۆ گەورەتری لەوە، ئەوە دونیایە، ئەوە خودای گەورە ئەوەندە بەڕەحم و بەزەییە قیامەتی ئەوانی نەداوە، قیامەتیان نەویستووە، بەشی داون لە دونیا، ئێمە بەشمان لە قیامەتە، ئەم خانوچکە بچکۆلەیەی دونیا بگۆڕینەوە بە قیامەتی نەبڕاوە؟!

ئینجا من سەرکردەی ئەم ئومەتەم، پێشەوای ئەو خەڵکەم، من بەو خەڵکە دەڵێم فەقیر و هەژاری دەبێ، دەبێت من خۆشم فەقیر و هەژاربم، ئەینا چۆن سەرکردەیەکم؟ لەبەرئەوە دەبێت منیش بەشدار ببم ئەی (عمر) لەبرسیەتی و هەژاریان، ئەو ماڵە هی خەڵکە ئەی (عمر)، ئەو خەڵکە منیان بە ئەمیندار داناوە، من چۆن دڵم دێت ماڵی ئەو خەڵکە لە بەرژەوەندی خۆم وَ ژن و ماڵ و منداڵ بەکاربهێنم، لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ توڕە بوو..

وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ (استَغفِر لِي) وتم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە.. فەرموی: (أللَّهُمَّ اغْفِرلَهُ) خودایە لە (عمر) خۆشبە..

دەفەرمووێت: وتم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئارام بگرە..

فەرمووی: ئەی (عمر) ئارام دەگرم.. ئەمەش جۆرێکە لە چارەسەر، دەفەرمووێت: (٢٩) دانە ڕۆژ پێغەمبەر ﷺ نەچوویەوە بۆ ماڵەوە، (٢٩) ڕۆژ (عمر،أبوبکر، فلان،..) قاپێك چێشتی بۆ دەبرد و لە خێمەکەدا دەیخوارد و لە کاتی نوێژەکاندا دەهاتە ناو مزگەوتەکە و جەماعەت و جومعەی دەکرد و دەچوویەوە ژوورەوە بۆ ناو خێمەکەی، کەسی نەدەبینی، (٢٩) ڕۆژ ئەو دەرگای ماڵانەی نەکردەوە..

دەفەرمووێت: (الحمد لله) دوای ئەوە ژنەکانی بە ئاگاهاتنەوە..

پێغەمبەر ﷺ ئیختیاری کردن، فەرمووی: هەر کەسێك ژیانی دونیای دەوێت با ئازاد بێت، ئەمە ژیانی منە، ئەمە حاڵی منە، ئەمە موچە و واریداتی منە، ئەوەی بەم ژیانە ڕازیە (إن شاءالله) خودای گەورە ئەجر و پاداشتی دەداتەوە، ئەوەی بەم ژیانە ڕازی نیە، دەتوانێت داوابکات و بە شەریعەتی ئیسلام مارە کراوین، بە شەریعەتی ئیسلامیش لەیەك جیادەبینەوە.. هەر نۆ خێزانەکەی فەرموویان:

ئێمە خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ هەڵدەبژێرین و قیامەتی نەبڕاوەمان دەوێت..

ئەمجا پێغەمبەر ﷺ بە شادومانیەوە چوویەوە بۆ ماڵەوە کێشەکە کۆتای پێهات..

## دەرسەکانی ئەم حەدیسە لە حەوت خاڵدا :

یەکەم: ئەگەر ماڵی پێغەمبەری خودا ﷺ ئاژاوەی تێکەوتبێت، هیچ کەس مافی ئەوەی نابێت بڵێت بۆ دەبێت لە ماڵی منیش ئاژاوەم بۆ دروست بووە؟ بەڵێ زۆر ئاساییە هەموو ماڵێك ئاژاوەی تێبکەوێت، چونکە ماڵی پێغەمبەری خودا ﷺ ئاژاوەی خێزانی تێکەوت.. ماڵی تۆش یەکێکە لە ماڵەکان.

دووەم: ژن داواکاری زۆرە، بە تەبیعەت ژن تموحی زۆرە، ئێستا زۆر پیاو هەیە دەڵێت: نارەحەتم لەم زروفەدا، فریا ناکەوم ،تا شتێك دەکرم شتێکی تر دێت.. تا مۆدێك دەکرم ماوەیەك بەسەر دەچێت مۆدێکی دیکە دێت.. ئەمە تەبیعەتی ژن بووە لە زەمانی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام دەبێت ژنانی مەرد چاو لە خاتوو (خَدیجە) بکەن، خاتوو(خَدیجە) ئەوەندە گەورە بوو لای خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ، خۆشەویست بوو، لە تەواوی ژیانیدا ڕۆژێك بەهانەی بە پێغەمبەر ﷺ نەگرت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوەی هەیشی بوو بە پێغەمبەری خودای بەخشی.. نەك هیچی داوانەکرد ئەوەی هەیشی بوو بەخشی بەو.

سێیەم: خۆڕاگری پێغەمبەری خودا ﷺ لەبەردەمی داواکاری ژنەکانیدا، ئەم هەموو ژنە (نۆ) ژن دەمیان لێکردبوویەوە، داوایان دەکرد پارەشی لەبەردەستدا بوو.. بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ خۆڕاگربوو، مەردانە و پێغەمبەرانە خۆڕاگری کرد، دەستی بۆ تەماع نەبرد.. زۆر پیاو هەیە خۆی ناگرێت لەبەردەم داواکاری ژن و منداڵیدا، خۆی ناگرێت بەرتیل خواردن و دزی کردن فزی کردن ماڵی حکومەت تاڵان کردن، دەڵێت بۆئەوەی ژن و ماڵ و منداڵەکەم لێی ڕازی بێت.. نا، دەبێت ئینسانی مەرد خۆڕاگربێت هەتا خودای گەورە دەرگای ڕەحمەتی لێدەکاتەوە دەست لە ماڵی حەرام نەدات..

چوارەم: حەزرەتی (عمر) وەکو باوکێکی خەم خۆر ئەها نەچوو بڵێت کچەکەم لە ماڵی خۆمدا هیچ عەیبێکی نەبوو، ئێستا پێغەمبەر ﷺ پێی بەخێو ناکرێت.. دەفەرمووێت: کچی خۆم وەرە لە ماڵی خۆمدا پێت دەبەخشم، بەڵام توخودا مێردەکەت ئازار مەدە، ئەها بۆ کوڕەکەت چی سەرف دەکەیت.. دە قەینا با جارێك بۆ کچەکەیشت سەرف بکەیت.

پێنجەم: خەم خۆری مسوڵمانان، هەموو گریان لە تاوان، نەك ئەگەر بیستت ئاژاوەیەك لە ماڵێکدا هەیە، خواخوات بێت چوار قسەی گوێ بیست بیت و تۆش چوار قسەی دیکەی بۆ زیاد بکەیت و هەموو گەڕەك پێی بزانێت، لەو شارەدا بڵاوی بکەیتەوە..

تا ئازیزەکەم، خەمی مسوڵمانان خەمی هەموومانە، ئەگەر خێزانێك ئاژاوەیەکی هەبوو.. نابێت پێی دڵشاد بیت، دەبێت بگری.. وابزانی ئەو ئاژاوەیەش لە ماڵی تۆدایە و لانی کەم ئەوەی پێت دەکرێ دوعای خێری بۆ بکەیت.

شەشەم: ئەوەیە: کە پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆیشت ماڵی بەجێهێشت، خێزانەکانی نەکردە دەرەوە، ئەمە دەرسێکی زۆر گەورەیە بۆ ئێمە، پیاوی وا هەیە قسەیەکی لەسەر چایەکی سارد و گەرم دەکات، یەکسەر سێ بەسێ ی پێدادەدات.. برۆ بۆ ماڵی باوکت لەم ماڵەدا نەبیت.. ئەها پێەمبەر ﷺ قەت شتی وای نەفەرموو، فەرمووی ئەم ماڵە هی ئێوەیە، خێزانەکانم، من دەڕۆم، کە مادەم دەمەقاڵیمان دەبێت نەمان توانی بگەینە ئەنجامێك پێغەمبەر ﷺ (٢٩) بیست و نۆ دانە ڕۆژ ماڵی بەجێ هێشت، بەلام بەژنەکانی نەوت بگەڕێنەوە بۆ ماڵی باوکتان، دەی هەستن ئەم ماڵە ماڵی خۆمە، هاتبوون چیتان پێ بوو؟! دەی هەستە بگەڕێوە.. پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێ لە ڕۆژان بە خێزانەکانی نەگوت بڕۆنەوە بۆ ماڵی باوکتان، ماڵ هی ژنە قەت دەری ناکەین و بڵێین بڕۆوە دەری بکەیت و ئەوانە.

حەوتەم: کۆتا دەرس، ئەگەر هەرچەندە ژن و مێردیش لەیەك عاجز بن، موودەی ئەو عاجزیەش زۆر درێژە بکێشێت، دەرگا ڕونە، ئاسۆو ڕونە، ئومێدەوارم ڕۆژێ ئاشت ببنەوە بەیەکەوە.. (٢٩) ڕۆژ لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ بە خودا بەقەت (٢٩٠) ڕۆژی ئێمەیە، (٢٩) ڕۆژ لە ژیانی فەخری عالەم و سەرکردەی ئومەتێك بە قەدەر دوو ساڵ زیاتر لە ژیانی ئێمەیە،(الحمد لله) دوای ئەو هەموو زەمەنە ئافرەتەکانیش بەهۆش خۆیان هاتنەوە داوای لێبوردنیان کرد.. پێغەمبەریش ﷺ عەفووی کردن.. ئەو لاپەڕەی هەڵدایەوە لاپەڕەیەکی سپی دەستی پێکرد (الحمد لله) ئاژاوەکە کۆتای پێهات..





(انشاء الله) هەر کەسێك ئاژاوەی هەبێ لەم مانگی ڕەمەزانەدا، خودای پەروەردگار وەك چۆن جارێکی تر خۆشی خستەوە ماڵی پێغەمبەر ﷺ ئاوا خۆشی دەخاتە ناو ماڵە کانەوە تا شەوێکی تر هەموو لایەکتان بەخوای گەورە دەسپێرم.

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم و رَحمَةُ اللهِ وبَرَكاتُهُ)



# وانەی شەشەم



## بابەت

بۆ ڕزگار بوون لە کێشە،

پشت بەخودا ببەستەو صڵاوات بدەو

ئارام بگرە



## وانەی شەشەم

بۆ ڕزگار بوون لە کێشە، پشت بە خوا ببەستە و صلاوات بدە و ئارام بگرە.



* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيْهِ وَسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾﴾ الاحزاب : ٥٦ .

* زانای پایە بەرز (عفیف عبدالفتّاح لَبّارَة) دەفەرمووێ : مانای صلاواتی ئێمە بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەمەیە : (اللّهُمَّ عَظِّمْهُ في الدُّنيا بِأَعْلاءِ ذِكْرِهِ ، وَ إِظْهارِ دينِهِ ، وَ إِبْقاءِ العَمَلِ بِشَريعَتِهِ ، وَ في الآخِرَةِ بِتَشْفيعِهِ في أُمَّتِهِ ، وَ إِجْزالِ أَجْرِهِ وَ مَثُوبَتِهِ ، وَ إِبْداءِ فَضْلِهِ للأَوَّلينَ والآخِرينَ ، وَ تَقْديمِهِ عَلى كافَّةِ المُقَرَّبينَ) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (الأَناةُ مِنَ اللهِ ، وَالعَجَلَةُ مِنَ الشَّيْطانِ). ـ رَواهُ الترمذي.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاةً ، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ بِها عَشْراً)

ـ رَواهُ مُسْلِمْ : ٣٨٤.

* وَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (ما مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلاّ رَدَّ اللهُ عَلَيَّ رُوحي ، حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلامَ). ـ رَواهُ أبو داود بِإِسْنادٍ صَحيح : ٢٠٤١ .

* وَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (البَخيلُ الّذي مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ).

ـ رَواهُ الترمذي : ٣٥٤٠، وَقالَ : حَديثٌ حَسَنٌ صَحيح .

## سەرچاوەکان :

١) رياضُ الصّالِحين ، الأمام النَوَوي . وەرگێڕانی مامۆستا نوری فارس ، ب٣ ، ل١٨٩ .
سالّی چاپ : ٢٠٠٦ .

٢) مَعَ الأنبياء في القرآن الكريم ، عفيف عبدالفَتّاح طَبّارَة ، ص ٣٣٥ .

٣) ئەزمون ، ئەندازیار عوسمان ، ل ٦٦ .

٤) پایزە برا ، مەلا ئەحمەدی شەریعە ، ل ٤٢ .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیمانداران و خوداناسانی بەڕێز: دانیشتنی ئەم شەومان بەسەلاوات دان لەسەر دیداری پێغەمبەر ﷺ دەست پێدەکەین، لەبەر ئەوەی کە ئێمە لەوانەی دوێنێماندا، لە باسکردنی موشکیلەیەکی ماڵی پێغەمبەری خودا ﷺ بووین، ئێمەش بە پەرۆشبووین وەکو ئەو صەحابانەی کە لەو زەمەنەدا لە خزمەتی خۆشەویستی خودا بوون، بۆیە لەبەر پەرۆشیمان لە دوای وتارەکە ئەمجا بیرمان هاتەوە کە صەلاواتەکانمان نەناردووە، بۆیە لە دانیشتنی ئەمشەویشمان صەلاواتەکانمان لێدەدەین و دەڵێین:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)

خۆشەویستان: ئێمە زنجیرە باسەکەمان بە ناوی: ﴿**ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشەم هەیە**﴾، هەر شەوەی یەکێك هاتووەتە خزمەتی و گرفتی خۆی باسکردووە یەکێ لە چارەسەری گرفتەکان بریتیە لە: ﴿سەلاوات لێدان لەسەر دیداری پێغەمبەری خودا ﷺ﴾ ئەم سەلاواتانە کەئێمە هەموو شەوێك دەچینە خزمەتیان، بەڕاستی کۆمەڵێك بەرەکەتمان بەسەردا دەبارێت..

### سێ بەرەکەتی صڵاواتدان:

**یەکەمیان:** ئەوەیە لە صەحیحی (موسلیم)دا هاتووە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی (مَن صَلى عَليَّ صلاةً صَلى الله عَليّه بِها عَشرة)،واتە: هەر کەسێك یەك سلاوات لە دیدارم بدات، خودای پەروەردگار دە سلاوات و ڕەحمەت و بەرەکەتی خۆی بەسەردا

دەرژێنێت، (سبحان الله) چ بەهرەیەکی گەورەیە، هەر کەسێك یەك سلاوات لە دیداری پێغەمبەری خودا ﷺ بدات.. خودای پەروەردگار دە سلاوات و رەحمەت و بەرەکەتی بەسەردا دەبارێنێت..

**خاڵی دووەمیان:** نزیك ترین کەس دەبین لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ، لە کاتێکدا ئێمە سلاوات لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ لێدەدەین، خۆشەویستمان فەرموویەتی: (أولَى النَّاسِ بي يَومَ القِيامَةَ أكثَرُهُمْ عَلَيَّ صلاةً)،واتە: نزیك ترین کەس لە رۆژی قیامەتدا لە من و لە شەفاعەتی من، ئەو کەسانەن کە لە دونیادا سەلاوات زۆر لەسەر من دەدەن.. چەندی سلاواتی زۆرترت لێدابێت، رەصیدی بەهێزتر وزیاترت هەیە، بۆ ئەوەی لە قیامەتدا لە خزمەت پێغەمبەری خودا بیت ﷺ.

**خاڵی سێیەم:** بەهرە وەرگرتن لە سلاوات ئەوەیە خەم و پەژارەت لەسەر لادەبات، گوناحیشت دەسرێتەوە، ئەم دوو خەلاتە گەورە!! لە دونیادا ئینسان زۆر جار خەمی گەورە رووی تێدەکات، هەر کاتێك زۆر غەمبار بوویت زۆر سلاوات لێبدە، هەرکاتێك گوناحت زۆر بوو، هەستت کرد گوناحت زۆرە، هەستت کرد بەشەرمەزاری لە بارەگای خودای گەورەدا، هەر سەلاوات لێبدە..

(ئوبەی کوری کەعب) دەفەرموێت: لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بووم، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا من تۆم زۆر خۆشدەوێت، زۆر سلاواتت لێدەدەم، چەند سلاوت لێبدەم باشە؟ فەرمووی: چەندی ئارەزوت لێیە، وتم: وەختەکانی خۆم کە زیکری خودا دەکەم زۆریەی وەختەکانم، یەك لەسەر چواری دادەنێم بۆ سلاوات لێدان..

فەرمووی: زۆر باشە، ئەگەر زیادیشی بکەیت ئارەزووی خۆتە، وتم: پێغەمبەری خودا دەیکەم بە دوو بەشەوە، بەشێکیان بەس بۆ سلاوات لەسەر دیداری تۆ لێدەدەم، فەرمووی: ئارەزووی خۆتە، خۆ ئەگەر زیادی بکەی باشترە، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەیکەم بەسێ بەشەوە، دوو بەشی سلاوات لەسەر تۆ لێدەدەم..

فەرمووی: زۆر باشە ئەگەر زیادی بکەیت (فأن زِدتَ فَهُو خَيرٌ لَك) هەتا زیاتر سلاوات لێبدەی بۆ خۆت باشترە.. وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەندەی دەرفەتم هەبێت، ئەوەندەی کە مەجالم بۆ بڕەخسێت، بە پێوە، بە دانیشتنەوە، لەسەر جێگای خەوتن، هەر سلاوات بۆ دیداری تۆ دەنێرم..

فەرمووی: (إذاً تَكفي هَمُّك وَ يُغفَرَ لَكَ ذَنْبُكَ)، فەرمووی: دەی موژدەت لێبێت، خودا خەم و خەفەتت لەسەر لا دەبات، لەگوناحەکانیشت خۆش دەبێت، ئێمە باس لە گیر و گرفت دەکەین، جا کێ هەیە لەم ڕۆژەدا کێشە و گرفتی نەبێت، هەریەکە بە دەردێکەوە گرفتارە، دەی با زۆر سلاوات لێبدەین، بە ئیزنی خودا، خوای گەورە خەمەکانمان لەسەر لادەبات.. وە لە گوناح و تاوانەکانمان خۆش دەبێت..

بەڵێ خۆشەویستان پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە لەشەوی ڕابردوودا لە خزمەت موشکیلەکەی ماڵی پێغەمبەردا ﷺ بووین، کۆمەڵێك دەرسمان باسکرد، یەکێك لە دەرسە گەورەکان ئەوەیە کە باسی سلاوات دەکەم، جارێ باسی سلاوات لێدانەکە دوایی باسی دەکەم، با لێرەدا سێ سلاواتی تر لێبدەینەوە، وەکو دەرسی ئەمشەومان، ئەوەی تر قەرەبووی شەوی ڕابردووبوو، ئێستاش دەچینەوە خزمەتی و دەڵێین:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَسَلَّم)
(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَسَلَّم)
(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَسَلَّم)

## صلاوات لەژووری نەشتەرگەری :

خۆشەویستان ئەوەی پێغەمبەری خودا فەرموویێتی دڵنیابن هەمووی لە سەدا سەد هەمووی تەواوە کە فەرمووی خەمت لەسەر لا دەبات لە تەنگانە ڕزگارت دەکات هیچ گومانی تێدا نیە.. شێخ (صالح المغامسی) هەیە لە سعودیە، وتار بێژە ئیمام و خەتیبی مزگەوتە، لە کەناڵی (نُورٌ و دُبَی) لە بەرنامەی (اهل القرئان) دا ئەم پیاوە باسی خۆی

گێڕاوەتەوە، دەڵێت: لە لوبنان بووم فەرمووی لە لوبنان عەمەلیاتی کردنەوەی دڵم بۆ کرا (فتح الصدر)، دڵمیان بۆ عەمەلیات کردم، دوای (٢٤) سەعات ئەمجا هاتمەوە هۆش خۆم و لە خەستەخانەم، سەیرم کرد ئەو دکتۆرە گەورە کە (١٤) کەس یاریدەدەری بوو، نەشتەر گەری دڵی دەکرد، ناوی دکتۆر (ئادەم سودانی)بوو، یەکێکە لە دکتۆرە بەناوبانگەکانی جیهان لە بواری نەشتەر گەری دڵدا..

دەڵێت: هەر کە هات و بەنجەکە خاوی کردبوومەوە دوای (٢٤) سەعات دکتۆر لەبەر چاوم بوو، بە دەم و چاویدا هەستم کرد خەمبار دیارە، وتم: خێرە باش ناتبینم؟!

وتی: وەڵاهی موشکیلە ئەوەیە، ئەی شێخ چەند دڵۆپە خوێنێك لەناو دڵتدا مەیوەتەوە، بە قەدەری خودای پەروەردگار ئێمە هەموو جوهدی خۆمان بەکارهێنا، بەڵام ناچارین جارێکی دیکە بەنجت بکەینەوە، وە جارێکی تر دڵت بکەینەوە، چونکە ئەو خوێنانە ناڕوات بە بۆریەکەدا، خوێنەکە لەناو دڵتدا مەیوەتەوە..

ئەڵێت: وەڵاهی زۆریش ترسام، وتی: پشت بە خودای پەروەردگار ببەستە و جارێکی تر دەتبەین بۆ ژووری نەشتەرگەری، دەڵێت: دەمامکەکانیان بەستبوو ئافرەتێکی موحەجەبەی لێبوو، سستەربوو، یاریدەدەربوو لەبەر دەستیاندا، وتی: شێخ بۆ سلاوات لێنادەیت، بۆ سلاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ نادەی؟! بەڵکو خودای پەروەردگار ئەو دڵەت بخاتەوە ئیش و ئەو چەند دڵۆپە خوێنە مەیوە پاڵ پێوە بنێت..

دەڵێت: وتم ڕاست دەکەیت، دەستم کرد بەسلاوات لێدان، سێ سلاواتم لێدابوو.. جیهازەکە دەستی کرد بە ئیش کردن وتی دڵۆپە خوێنەکان ڕۆشتن!!

(سبحان الله) وەڵاهی وتی: نەیان بردمەوە بۆ ژووری نەشتەرگەری، دڵم لێی دایەوە بەهێز و بەرەکەتی ئەو سلاواتانە ئەوچەند دڵۆپە خوێنە مەیوەی پاڵ پێوەناو لە نەشتەرگەری ڕزگارم بوو..

بەڵێ خۆشەویستان: ئەوە بەرەکەتی سلاْواتە، جا لە ماڵەکەی پێغەمبەردا ﷺ کە موشکیلە هەبوو گەورەترین دەرس کە ئێمە وەری بگرین ئەوەیە کە: (پەلە نەکردنە) پێغەمبەری خودا ﷺ بەڕێزان پەلەی نەکرد لە تەلاْقدانی خێزانەکانیدا، سەیر بکە، زۆر کەس لە بچوکترین موشکیلەدا یەکسەر پەنا بۆ تەلاْق دەبات، نەخێر، بەلاْم پێغەمبەری خودا ﷺ (٢٩) ڕۆژ (٢٩) ڕۆژ لەو خێمە بچکۆلەی ناو حەرەمی مزگەوتدا مایەوە، لە مزگەوتی مەدینەدا نەچوویەوە لای خێزانەکانی، هەتا ئەوانیش دڵیان چاکبوویەوە، ئەو موشکیلە گەورەش کۆتای پێهات..

## دوای ٤٦ ساڵ دابڕان.. بەیەکدەگەنەوە !

لە وڵاتی کوردەواری خۆماندا بەسەرهاتی شیرین هەیە، دەرس و عیبرەتە بە تایبەت بۆ لاوەکان، بۆ ئەوانەی کە لە سەرەتای ژیانی هاوسەرێتیدان، بەهۆی گرفتی بچکۆلەوە، بە هۆی شارەزانەبوون لەمەرامی هاوسەریەتی لە ژیانی هاوسەریەتی..

بەهۆی ئەوەی ئەم کوڕە لە ژینگەیەکدا پەروەردەبووە، ئەم کچەش لە ژینگەیەکدا پەروەردە بووە، جاری واش هەیە لەتەبیعەتی یەکتر شارەزانین، جاری واهەیە تموحەکانی یەکتر شارەزانین، جاری واهەیە ئاستی ڕۆشنبیری ئەم و ئەو وەك یەك نیە، جاری واهەیە بەرزی ئیمانی ئەم کوڕە و ئەم کچە وەك یەك نیە، یەکێکیان زیاترە یەکێکیان کەمترە، یەکێکیان بە قەناعەت ترە یەکێکیان بە تموح ترە،بەهۆی ئەوەوە گرفت دروست دەبێت.. جاری واهەیە لە سەرەتای خاڵدا پەنا بۆ تەلاْق دەبەن..

بەلاْم ئەم باسە کە ئێمە لە کوردەواریدا باسی دەکەین، بەسەرهاتی پیاوێکە بەناوی حاجی (علی) یەوە، خەڵکی یەکێك لە گوندەکانی کوردستانی ڕۆژهەلاْت بووە، کوردستانی ئێران، لە ناوچەی (مەریوان)، ئەم پیاوە ژن دێنێت، ژیانی هاوسەری لەگەڵ خزمێکی خۆیدا پێك دێنێت، بەلاْم هەر لە سەرەتاوە بە نەگونجان دەست پێدەکەن و، ئافرەتەکە دەڕواتەوە بۆ ماڵی باوکی، ئەو پیاوەش ناوی (علی) دەبێت..

ئەو زەمانە پێیان وتووە کاك (علی) کوڕێکی گەنج دەبێت، پێی ناخۆش دەبێت ژنەکەی تەلاق نادات، نەماڵی باوکی پێی دەڵێن تەلاقی بدە، نە ژنەکەش داوای تەلاق دەکات، نە ئەمیش خێزانەکەی تەلاق دەدات، سەری خۆی هەڵدەگرێت و لە ئێرانەوە بەرەو سلێمانی دێت، لە سلێمانی دەگیرسێتەوە، دواتر تەسکەرە دەردێنێت و جنسیەی ئێرە وەردەگرێت، ژن دێنێت لە سلێمانی، منداڵی گەورە کوڕ و کچ و ئەمانەی دەبێت، ئەو ژنە هەر لە شاری (مریوان) ماوەتەوە، نە تەلاق دراوە، نە باسی شوو کردن و شتی وای کردووە، هەر لەگەڵ ماڵی براکانی ژیاوە لە ساڵەکانی (٢٠٠٠)رەکان بەدواوە، ئەم پیاوە دەچێت بۆ حەج و دەبێت بە حاجی (علی)، لە یەکێك لە گەڕەکەکانی سلێمانی نیشتەجێ ـدەبێت، خێزانەکەی واتە ئەو خێزانەی کە لە سلێمانی هێناویەتی و چەند منداڵێکی لێی هەیە، کوڕ و کچی عازەب و خاوەن ماڵ و بەشوو دراوی هەیە، ئەم ژنە کۆچی دوایی دەکات ..

مامۆستایەکی بەڕێزی شاری سلێمانی کە خەڵکی ئێران دەناسێت و تێکەڵاوی لەگەڵ ماڵی ئەو خێزانە کۆنەی هەیە، بە بیری مام حاجی دێنێتەوە دەڵێت خۆ تۆ هەر خێزانت ماوە، چەند ساڵی بەڕێزان ئەمەی پێچوو بێت؟ (٤٦) ساڵ!! (٤٦) ساڵە ئەو ئافرەتە ڕۆژێك لە ڕۆژان داوای تەلاقی نەکردووە!! بیری لەشوو کردنیش نەکردۆتەوە!!

ئەم حاجیەش بیری نەکردۆتەوە بڵێت تەلاقی دەدەم ، دەڵێت: خۆ تۆ ئەو ژنە هەر حەلاڵی خۆتە تەلاقێك بە دەمتدا نەهاتووە، ئەویش داوای تەلاقی نەکردووە، منیش هاتووچۆی (مەریوان)م زۆر کردووە هەر دانیشتووە، مام حاجی بۆ نایەیت ئەم ژنە بیهێنیتەوە؟! دەڵێت: جاچۆن دەگونجێت؟! دەڵێت: وەلاهی زۆر واریدە زۆر باش دەگونجێت.. دەچێت سەفەرێکی ئێران دەکات و لە کوردستانی ڕۆژهەلات، لە شاری (مەریوان)دا لەگەڵ ئافرەتەکە قسە دەکات و بەهەرحاڵ دەگەنە قەناعەتێك کۆمەڵێك پیاو دەچن وەکو بوك گواستنەوە لەوێوە دەیهێننەوە..

دوای (٤٦) ساڵ دابڕان ئەم حاجی و حاجی ژنە بەیەك شاد دەبنەوە!! بەڵام ژیانێکی هەتا بڵێیت پڕ موحیبەت و خۆشەویستی، وەکو تازە لاوی یەکتریان ناسیبێت، بەڵام بەقەدەری خودای پەروەردگار سێ ساڵ بەیەکەوە دەژین و ئەم ژنە کۆچی دوایی دەکات.. ئەو مامۆستا بەڕێزەی ئەم باسەی نوسیوە لە کتێبەکەیدا دەڵێت:

بەڕاستی کەسم نەدیووە ئەوەندا بە پەرۆش بێت بۆخێزانی وەکو ئەو حاجی (علی) یە بۆ خێزانەکەی خۆی بە پەرۆش بوو، چونکە دەیووت: بەڕاستی ئەمجا من قەدری تۆم زانی، چەند ئافرەتێکی ڕێك و پێك بووی، چەند ئافرەتێکی بەحەیا و حورمەت بووی، چەند ئافرەتێکی خانەدان، (٤٦) دانە ساڵی ڕەبەق تۆ چاوەڕێ بوویت، ڕۆژێك لە ڕۆژان تۆ داوای تەلاقت نەکرد، زۆر بە مەراقەوە بەسەر دارە مەیتەکەیەوە، بەسەر قەبرەکەیەوە گریا و گەردنی ئازاد کرد.. ئەویش پێش مردنی گەردنی ئەوی ئازاد کردبوو.. لاپەڕەیەکی سپی و نوێیان هەڵدابوویەوە لە ژیانی هاوسەرێتیدا !!

## لەکاتی کێشە چی بکەین:

یەکەم: پەنا بەرە بۆ خودای پەروەردگار ئەو گرفتەت بۆ حەل بکات.

دووەم: زۆر سلاوات لە دیداری پێغەمبەر ﷺ بدە..

سێیەمیشیان: ئەوەیە کەسێکی موسڵیح، کەسێکی لێزان، کەسێکی دلسۆز و پاك، کەسێك کە شارەزا و خیبرەی ئەو کارەی هەبێت، کە لە فیقهی ئیسلامیشدا ڕێکخەری باری خێزانی هەیە، توێژەری دەروونی و کۆمەڵایەتی هەیە، کە بەداخەوە لە کوردستانی ئێمەدا ئەوەنیە، کە ژن و مێرد کێشەیەکیان هەبێت ئەم دەچێتە بەینیانەوە، ئەم پسپۆڕی ئەوبوارەیە، لە کێشەکەیان تێدەگات موشکیلەکەیان بۆ شی دەکاتەوە، ئامۆژگاریان دەکات، بە شێوەیەکی زۆرسادە کۆتایی بەو موشکیلە دەهێنێت..

بەڵام کە ئەمە نەبێت ئەو ئینسانانە بە ژیرانە بیر بکەنەوە، دوای پەنا بردن بۆ خودای پەروەردگار و سلاوات لێدان لەسەر دیداری پێغەمبەر ﷺ، تەماشاکردنی ئەوەی

لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ ئەم موشکیلانە هەبوون ، (إن شاء الله) گرفتی هەموو خێزانەکان حەل دەبێت، هەرچەندە زەمەنی زۆریشی پێبچێت، دوای (٤٦) ساڵ دابڕانی ژن و مێردێك، توانیان بەوپەڕی موحیبەتەوە ژیانی هاوسەری پێك بهێننەوە..

لە کۆتایی قسەکانی ئەمشەومدا ئەوە دەڵێین: سوپاسی خودای پەروەردگار بکەین کە ئێمە ئەو پێغەمبەرە چاوساغەمان هەیە، ئەو دڵسۆزەمان هەیە، ئەو ڕابەرەمان هەیە، وەڵاهی شەو و ڕۆژ سەرمان لە سوجدەدابێت هێشتا شوکری ئەوە تەواو ناکەین کە پێغەمبەری خودامان ناسیوە، پێغەمبەری خوداﷺ لە ژیانیدا ئەوەندە دڵسۆز بووە بۆ ئەم ئومەتە و بۆ شوێن کەوتوانی، ئامادەبوو واز لە خێزانەکانی بهێنێت، واز لە خۆشەویستانی بهێنێت، بەڵام یەك دانە درهەمیش، یەك فلسەسورکەیەکیش، خیانەت لەو کەسانە نەکات کە ئەم بۆتە ڕابەر و چاوساغ و پێشەوایان، ئەو ڕۆژەش کە وەفاتی کرد، خەڵکی نەڵێت پێغەمبەری خودا ﷺ لەدوا ساتەکانی ژیانیدا دەوڵەمەند بوو..

نەخێر بە پێچەوانەوە، پێغەمبەری خودا ﷺئەو شەوەی کە وەفاتی کرد، ئەو چرایەی لە ماڵی پێغەمبەردا بووە زەیتی تێدا نەبوو، بە تاریکی شەویان کردەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ (٧) دانە درهەمی هەبوو، حەوت پەنجایی هەبوو، ڕۆژێك پێش وەفاتی هەر هەمووی بەخشی، واتە ئەو ڕۆژەی خرایە ژێر گڵەوە لە ماڵی پێغەمبەری خودا ﷺ تاقە درهەمێکیش بەجێ نەماوە..

یەکەم سەرکردە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کە ئەو هەموو خەزێنە و ئاڵتون و پارەی لەژێر دەستدا بووە، بەڵام کاتێك وەفات دەکات و دونیا بەجێدەهێڵێت تاقە یەك درهەمیش لەدوای خۆی بۆ یەك کەس بەجێ نایەڵێت، ئەوەندە ڕاستگۆ بووە، جا ئەگەر خەڵکێك پێشەوایەکیان هەبێ لە دونیا، چەند پارەی بێ، چەند دەست پاك بێت، چەند لەگەڵی ڕاستگۆ بێت، هەرتاسەر لێواری قەبرەکەی دەتوانێت لەگەڵیدا بێت، ئەگەر لەبیری بێت، بەس پێشەوای ئێمە، پێغەمبەری ئێمە ﷺ،کە ئێمە تەواوی ئەم ڕەمەزانە لەخزمەت

پێغەمبەری خوداین ﷺ لەگەڵ صەحابەکان هەموو شەوێك جارێك دەچینە خزمەتی، ئەوە فەخرە بۆ جەنابتان، بۆ هەمووماں، کە شەوانە خودا بەنسیبی کردووین لەم ڕەمەزانەدا شەرەفی دیداری پێغەمبەری خودامان ﷺ بەنسیب دەبێت..

ئەو پێغەمبەرەی نەك لە دونیا چاوساغمانە، بەڵکو لە قیامەتیشدا فریامان دەکەوێت، بە ئیزنی خودا، چونکە لە قیامەتیشدا هاوار دەکات: (أُمَتي ، أُمَتي ، أُمَتي) ئومەتەکەم، ئومەتەکەم، ئومەتەکەم، دەفەرمووێت: لەسەر پردی سیرات دەوەستم، هەتا ئاخیر نەفەری ئومەتم نەچێتە بەهەشتەوە ئۆقرە ناگرم، وازناهێنم، وەلآهی چەند ملیۆن خەڵکێك هەیە لەم ئومەتە، وەلآهی موستەحەقی بەهەشت نیە، تەرازوی کردەوەکانی خراپەی زۆرترە لە چاکەکانی، بەلآم خودای گەورە بواری بە پێغەمبەر ﷺ داوە، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، شەفاعەت بۆ کێ دەکەیت، تکا بۆ کێ دەکەیت، تکای بۆ بکە و لەبەرخاتری تۆ دەیبەخشم!!

دەفەرمووێت: هەر کەسێك شەریکی بۆ خودا قەرار نەدابێت، ئەی پەروەردگارا هەر کەسێك تۆی خۆش ویستبێت بە حەق، منی خۆش ویستبێت لەبەر خودا، چونکە ئەوەی پێغەمبەری خودای خۆش بوێت، لەبەر خودا خۆشی دەوێت، ئەی خوای پەروەردگارم ئەمانە لە ئوممەتم منیان نەبینی، بەلآم ئیمانیان پێهێنام، ئەی ئەو کەسانەی زۆر سلآواتیان لێدام.. ئەی ئەو کەسانەی بەردەوام لەگەڵ ناوی منیان دەبیست موچورکە بە لەشیاندا هاتووە، دڵی دەهەژاو چاویان فرمێسکی دەڕشت.. ئەی خوای پەروەردگار تکا دەکەم..

دەفەرمووێت: سەر دەخاتە سەر سوجدە، خوا دەفەرموێ: سەرت بەرز بکەوە، داواکەت وەرگیراوە، داواکەت وەرگیرا، داوا بۆ کێ دەی دەیان بەخشم، بە ملیۆنەها خەڵك خودا لەبەر پێغەمبەر ﷺ لێیان خۆش دەبێت، (ان شاءالله) ئێمە یەکێك دەبین لەو کەسانەی کە پێغەمبەر ﷺ شەفاعەتمان بۆ دەکات.. دەبێ شانازی بکەین بەڕابەرایەتی حەزرەتی ﴿محمد﴾ ﷺ،بڵێین:

(رَضِتُ باالله رَبّا و بالإسْلامِ دِيناً و بمُحَمَدٍ ﷺ نَبِيّا و رَسولاً) ڕازین خوایە بە پەروەردگاری تۆ، ڕازین بەم ئیسلامە کە پێت خەڵات کردین، لە غەیری ئیسلام بەهیچ بەرنامەیەکی تر قبوڵمان نیە وپێی ڕازی نین، بەرێبازی ژیانی خۆمانی نازانین، خودایە ڕازین ﴿محمد﴾ ﷺ ڕابەر و سەرکردە و چاو ساغمان بێت، هەتا شەوێکی تر لەگەڵ جەنابتان دەگەینەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ هەموو لایەکتان بە خودای گەورە دەسپێرم..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم و رَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ)

# وانەی حەوتەم

## خزمەتکردنی دایك مایەی هیدایەتی خوایە

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا﴾ النساء: ٣٦.

* جاءَ رَجُلٌ إلى رَسُولِ اللهِ ﷺ . فَقالَ : يا رَسُولَ اللهِ ، مَنْ أَحَقُّ النّاسِ بِحُسْنِ صَحابَتي ؟ قالَ : أُمُّكَ ، قالَ : ثُمَّ مَنْ ؟ قالَ ثُمَّ أُمُّكَ ، قالَ ثُمَّ مَنْ ؟ قالَ ثُمَّ أُمُّكَ ، قالَ : ثُمَّ مَنْ ؟ قالَ : ثُمَّ أَبوكَ ... ـ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، بُخاري : ٥٩٧١، وَ مُسلِم : ٢٥٤٨ .

* قالَ أَبو هُرَيْرَة : (إنَّ أُمّي كانَتْ مُشْرِكَةً ، وَكُنْتُ أدعوها إلى الإسلامِ ، وَكانَتْ تَأْبى عَلَيَّ ، فَدَعَوتُها يَوماً فَأَسْمَعَتْني في رَسُولِ اللهِ ﷺ ما أَكْرَهُ . فَأَتَيْتُ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَ أَنا ابْكي ، فَأَخْبَرْتُهُ ، وَ سَأَلْتُهُ أَنْ يَدْعُوا لَها ، فَقالَ : (اللّهُمَّ اهْدِ أُمَّ أَبي هُرَيْرَةَ) ، فَخَرَجْتُ أَعدو ابشرها ، فَأَتَيْتُ فَإذا الباب مجاف ، وَسَمِعْتُ خَضخَضَةَ الماءِ ، وَ سَمِعَتْ حِسِّي ، فَقالَتْ كَما انْتَ ،ثُمَّ فَتَحَتْ ، وَقَدْ لَبِسَتْ درعَها ، وَ عجلت عَنْ خِمارِها ، قالَتْ : اشْهَدُ ان لّا إلهَ إلّا الله ، وَ أَشْهَدُ ان مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ ، قالَ : فَرَجَعْتُ إلى رَسُولِ اللهِ ، ابْكي مِنَ الفَرَحِ كَما بَكَيْتُ مِنَ الحُزْنِ ، فَأَخْبَرْتُهُ وَ قُلْتُ : أُدْعُ اللهَ أَنْ يحببني وَ أُمّي إلى عِبادِهِ المُؤمِنِينَ ، فَقالَ : (اللّهُمَّ حَبِّبْ عُبَيْدَكَ هذا ، وَ أُمَّهُ إلى عِبادِكَ المُؤمِنِينَ ، وَ حَبِّبْهُمْ إلَيْهِمْ) .

ـ أَخْرَجَهُ أَحمد ، وَغَيْرَهُ وَ قالَ الذَّهَبي في . سِيَرِ أَعْلام النُّبَلاء . ج٢ ص٥٩٣ : إسْنادُهُ حَسَنٌ.

* وَيشتَدُّ الألَمُ بِأبي هُرَيْرَةَ مِنَ الجُوعِ مَرَّةً ، فَيَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ إلى المَسْجِدِ ، لا يَخْرُجُهُ إلاّ الجُوعُ ، فيجد نَفَراً مِنْ اصحابِ رَسولِ اللهِ ﷺ ، فَيَقُولُونَ : يأبا هُرَيْرَة ، ما أخْرَجَكَ هذهِ السّاعة ؟! ، فَيَقُول : ما أَخْرَجَني إلاّ الجُوعِ ، فَيَقُولُ أبُو هُرَيْرَةَ : فَقُمْنا ، فَدَخَلْنا عَلى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقالَ : (ما جاءَ بِكُمْ هذهِ السّاعَة ؟) . فَقُلْنا يا رَسُولَ اللهِ جاءَ بِنا الجُوعِ ، قالَ : فَدَعا رَسُولُ اللهِ ﷺ بِطَبَقٍ فيهِ تَمْرٌ ، فَأَعْطَى كل رَجُلٍ مِنّا تَمْرَتَيْنِ ، فَقالَ : (كُلوُا هاتَيْنِ التَّمْرَتَيْنِ ، وَاشْرَبوا عَلَيْهِما مِنَ الماءِ ، فَإنَّهُما سَتُجْزِيانِكُم يومكم هذا) ...

قالَ أبُو هُرَيْرَةَ : فَأكَلْتُ تَمْرَةً ، وَ خَبَّأتُ الأُخْرى ، فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ( يا أبا هُرَيْرَةَ ، لِمَ رَفَعْتَ هذهِ التَّمْرَةَ ؟ فَقُلْتُ : رَفَعْتُها لِأُمّي ، فَقالَ : كُلْها ، فَأنّا سَنُعْطِيكَ لَها تَمْرَتَيْنِ .

فَأكَلْتُها ، فَأَعْطاني لَها تَمْرَتَيْنِ ...

ـ قالَ الأرناؤوط في تَخْريجِهِ لِأَحاديث (سِيرُ أَعْلام النُّبَلاء) ج٢ ص٥٩٣ .رِجالُهُ ثِقات ، خَلا والد محمد بن هلال ، فَقَدْ وثقه إبْنُ حِبّان .

سەرچاوەکان :

١) زَوْجات وَ صَحابِيات حَوْلَ الرَّسُول ﷺ ، سَعْد يوسف أبو عَزيز ، ص٤٦٣ .

٢) گۆڤاری (دوانگە) ، ژمارە : ٤٤ ، نیسانی ٢٠١٢ ، بابەتی : (پاداشتی خزمەتی دایك هەر لە دنیادا) لە نوسینی : مامۆستا حەسەن پێنجوێنی ، ل٢٨.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیمانداران و خوداناسانی بەڕێز دانیشتنی ئەم شەویشمان لە زنجیرە باسی: ﴿ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشە و گرفتم هەیە﴾ دەچینەوە شاری مەدینە، بۆ خزمەتی خۆشەویستامان و دەچینەوە خزمەت ئەو مەجلیسە کە صەحابەکان تێیدا دانیشتوون، ئای چ سەردەمێکی زێڕین بووە، چ سەردەمێکی بەختەوەری بووە، هەموو هیواو ئاواتی ئەو مرۆڤانە، ئەو نورە پاکانە، ئەو ئینسانانە کە بەشکڵ بەشەربوون، بەڵام بەڕاستی فریشتە ئاسا لەسەر زەویدا دەجولاًنەوە..

هەموو شەو و ڕۆژێك لە خزمەتی پێغەمبەردا بوون ﷺ، هەموو خەم و هەمێکیان بەس قیامەت بوو، بەس ئاوەدان کردنەوەی قیامەتی خۆیان، قەبری خۆیان، بەدەستهێنانی بەهەشت بوو، لەم دونیایەش دانەبڕا بوون، لەگەڵ دونیاشدا ئەژیان، بەلاًم دونیا چۆکی لەسەر سنگیان دا نەدابوو، وەکو ئێمەیان لێنە هاتبوو کە هەموو ژیانمان هەر دونیا بێت، ئەوان دونیا و قیامەتیشیان تێکەلاًو کرد بوو، جا لەبەر ئەوەی وەکو مرۆڤێك لەسەر زەوی دەژیان، توشی گرفتیش دەبوون، بەلاًم زۆربەی گرفتەکانیان بیر کردنەوە بوو لە قیامەتی خۆیان، یان کەسێکی نزیکی خۆیان ،یان مسوڵمانان بەگشتی.

ئەمشەو دەچینەوە شاری مەدینە بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، لەو کاتەدا کە لەناو صەحابەکاندا دانیشتووە، ئێمەش بە چونە خزمەتی لەم شەوە پیرۆزەدا، لەم شەوی جومعەدا، کە ئێمە (إنشاء الله) بیکەین بە دەستورێکی خۆمان، پێویستی بکەین لەسەر خۆمان بەڕاستی کە دەڵێم پێویستی بکەین مەبەستم نیە وەکو واجب، چونکە واجب ئەوەیە کە تەنها خودای گەورە واجبی کردووە، بەلاًم سلاًوات لێدان لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ لە چەند شوێنێکدا هەیە هەر خۆی واجبە، لە چەند شوێن ئەگەر

سلاوات لیّ نەدرێت ئەو عیبادەتە خودا قبولّی ناکات، بە تایبەت هەولّبدەن بەڕێزان لە ڕۆژی جومعەدا لە ڕۆژی جومعەدا، کە لە نوێژی بەیانی ڕۆشتینەوە هەتا ئەو کاتەی وتاربێژ دەست پێدەکات بەوتاری جومعە، ئەو زەمەنە زۆر زێڕینە، لەو فەترەیەدا، لەم فەترەیەدا پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت:

هەرکەسێك لە ڕۆژی جومعەدا سلاوات لێبدات بە گوێی خۆم گوێم لێیەتی، بۆ خۆم گوێم لێیەتی!! ناوی تۆمار دەکرێت لام، پێم دەوترێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ فلانە کەس لە شارۆچکەی پیرە مەگرون سەد سلاواتی بۆ تۆ ناردووە، دەی تۆیش (إنشاء الله) ناوی تۆمار بکە لە لیستی ئەو کەسانەی شەفاعەتیان بۆ دەکەیت لە قیامەتدا، ئەو چەند سلاواتە بڕواتان پێمە (٦) شەش دەقیقەی پێناچێ.. بە تەسبیحەکەت، پەنجەکانی دەستت، هەموو جومعەیەك سلاوات لێبدە، لەم شەوە پیرۆزەدا سلاواتەکانمان دەنێرین بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ:

(اللّهُمَّ صَلی عَلی سَیِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلی آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلَّم)
(اللّهُمَّ صَلی عَلی حَبیبِنا مُحَمَّدٍ وَعَلی آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلَّم)
(اللّهُمَّ صَلی عَلی شَفیعِنا مُحَمَّدٍ وَعَلی آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلَّم)

## مسولّمان بوونی دایکی ئەبوو هورەیرە

خۆشەویست دانیشتووەو صەحابەیەك، کەسێکی زۆر ئازیز، کە کەس نیە لە مسولّمانان ناوی ئەو صەحابەیەی نەبیستێت، صەحابەی خۆشەویست (أبی هریرە)، (أبی هریرە) دێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، دەگریا.. زۆر بە کولّ دەگریا.. زۆر بە مەحزونی دەگریا.. زۆر مەحزونە زۆر خەفەتبارە..

ئەی (أبی هریرە) بۆ وا خەفەت باری؟!

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ موشکیلەیەکی گەورەم هەیە، ئەی (أبی هریرە) فەرموو موشکیلەکەت بلّێ.. فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا من دایکم هەیە، باوکم کۆچی دوای

کردووە و دایکم لە شوێنی باوك منی بەخێو کرد، من دایکم زۆر خۆش دەوێت، بەڵام بەداخەوە دایکم کافرە، بڕوای بەم دینی ئیسلامە و پێغەمبەری خودا نیە، (نَعُوذُ بِالله) بت پەرستە بت دەپەرستێت، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بە زمانی شیرین زۆر لە دایکم پاڕامەوە، هەموو ڕۆژێ قسەی لەگەڵ دەکەم، دایە گیان با بەبێ ئیمانی نەڕۆی، دایە گیان بابە کافری نەچیتە لقای خوا، باجەهەنم شوێنت نەبێت، ئەو ڕێبازە جوانە، ئەو پێغەمبەرە حەقە بناسە، وەرە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ ..

بەڵام ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمڕۆ دایکم نەك هەر جوابی نەدامەوە، نەك هەر ئەوەی بە قسەی نەکردم، کۆمەڵێ قسەی سوك و ناشرینی کرد بەرامبەرت، لەبەر ئەوە بەڕاستی لە داخا گریانم دێت، لە بۆ ئەو وەزعەی کە دایکمی تیایە لە جیاتی بەیەکەوە بچینە بەهەشت، یەقینم هەیە کە لەسەر ئەم بیر و باوەڕە بمرێت دەچێتە جەهەنم..

لەبەر ئەوە زۆر مەحزوونم ئەها خەمی قیامەتیەتی، خەمی ئەوەیەتی دەیەوێت دایکیشی بچێتە بەهەشت، پێغەمبەری خودا ﷺ نەیفەرموو: چۆن قسەی بە من وتووە؟ چۆن غەڵەتی وایکردووە! ئەمە لای پێغەمبەری خودا نەبوو، چونکە: پێغەمبەر ڕەحمەتە﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾، الأنبياء﴾ ئەوە هەر ڕەحمەتی لێدەوەشێتەوە..

ئەو کۆمەڵگایەی پێغەمبەری خودایشی ﷺ تێدا دەژیا، هەر ڕەحمەت بوو، سەیر بکە لە شاری مەدینەدا دایکی صەحابەیەك بت پەرستە، کافرە، دوژمنی خودا و پێغەمبەری خودایە ﷺ،قسە بە پێغەمبەریش ﷺ دەڵێت، لەو شارەشدا جێی بۆتەوە، کەسیش پێی ناڵێت پشتی چاوت دوو برۆی پێوەیە، یەعنی خەڵکێك وادەزانن ئەگەر مسوڵمانان دەسەڵاتیان هەبێت چاوی خەڵك دەر دەهێنن بەپێچەوانەوە، ئەوە زەمەنی پێغەمبەرە ﷺ کوڕەکە صەحابەیە، دایکەکە کافرە.

(عبدالله إبن ئوبّی إبن سَلول) صەحابەیەکی هەرە خۆشەویستە، باوکی سەرۆکی مونافیقانە، تەنانەت رۆژێك دەڵێت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ باوکم زۆر بێ ئەدەبە بەرامبەرت، رێگەم پێبدە با بیکوژم، بەس تۆ ئیزنم بدە باوکم دەکوژم، ئەو دوژمنەت لەکۆڵ دەکەمەوە، چونکە جارێکیان گوێدرێژێك بەویادا تێدەپەڕی بۆنێکی ناخۆشی لێدەهات دور لە ڕوتان، ئەو مونافیقە، ئەو زاڵمە، ئەو دڵ پڕ لە قینە، وتی: بۆنی ئەو گوێدرێژە لە بۆنی ئەو ﴿محمد﴾ە خۆشترە بەلامەوە..

ئەم قسەیە بە(عبدالله)ی کوڕی گەیشتەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بەس تۆ بفەرموو وەڵامی سەری باوکم لە لاشەی جیادەکەمەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: وازی لێبهێنە، وازی لێبهێنە ئێمە نەهاتووین بۆ خەڵك کوشتن، ئێمە هاتووین بۆ هیدایەتی خەڵك، یەعنی لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا ئەو هەموانەی تێدایە، پێغەمبەری خودا ﷺ دەبێت چی بفەرموێت؟! بە (أبی هریرە)ی فەرموو:

ئەی (أبی هریرە) تۆ دەفەرمووی چی؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ وەڵامی ئەوە گەورەترین موشکیلەمە بۆیە وادەگریم، تو خودا دوعا بۆ دایکم بکە، بەڵکو خودای گەورە هیدایەتی دایکم بدات..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اللّهُمَ اهدِي أُمِي أبي هُرَيرَه) یارەبی خودایە بەگەورەی خۆت هیدایەتی دایکی (أبی هریرە) بدەیت، پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە، خودایە بە گەورەی خۆت هیدایەتی دایکی ئەبی هورەیرە بدە..

پێغەمبەر ﷺ ئاوا دەستی بەرز کردەوە خوایە بە گەورەی خۆت هیدایەتی دایکی (أبی هریرە) بدەیت.. بیهێنە سەر ڕێبازی پاکی ئیسلام و ئەو کافریەی لە دڵتدا لابدەیت.. ئەم (أبی هریرە)کەئەم دوعا بەکوڵ ودڵەی پێغەمبەری خوای بیست، ڕێك ڕۆشتەوە بۆماڵەوە، وتم (إنشاء الله) دایکم یەکسەر ئیمانی هێناوە..

دەفەرموێت: کە چومەوە دەرگاکە ئەڵقەکەی داخرابوو، پێوە درابوو، خشپەی دەنگی ئاو دەهات، یەکێك وەکوئەوەی خۆی بشوات لە ژوورەوە، لە دەرگاکەم دا، دایکم

وتی کوڕم تۆی؟ وتم: بەڵێ دایکەگیان ئەوە منم.. وتی: بوەستە هەتا جلەکانم لەبەر دەکەمەوە، وا خۆم دەشۆم، (أشهد ألا الهَ إلا الله و أشهد أن مُحَمَدً رَسُول الله) مسوڵمان بووم، پەشیمان بووم لەو ڕابردووەم، ئێستا خۆم دەشۆم، پاك و خاوێن جلەکانم لەبەر دەکەم، دەچینە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، دەفەرمووێت ئەوەندە خۆش حاڵبووم ڕانەوەستام هەتا دایکم جلەکانی لەبەر بکات، ڕامکردەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بەگریانەوە.. بەڵام ئەم جارە گریانی خۆشی بوو، چونکە دوو جۆر گریان هەیە: گریانێك ئینسان لە تاوی خۆی، لە مەراقی خۆی دەگریا، ئینسانیش جاری واهەیە لە موشکیلەیەك ڕزگاری دەبێت، لە خۆشیدا دەگریا..

دەفەرمووێت: چومەوەخزمەت پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی ئەی (أبی هريره)ئەمجارە بۆ دەگریت؟!

ووتم: ئەم جارە گریانی خۆشیە، سوپاس بۆ خوا پێغەمبەری خودا فەوری دوعاکە گیرابوو، دایکم مسوڵمان بوو، وا خۆی دەشوات و خۆی پاك دەکاتەوە و دێتە خزمەتت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، توخودا دوعامان بۆ بکە، منیش و دایکیشم زۆر بێکەس و بێ دەرین، زۆر فەقیر و هەژار و داماو و بێکەسین، بەڵکو لە لای ئەو خەڵکەی خودا خۆشەویست بین..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اللَّهُمَ حَبِيب عُبَيدكَ هذا) خودایە ئەم بەندە بچکۆلەی تۆ (أبی هريره) زۆر خۆی بە بەستەزمان دەزانێت (عُبَيد) یەعنی تەصغیری (عَبد) خودایە ئەم بەندە بچکۆلەی خۆت، ئەم (أبی هريره) ،(وَ أُمَّهُ) دایکەکەشی، خۆشەویست بکە (إلي عِبادكَ المؤمِنين) هەرچی ئیمانداره ئەمانەی خۆش بوێت، (و حَبيتهُ إليهم)،

یارەبی.. خودایە.. هەرچی ئیماندارە خۆشەویستی بکەی لە دڵی ئەم و ئەم دایکەیدا، دەفەرمووێت (سبحان الله) هەرچی چاوی پێدەکەوتین خۆشی دەویستین، وە ئێمەش هەموو خەڵکیمان خۆشدەویست، نە من و نە دایکم ڕقمان لە هیچ بەشەرێك نەبوو، ئەوە بەرەکەتە!! ئەمە، ئەم ڕەمەزانە، ئەم مزگەوتە فێری ئەوەمان دەکات، تا دایك ئەگەر

کافریش بێت، نابێت دەنگی لێ دابڕیت، ئەبێت خەمت بێت، شەو و ڕۆژ دوعای بۆبکەیت، بڵێیت: خودایە هیدایەتی دایکم بدەیت، بیهێنە سەر ڕێبازی ڕاست و دروستی ئەم دینە..

## نەخۆش کەوتنی دایکی هیدایەتی بۆ هێنا

خۆشەویستان: خزمەت کردنی دایك گەلێك بەرەکەتە، لە شاری مەدینەوە دێینەوە بۆ ئەو شاری سلێمانیەی خۆمان، بەسەر هاتێکی واقعی بۆ جەنابتان، دەگێڕمەوە پاڵەوانی چیرۆکەکەمان، گێڕەوەکەی کە من لە زمانی ئەو دەگێڕمەوە، ئێستا لە ژیاندایە، مامۆستا (حەسەنی پێنجوێنی)یە، کە بەهۆی ستەمی بەعسەوە ساڵانی (١٩٨٨) عێراقی بەجێهێشت و دواتر لە عێراقەوە چووە پاکستان و لە پاکستانەوە چوو بۆ ئوستراڵیا، (١٢) ساڵ لە ئوستراڵیا ژیا، ئێستا بەیەك جاری هاتۆتەوە کوردستان، ئێستا لە سلێمانی جێگیرە.. ئەم پیاوە بەڕێزە، ئەم مامۆستا ئازیزە، دەفەرمووێت:

کەسێك هەبوو خەڵکی پێنجوێن بوو، بەڵام ئەو کاتەی من پێنجوێنم بەجێهێشتبوو، بەهۆی فەقێیەتی و مامۆستایەتیەوە، ئەو منداڵ بوو لەبەر ئەوە نەمناسیەوە، بەڵام بەسەرهاتێکی زۆر خۆشی ئەویان بۆ گێڕامەوە، ویستم لەدەمی خۆی بیبیستم، بۆیە دوای نوێژی عیشایەك لە مزگەوتی (ئەبو بەکری صدیق)ەوە بەرەو ماڵی ئەو کەسە ڕۆشتین یەکترمان ناسیەوە، بە یەکتریان ناساندینەوە..

وتم: بەسەر هاتی تۆ لەگەڵ دایکتدا شتێك هەیە؟ وتی: بەڵێ. وتم: دەتوانی بۆمی باس بکەی، وتی: بەڵێ، مامۆستا قەیچێکە..

وتی: من کاتێك لە پێنجوێن بووم کوڕێکی تازە پێگەشتوو بووم، لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکی خراپدا دژ بە دیندا، تێکەڵاو بووم، فکرێکی چەپی خراپم هەبوو، دوژمن بە خودا و بە مزگەوت و بە قورئان و هەموو شتێك بووم، بەڵام دواتر بەهۆی بار و دۆخەوە لە پێنجوێنەوە هاتینە شاری سلێمانی، من خێزانم پێك هێناو یەك دوو منداڵمان بوو.. (سبحان الله) من زۆر ڕێزی دایکم دەگرت، دایکیشم هەموو جارێك دەیوت: خودایە

هیدایەتی ئەم کوڕەم بدەیت، ئەم کوڕە زۆر لارە، نوێژ نەکەرە، ڕۆژوو نەگرە، دژ بە تۆیە، خودایە هیدایەتی ئەولادەکەم بدەیت هیدایەتی کوڕەکەم بدەیت..

دەڵێت: گاڵتەم بەو دوعایانەش دەهات، خودا و ئیسلام و ڕۆژوو هیدایەت و ئەوانە، دەڵێت: (سبحان الله) دایکم لەکت و پڕێکدا جەڵتەیەك لێیدا، توشی شەلەلی کرد، لە جێگەدا خستی، ئەوەندە لە جێگادا مایەوە پشتی کونی تێبوو.. ئەوەندە مایەوە، دایکیشم ئافرەتێکی قەبە بوو، زۆر بە ناڕەحەت هەڵدەسوڕا، وەلأهی گرانیش بوو، پارەیەك کە هەمبوو، کۆمکردەوە چووم دۆشەکێکم کڕی، دۆشەکی کارەبایی کە هەوای تێدەکرێت و بەرز و نزم دەکرێت، دواتر قەرەوێلەیەکی کارەبایم بۆ کڕی بۆ ئەوەی قەرەوێڵەکە دایکم بجوڵێنێت، چونکە هەموومان پێمان هەڵنەدەسوڕا، بۆ ئەوەی بەردەوام بیجوڵێنێت و ئەو کونەی پشتی چیتر گەورە نەبێت، کرم تێی نەدات.. زۆر ناڕەحەت بووم، بە خۆم خێزانم، خێزانیشم خزمەتی دایکمی دەکرد خودا هەڵناگرێت.

دەڵێت: شەوێکیان کە دایکم بانگی کردم لەتاوی ئازاری خۆی وتی ڕۆڵە گیان وەرە هەڵمبگرە پشتم تەقی، ئەڵێت هەڵمگرت وتی سەغڵەتم، قەتعەمان لە ژێری دادەنا، دەڵێت قەتعەکەم خستە ژێر دایکم و هەڵمگرت و یەك قرچە لە پشتمەوە هات..

دەڵێت: هاوارم کرد فریام کەون، خەریکە پشتم لەت دەبێت، بەلأم لە تاوی دایکم بەو ئازارەی کەهەر خوا خۆی دەزانێت چەند ئازار بە پشتم گەیشت، دەستم لەدایکم بەرنەدا و وتم نەوەکو دایکم بکەوێت سەری بەر قەرەوێڵەکە بکەوێت، هەتا خێزانەکەم و منداڵەکانم هەستان و پەلاماریاندام و گرتمیانەوە..

بەڕاستی وام لێهات خەریکبوو قاچەکانم لەجوڵە بکەون، بەلادا کەوتم، ئیتر لەسەر چوار چنگۆڵە دەڕۆشتم ئاوێك بخۆمەوە، زۆر ناڕەحەت بووم، دوای چەندین دەرزی و دەرمان، ئەمجا دوکانێکم هەبوو، دەچووم بۆ دوکانەکە، بەلأم دەبوایە چوار پێنج جار دابنیشتمایە هەتا تۆزێك قاچم تینی تێدەهاتەوە، ئەو فەقەراتەی پشتم ئەشیعەی تەنوریان بۆ گرتم، وتیان چوار فەقەرەی خزیوەتە سەر یەك عەمەلیاتی فەقەرات نەبێت

هیچ هێزێك نیە ئەمەی تۆ چاك بکاتەوە، ئەو دکتۆرە گەورانەی سلێمانی وتیان خۆت دەرزی و مەوادی موستەکین مەخۆ ئیلا دەبێت پشتت عەمەلیات بکرێت..

دەڵێت: منیش دەموت خوایەگیان من ئەم جەڵتەیە داویەتی لەدایکم، مەیتێکە لەوێ، دەست کورت و نەدارم، بۆخۆم ئەم سوکە دوکانەم هەیە، ئەی خودایە زۆریش دەترسام لە عەمەلیاتی فەقەرات، هەر لە قاچیش ببم، زۆر ناڕەحەتبووم.. دەڵێت: (سبحان الله) ڕۆژێك ناشوکریم نەکرد، نەموت ئێمە مەیتێك بووین، بۆ بووین بە دوو مەیت؟! ناشوکریەك بە دەممدا نەهات، دەموت کاری خودایە بێ حیکمەت نیە، سەرەتایەك بوو کە لە تاوی ئازاری خۆم دەموت خودایە فریامان بکەوی، هاوارم بۆ خودا دەبرد..

دەڵێت: لەو کاتانەدا بووین نەك پشتم چاك نەبوویەوە، نێوانی پەنجەکانی قاچم برینێکی لێپەیدا بوو، (سبحان الله) قنچکەیەك بوو، قنچکەکەم تەقاند بوو بە ئاو و زڵکە، برینی هەردوو پەنجەی قاچم خوێناوی پێدا تکایەوە.. ئازارەکەی ئەو برینەم پشتی لەبیر بردمەوە، ئازاری واهەیە ئازارت لەبیر دەباتەوە ، ئەویش چەند مەڵحەم، چەند دەرزی و دەرمان، چەند دەرمانی گیایم بەکارهێنا.. بەڵام سودێکم لێنەبینی..

دەڵێت: شەوێکیان خەوتم، لە خەونمدا بینیم کەسێك هات بۆ لام، نەمناسی، وتی: ئەوە چیە؟ وتم پشتم دێشێت، بەڵام سەرەڕای پشتم ئەو برینەی بەینی پەنجەکانم خەمی ئەوەمە و ناوێرم بە زمان بیڵێم، خودانەکات ئەترسم لێم بکات بە نەخۆشیە خراپەکە و دوایی قاچم ببڕنەوە، بەڕاستی خەمبارم. وتی: کاکی من عیلاجەکەی ئاسانە و لە ماڵی خۆتدا هەیە!!

دەڵێت: وتم چیە؟ وتی: بڕۆ کەوانتەرەکەتان چەکمەجەکەی بکەرەوە، حەبێکی تێدایە گولاجە، ئەو حەبە بهێنە هەڵیبچڕە و تۆزەکەی بەو بەینی پەنجانەتدا بکە چاك دەبێتەوە..

دەڵێت: (سبحان الله) لە تاوان کرد خەبەرم بوویەوە لەو خەوە، هەر بەو شەوە کارەبا نەبوو، چراکەمان کزبوو، هەڵمگرت و چووم چەکمەجی کەوانتەرەکەم راکێشا کوت و موت یەك دانەحەبی تێدا بوو، حەبە گولاجەکەبوو! !

وتم: وەڵاهی ئەم خەوە لەلایەن خوداوەیە، ئەینا ئەم حەبە چی دەکات بەبێ پارچە، بەبێ شت! هەر بەو شەوە هەستام برینەکە تەڕ بوو، خوێنی پێدا دەهاتە خوارەوە، گولاجەکەم هەڵبچڕی و ڕێك تۆزەکەم پێدا کرد، سوێند دەخوات و دەڵێت: بۆ بەیانی قەتماغەی بەستبوو، برینێك وەکو ئەوەی سەرەکەی بە چەسپی بگریت، لەژێرەوە هێنای، یەکپارچە توێکڵی فرێدا برین وشکی کرد.. نەجاتم بوو.. بەڵام ئەمجارەیان وام لێهات بە تەواوەتی کەوتم، دوکانەکەم داخرا، کەسیش نەبوو شتێکی واشی تێدا نەمابوو بە شەریکی بیدەمێ، دەست کورتی و هەژاری زۆری بۆ هێنا بووین، بەڵام بەردەوام دایکم دوعای بۆ دەکردم دەیوت:

خودایە هیدایەتی ئەم کوڕەم بدەیت، شیفای ئەم کوڕەم بدەیت، ئەم کوڕە بۆ من زۆر باشە خزمەتی کردووم.. دەفەرمووێت: شەوێکیان بانگی بەیانی ئاگام لێی بوو بانگی دا، ئەو کاتە هێشتا نوێژم نەدەکرد بۆ خودا، دوای بانگی بەیانی ماوەیەك بەخەبەر بووم، دوایی خەوم لێکەوتەوە.. لە خەونمدا دەستێك هات، بەڵام دەم و چاوم نەدەبینی،

وتی: کوێت دێشێت؟ وتم: پشتم دێشێت ئا لێرەمەوە دێشێت بە قاچی چەپمەوە دێشێت دەڕواتە خوارەوە تەزوویەك لە بنی پێم دەردەچێت، هێزم نەماوە..

دەڵێت: هەموویم بۆ باسکرد وەکو دکتۆرێك، دەڵێت: دەستی خستە سەر پشتم، پێیدا هاتە خوارەوە هەتا بە قاچی چەپمدا نزیکی ئەژنۆم بوویەوە وتی ئەو خەڵەلە بەزۆری ئالێرەدا کۆبۆتەوە، تەزوویەکی کارەبای لێبدەن! !

دەڵێت: وەڵاهی تەزوویەکیان لێدام ئەوەندە بەهێز بوو کە ڕاپەڕیم هاوارم کرد، ماڵ و منداڵم خەبەریان بوویەوە.. وتیان: ئەوە چی بوو؟! وتم وەڵا تەزووی کارەبایان لێدام (سبحان الله) بۆ مامۆستای دەگێڕێتەوە و دەڵێت: قاچم یەك پارچە ئاوای دەکرد قاچم

ئەجولا، خۆ بەدەست خۆم نەبوو، هەموو لەشم دەلەرزی، هەستامە سەر پێ، خودایە ئەوە منم بە قاچەکانی خۆم هەستام! ئەوە منم و دەستم بۆ پشتم دەبەم، بزانم ئەو ئازارەم هەیە نیە، نەبوو!! چومە سەرئاو یەکسەر وتم حەمامەکە کراوەیە؟ ئاوەکە گەرمە؟

وتیان: بەڵێ، دەست بەجێ چوم خۆم شت، هاتم بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا نوێژی بەیانیم گێرایەوە. وتم: خودایە تۆبە بێت، خودایە گیان ئەوە منم بەبێ ئەوەی بچمە سەر کورسی عەمەلیات، بێ ئەوەی عەمەلیاتی فەقەرات بکرێم، بێ ئەوەی بەنجم لێبدرێت، ئەوە منم جارێکی تریەو قاچانەم دەڕۆم، ئەوە منم قاچم نەبڕدرایەوە بە حەبێکی گولاجی ماڵی خۆم کۆتای پێهات.. شەرت بێت خودایە ڕوو لە تۆ بکەم، لەو ساتەوە ڕووم کردە خودا دایکم زۆر شادومان بوو، بەڵام دایکم هەر سەری ئیشی دەکرد، بەسەر و مێشك وریا بوو..

بەڵێ خۆشەویستان: دەڵێت: ئەوە سەرەتای هیدایەتم بوو، ڕۆشتم بۆ دوکان، بەڵام نەك دانەنیشتم یەك وچانیشم نەدا، ئەو ڕۆژە بەپێوە پێشوازی موشتەریەکانم دەکرد، خودا بازاڕی بۆ کردمەوە، ڕزق و ڕۆزی ڕووی تێکردم، ئەمجا دایکم چەند شادومان بوو..

مامۆستا (حەسەن) پێنجوێنی دەڵێت: کە ئەم بەسەرهاتەی بۆ دەگێڕامەوە فرمێسك هۆن هۆن بەچاویدا دەهاتە خوارەوە.. لەو کاتەدا دایکی کەوتبوو لەسەر جێگادا، ئێمە هەردووکمان لەلای دانیشتبووین، دایکی هەر بەین نابەینێك دەیوت: (أشهد، أشهد) کوڕەکەیشی دەیوت: (الا إله الله محمد رسول الله) لەسەعاتێکدا دە جار بەیەکەوە شایەتومانیان دەهێن.. ئەم پیرە ژنە خەمی کوڕەکەی بوو دەیوت (أشهد) بۆ ئەوەی کوڕەکەی شایەتومان بێنێت..

ئەمە بەسەرهاتی ئەو کەسەیە کە ئێستا لە ژیاندایە بە بەرەکەتی خزمەت کردنی دایك خودای گەورە گەردنی ئازاد کرد لەئاگر، بە بەرەکەتی خزمەت کردنی دایك کە بەهۆی ئەوەوە فەقەراتەکانی چونە سەر یەك، دایکێکی کێش قورس، خودای گەورە نەیخستە

بەر دەستی دکتۆر و دەرمان، بەشیفای خۆی بە(كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ يس ) شیفای بۆ نارد..

(إنشاء الله) هەموو ئەو کەسانەی دایکیان ڕووی لە خودا نیە، چونکە زۆر گەنجمان هەیە خەفەت بەوە دەخوات و دەڵێت: بەداخەوە دایکم لەو تەمەنەدا ڕووی لە خودا نیە زۆر کچ هەیە موحەجەبەو دیندار و خودناس، کەچی دایکی خودا نەناسە..

یارەبی خودایە لەم شەوەدا لێت دەپاڕێمەوە بە بەرەکەتی ئەم مانگی ڕەمەزانە، بە بەرەکەتی ئەمشەوی پیرۆزی جومعەیە، بە بەرەکەتی ئەو دەستە بەدەست نوێژانەی لەو گەنج و بە تەمەنانەی کەلەم مانگەدا بەم هیلاکەتیە ڕویان کردۆتە ماڵەکەی تۆ، بۆ ئەوەی کەوا ڕەزامەندی تۆ بەدەست بهێنن، یارەبی خودایە هیدایەتی هەموومان بدەیت، هیدایەتی ئەو کەسانە بدەیت کە ڕوویان لە تۆ نیە، هیدایەتی ئەو کەسانە بدەیت کە چەند ڕۆژی ڕەمەزانە بە ڕۆژوونین، یارەبی بەم شەوە هیدایەت بخەیتە دڵەکانیانەوە.. بەرەو نوری ئیسلام بێن.. خودایە دایك و باوکمان زەلیل نەبن.. هەتا لە دونیا دەژین پاك و خاوێن بن.. ئەگەر کاتێك ئێمەو ئەوان مردین بە ئیمانەوە بێینەوە بارەگای تۆ، خودای پەروەردگار لە ئێمەش و لە دایك و باوکمان و سەرجەم ئەهلی ئیمان خۆشبیت.. شیفای نەخۆشەکانمان بدەیت.. لە مردووە کانیشمان ببوری، بەگەورەیی خۆت عاقیبەتی هەموو لایەکمان بەخێر بکەیت.. تاشەوی داهاتوو هەموو لایەکتان بە خودا دەسپێرم..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم و رَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ)



# وانەی هەشتەم



## بابەت

## نابێ دینداری و خوا ناسین

## ببێتە هۆی ئازاردانی کەسانی تر



# وانەی هەشتەم

## نابێ دینداری و خوا ناسین ببێتە هۆی ئازاردانی کەسانی تر



لە بارەی گەورەی نوێژی جەماعەت لە مزگەوتدا ئەم فەرموودانە هاتوون :

* عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ ، قالَ : (أَتَى النَبِيَّ ﷺ، رَجُلٌ أَعْمَى ، فَقالَ يا رَسُولَ اللهِ ، إِنَّهُ لَيْسَ لي قائِدٌ يَقُودُني إلى المَسْجِدِ ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنْ يُرَخِّصَ لَهُ في بَيْتِهِ ، فَرَخَّصَ لَهُ فَلَمَّا وَلَّى دَعاهُ ، فَقالَ : هَلْ تَسْمَعُ النِّداءَ بالصَّلاةِ ؟ قالَ : نَعَمْ ، قالَ فَأَجِبْ). ـ رَواهُ مُسْلِم : ٦٥٣.

* (صَلاةُ الجَماعَةِ تَفْضُلُ صَلاةَ الفَذِّ بِسَبْعٍ وَ عِشْرِينَ دَرَجَةً).

ـ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: بُخاري : ٦٤٥ ، وَ مُسْلِم : ٦٥٠.

* (قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (أَعْظَمُ النّاسِ أَجْراً في الصَّلاةِ أَبْعَدُهُمْ ، فَأَبْعَدُهُمْ مَمْشًى) .

ـ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: بُخاري : ٦٥١ ، وَمُسْلِم : ٦٦٢ .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (مَنْ خَرَجَ إلى المَسْجِدِ لا يُخْرِجُهُ إلاّ الصَّلاةُ لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً ، إلاّ رُفِعَتْ لهُ بِها دَرَجَةٌ ، وَ حُطَّ عَنْهُ بِها خَطيئَةٌ).

ـ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ : بُخاري : ٦٤٧ ، وَ مُسْلِم ٦٤٩.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (مَنْ أَكَلَ مِنْ هذهِ الشَّجَرَةِ ـ يَعْني الثُّومَ ـ فَلا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنا)

ـ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: بُخاري : ٨٥٣ ، وَ مُسْلِم ٥٦١.

* عَنْ ابي مَسْعُودٍ ، قالَ : قالَ رَجُلٌ : يا رَسُولَ اللهِ ﷺ إِنِّي لَأَتَأَخَّرُ عَنِ الصَّلاةِ فِي الفَجْرِ مِمّا يُطيلُ بِنا فُلانٌ فيها ، فَغَضِبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ما رَأَيْتُهُ غَضِبَ فِي مَوْضِعٍ كانَ أَشَدَّ غَضَباً مِنْهُ يَوْمَئِذٍ ، ثُمَّ قالَ : (يأَيُّها النّاسُ ، إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ ، فَمَنْ أَمَّ النّاسَ فَلْيَتَجَوَّزْ ، فَإِنَّ خَلْفَهُ الضَّعيفَ وَ الكَبيرَ وَ ذا الحاجَةِ) .

ـ مُتَفَقٌ عَلَيْهِ: بُخاري : ٧٠٤ ، وَ مُسْلِم : ٤٦٦ .

* أَعْذارُ تَرْكِ الجُمُعَةِ وَ الجَماعَةِ سَبْعَةٌ :

١) المَرِيضُ .
٢) الخائِفُ .
٣) المُدافِعُ لِأَحَدِ الأَخْبَثَيْنِ .
٤) مَنْ يَخافُ ضِياعَ مالِهِ ..
٥) المَطَرُ أَو الرِّيحُ الشَّديدُ .
٦) تَطويلُ الإمامِ تَطْويلاً مُمِلاً .
٧) تَقْصيرُ الإمامِ تَقْصيراً مُخِلاً .

قالَ الشَّيْخ إبنُ عُثَيْمين ، في (الشرح الممتع ج٤ ، ص١٥٤ ) : (يُعْذَرُ بِتَطْويلِ الإمامِ إذا كانَ طُولاً زائِداً عَنِ السُّنَّةِ ، وَقالَ : وَإذا لَمْ يُوجَدْ مَسْجِدٌ آخَرُ سَقَطَ عَنْهُ وُجُوبُ الجَماعَةِ!) ..

* عَنْ أَبي قَتادَةَ : عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قالَ : (إِنِّي لَأَقُومُ في الصَّلاةِ ، أُريدُ أَنْ أُطَوِّلَ فيها ، فَأَسْمَعُ بُكاءَ الصَّبِيِّ فَأَتَجَوَّزُ في صَلاتي ، كَراهِيَةَ أَنْ أَشُقَّ على أُمِّهِ)

ـ رَواهُ البُخارِيُّ : ٧٠٧.

## سەرچاوەکان :

١) رَوْضَةُ المُتَنَزِّهِ ، شَرْحُ بِدايَةِ المُتَفَقِّهِ ، أيْمَن بن علي موسى ، ج١ ص٢٦٤ ـ ٢٧٩ ط : ١ ، ٢٠١٠ دارُ إبْنِ رَجَب .

٢) ئاسودەی ئیسلام ، فاتح مەلا ڕەسول شارەستێنی ، ب١ ، ل٦١٥ .

٣) گۆڤاری دوانگە ، ژمارە : ٤٤ ، نیسانی ٢٠١٢ ، ل٢٦ . بابەتی ئازادی و بەرپرسیارێتی زمان و ووشە ، لە نوسینی : پ . دکتۆر عەلی قەرەداغی .

٤) موسوعة أسْماء اللهُ الحُسْنَى . د . محمد راتب النابُلسي ، ج٢ ص٨٩٥ .شیکردنەوەی ناوی پیرۆزی ـ الرَّقیب ـ .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیمان دارانی بەڕێز: دانیشتنی ئەمشەویشمان هەر لە خزمەت مەجلیسی پێغەمبەری خودا دایە ﷺ، ئەمشەویش کوڕێکی گەنج کێشە و گرفتێکی هەیە، دێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، ئێمەش هەروەکو شەوانی ڕابردوو دەچینە خزمەتی و سەلام کردنی ئێمە بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ بریتی دەبێت لە: سڵاواتدان لەسەر دیداری ئەو خۆشەویستە:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)

## درێژی نوێژەکەی بێبەشم دەکات لەجەماعەت

خۆشەویستان: کوڕێکی گەنج دەچێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺو موشکیلە و گرفتێکی هەیە، با گوێی بۆ بگرین بزانین کاتێك موشکیلەکەی باسدەکات گرفتی ئەو چیە؟ دەفەرمووێت: (یا رسول الله) ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ،(إني لأتأخَرُ عنِ الصَّلاةِ في الفَجر) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من مەحرووم بووم، من بێ بەشبووم لە بەرەکەتی جەماعەتی نوێژی بەیانیان، بۆ کوڕی گەنج؟! بۆ ناتوانی جەماعەتی بەیانیان لە مزگەوتدا بکەیت؟ دوژمنداری لەبەر دوژمنەکانت بەو شەوە تاریکە ناتوانی بچیت بۆ جەماعەت؟ نەوەڵا ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ..

ئەی کوڕی گەنج نەخۆشیت لەبەر نەخۆشی ناتوانی بچیت بۆ جەماعەت؟ نەوەڵا ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، دڕندە و مار و دووپشك لە ڕێگەتدا هەیە دەترسی پێوەت بدەن، چرات نیە گڵۆپ و لایت و ڕوناکیت پێ نیە؟ نەوەڵا ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەمانە

نین، من دەتوانم بچم بۆ مزگەوت، ڕێگام ئەمینە مەترسی نیە، بەڵام لەبەر یەك شت ناچم بۆ نوێژی بەیانیان، مەحرووم بووم لە بەرەکەتی نوێژی بەیانیان..

بەڕێزان هەر کەسێك نوێژی بەیانی لە مزگەوتدا بە جەماعەت بکات، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: لە زەمانەتی خودای گەورەدایە (إنشاء الله)، خودا دەیپارێزێت هەتا نوێژی بەیانی داهاتوو، هەر کەسێك نوێژی بەیانیان بە جەماعەت لە مزگەوتدا بکات، خودا ئەو ڕەحمەی لەگەڵدا بکات هەولبدە وەکو ئەوە وایە نیوەی ئەو شەوە لەسەر بەرماڵ شەو نوێژی کردبێت، ئەی گەنج ئەی بۆ تۆ مەحروومی لەم خێر و بەرەکەتە؟!

دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ (مِمَّا يُطِيلُ بنا فُلانٌ فيها) وەڵاهی من بۆیە مەحرووم بووم لەوخێر و بەرەکەتەی نوێژی بەیانی چونکە فڵان کەس ئیمامی مزگەوتە، مامۆستای مزگەوتەکە، ئیمامی مزگەوتەکە، مەلای مزگەوتەکە، نوێژێك دەخوێنێت بەیانیان نوێژێکی یەکجار دوور و درێژە.. ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من ئەهلی کەسابەتم، وەڵاهی ناتوانم ئەوەندە بمێنمەوە، وەختێك ئەو سورەتێکی وادرێژ دەخوێنێتەوە دونیا تەواو ڕوناك بۆتەوە.. کاتێك دەچمە بازاڕ خەڵك دەمێکە پێش من کەوتووە، لەبەر ئەوە ناچارم هەر لە هەیوانی مزگەوتەکە بەپەلە دوو رکات نوێژی بەیانی دەکەم، بۆ ئەوەی فریای کەسابەت بکەوم..

ئایا پێغەمبەری خودا ﷺ لەم گەنجە تووڕەبوو؟ بفەرمووێت کاکە ئەوە بۆ بۆ دونیاکەت ئاوا ئازایت، بۆ کار و کاسپیەکەت ئازایت؟! ئەوە بۆ ئەوەندە بۆ نوێژەکە عاشق نیت ئەی خودا نافەرمووێت:﴿وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾﴾ الأسراء. ئای لە لەزەتی قورئان خوێندنی بەیانیان بە تایبەت لە نوێژدا..

بزانین پێغەمبەری خودا ﷺ لەم گەنجە تووڕە بوو، فەرمووی تۆ مونافیقی، تۆ دوو ڕوویت، تۆ حەزت بە قورئان و دینداری و مزگەوت و نوێژی درێژ نیە.. پێغەمبەر ﷺ تووڕەبوو (فَغَضِبَ رَسول الله ﷺ ما رأيتهُ غَضَبَ في موضع كان أشَدُّ أشَدُّ غَضَباً منهُ يومئذٍ)

ئەو صەحابەیە ئەم حەدیسە دەگێڕێتەوە (أنَسْ)ە، دەفەرمووێت: وەڵاهی پێغەمبەر ﷺ توڕەبوو بە توڕەبونێك هەرگیز لەمەوپێش توڕەبوونی وامان لە پێغەمبەری خودا ﷺ نەبینی بوو، بەڵام بزانین لە کێ توڕەبوو.. (ثُمّ قال) چووە سەر میمبەر فەرمووی:

ئەی خەڵکینە (إنَ منكم مُنفِّرينَ) بەڕاستی ئێوە خەڵکێی واتان تێدایە، ئەم خەڵکە لە ئیسلامەتی دوور دەخاتەوە، ئێوە خەڵکێکتان تێدایە خەڵکی دەترسێنێت لە دینداری، خەڵکی مەحرووم دەکات لە بەرەکەتی مزگەوت، لە جەماعەت، لە قورئان خوێندن، لە زیکر و ویرد، ئێوە کەسانێکتان تێدایە نەفرەت کەرن، دوور خەرەوەی خەڵکن لەم ڕەحمەتە، (فَمَن أمّ النّاس) ئاگاداربن هەر کەسێك پێش نوێژی بۆ خەڵك کرد، (فَلْيَتَجَوّز) با نوێژێکی پوخت بکات، زۆر درێژەی پێ نەکێشێت..

(فَإن فيهم الضّعيف وَ الكبيرَ وَ ذا الحاجّة) چونکە لەناو ئەو خەڵکەدا کەئێوە پێش نوێژیان بۆ دەکەن، لەناو ئەو خەڵکەدا خەڵکێکی تێدایە لاوازە، بێهێزە، ناتوانێت زۆر بوەستێت، خەڵکێکی تێدایە پیر و بەساڵدا چووە، چووەتە تەمەنەوە، لاواز بووە لەبەر پیریدا خۆی بۆ ڕاناگیرێت، خەڵکێکی تێدایە خاوەن پیشەیە وەکو ئەم گەنجە، خواخوایەتی زوو نوێژەکەی تەواو بکات و فریای کار و کەسابەتەکەی بکەوێت.. خەڵکێکی خاوەن پێداویستی تێدایە خەڵکێکی تێدایە، وڵاخەکەی لەدەرەوە بەستوەتەوە، ئوتومبێلەکەی بەجێهێشتووە دڵی لەلایەتی، سەردان و میوانێکی هەیە..

لەبەر ئەوە فەرمووی قبوڵ ناکەم بە ناوی ئیمامەتی مزگەوتەوە، گەنجێکی ئاوا لە نوێژی بەیانی مەحرووم بکرێت، ئەو ئیمامەی ئاگادار کردەوە دەبێت نوێژەکەت کورت و پوخت بێت، جا حەز دەکەیت دوایی بڕۆ هەتا نوێژی نیوەڕۆ قورئان بخوێنە، بەڵام نابێت ئەم دینداریەی تۆ ئەی ئیمامەکە، ئەی ئەو کەسەی حەزت لە نوێژی درێژە، ئەی ئەو کەسەی حەزت لەقورئان خوێندنە، نابێت دینداریەکەت لەسەر حیسابی خەڵك بێت!!

ئەمە دەرسی ئەمشەومانە کە ئەم حەدیسە (متفقٌ علیە)ە، لە صەحیحی (بوخاری) و (موسلیم)دا هاتووە، یەعنی دینداری و خوداناسی نابێت لەسەر حیسابی خەڵکانی تر بێت، نابێت لەسەر حیسابی ئازاردانی بەشەرەکانی تربێت..

## بە گریانی منداڵێك نوێژەکەی کورت کردەوە

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: نوێژی بەیانیم دەکرد بەجەماعەت بۆ خەڵکی مسوڵمان و صەحابەکان، دەکرد پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت:

وەڵاهی حەزم دەکرد نوێژەکە ئەوەندە درێژ بکەمەوە، زۆری قورئان تێدا بخوێنم، لەو کاتەدا گوێم لە گریانی منداڵێك بوو.. لەو کاتەدا لە زەمانی پێغەمبەر ﷺ مزگەوتی پیاوان و ئافرەتان یەك مزگەوت بووە، یەعنی ئەم مزگەوتە بیکەی بەدوو بەشەوە دیواریش لە بەینیاندا نەبووە، پەردەش نەبووە، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو:

پیاوان وەرنە پێشەوە، منداڵان لە دوای پیاوانەوە، ئافرەتان ئێوە لە دوای منداڵەکانەوە بوەستن.. هەمووی لەیەك مزگەوتدا جەماعەتی دەکرد، ئافرەتان نوێژی بەیانیش دەهاتنە مزگەوت، منداڵی مەلۆتکەشیان دەهێنا بۆ مزگەوت..

ئێستا خەڵك پێی سەیرە ئافرەت بچێت بۆ مزگەوت، مزگەوتی خۆی هەیە، دەرگای هەیە، پەردەی هەیە، هێشتا بەلایەوە عەجیبە ئەوە ئەو ئافرەتانە بۆ دێن بۆ مزگەوت! بابە لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ لەیەك مزگەوتدا خەڵك نوێژی دەکرد.. ئەهلی مزگەوت فریشتە ئاسایە، خەڵك لە شوێنی تردا گورگە، تۆ لە گورگ بیپارێزە، ئەینا (إنشاء الله) لەناو مزگەوتدا توشی خراپە نابێت.

بەڵێ خۆشەویستان: دەفەرمووێت کە گوێم لە دەنگی منداڵەکەوەبوو لە دوای دەنگی منداڵەکە یەکسەر (فلیَتَجَوَّز) نوێژەکەم کورت دەکردەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت نوێژەکەم کورت دەکردەوە دەموت بادایکی منداڵەکە ناڕەحەت نەبێت، چونکە لەزەت لە نوێژەکە ناکات، منداڵی مەلۆتکە بگری و تۆ نوێژ بکەیت لەبەر منداڵەکەی ئاگای لە

نوێژەکە نامێنێت. لەبەر خاتری دڵی ئەو دایکە لە ڕیزی دواوە، پێغەمبەری خودا ﷺ یەکسەر نوێژەکەی کورت دەکردەوە، نابێت عیبادەتت لەسەر حیسابی خەڵکی بێت، دەبێت ڕەچاوی بەرژەوەندیەکان بکەیت، (سبحان الله) ئەم دینە ئەگەر لێی حاڵی ببین چ جوانیەکی تێدایە، چەند ڕێزی مرۆڤی تێدایە، پێغەمبەری خودا ﷺ موژدەی داوە: نوێژی بە جەماعەت گەلێك خێرە، هەر کەسێك لە ماڵەوە بەنیەتی نوێژی جەماعەت بێت بۆ مزگەوت.. ئێستا موژدە لە جەنابتان، گەلێکتان زۆر ڕێگاتان لەم مزگەوتە دوورە، دڵنیابە هەر هەنگاوێك یان هەر خولێکی تایەی سەیارەکەت کە پێی دێیت (إنشاء الله) پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (خودا ئەجرێکت بۆ دەنوسێت گوناحیشت لە کۆڵ دەکاتەوە).

کۆمەڵە صەحابەیەك هەبوون لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ، ماڵیان زۆر دوور بوو لە مزگەوت، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، ڕاوێژت پێدەکەین دەفەرمووی چی ئەگەر لە دەووری مزگەوتەکەی تۆدا هەندێك پارچە زەوی بکڕین بیکەین بە خانوو؟

فەرمووی: (دیارکم آثارکم، دیارکم آثارکم) وازبهێنن، وازبهێنن، بە خودا ماڵە دوورەکانی خۆتان قازانجی زیاترە.. چونکە هەموو هەنگاوێکتان بە چاکەیەکە، هەر هەموو هەنگاوێك، هەتا فەرمووی: هەنگاوی گەورە و بەپەلە مەهاوێن، هەنگاوەکانتان با بچوك بێت، بۆ ئەوەی چاکەکانتان زۆرتر بێت ئەوە فەزڵی جەماعەتە، یەك نوێژ لە مزگەوتدا بەجەماعەت بە (٢٧) نوێژ حیسابە، لە ماڵێ، بەنیەتی جەماعەت هاتیت، مستیت نەکرد، بەڵام ئیمام پەلەی کرد بوو.. یان خەڵکەکە زۆر چاوەڕێیان کردبوو.. جەماعەتەکە کرابوو.. تۆ بەتەنها نوێژەکەت کرد خودا (٢٥) نوێژت بۆ دەنوسێت!! (سبحان الله) لەو بەرەکەتە!!

حەدیسەکە دەفەرموێت: (٢٥،٢٧)، (٢٧) ئەوەیە کە: لەگەڵ ئیمامدا بیکەیت.. (٢٥) ئەوەیە کە: خۆت بە تەنها بیکەیت، فریای هیچ نەکەوتوویت، بەتەنها لەهەیوانەکە نوێژت کرد، خودا (٢٥) نوێژت بۆ دەنوسێت!

(سبحان الله) ئەم جەماعەتە نابێت لەسەر حیسابی خەڵك بێت، چونکە لە حەدیسدا دەفەرموویێت: (من أكلَ ثوماً أو بصلاً) هەر کەسێك لە ئێوارە سیری خوارد یان پیازی خوارد (فليَعتَزِلنا) بالێمان دوور بکەوێتەوە (أو فليَعتَزِل مَسجِدَنا)، نەیەتە مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، (سبحان الله) (٢٧) دانە خێری لەکیس چووە ئەوکەسە، ئەو هەموو هەنگاوانە، لەوانەیە (٥٠٠) هەنگاوی نابێت، (٥٠٠) چاکە، (٥٠٠) گوناحی لەکۆڵ دەبێتەوە..

مادام بۆنی سیر و پیاز لەدەمت دێت مەیە بۆ جەماعەت، لێمان دوور بکەوە، پێغەمبەر ﷺ وادەفەرموویێت.. نابێت بڵێیت بە خودا حەزم لە سیرەکەشە، بۆ دڵم چاکە، بۆ خوێن باشە حەزم لە پیازەکەشە، ساوەر پێوەی دەخورێت.. دوو قاپی کە دەخۆیت، بەڵام بە خودا حەزم لە نوێژی جەماعەتەکەشە، وەڵابرا دەبێت حەزت لە یەکێکیان بێت، نابێت (خورمژی) بخۆیت! نابێت، حەزت لە نوێژی جەماعەتەکەیە لە ڕیزی پێشەوە لێی داکوتی، یان لە ناوەڕاستەوە بۆنی سیر و پیاز ئەو خەڵکە ئازار بدات، نەزانێت چی بڵێت، دەبێت یەکێکیان هەڵبژێریت، نابێت دینداریەکەت لەسەر حیسابی خەڵك بێت، لەسەر بۆنی ناخۆش کردن بە لوتی خەڵکدا بێت.

(سبحان الله) ئەم دینە چ عەزەمەتێکی تێدایە، پرسیار کرا لە ئیمامی (شافیعی) "ئیمامی (شافیعی) لەساڵی (٢٠٤)ی کۆچی وەفاتی کردووە یەعنی (٢٠٤) ساڵ لەدوای هیجرەتی پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەککەوە بۆ مەدینە وەفاتی کردووە، نزیکەی (٢٠٠) ساڵ لە دوای کۆچ کردنی پێغەمبەر ﷺ ئیمامی (شافیعی)ش وەفاتی کردووە"

لێیان پرسی: ئەی ئیمام، ئەگەر یەکێك کرێکاری بۆ کەسێك دەکرد، مافی ئەوەی هەیە نابێت خاوەن کار ڕێگەی لێبگریێت نوێژی نیوەڕۆکەی لە کاتی خۆیدا بکات؟ واتە واجبە ئەمە، عیبادەتی خودایە، بۆ کەس تەرك ناکرێت..

خۆشەویستان ئیمامی (شافعی) فەرمووی واجبە ئەم ئینسانە لە کاتی نیوەڕۆدا هەستێت نوێژێکی پوخت و خاوێن بکات، بەڵێ نوێژەکەی کرد، کابرا لە نوێژ بویەوە

کابرای کرێکار، ئەها جوان گوێی بۆ بگرن، کابرا کە لە نوێژ بوویەوە ئەمجا وتی: خۆ من وامزانی نوێژی چێشتەنگاو کەدەست نوێژم هەڵگرتووە دەست نوێژم ماوە.. خۆ دەست نوێژم هەڵنەگرتەوە، بەڵام بەو خودایە بێدەست نوێژیەکم بەسەرداهاتووە، هەستی بە خۆی کرد، دەستێکم بە ئاو گەیاندووە، خۆ بە خودا دەست نوێژم نەبووە، فەرمووی: واجبە جارێکی دیکە بچێت دەست نوێژ بگرێت، ئەمە حەقێکی خودایە، بەڵام دەبێت لە دوایدا کە ئێوارە دەستی لەئیش هەڵگرت ئەم نوێژەی دووەمیان چەند دەقیقەی خایاند، ئەوەندەش دەقیقە ئیش بۆ خاوەن کارەکەی بکات.. ئەینا خودای گەورە لێی قبوڵ ناکات!!

(سبحان الله) ئەم نوێژەی یەکەمیان حەقی خۆت بوو، بەڵام نوێژی دووەمیان کە جارێکی دیکە ڕۆشتووی دەست نوێژت تازە کردۆتەوە و نوێژت کردووە، حیسابت کردووە (٧) دەقیقە، (١٠) دەقیقەت پێچووە، دەبێت لە ئێوارەدا (١٠) دەقیقە ئیش زیاد بۆ خاوەن کارەکە بکەیت، ئەینا خودای گەورە لێت قبوڵ ناکات، نابێت نوێژەکەت لەسەر حیسابی خەڵکی بێت، (سبحان الله) دەبێت دین داریەکەت ڕەمزێکی جوان بێت، بۆ ئەوەی ژیان جوان بکەیت، ئێمە موشکیلەمان ئەوەیە: جاری وا هەیە کابرا کرێکارە دائیم لە ترسی کرێکاریەکە، پێی خۆشە نیو سەعات لە مزگەوتدا بمێنێتەوە!! بەڵام دین داری ڕاستەقینە ئەوەیە: لەسەر حیسابی خەڵک نەبێت.

## کرێکارێك بوە هۆی هیدایەتی بەڕێوبەرەکەی !!

دکتۆر( محمد راتب نابلسی)چیرۆکێکی زۆر سەرنج ڕاکێشمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەها خەڵك سەیری چی ئیماندارەکان دەکات؟ بەڕێزان ئیماندارانی خۆشەویست، دکتۆر (محمد) دەفەرمووێ: من لە مزگەوتی دیمەشقدا، هەموو دوای بانگی نیوەڕوانێك، کە ئیمام پێشنوێژیەکە خەریك بوو نوێژی دادەبەست، خەڵك زۆر کۆدەبونەوە، مزگەوتی بازاڕ بوو زۆر قەرەباڵغ بوو..جەنابتان ئەو مزگەوتانە شارەزان کە لەناو بازاڕن، دوکاندار و

کاسبکار و، تا دە دەقیقە زیاتر ڕادەوەستێت.. هەتا لە شەرعدا دەفەرمووێت:

نابێت ئیمامی مزگەوت لە (١٠) دەقیقە، چارەکێ، زیاتر چاوەڕێی خەڵك بکات. ئەگەر خەڵك کۆبوونەوە، زۆری حەدی هەرە زۆری لە (١٠) دەقیقە،چارەکێك زیاتر ڕانەوەستێت، دەبێت جەماعەت بکات ئەگەر (٥) کەس حازر بوون، ئیمام سەیری کردن (١٠) کەس حازرن، بەڵام وا (٢٠) کەس بەرەو مزگەوت دێن، بەڵام (١٠) دەقەیە زیاتر بانگی داوە، دەبێت خێرا جەماعەتەکەی بکات.. نابێت بڵێت با ئەو جەماعەتەش فریا بکەون، لەبەر خاتری ئەمانە، نابێت فریاکەوتنی ئەوانە لەسەر حیسابی ئەمانە بێت، چونکە ئەمان دەمێکە دانیشتون.. لەوانەیە ئەمان وەڕەسبن، لەوانەیە ئەمان برسیان بێت، لەوانەیە ئەمان سەردانیان هەبێت.. میوانیان هەبێت..

دەفەرمووێ: ئەو ئیمامە تەقریبەن چارەکێك لەدوای بانگەوە چاوەڕێ دەکات، تا وەکو خەڵکەکە کۆ دەبنەوە،جالەو دەرفەتەدا من مەوعزەیەکی بچکۆلەم دەکرد، ئامۆژگاریەکم بۆ خەڵك دەکرد، خەڵك پێی خۆش بوو، خەڵکەکەش گوێ ڕایەڵ دەبوون و بێدەنگ دەبوون، خەڵکیش وردە وردە دەست نوێژیان دەگرت و دەهاتن دادەنیشتن.. دەڵێت: ڕۆژێکیان کابرایەك رەئیسی دائیرەیەك، وەکو ئەم مزگەوتەی ئێمەو ئەو دائیرانە، دەڵێت: رەئیسی دائیرەیەك کە بەعومری خۆمان نەمان بینی بوو لە ناو مزگەوتدا، ڕۆژێکیان بینیمان لە مزگەوتدایە، نوێژی عیشامان کرد هات بۆ مزگەوت، ئەی لە خودا بە زیاد بێت، ئەم مەسئولە، ئەم کاربەدەستە، ڕووی لەخودا کردووە..

وتمان: دەبێت چ حەدیسێك کاری لەم پیاوە کردبێت؟! دەبێت کێ قسەی بۆ کردبێت؟ دەڵێت: چووینە لایەوە لەگەڵ ئیمامی مزگەوتەکەدا، وتمان: یاخودا بەخێر بێیت.. دەی چەند جوانە کاربەدەستانی حکومی لە ڕیزی خەڵکدا بن، دڵیان پێی ئەگەشێتەوە، فەرەح دەبێت، ئەویش خەڵك دەبینێت، خەڵکیش ئەو دەبینێت، ئەوە کێ بوو بەهۆی هیدایەتت؟ چ کەناڵێکت گوێ لێگرت؟ وتاری چ مامۆستایەکت گوێ لێبوو؟

وتی: وەڵاهی من یەك کرێکار ئامۆژگاری کردم..! کرێکارێك!! وتی: ئەرەوەڵا کرێکارێك ئەلف و بێ لەیەك جیا ناکاتەوە، کام کرێکارە؟! وتی: وەڵا فەراشی دائیرەکەمان.. وتم: چۆن؟ وتی: دەبا بۆت باس بکەم، ئێمە فەراشێکمان هەیە لەو دائیرەدا، کارگوزارێکمان هەیە، ژینگە پارێزێکمان هەیە، پیشەیەکی ڕێزدارە، هیچ فەرقی نیە لەگەڵ مودیری دائیرەکەدا، ئەم پیاوە ڕووخسەتی لە من خواست و ووتی:

تۆ بەڕێوبەری ئەم دائیرەی، من بەبێ پرس ناچم، بەڵام وەڵاهی عاشقی نوێژی جەماعەتم، لە منداڵیەوە حەزم نەکردووە نوێژەکانم بفەوتێت، ئەگەر جەنابت وەکو مودیری دائیرەکە و من باخەوانێکم لێرە، باخەوانێکم ئەو نەمامانە ئاو دەدەم و پیسیەك هەبێت کۆی دەکەمەوە، ئەگەر ڕووخسەتت لەسەر بێت نوێژی نیوەڕوان دەچمە مزگەوت جەماعەتەکەم دەکەم، وەعد بێت خۆم دواناخەم.. نوێژەکەم کرد دەگەڕێمەوە..

دەڵێت: منیش وتم: ئاساییە برا نوێژەکەشت بکە، ئیسراحەتێکیش دەکەیت، خۆ ئیشەکەی تۆ ئەوە نیە هەموو دەقیقەیەك ئیمزا بۆ خەڵك بکەیت.. لەدوایدا ئیشی خۆت کردووە، لەدوایدا ئیشی خۆت هەر کردووە.. لەبەیانیەوە لەدوایدا دێیتەوە هەتا سەعات (٣) لە دائیرە دەبیت، ئاساییە برۆ هیچ مانیعێکم نیە..

دەڵێت: من پیاوێکی دیندار نەبووم، بەڵام پێم بێویژدانی بوو ڕێگەی خوداناسی لە خەڵك بگرم، بە تایبەتی ئەو پیاوە ئەگەر بچوایە بۆ مزگەوت، مزگەوتەکە لە تەنیشت دائیرەکەبوو، هەروەکو ئەم دائیرە و مزگەوتە، هیچ لەسەر زەرەری خەڵك حیساب نەدەبوو، ئیزنم دا ئەویش ڕێك و پێك دەچوو جەماعەتی خۆی دەکردوو، دەهاتەوە..

ڕۆژێکیان کە هەموو مۆزەفێك ئیجازەی هەیە، ئەویش تەقدیمی کرد، کە منیش لە مەسافەی ئەو دوو مانگەدا هیچ ئیجازەیەکم نەبووە، بۆم هەیە چوار پێنج ڕۆژ مۆڵەت وپشوو وەرگرم.. وتم: شەش دانە ڕۆژ بۆت هەیە ئیجازە وەربگریت، چونکە تۆ لەم مەسافەیەدا، تۆ نە نەخۆشی، نە سەفەر، هیچت نەبووە.. شەش ڕۆژ بەڕێزت بۆت هەیە سەفەرێك بکەیت، سەردانێك بکە.. وتی: زۆر مەمنون زۆر خۆشحاڵم..

دەڵێت: بەیانی كە دەچمە دائیرە، سەیر دەكەم ئەو وەكو ڕۆژان لە پێشەوە لە دائیرەیە، خەریكی باخ و ئەوانەیە، وتم: برا تۆ لێت تێكچووە! تۆ لەم ڕۆژەوە پشووتە، ئیتر بۆ هاتوویتەوە بۆ دائیرە؟!

وتی: قوربان وەڵاهی من زۆر خۆشحاڵم كەئەو شەش ڕۆژەم هەبوو، چونكە من شەش ڕۆژ قەرزاری ئیش و كارم بۆ ئەم دائیرەیە، وتم: باوەڕ بكە لە سجیلی غیابی تۆدا یەك ڕۆژ غیابت نیە، تۆ بۆ ئیش لەخۆت قورس دەكەیت، ئەگەر هەبوایە پێمان دەوتیت.. وتی: قوربان من ئیجازەم لە جەنابت وەرگرتووە بۆ ڕۆیشتم بۆئەو مزگەوتە و بۆ نوێژی جەماعەت، من وتم: بۆ نوێژی جەماعەت.. بەڵام وەڵاهی لەو مزگەوتە مامۆستایەك دەوری (٥) بۆ (١٠) دەقیقەیەك حەدیسێكی زۆر خۆش دەخوێنێتەوە، ئەوەندە حەزم لە حەدیسەكەی بوو، گوێم لێدەگرت و لەگەڵ ئەوانیش جەماعەتەكەم دەكرد..

بەڵام من بە تۆم وت بەس نوێژەكە دەكەم، بە خودا لەدوای نوێژەكە لێت شاراوە نەبێت سونەتی دوای نوێژی نیوەڕۆشم دەكرد، كە من نەموتوە نوێژی سوننەت دەكەم! بەڵام هەمویم بە قەڵەم و كاغەز نوسیوە، لەو مەسافەیەدا دەكاتە شەش ڕۆژ دەوام، ئەو شەش ڕۆژە دێمەوە كامل دەوام دەكەم! لە جیاتی ئەو هەموو ڕۆژانەی لەدوای جەماعەتەكە و لە پێش جەماعەتەكە گوێم لە مەوعیزەی مامۆستا گرتووە..

نامەوێ لەسەر حیسابی دائیرەكە بێت، من چوم پرسم بەجەنابت كرد بەس بۆ نوێژە فەرزەكە!!

دەڵێت: وتم برام وەڵاهی ئەمەی تۆ دەیڵێیت لەكەسم نەبیستووە، ئەی قوربان بە خودا من شەرم لە تۆ ناكەم بە خودا منیش پێم خۆش بوو لەم شەش ڕۆژەدا، بڕۆم سەفەرێك بكەم.. ماڵی دۆستێك بەسەر بكەمەوە.. بەڵام ئەی خودا؟ خۆ خودا ئاگای لێیە!! هەموو ئەو كاتانە لەسەر من حیسابن، من نان لەو دائیرەیە دەخۆم، موچەی لەسەر وەردەگرم، مافی ئەوەمنیە من بێم لە مزگەوتدا دابنیشم، بەس بۆ نوێژە فەرزەكە

من ئیجازەم لەتۆ وەرگرتووە خوداش هەر ئەوەندە ڕێگام دەدات، بەلاَم زۆر خۆشحالّم بەم شەش ڕۆژەی خۆم لێرە کە ئیجازەم، قەرەبووی ئەو ماوە فەوتاوە دەکەمەوە..

دەڵێت: کەئەوەم بیست، وتم: دینێك ئەوەندە گەورە بێت، ئیمانێك بەو خودایەی کەوا کابرا چاوی لێی نیە، بەلاَم کابرا یەقینی هەیە (فإن لم تكن تراهُ فإنهُ يَراك) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەگەر تۆ خودا نابینیت دڵنیابە خودا دەتبینێت" ئەم پیاوە فەقیرە، نەخوێندەوارە، کارگوزارە، باخەوانە، دەست قڵیشاوە، بە موچەی کەم لە ترسی ئەو (رَبُ العالمين) کە قەرزاری قیامەت نەبێت، دینەکەی ناشرین نەکردووە.. مزگەوتەکەی لەسەر حیسابی دائیرەکە نەبووە.. وەلاّهی لەوێدا بەخۆمدا چومەوە و وتم: ئەو دینە شایەنی ئەوەیە پیاو بچێتە ناویەوە، وەلاّ من لەسەر دەستی ئەو کرێکارە تەوبەم کردووە، ئێستا دێمە مزگەوت..

(سبحان الله) جاری واهەیە کرێکارێکی دڵپاکی مسوڵمان پەنجا هێندەی مەلایەکی زۆرزان خزمەت بە دین دەکات، ئەم دینە هەموو کەسێك دەتوانێت بانگەوازی بۆ بکات بە تایبەتی بە ڕەوشتە جوانەکان، بە ئەخلاقە پەسەندەکان، بەڵێ گەنجەکە موشکیلەی هەبوو، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەترسی ئەو ئیمامە ناوێرم بێمە مزگەوت، چونکە ئەوەندە نوێژ درێژ دەکاتەوە من کەسابەتەکەم دەفەوتێت، پێغەمبەر ﷺ لە ئیمامەکە تووڕە بوو، لەسەر حیسابی دینداری خۆت ئازاری نوێژ خوێنێکی مزگەوتیش مەدە..

یارەبی خودایە لەدینەکەی خۆت شارەزامان بکەیت، کار و کردەوەی جوانی پێبکەین، (إنشاء الله) نمونەیەکی جوان بین، بەکردەوە جوانەکانی ئێمە مسوڵمانانە (انشاء الله) خەڵکی لار و لەوێر هیدایەت وەربگرێت.. عاقیبەتی هەموو لایەکمان بە خێر بکەیت..

تا شەوێکی تر و کێشەیەکی تر لەخزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بەخوداتان دەسپێرم

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَ رَحمَةُ اللهِ وَ بَرَكاتُهُ) .



# وانەی نۆیەم



## بابەت

## مانەوەی منالّ لای دایك..

## دوای جیا بوونەوەی..



# وانەی نۆیەم

## مانەوەی منالٚ لای دایك.. دوای جیابوونەوەی..

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى :﴿فَأَنفِقُواْ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُواْ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴿٦﴾﴾ الطّلاق.

* وَقالَ اللهُ تعالى : ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ﴾البقرة : ٢٣٣ .

* عَنْ عبدالله بن عمرو ، : أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ جاءَ تْهُ إِمْرَأَةٌ ، فَقالَتْ : يا رَسُولَ اللهِ ، إِنَّ إِبْني هذا ، كانَ بَطْني لَهُ وِعاءً ، وَ ثَدْيي لَهُ سقاءً ، وَ حِجري لَهُ حِواءً ، وَ إِنَّ أَباهُ طَلَّقَني ، وَ أَرادَ أَنْ يَنزِعه مِنيِّ ، فَقالَ لَها رَسُولُ اللهِ ﷺ : (أَنْتِ أَحَقُّ بِهِ مالَمْ تنكِحي). ـ رَواهُ أَحْمَد : (٢ / ١٨٢) وَ أَبُو داود : (٢٢٧٦) والحاكم (٢ / ٢٠٧) وَ صَحَّحَهُ ، وَ البَيْهَقي (٨/ ٤ . ٥) بإِسْنادٍ حَسَنٍ.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (الخالَةُ بِمَنْزِلَةِ الأُمِّ). ـ رَواهُ البُخاريُّ : ٤٢٥١.

* له شەرعدا دەفەرمووێ : (وَ إِذا فارَقَ الرَّجُلُ زَوْجَتَهُ وَ لَهُ مِنْها وَلَدٌ ، فَهِيَ أَحَقُّ بِحَضانَتِهِ إِلى سَبْعِ سِنينَ ، ثُمَّ يُخَيَّرُ بَيْنَ أَبَوَيْهِ ، فَأَيَّهُما اَخْتارَ ، سُلِّمَ إِلَيْهِ) .

- كِفايَةُ الأَخيار في حَلِّ غايَةِ الأَختِصار ، ص٦٣١. العَلاَّمَة المُحَدِّث : تقي الدِّين أَبي بكر بن محمد الحِصْنِيّ ط : ١ ، ٢٠١٣ ، دارُ الفَيْحاء ، دِمَشق .

## سەرچاوەکان :


١) الفِقْهُ المَنْهَجي ، د. مصطفى الخِن ، د . مصطفى البُغا ، علي الشرْبَجي . ج ٢ ص ١٨٢ ، ط : ١٣ ، ٢٠١٢ ، دارُ القَلَم ، دِمَشق .

٢) پوختەی فیقهی ئافرەتان ، ئەبو بەکری صدیقی ، ل٥٣٨ ـ ٥٤٢ چاپی سێیەم ، ٢٠١١ ، نوسینگەی تەفسیر .

٣) پایزەبرا ، مەلا ئەحمەدی شەریعە ، ل ١٠١ ـ ١٠٤ .

٤) ڕۆژنامەی یەکگرتوو ، ژ : ٩٠٠ لە ٢٣ / ٧ / ٢٠١٢ ، ل١١ ، بابەتی : دایە خەبەرم مەکەوە ، لە نوسینی : نیگار حەمەد علی .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز: ئەمشەویش لەگەڵ زنجیرە باسەکەماندا لە خزمەت جەنابتان دەچینەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، لە مەجلیس و دانیشتنی پڕ بەرەکەتی ئەو زاتە، ئەو سەروەرە سالارەدا، ئەو شەفیعی مەحشەرەدا دادەنیشین، ئێمەش بە دڵ و بەگیان دەچینە خزمەتی و سەلاوات دەدەین لە دیداری پێغەمبەری خودا ﷺ، دەڵێین:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

## ئەی پێغەمبەر ﷺ منداڵەکە بۆکاممانە ؟

خۆشەویستی خودا ئەمشەویش لە مزگەوتی مەدینەدا دانیشتووە، لەوکاتەدا کە لە ناو صەحابەکاندایە و کۆڕ و مەجلیسێکی خۆشیان هەیە و بەقورئان و، باسکردنی زروفی زەمەن و، باسکردنی ئەو ڕووداوانە کە لەگەڵ ئەو قورئانەدا دابەزیووە، لەو کاتەدا ئافرەتێك داوای ئیزن دەکات و دەڵێت:

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەمەوێت بێمە خزمەتت و منیش گیر و گرفت و موشکیلەم، هەیە بابزانین ئەو دایکە، ئەو خوشکەی ئەمشەو دێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، چ کێشەو گرفتێکی هەیە؟ دەفەرموێت: کە دێتەژوورەوە بۆ مزگەوت، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەموێت: وەرە پێشەوە، دێت و لەبەردەمی پێغەمبەری خودا و لەبەرچاوی هەموو صەحابەکاندا دادەنیشێت و منداڵێکی ساوای بە باوەشیوەیەتی، دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئائەم منداڵە، ئاماژە بۆ منداڵەکە دەکات، ئەم منداڵە

کە بە باوەشمەوەیە، (٩) مانگ بەم چەرمی سکەم هەڵمگرتووە، پاشان لە باوەش و لە دامێنی خۆمدا حەواوەتەوە، بە شیری ئەو مەمکانەم گۆشم کردووە، پێم گەیاندووە تێرم کردووە، ئێستا وا منداڵەکە کە تەمەنی ساڵێك تێپەڕیووە، هێشتا شیرە خۆرەیە، من لەم کاتەدا ئەم منداڵە بیلبیلەی چاوەکانمە، بۆم پێدەکەنێت، هەموو هیواو ئاواتم ئا ئەم منداڵە چاو گەشەیە، بەڵام بەداخەوە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، لەگەڵ باوکیدا نەمان توانی بەیەکەوە بگونجێین.. ژیانمان تاڵ بوو، ئەمڕۆ بڕیاری داو لێم جیابوویەوە، تەڵاقی دام.. ئێستا گرفتم لەوەدایە: جگە لەوەی جیابوونەوە بۆ خۆی دەردێکی گرانە، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ پەلاماری منداڵەکەشی داوە، دەیەوێت منداڵەکەشم لێم بسێنێتەوە، بەڵام وەڵاهی من ناتوانم بەبێ ئەو منداڵە بژیم، ئەوە پارچەیەك لە جگەرمە چۆن دەتوانێت منداڵەکەم لێبسێنێت؟

چونکە لە پێش ئیسلامدا ئەمە باو بوو، کاتێك کە ئافرەت تەڵاق دەدرا، یەکسەر منداڵەکە دەدرایەوە بە ماڵی باوکی، کەئافرەت تەڵاق دەدرا و لە مێردەکەی جیادەبوویەوە، منداڵی لێبوایە ساڵە وەخت، بوایە یەك ڕۆژ بوایە، دوو ساڵ بوایە، یەکسەر دەیان دایەوە بە ماڵی پیاوەکە و ئافرەتەکە بەبێ منداڵ دەهاتەوە ماڵی باوکی خۆی، خۆ ئەگەر منداڵەکە لە سکی دایکی دا بوایە، کەلەدایك دەبوو، نەیان دەهێلا قەترەیەك شیر بخوات، یەکسەر دەیان ناردەوە بۆ ماڵی باوکی منداڵەکە..

وەکو ئێستاش ئەوە لە کوردەواریدا هەیە دەستوورێکی ناشرینە، ئەوە دەستوورێکی پێش ئیسلامە، ئافرەتی واهەیە تەڵاق دەدرێت حامیلەیە، کەمنداڵەکە لەدایکی دەبێتەوە نایەڵن قەترەیەك شیر لە دایکی بخوات، هەر یەکسەر بۆی دەخەنە پەرۆیەك و بۆی دەنێرنەوە بۆ ماڵی باوکی منداڵەکە، ئەوە لە پێش ئیسلامدا وابووە..

ئەو پیاوەش بە تەعەصوبی پێش ئیسلامەتی هەر وای دەزانی ئەم دنیا هەیە، وتی: منداڵەکەت نادەمێ تۆم تەڵاق داوە، بەڵام منداڵەکەت نادەمێ، ئافرەتەکەش منداڵەکەی لەباوەش گرتبوو، مەردانە هاتەخزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ شەکوای خۆی کردو وتی:

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، من ناتوانم بەبێ منداڵەکەم بژیم، بەڵام ئەو پیاوە دەیەوێت ئەو منداڵەم لێبسێنێتەوە، چارم چیە؟

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (أنتِ أحَقُّ بهِ ما لم تَتَزوج) ئەی خوشکی خۆم، تۆ لایەق تری کە منداڵەکەت لابێت و بەخێوی بکەیت، شیری بدەیتێ و پێی بگەیەنی، بە مەرجێك شوو نەکەیتەوە، تۆ لایەق تری لە باوکی، باوکی با بۆ خۆی هەر بڵێ، هیچی بۆ ناکرێت لەگەڵتدا، تۆ واجبە منداڵەکە لای تۆ بێت، خەمت نەبێت، ناتوانن لێت بسێنن، منداڵی خۆت بەخێو بکە هەر وەختێك شووت کردەوە بەپیاوێکی بێگانە، پیاوێك کە مامی منداڵەکە نەبێت، کەسێکی منداڵەکە نەبێت، بێگانەیەك بێت بە باوکی منداڵەکە، ئەو کاتە بۆی هەیە داوای منداڵەکە بکاتەوە..

ئەو کاتە ڕەنگە تۆ ئەو مافەت نەمێنێت، ئافرەتەکە وتی: من لەسەر منداڵی خۆم دادەنیشم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەی بێخەمبە برۆ منداڵی خۆت بەخێو بکە..

کەواتە: دەرسی ئەمشەومان گرفتی ئەو خوشکانەیە کاتێك جیادەبنەوە لە مێردەکانیان منداڵیان هەیە، بەزۆری زۆرداری یان لە ترسی خەڵك، لەبەر چاوی خەڵك، دەڵێن: بۆ منداڵی خەڵك بەخێو بکەین، ماڵی باوکی کچەکە دەڵێن: جا ئێمە هەقمان چیە منداڵی خەڵك بەخێو بکەین، کابرا کچەکەمانی نەوێت،، بۆ منداڵی بۆ بەخێو بکەین کوڕەکەشی دەدەینەوە..

لەم بەینەدا ئەم دایکە جاری وا هەیە پێی عەیبە قسە بکات، جاری واهەیە ناتوانێت، دەڵێت من منداڵ بەچی بەخێو بکەم؟ لەو بەینەدا منداڵەکە دەبێتە قوربانی، منداڵەکەش دەبێتە قوربانی هەم دایکەکەش.

تەنانەت عولەمایانی وەکو (إبنُ الحزم) و(شیخ حسن) ی بەصری ڕەئیان وایە: دەبێت تەنانەت ئافرەتەکە شووش بکاتەوە، بەڵام شوو بکات بە پیاوێکی مەردی پیاوانە، تێرا ببینێت بە چاوی باوە پیارە سەیری ئەم منداڵە ناکات، وەکو منداڵی خۆی حورمەتی دەگرێت، هەتا ئەگەر ئافرەتەکە شووش بکاتەوە، منداڵەکەی هەر لێناسێنرێتەوە،

بەشەرتێك ئەو پیاوە پیاوانە بێت، قازی تێی رابببنێت كە ئەو منداڵە زایە نابێت، نابێتە قوربانی، وە ژیانی دایكەكەیش بە هۆی منداڵەكەوە تاڵ نابێت..

كەواتە: زنجیرەی بەخێوكەرەكان، من پێمخۆشە جەنابتان وەكو مسوڵمانێك ئەم حەقیقەتە شەرعیە بزانن: لایەق ترین كەسێك بۆ بەخێو كردنی منداڵ دایكە، ئەگەر دایكەكە شوی كردەوە، یان وتی ئەم مندڵە بەخێو ناكەم، ئەگەر پیاوەكەم منی نەوێت من منداڵی ئەوم بۆ چیە؟ یان شوی كردەوە بە پیاوێك، پیاوەكەش وتی وەلا من ئافرەتەكەم دەوێت، من منداڵی ساوای خەڵك بۆ بەخێو دەكەم..

لەم حاڵەتانەدا منداڵەكە دەدرێت بەكێ بەرێزان؟ دەدرێت بە دایكی دایكی منداڵەكە، دەدرێت بە نەنكی منداڵەكە، بەڵام دایكی باوكی منداڵەكە نا، دەدرێت بە دایكی دایكی منداڵەكە، ئەگەر نەنكیشی وتی: وەلا من بەسەری سپیەوە تازە منداڵم بۆ بەخێو ناكرێت.. دەدرێت بە پوری منداڵەكە، كامە پوریان؟ خوشكی دایكی منداڵەكە.

چونكە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (الخالةُ بمَنزِلَةِ أُمٍّ) خوشكی دایك كە پورە، لە جێگای دایكتە، دەدرێت بە خوشكی دایكی منداڵەكە، ئەمجا ئەگەر پوری منداڵەكە وتی: وەلا من منداڵی ساوای خەڵكم پێ بەخێو ناكرێت، بۆ خۆم منداڵی ساوام هەیە تاقەتی منداڵم نیە.. ئەمجا دەدرێت بە دایكی باوكی منداڵەكە، بە نەنكی، بەڵام كام نەنكەیان؟ ئەمجارە ئەم نەنكەیان كە دایكی باوكی منداڵەكەیە، كە دایە گەورەیەتی، ئەمجا ئەویش ئەگەر پێی بە خێو نەكرا، یان نەمابوو.. دەدرێت بە پوری منداڵەكە، بە خوشكی باوكی، ئەگەر هەر نەبوو.. ئەدرێت بە كچی برا، ئەمجا كە كەس كەس نەبوو، دەدرێت بە باوكەكە.

ئەها ئەم هەموو دەرەجەیە، هەر دەبێت ئافرەت منداڵ بەخێو بكات، ئەمجا كە كەس ئەم منداڵەی لەخۆی نەگرت، كە كەس نەبوو لەو بنەماڵەیە دەدرێتەوە بە باوكی منداڵەكە، ئەگەر باوك وتی من منداڵم ناوێت، من ژن دێنم منداڵم بۆ بەخێو ناكرێت..

دەدرێتە دەستی باپیری، باوکی باوکی منداڵەکە، ئەگەر کەس نەبوو دەدرێتە دەست برای منداڵەکە، ئەگەر نەبوو دەدرێتە برازا، ئەگەر هەر نەبوو دەدرێتە دەست مام.. بەم زنجیرە دەڕوات، نابێت بە ئارەزووی خۆت بڵێیت منداڵەکە دایکی بەخێوی نەکات، بیهێنە با دایە گەورەی بەخێوی بکات، دایکی باوکی بۆی بەخێو بکات، نەخێر دایکی دایك لەپێشترە، پوری خوشکی دایك لە پێشترە لە دایکی باوك، ئەمە شەرع ئاوا دابینی کردووە، جالەبەر ئەوە وریابن بەرێزان، ئەم حاڵەتانە خوشکت هەیە، کەسێکت هەیە، کچت هەیە شوو دەکات، جاری واهەیە تەڵاق دەدرێت، ناگونجێت، ئەمە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا جارێك و هەزار جار نیە، زۆرە بەتایبەتی لەم زەمەنەدا، ئەوا ئامان نەبی بە باعیسی دابڕینی منداڵێك لە دایکی، نەبی بە باعیسی دابڕینی منداڵێك لە دایکی.

## ئەوەندە گریا بۆدایکی.. مرد !

لە (کوڕەداوێ)ی شارباژێڕ ڕوداوێکی سەرنج ڕاکێش هەبووە، لە ساڵی (٣٠)یەکاندا ڕوویداوە، دەڵێت: منداڵێك ئافرەتێك لەدوای ئەوەی مێردەکەی دەمرێت، ئەو زەمەنە زەمەنی گرانی دەبێت، ساڵەکانی (٣٠)، لەبەر نەبوونی و نەداری عورفی زەمەنی ئەو وەختەی کوردەواری، دەیەوێت شوو بکاتەوە، شوو دەکاتەوە بە پیاوێك لە کوڕەداوێی سەروو، دوو دێن ئاوا بەرامبەر یەکن، منداڵێکی دەبێت..

ئەم منداڵە عومری لە دوو ساڵ تێپەڕی نەکردووە، (سبحان الله) کە خەڵك دێن جلی بوکێنی لەبەر دەکەن، دایکی دەڕازێننەوە شایەت حاڵی ئەو ڕووداوانە ئافرەتێکە دەیگێڕێتەوە لە سلێمانی، کە لە کتێبدا بۆ مامۆستایەکی دەگێڕێتەوە، ئێستا ماوە..

دەڵێت: هەر کە هاتن زانی بۆ دایکی دێن، ئەو منداڵە وەکو دڵی خەبەر بدات دەستی کرد بەگریان، دامێنی دایکی بەرنەدەدا و خۆی هەڵدەواسی بە دایکیدا، بە هیچ شێوەیەك بەری نەدەدا، ئەو ماڵەش وتیان خێرتان دەگات ئەو منداڵە لەگەڵ خۆتان بەرن..

وتیان: وەڵاهی منداڵی خەڵك بەخێو ناکەین، دوای شتێکی لێبێت، ئێمە بەس ئافرەتەکە دەخوازین، نەك منداڵی ساواش لەگەڵ خۆمان بەرین..

دەڵێت: منداڵەکەیان لە دایکەکەی پچڕی، منداڵەکە زۆر گریا، کەسێك خزمێکیان هات، گۆزەیەکی شکاو هەبوو، جوجك و مریشك و ئەوانە ئاویان تێدا دەخواردەوە.. نیوە بوو لە ئاو، بنەگۆزەیەك بوو، دەڵێت: منداڵەکەی هێنا وتی ئەوە دایکتە، ئاوەکە وەکو ئەوەی لە شووشەدا سەیر بکەی، منداڵەکە سەیری کرد وێنەی خۆی تێدا بینی، دەیوت دایە.. دایە.. دایکی ماچ دەکرد، هەموو شەو و ڕۆژێك ئەم منداڵە دەگریا، دەیان بردە سەر ئەو لەتە گۆزەیە، ئەیان وت ئەوە دایکتە، لەویایە، منداڵەکەش ئەوەندە عەقڵی پێنەدەشکا ئەمە وێنەیەکە، بەڵام وای دەزانی ئەمە وێنەی دایکیەتی، چونکە تا ئیستا خۆی نەبینی بوو لە ئاوێنەدا..

دەڵێت: ژیر دەبوویەوە، بەڵام پاش یەك مانگ بە بەردەوامی ئەو منداڵە دەگریا، هەتا لە ئاخیردا گیانی لەدەستدا، هەر ژیر نەبوویەوە بەبێ دایکی، یەعنی ئەوە تاوانێکی گەورەیە هەتا ئەگەر تەنانەت بە شوو کردنەوە منداڵ گەیشتە ئەو حەدە نابێت قوربانی بێت، ئەمە لە سیەکاندا ڕوویداوە..

## لەباوەشی دایکیا مرد

لەساڵی (٢٠٠٦) دا، لەم دەشتی کۆیە، لەبەر حورمەتی گوندەکە ناوی نەڵێم باشە، لە دەشتی کۆیە ئافرەتێك لەگەڵ مێردەکەیدا کە سەرەتای ژیانیشان دەبێت، منداڵێکیان دەبێت منداڵەکە چوار مانگ دەبێت، بەڵام دوایی بە هۆی ئاژاوەی خێزانی، ئافرەتەکە دەتۆرێت و دەڕواتەوە ماڵی باوکی..

ماڵی باوکیشی دەڵێن: بڕۆ جارێ منداڵەکەت لە ماڵی مێردەکەت دابنێ، ئەمجا وەرەوە، منداڵ بۆ ئێمە مەیەنەرەوە، کە خۆت تۆراوی قەیناکە، لەگەڵ مێردەکەدا

ناحەوێیتەوە، بەس منداڵەکە مەیەنەوە، ئەها ئێمە چەند بەسەقەتی لەم دینە گەیشتووین، ئەوە شتێکی ناڕەوایە قەیچێکە با منداڵی تۆشە بەخێوی بکەیت..

دەڵێت: کە هێنایانەوە، منداڵەکەیان پێدا ناردەوە بە دایکەکەیدا، لەبەردەم باوکی مێردەکەی دانا و بۆخۆی گەڕایەوە بۆ ماڵی باوکی، سێ دانە مانگی ڕێك ئەم ئافرەتە تۆرا، پاشان ئەم منداڵە بەردەوام دەگریا بۆ دایکی، زۆر ناڕەحەت بوو، ئەوەی کەوا مامۆستای ئاوایی و پیاو ماقوڵانی وەکو جەنابتان و کۆمەڵە گەنجێکی ڕێك و پێك، چونە بەینەوە، زۆریان تەکلیف لە ئافرەتەکە و لە ماڵی باوکی کچەکە کرد، هەتا ڕازی بوون ئەمجارەش ئافرەتەکە بێتەوە بۆ لای هاوسەرەکەی، دەڵێت: کەهاتەوە لە دوورەوە منداڵەکە دەگریا، ئەو دایکە وەکو شێت و هار، بیست مەتر زیاتری مابوو، ڕایکرد بەرەو منداڵەکەی، لەتاوا وتی منداڵەکەم بۆ بهێنن، لە ماڵی باوکی تازە پێی عەیب بوو منداڵەکە بێنێتەوە، تۆراویشە بەڕوودا کەوتبوو، دەڵێت: شایەت حاڵەکانی ئەو شوێنە ساڵی (٢٠٠٦) ڕوویداوە. دەڵێت: منداڵەکەیان هێناو دایکەکە لەباوەشی گرت، منداڵەکە لوتی نابوو بەسەر سنگی دایکیەوە، وەکو ئینسانێك کە هەناسەی توند دەبێت، بەهەموو هێزی خۆی هەناسەیەکی هەڵمژی، ملی لار بوویەوە، کە سەیری کرد ڕۆحی دەرچووە ! !

(سبحان الله) دوا هەناسەی دا لەباوەشی دایکی دا، ئەوەندە بە مەراقەوە ئەوەندە بە عیشق و خۆشەویستیەوە بۆنی سینەی دایکی کرد..

کەواتە: چ تاوانێکی گەورەیە کە پێغەمبەری خودا ﷺ ئاماژەی پێکردووە، هەر کەسێك ببێت بەباعیسی دابڕانی منداڵێك لە دایکی، خودای گەورە لە ڕەحمی خۆی مەئویسی دەکات، کەس لە ڕەحمی خودا مەئویس نابێت، ڕەحمی خودا ئەوەندە گەورەیە، قەتل بکەیت، زینا بکەیت، ئارەق بخۆیت، هەرچی گوناحە بەس شەریکت بۆ خودا قەرار نەدابێت.. لە ڕەحمی خودا مەئویس نابێت.

بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێك ببێتە هۆکاری تەڵاقدانی ئافرەتێك، هەر کەسێك ببێت لەیەك کردنی ژن و مێرد، بە قسەیەك، بە ڕەفتارێك، بە قسە

گێڕانەوەیەك، لە ئەنجامدا ئەم ژنە تەڵاق بدرێت، ئەم کورپەلە و دایکە لەیەك دابڕێن.. دەفەرمووێت: هەرکەسێك دایك و منداڵێك لەیەك دابڕێت، خودا ئەو کەسە لەڕەحمی خۆی دادەبڕێت! ڕەحمی خودا شمولی ئەو ناکات!!

زۆر خەتەرە، بۆیە بەردەوام ئاگامان لێی بێت، جاری واهەیە شەرت نیە هەر کچت هەبێت، یان خوشکت هەبێت، ئاگات لێی بێت بەقسەیەك نەبیتە هۆکاری ئاژاوەی ناو ماڵێك، کە تۆ بویت بەئاژاوە، بویت بەسەبەب ئافرەتەکە تەڵاقدرا، منداڵەکە لە دایکی دابڕا، ئەوە تۆ بەڕاستی گوناحی گەورەت دەکاتێ..

## خۆی بۆمناڵەی سوتاند

کۆتا بەسەرهاتێك کە مامۆستا (نیگار محمد)، مامۆستایەکە بۆمان دەگێڕێتەوە، "ئەو مامۆستای ئامادەییە" دەفەرمووێ: قوتابیەکم هەبوو لە ناوەندیدا زۆر بە ناز لە ماڵەوە بەخێو کرابوو، تاقانەی دایك و باوکی بوو، کچێك بوو کچێکی زۆر ڕێك و پێکیش بوو، بەڵام دواتر نەیان هێشت بچێتە خوێندنی کۆتایی، لە قوتابخانە دەریان کردوو، بە منداڵی بە شوویاندا، هەر زوو بەشوویان دا..

دەڵێت: کاتێك کە بەشوویان دا چونکە ئەوەندە کەم ئەزموون بوو، کەم تەمەن بوو، زۆری نەبرد لەدوای منداڵێك لەگەڵ مێردەکەیدا عاجز بوون و منیش بە حوکمی ئەوەی سەردانم دەکردن،هەر سەرەتاش ناڕازی بووم. وتم: لەمەکتەب دەری مەکەن، بەشووی مەدەن، گوناحە ڕەنگ بێت بە کەڵکی ماڵ و مێرد نەیەت، ئەمە کەم تەجروبەیە..

وتیان: نا، نا، ئێمە هەروا کچ بەشوو دەدەین، باشترە بێگرفت ترە، ئێستا ئەو ماڵە ڕێك و پێکن و ماڵێکی باشن، خزمی خۆمانن، بە هەرحاڵ بەشوویان دا، دوای منداڵێك لەگەڵ مێردەکەیدا نەگونجان، ئافرەتەکەیان بردە ماڵەوە و منداڵەکەیان لێسەند، کچەکە زۆر داوای کرد، کچێکی زۆر بچکۆلە و جوانی هەبوو..

دەڵێت: هەتا جارێك داوایان لە من کرد، منیشیان ڕاسپارد، کە بچم کچەکەی بۆ بهێنمەوە، باوکی منداڵەکە وتی من نە ئەو ژنەم ویستووە نە منداڵیشت دەدەمێ، چۆن دەهێڵم منداڵەکەم لەبەردەستی ئەودا پەروەردە بێت، بەهیچ شێوەیەك قبوڵی ناکەم.

ئەڵێت: ڕۆژێکیان ئەم ئافرەتە کە بەردەوام لە ژورەوە بوو دەگریا، دوای عەسرێکی زۆر درەنگ، دایکی دەچێتە ژورەوە سەیر دەکات ئەم کچە خەوتووە، دایکی منداڵەکە لە خەوێکی قوڵدایە، ئەویش دەست دێنێت بەسەریدا و دەڵێت کچم هەستە، هەستە، بەم دوای عەسرانە خەو باش نیە..

دەڵێت: کەهەستا وتی: خۆزگە دایکە خەبەرت نەدەکردمەوە، ئاخ خۆزگە خەبەرت نەکردمایەوە، ئێستا لە خەومدا منداڵەکەم لەناو باوەشمدا بوو، کچەکەیان بۆهێنا بووم لە باوەشمدا بوو، ئای لەو خەوە خۆشە، خۆزگە نەهاتیتایە ئەم ژوورەوە!

دایکی دەڵێت: زۆر مەحزوون بوو، ئەو دەستی کرد بەگریان، ئەویش بە گریان ڕۆشتە دەرەوە، وەختێکی زانی بۆنی دوکەڵ دەهات، هەر ئەوەندی زانی کچەکەی خۆی سوتاند و هاواری کرد.. منداڵەکەم.. و بۆ خۆی گیانی دەرچوو، جەستەی تەواو سوتاو مرد، یەعنی لەتاوی منداڵەکەی، دوانەفەسی ژیانی بە قوربانی ژیانی منداڵەکەی کرد، خۆی سوتاند چونکە ئیتر تەحەمولی دوری کچەکەی نەکرد!!

لەبەر ئەوە ئێمە ئاگامان لێی بێت، هەرگیز لە ژیاندا نەبینە هۆکار، هەتا جاری واهەیە ژن ئەگەرخراپ بێت تەحەمولی لەگەڵ نەکەیت، هەتا پیاو خراپ بێت ژن تەحەمولی لەگەڵدا نەکرد، ئەبێت تەحەمولی لەگەڵدا بکات..

بڵێت: لەبەر خاتری منداڵەکان، با ئەم منداڵانە سەرگەردان نەبن، با هەر چۆنێك بێت ئەم منداڵە لای دایکی بێت، پیاوەکە قوربانی بەخۆی بدات، جاری واهەیە ژنەکە قوربانی بەخۆی بدات، بڵێت: باشیرازەی ماڵەکە تێك نەچێت، چونکە دەترسم بتۆرێم منداڵەکەم لێ بسێنێت، ئەم منداڵە بکەوێتە بەردەستی خەڵك، با خۆمان بکەین بە قوربانی منداڵەکە، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین: منداڵ چارەسەری کێشە خێزانیەکانە، زۆر جار ژن

و پیاو ئەگەر کێشەیان هەبوو، سەیری منداڵەکان بکەن هەریەکە و لە حەدی خۆی تەنەزول بکات، کێشەی ئەو ماڵە کۆتای دێت..

ئەمە ئەو کێشەیە بوو، ئەو موشکیلەیە بوو کە لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ ئافرەتێك هەی بوو.. هەتا شەوی داهاتوو لە باسێکی تری ﴿ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشەم هەیە﴾ هەموو لایەکتان بە خودا ئەسپێرم.

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَ رَحمَةُ اللهِ وَ بَرَكاتُهُ) .

# وانەی دەیەم

## کێشەی ئەو کەسەی ویستی هەواڵ بداتە دوژمن

* عَنْ عَلِيٍّ ـ رضى اللهُ عَنْهُ ـ قالَ بَعَثَني رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنا وَ الزُّبَيْر وَ المقداد ، قالَ إنطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوضَةَ خاخٍ ، فَإِنَّ بِها ظَعينَةً مَعَها كِتابٌ فَخُذُهُ مِنْها ... فَذَهَبْنا تَعادَى بِنا خيلُنا حَتَّى أَتَيْنا الرَّوْضَةَ ، فَإِذا نَحْنُ بالظَّعينَةِ ، فَقُلْنا : أَخْرِجي الكِتابَ ، فَقالَتْ : ما مَعِيَ مِنْ كِتاب ، فَقُلْنا : لَتُخْرِجَنَّ الكِتابَ أَوْ لَنُلْقِيَنَّ الثِّيابَ ، فَأَخْرَجْتُهُ مِنْ عِقاصِها ، فَأَتَيْنا بِهِ النَبِيَّ ﷺ فَإِذا فيهِ مِنْ حاطَبْ بن أَبي بَلْتَعَةَ إلى أُناسٍ مِنَ المُشْرِكِينَ مِمَّنْ بِمَكَّةَ يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ النَبِيِّ ﷺ فَقالَ النَبِيُّ ﷺ ما هذا يا حاطِبُ ؟! قالَ : لا تَعْجَلْ عَلَيَّ يا رَسُولَ اللهِ ، إِنِّي كُنْتُ امْرَأً مِنْ قُرَيْشٍ ، وَلَمْ أَكُنْ مِنْ أَنْفُسِهِمْ ، وَكانَ مَنْ مَعَكَ مِنَ المُهاجِرِينَ لَهُمْ قَراباتٌ يَحْمُونَ بِها أَهليهِمْ وَ أَموالَهُمْ بِمَكَّةَ ، فَأَحْبَبْتُ إذْ فاتَني مِنَ النَّسَبِ فيهِمْ أَنْ أَصْطَنِعَ إِلَيْهِمْ يَداً يَحْمُونَ قَرابَتي ، وَ ما فَعَلْتُ ذالِكَ كُفْراً وَلا إِرْتِداداً عَنْ ديني ، فَقالَ النَبِيُّ ﷺ إِنَّهُ قَدْ صَدَقَكُمْ ، فَقالَ عُمَر : دَعْني يا رَسُولَ اللهِ فَأَضْرِبُ عُنُقَهُ ، فَقالَ إِنَّهُ شَهِدَ بَدْراً ، وَما يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللهَ عَزَّوَجَل اطَّلَعَ عَلى أَهْلِ بَدْرٍ ، فَقالَ : إِعْمَلُوا ما شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ). ـ رَواهُ البُخاري :٤٨٩٠.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : في اهْلِ بَدْرٍ : (إِنِّي لَأَرْجوا أَنْ لا يَدْخُلَ النّارُ أَحد إِنْ شاءَ الله ، مِمَّنْ شَهِدَ بَدْراً والحُدَيْبِيَّةَ). ـ رَواهُ مُسْلِم.

* قالَ سَعيدُ بْنُ مُسَيَّب : (لَيْسَ مِنْ شَريفٍ ، وَلا عالِمٍ ، وَلا ذي فَضْلٍ إلاّ وَفيهِ عَيْبٌ ، وَلكِنْ مِنَ النّاسِ مَنْ لا يَنْبَغي أَنْ تَذكر عيوبه ، فَمَنْ كانَ فَضْلُهُ أَكثَرَ مِنْ نَقْصِهِ وَهَبَ نَقْصُهُ لِفَضْلِه). - البِدايَة وا النِّهايَة ج٩ ، ص١٠٠ ، إبْنُ كَثير ، مكتَبة المعارف ، بيروت .

* وَقالَ الأمام إبْنُ القَيِّم : (مِنْ قَواعِدِ الشَّرْعِ وَالحِكْمَةِ أَنَّ مَنْ كثرت حَسَناته وَ عظمت ، وَكانَ لَهُ في الإسلامِ تَأْثيرٌ ظاهِرٌ ، فَإِنَّهُ يَحْتَمِلُ مِنْهُ ما لا يَحْتَمِلُ مِنْ غَيْرِهِ ، وَ يعفَى عَنْهُ مالا يعفَى مِنْ غَيْرِهِ ، فَإِنَّ المَعْصِيَةَ خبثٌ ، وَالماءُ إذا بَلَغَ القُلَّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلِ الخبثَ ، بِخِلافِ الماءِ القليلِ ، فَإِنَّهُ يَحْمِلُ أَدْنى الخُبْثِ) .

- مِفتاح دار السَّعادة ، ج١ ، ص١٧٦ ، إبْنُ القَيِّم الجوزيَّة ، دارُ الكُتُب العِلْمِيَّة ، بيروت.

## سەرچاوەکان :


١) فَتْحُ الباري ، شَرح صَحيح البُخاري ، إبن حَجَر العَسْقَلاني ، ج٨ ، ص٨٠٨ . ط : ٣ ، ٢٠٠٠ ، دارُ الفَيْحاء ، دِمَشق .

٢) خەمێکی لەبیرکراو ، د . خالد محمد صالح . ل ٧٧ - ٨٠ ، چاپی یەکەم : ٢٠١٣ ، سلێمانی .

٣) گۆڤاری ڕێگای شەرع، ژ . ٣ ، پایزی ٢٠١١ ، ل٦١ . بابەتی: حوکمی جاسوسی ، نوسینی : دلێر حەسەن .

٤) گۆڤاری چارە ، ژمارە : ٢١ ، حوزەیرانی ٢٠١٢ ، ل ١٤ ، هەولێر . بابەتی : (کێسی پاشماوەی سەگەکان لە ئەوروپا چی لەسەر نوسراوە ؟! لە نوسینی : تاڤگە کەریم .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز: ئەمشەویش لەم کاتە پیرۆزەدا، لەماڵی خودای گەورە، بەشێکی تر لە عیبادەتمان (انشاء الله) دانیشتنە لەم کۆڕ و مەجلیسانەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەچینەوە خزمەت خۆشەویستمان و سلاوات لە دیداری دەدەین و دەڵێین:

(اللّهُمَّ صَلی عَلی سَیِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلی عَلی حَبیبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلی عَلی شَفیعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

## نهێنی درکاند بەنەزانی

ئەمشەو دەچینە شاری مەدینەی پیرۆز، پێغەمبەری خودا ﷺ صەحابەکانی ئاگادار کردەوە لە کارێکی گەورە و گرنگ، کە ئامادەکردنی لەشکرێك و سوپایەکە بۆ ئەوەی لەکت و پڕێکدا چواردەوری شاری مەککە بگرێت، بەتەمای فەتح کردنی شاری مەککە، بەلام نابێت ئەم کارە هیچ کەس پێی بزانێت، چونکە نەخشەی سەربازی دەبێت زۆر نهێنی بێت، دەبێت ئەم لەشکرە نزیکی مەککە بێتەوە، ئەمجا کافرانی مەککە ئەم لەشکرە گەورە بە چواردەوری مەککەوە ببینن پاشان بزانن کە شەڕ کردن سودێکی نیە، بە ئومێدی خودای گەورە شاری مەککە بە ئاشتی فەتح بکرێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ کۆمەڵێك سەرکردەی سەربازی لەدەورە، ئەم نەخشە سەربازیە پێ ڕاگەیاندن.. فەرمووی: ئێمە نەخشەکەمان ئەوەیە کە ئێوە سەربازەکانتان حازر بکەن، بەلام ئەم دەنگ و باسە دەبێت زۆر نهێنی بێت. نابێت هیچ کەسێك لە ماڵی خۆی ئەمین نەبێت نابێت بیدرکێنێت، مەگەر لە ماڵ و منداڵی خۆی زۆر ئەمین بێت، نابێت

مونافیقەکانی مەدینە بزانن، چونکە لە شاری مەدینەدا کافر هەیە، جولەکە هەیە، مەسیحی هەیە، مولحید هەیە، بت پەرست هەیە، نابێت ئەم دەنگ و باسە لەناو ئەم جەمعەی خۆمان بچێتە دەرەوە..

بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ دوای ئەوەی کە چەند ڕۆژێکە ئەمەی ڕاگەیاندووە لە کت و پڕێکدا بانگی ئیمامی (علی) دەکات و دەفەرمووێت: ئەی (علی) خێرا بکە، دوو کەس لەگەڵ خۆتدا بەرە بڕۆ ڕاکە.. بەڵام زۆر بەپەلە سواری ئەسپێکی تیژڕەو ببن، بڕۆن لە دەرەوەی شاری مەدینە ئافرەتێك ها لە فلان شوێندا، ئەو ئافرەتە بگرن.. ئەو ئافرەتە نامەیەکی پێیە، هەرچی خۆی پچڕیەوە، سەرەتا تەسلیم نابێت بڵێت نامەکەم لایە، یان نا، بەڵام ئێوە بەزۆر ناچاری بکەن کە نامەکەتان تەسلیم بکات .

دەفەرمووێت: ئیمامی (علی) و ئەو دوو هاوەڵەی لەگەڵیدا بوون ڕۆشتن لە دەرەوەی شاری مەدینە، لە شوێنێکدا ئافرەتەکەیان گرت، فعلا ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموو بووی وابوو.. ئافرەتێك لەوێ هەبوو، دەفەرمووێت وتیان نامەیەکت پێیە بۆ کافران و دوژمنانی مەککەی دەبەیتەوە تکایە ئەو نامەیەمان بە خۆشی بدەیە؟

وتی: نەخێر نامەی چی و شتی چی وائێوە شێت بوون نامە چی دەکات لای من؟! جا من چ ئیشێکم هەیە بەم کارانەوە، من ئافرەتێکی نەخوێندەوارم..

وتیان: شتی وا نیە، ئیلا دەبێت ئەو نامەیە ئاشکرا بکەیت لەکوێدا داتناوە، شاردووەدەتەوە.. زۆر خۆی پچڕییەوە، سوێندی خوارد وتی شتی وانیە، ئیمامی (علی) فەرمووی: پێغەمبەری خودا ﷺ لە خۆیەوە قسە ناکات، تۆ ئەم نامەیەت پێیە چیتر ئازارمان مەدە، با ئازارت نەدەین..

ئافرەتەکە زانی وازی لێناهێنن، پرچەکانی درێژ بوون، پرچەکانی کردەوە لەناو پرچێکیان نامەکەی شاردبوویەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر تەنانەت جلەکانیشی لەبەر دابکەنرێت، ئەم پرچانە شکی ئەوەی پێ نابرێت، بەڵام کە زانی سورن لەسەر ئەوەی کە

دەبێت هەر نامەکە ئاشکرا بکات، ئەینا بە دیلی دەیهێننەوە بۆ مەدینە، نامەکەی لەناو پرچەکەدا دەرهێنا ئەم نامەیە تەواوی دەنگ و باسی پێغەمبەری ﷺ تێدا بوو..

پێغەمبەر بەتەمایە بێتە سەرتان، بۆ گەورە پیاوانی مەککە ئەم نامەیە نوسراوە، دێتە سەرتان وریای خۆتان بن، لەشکرێك لە کت و پڕدا بە سەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺ چوار دەوری شاری مەککە دەگرن، ئێوە حەزەری خۆتان بکەن و وریابن، بەڵام ئەم مەسەلەیە لێرەدا ئەوەی گرنگە کێ ئەم نامەیەی نوسیوە؟ کێ ئەم نهێنیەی پێغەمبەری خودای ﷺ ئاشکرا کردووە؟!

ئیمامی (علی) نامەکەی هێناوە، فەرمووی ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە نامەکەیە، بەڵام ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێ ئەم خەبەرەی دا بەتۆ کە ئەم ئافرەتە لەوێیە؟

فەرمووی: (جبریل)، بە خودا خۆ هیچ بەشەرێك ئەمەی بەمن نەوتووە، (جبریل)ی ئەمین لە ئاسمانەوە هات و فەرمووی ئەی ﴿محمد﴾ فریابکەوە، ئەو ئافرەتە ئەو نامەیە دەگەیەنێت، نامەیەکی جاسوسیە، خەبەر و دەنگ و باسی ئەم لەشکرەی ئێوە هەمووی دەگاتە دوژمن، من (جبریل) پێی وتم: بۆیە دڵنیابووم ئەو نامەیە بەو ئافرەتەیە، چونکە (جبریل) ئەمینە و وەحی ئاسمانی پێیەو قسەیەك ناکات لە خۆیەوە ئیلا وەحی خودای پەروەردگار نەبێت، بەڵێ، بەڵام ئەوەی گرنگە، ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئەوەی دڵتەزێنە ئەوەیە: کێ توشی ئەم هەڵە گەورەیە بووە؟

یەکێك لە صەحابە هەرە گەورەکان، ناوی (حاطبی إبن أبي بَلْتَعَه)یە!

یەکێکە لە سەرکردەکانی نزیك پێغەمبەر ﷺ، ئەم هەڵەیە ئەو کردوویەتی، ئەم نامەیەی بۆ دوژمن ناردووە، (سبحان الله) زۆر سەیرە! کابرایەك لە شەڕی (بدر)دا بەشداری کردووە، کابرایەك ماڵ و منداڵی لە مەککە بەجێهێشتووە، تاقە نەفەری لە پێناوی خودادا هیجرەتی کردووە، ئەی ئەم هەڵەیەی چۆن کرد؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بڕۆن دەست گیری بکەن (حاطِبْ)یان دۆزیەوە، دەست گیریان کرد و پەل بەستیان کرد.. هێنایانە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئیمامی (عمر) هەر لەوێدا شمشێرەکەی دەرهێناو فەرمووی: (دَعني أضرِبُ عُنُقَ هذا المُنافِق)..

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ واز بهێنە، تەنها ئەمر بفەرموو هەر ئێستە سەری لە لاشەی جیا دەکەمەوە ئەمە مونافیقە، ئەمە دووڕووە، تۆ بەئەمانەتەوە ئەم قسانەت بە ئێمە ڕاگەیاند، کە چی ئەم پیاوە جورئەتی ئەوەی کرد، بە ئافرەتێکی کافردا ئەم نامەیە بگەیەنەتە دوژمن، ئەزانی ئەگەر ئێمە بڕۆشتینایە و تووشی کەمینی ئەوان ببووینایە بەچی هیلاکیەك دەچووین؟ لەوانەیە بەسەدان خەڵکمان لێ بکوژرایە، ئەوە زۆر حاڵەتێکی خەتەرە! (فأنهُ نَكَثَ وَظاهَرَ أعدائَكَ علَيك) ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەوە عەهد و پەیمانی شکاندووە، ئەوە خیانەتی کردووە، ئەوە دەیەوێت دوژمنانی ئیسلام بەسەر تۆ و ئیسلامدا زاڵ بکات.. لەبەر ئەوە پێویستە بە سزای خۆی بگات. "کە کوشتنە بۆ جاسوس" دەبێت بکوژرێت، بە تایبەت لە مەسەلەی ئاوا هەستیاری عەسکەریدا، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی:

واز بهێنە ئەی (عمر)، بوەستە، بابزانین ئەم پیاوە بۆ ئەمەی کرد؟ بە نەرموو نیانی، بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، لە ئەوپەڕی غەزەب و توڕەیدا نەرم و نیانیت لە دەست نەدەدا.. ئەی (حاطب) تۆ بۆ ئەم کارەت کرد؟ ئەوە شیاوی تۆ نەبوو، ئەمە لە پیاوی وەکو تۆ نەدەوەشایەوە، هەتا تەنانەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

ئەگەر خەڵك ئاگاداری بکردبمایەوە، بیان وتایە (حاطب) کاری وای کردووە، باوەڕم نەدەکرد، ئەگەر بەوەحی ئاسمانی ئاگادار نەکرامایە، کەسێك بهاتایە بیوتایە (حاطبی إبن أبي بَلتَعَة) ئەم کارەی کردووە، قسەم بە قسە نەدەکرد و باوەڕم پێنەدەکرد، چونکە ئەمە لە تۆ ناوەشێتەوە ئەم نهێنی درکاندنە!

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ (لا تعْجَل عليَّ) پەلەم لێ مەکە، باقسەی خۆم بکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فەرموو قسەی خۆت بکە..

وتی: (إني كُنتُ إمراً مَلصقاً في قريش و لم أكن من أنفُسها) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تۆ زۆر باش دەزانیت من كابرایەكم ئەصڵی خۆم قورەیشی نیم، خەڵكی مەككە نیم، كاتی خۆی بەئاوارەی هاتمە شاری مەككە، ئەصڵێكم نیە خەڵكی مەككە نیم.

(و كان معك من المهاجرين، لهم قربات بمكّة يَحمُونَ بها أهليهم، وَ أموالَهُم) ئەوانەی لەگەڵ تۆدان، ئەوانە خەڵكی مەككەن، لەخودا بەزیاد بێت هەموویان خزم و كەس و كارێك، دڵسۆزێك، برایەك، برادەرێكیان لەشاری مەككە هەیە، كەهەم وریای ماڵ و پارەیان دەبێت نایەڵێت، خانووەكانیان بسوتێنێت، ماڵ و منداڵیان كە لەوێ بەجێ ماوە بەهۆی خزمایەتیەوە، بەهۆی سیلەی ڕەحمەوە بەرگریان لێدەكرێت، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، من چونكە خەڵكی شاری مەككە نیم، كەسم نیە لەوێ، من كاتی خۆی بەغەریبی هاتمە ئەوێ، ژن و منداڵەكەشم بۆ دەرنەچوو لەكاتی هیجرەتدا، ئەمە نزیكەی هەشت ساڵە من ئەو ماڵ و منداڵەم لەوێ بەجێهێشتووە..

كاتێك كە بیرم كردەوە تۆ ئەم شتەت لەلای ئێمە دركاند، كە بەتەمای لەشكرێكی ئاوا بخەیتە سەر مەككە (فَأحبَبْتُ إذ فاتَني ذلك مِنَ النَّسَبِ فيهِم) بیرم كردەوە كە من خزمێكم نیە لەو شارە، وائەگەر شەڕ قەوما بیان خاتە پاڵ خۆی، پەنای ئەو كوڕ و كچ و منداڵە ساوایانەم بدات، ماڵ و موڵكم بپارێزێت، (أنْ تَّخِذَ عندَهم يداً يحمونَ بها قَرابَتي) ویستم كارێك بكەم، ئەو كارە شەفاعەتم بۆ بكات لای سەركردەكان، بەهۆی ئەم خزمەتەی كەپێشكەشیان دەكەم، ئەوانیش دەستێكی خێر بە منداڵەكانمدا بهێنن، وەكو منداڵەكانی خۆیان بیان پارێزن، من لە پێناوی ژن و منداڵەكەمدا ئەمەم كرد..

وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تەنها لە پێناوی ژن و منداڵەكەمدا، بۆ ئەوەی كەوا خزمەتێكم بەوان بكردایە، ئەوانیش لەپێناوی ئەم نامە و خزمەتەی مندا، دەستێكی خێریان بەسەر منداڵەكانمدا بهێنایە، (وما فعَلتُ كفراً وَلا إرتِداداً) وەڵاهی نەكافر بوومەوە، نەمورتەد بوومەوە (ولا رِضاً بِالكُفرِ بَعدَ الإسلام) نە لە دوای ئەوەی كە خودا هیدیەتی داوم بۆ ئیسلام، جارێكی دیكە مەیلی كوفرم بو بێت..

وە لە ڕیوایەتێکدا فەرمووی: (وَ ما غَيّرتُ وَما بدَّلتُ) وەڵاهی دین و ئیمانەکەی خۆمم نەشێواندووە بەدلم نەکردووە، (أما إني لَم أفعَلهُ غشاً يارَسُول الله ﷺ) خودا بۆ خۆی ئاگای لێیە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من وەکو مونافیقێك و غەشاشێك ئەم کارەم نەکردووە، (وَ ما كَفَرْتُ ولا ارْتَدَدتُ لِلأسلامِ إلا حُباً) وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم دەقیقەیە من خۆشەویستیم بۆ ئیسلامەتی زیادی کردووە، کەمی نەکردووە، وەڵاهی ئەمە دەنگ و باسەکەی منە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، تەنها لەبەر ئەوەی ژن و منداڵەکەم کەسیان نەبوو لەو شارەدا، هەرکەسە و خزمێکی هەبوو من نەبێت، بێ کەس بووم ویستم بەم خزمەتە بەرگریەك لە منداڵەکانم بکەم، ئەینا من هەشت دانە ساڵە هیجرەتم لە خزمەت تۆدا کردووە، ماڵ و منداڵ و موڵکم هەموویم بەجێهێشتووە، بەس لەبەر ئەمە بوو، ئەمە قسەکەمە..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (فَقَدْ صَدَقَكمْ) ئەم پیاوە ڕاست دەکات. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕاست دەکات (وَلا تَقُولُوا لَهُ إلا خيراً) ئەوەی خێرنەبێت بەم پیاوەی نەڵێن، دەستی بکەنەوە و وازی لێبهێنن، (إنَّهُ قَد شَهَدَ بَدراً) ئەم پیاوە لەجەنگی (بدر)دا بەشداری کردووە، لەو ڕۆژەدا پاڵەوانی زۆر مەرد نەبوایە نەیدەتوانی خۆی ڕابگرێت، ئێمە (٣١٣) کەسی بێ چەك بووین، هەزار کافری شمشێر بەدەستی ئەسپ سوار، دووسەد دەبابەمان لەسەر بوو، دووسەد ئەسپ سوار هاتبوون پەلاماریان دەدایین، پاڵەوانی مەرد نەبێت بەرگەی نەدەگرت..

ئەم (حاطب)ە لەڕۆژی تەنگانەدا پشتی منی بەرنەدا، وەڵاهی ڕاست دەکات، ئەم بەشداری (بدر)ی کردووە (وَما يُدريكَ لَعَلَّ اللّهَ أن يَكونَ قَد إطَّلَعَ عَلى أهلِ بَدرٍ، فَقَال: إعمَلوُا ما شِئتُمْ، فَقَدْ غَفَرتُ لَكُم)، فەرمووی: ئێوە چوزانن لەوانەیە خودای پەروەردگار بە چاوی سۆز و بەڕەحمەت و لێخۆشبوون سەیری ئەهلی بەدری کردبێت، فەرموویێتی:

هەر کەسێك لەبەدردا بەشداری کردبێت بڕۆن چی دەکەن بیکەن خودای گەورە لێتان خۆش بووە، لەبەر ئەوە وازی لێبهێنن، دەستەکانی بکەنەوە و ئازادی بکەن، ڕاست

دەکات، ئەم پیاوە ڕاست دەکات. حەزرەتی (عمر) گریا، فەرمووی: خودا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن..

## لەهەڵەی ئەو صەحابیە.. چەند دەرسێك وەردەگرین:

لێرەدا بەڕێزان ئەمە بەسەر هاتێك بوو، ئەمە موشکیلەی پیاوێك بوو کەگرفتی ماڵ و منداڵ، گرفتی بێ کەس وبێ دەری کاری لێکرد، کەخیانەت بکات، ئەمانەتێکی پێغەمبەری خودا ﷺ بدرکێنێت، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك سەیری دەم و چاوی کرد فەرمووی ڕاست دەکات، ئەم پیاوە لەدڵەوە ئەم هەڵەیەی نەکردووە، ئەمە هەزار و چوارسەد و ئەوەندە ساڵ لەمەو بەر ڕووی داوە، بۆ ئەمڕۆی ئێمە چ دەرسێکی لێ وەردەگیرێت؟! کەئێمە ئەمشەو لەم مزگەوتەدا دانیشتووین چەند دەرس و وانە لەم هەڵەی ئەم صەحابیە وەردەگرین:

## یەکەم: هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات

ئەوەتا ئەو صەحابیە بەردەوام لە خزمەت پێغەمبەری خودادا بوو ﷺ، کەچی توشی هەڵە بوو، کەواتە مرۆڤ نیە بێ هەڵە بێت، إنسان لەنیسیانەوە هاتووە، لە لەبیر چوونەوە هاتووە، هەڵەی هەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو هەڵەی بەرامبەر ئیسلام دەکرێت لەدڵەوە نەبێت، دڵ ڕەش نەبێت، خلیسکانێ بێت خلیسکان، ئەم پیاوە قاچی خلیسکا، بەڵام چونکە ڕاستگۆ بوو ڕزگاری بوو، ئەگەر مونافیق بوایە سەد سوێنی دەخوارد..

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو نامەیە من نەم نوسیوە، پێیان کردم، ترسم هەبوو، بەڵام ڕاست و ڕەوان چی لەدڵیا بوو، بەبێ گرێ پێی وت.. پێغەمبەر ﷺ ڕاستگۆیەکەی قبوڵ کرد.. کەواتە: کاتێك ئینسان هەڵەی کرد، ئەوە ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ نەمابێت، بچێتە خزمەتی پەروەردگاری و بڵێت:

خودایە گیان من ئەو هەڵەیەم کردووە.. من ئەو هەڵەیەم لەڕەشی دڵمەوە نەکردوە.. قاچم خلیسکاوە، خودایە بەگەورەیی خۆت لێم ببورە.. (إنشاء الله) خودای گەورە وەکو ئەو صەحابەیە لێیبورا (إنشاء الله) لەو ئینسانەش دەبورێت.

## دووەم: لێخۆشبون هەڵبژێرە

پێغەمبەری خودا ﷺ بەردەوام حەزی دەکرد کەصەحابەکان دەگلان، قاچیان دەخلیسکا، لێیان خۆش بێت، نەك تۆڵەیان لێبستێنێت، پێغەمبەر ﷺ لێخۆشبوونی پێخۆشتر بوو.. تەنانەت زۆر جار کاتێك بیزانیایە ئەمە قسەی دەمە، ئەمە قسە درکاندنێکە، بەڵام دڵ ڕەش نەبووە، دڵ پڕی نیە لەنیفاق و کوفر..

پێغەمبەری خودا ﷺ جارێك دوو کەس هاتنە خزمەتی، یەکێکیان (زوبێری إبن عوام) بوو، کە پورزای خۆیەتی، ئەوی تریان کابرایەکی خەڵکی مەدینە، ئەنصاری بوو، لەسەر ئاو کێشەیان هەبوو، باخەکانیان لە یەکتر نزیك بوو.. کابرای ئەنصاری دەیوت: دەبێت ئەو ئاوەی من بەناو موڵکەکەی تۆدا بڕوات، یەکەم جار من ئاوی بدەم، دواتر تۆ ئاوی بدەیت. ئەویش دەیوت: قوربان ئەم موڵکەی ئەم تازە ئاوەدان کراوەتەوە، من بەمرووری زەمان ئەم موڵکەی خۆم ئاوداوە، پاشان ئەم ئاوە خۆ ناگرمەوە، پاشان بائەویش ئاوی پێبدات..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (زوبێر) ڕاست دەکات ئەم ئاوە با یەکەمجار (زوبێر) ئاوی پێبدات، دواتر ئەی ئەنصاری، ئەی خەڵکی مەدینە، ئەی فلان کەس، تۆ باخەکەی خۆت ئاو بدە، ئەم کابرایە قسەیەکی گوت کە لە ئەصڵدا کوفرە، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ وادەزانم تۆ پشتی پورزاکەی خۆت دەگریت دژی من، بڕیار دەدەیت!!

ئەمە لە ئەصڵدا کوفرە، نابێت کەسێك گومانی هەبێت لە عەدالەتی پێغەمبەر ﷺ، لە عەقیدەدا ئەمە کوفرە!!

بەڵام پێغەمبەر ﷺ هیچ لێی نەگرت، زانی ئەمە قسەیەکە لەکاتی تورەبوون و دڵ گەرم بوون بەسەر زمانیدا هاتووە، ئەینا لە دڵەوە ئەم پیاوە تەعنی نەداوە لە پێغەمبەر ﷺ، ئەها پێغەمبەر ﷺ لێیبورا، لەسەری نەڕۆشت، فەرمووی: نانا دڵنیابە من فەرقی کەس ناکەم، پورزاکەی خۆم، یاتۆ فلان کەس، من سەرکردەی ئەم ئومەتەم، من پێغەمبەری ئەم ئومەتەم، دڵت شتی وانەخوازێت، کابراش دڵی چاك بوو..

پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەم هەڵەیە نەڕۆشت، کە لە ئەصڵدا کوفرە، بۆیە بەردەوام ئینسان کاتێك هەڵەی کرد، بەتایبەت قاچ خلیسکان بوو بێت، لێبوردن باشترە..

## سێیەم: کارە باشەکانتت بیربێت

بەشداربوانی بەدر مادام ئەو کارە گەورەیان هەیە، شەفاعەتی بۆ ئەم کارە خراپەی کرد، بۆیە ئێمەش چەند خۆشە کارێکت بۆ ئیسلام کردبێت، لەکاتێکدا کە توشی گوناح بوویت،بڵێیت: خودایە لەبەر بەرەکەتی ئەو کارە کەکردوومە، خودایە لێم خۆش بە، ئینسان خۆی و بەینی خودا خزمەتێکی بەم دینە کردبێت، لەوەختێکی هەستیاردا، لە وەختێکی سامناکدا، لەوەختێکدا کەمسوڵمانان زەعیفن، لەوەختێکدا کە سونەت کەمە، تۆ ڕاپەڕی بۆ ئەم ئیسلامە، کارێکی گەورەت ئەنجام دابێ، وەکو ئەوانەی بەشداری بەدریان کرد، ئەو شەرەفە گەورەیان پێبڕا، تۆش کارێکت کردبێت، ڕۆژێك کەتوشی گوناح بوویت، توشی قاچ خلسکانێك بوویت،بڵێیت: یارەبی خودایە لەبەر ئەم کارەم لەم گوناحەم ببورە، ئەمە لەم دەرسانەوە وەردەگیرێت.

## چوارەم: خیانەت لە دینەکەمان نەکەین:

خیانەت لەدین زۆر خەتەرە، بەداخەوە خەڵکێك هەیە مسوڵمان ئێستا لەم وڵاتە ئەچێتە ئەو ئەوروپایە، بۆ ئەوەی ئیقامەیەکی کاتی وەربگرێت کەهیچ نیە لەدونیادا، دەڵێت: بوومە گاور! !

وەلا لەكوردستان بومە مەسیحی، مسوڵمانان هەڕەشەیان لێكردم، خەریك بوو سەرم ببڕن.. بۆیە ڕامكرد بۆ ئەو ئەوروپایە، كاكە من گاورم!! (نَعوذُ بِاللهِ) ئەوە تەنەزوله بەدینی خۆت، ئەوە خیانەت كردنە بە عەقیدە، پاشان خیانەت كردن بەنیشتیمان..

ئەو زێدەی پێغەمبەری خودا ﷺ تێیدا دەژیا، ئەو كۆمەڵە خەڵكە نیشتیمانی تۆیە، ئەوە هاوڵاتی تۆیە، دەبێت زۆر وریا بیت خیانەت بەنیشتیمان نەكەیت، ڕاستە خەڵكێك لە وڵاتی ئێمە ئێستا بەهۆی ئەو كاربەدەستە خراپەوە، بەهۆی ئەو حیزبەوە، بەهۆی فلانەوە، خۆشەویستی نیشتیمان كاڵ بۆتەوە لەدڵماندا، بەڵام ئێمەی مسوڵمان بەپێچەوانەوە، ئەم نیشتیمانە بەهی خۆمان دەزانین، ئێمە لەم خاكەدا لەدایك بووین، لەسەر ئەم خاكەدا دەژین، دەبێت ڕۆژێك ئێمەی ئەهلی ئیسلام و مزگەوت، خەڵكێكی جوان پێبگەیەنین، كە ئەم نیشتیمانە بەئاسودەیی بەدەست پاكی بەبەختەوەری لەسەری بژین، (انشاء الله) بە ئەمین و ئەمان خودا پەرستی لەسەر بكەین..

بەداخەوە هی واهەیە لەسەر حیسابی شتێكی كاتی، ئەها جاری واهەیە ئینسان ناڵێت ئەمە'كابرا كافرە، ئەها ئەو صەحابەیە خلیسكا لە پێناوی شتێكی كاتی، كە ماڵ و منداڵ و موڵكەكەی بوو، بۆ ئەوەی قسەیەكی لای كافران هەبێت ،ئەم نامەیەی نوسی، ئەم هەڵەیەی كرد.. مسوڵمانی ئێمە جاری واهەیە سادە بووە، بڕوابكەن خەڵك هەبووە لەجومعەدا بووە، جاری واهەیە ڕەخنەیەك لەحكومەت گیراوە، چووە بۆلای كاربەدەستێك ئیشی پێی هەبووە، هیچی بەدەستەوە نەبووە، هیچ چالاكیەكی نەبووە بڵێ من ئەمەم بۆ ئەم حكومەتە كردووە.. وتویەتی: قوربان ئەزانیت ئەمڕۆ لە جومعەدا ئەو مامۆستایە قسەی بە حكومەت وت.. هەر ئەو كاربەدەستە بۆ خۆی تەلەفون بۆ ئێمە دەكاتەوە: وەلا مامۆستا فلان كەسم لابوو، خۆ بەخودا دەمزانی قسەكانی هەمووی بۆ ئەوە بووە ئیشێكی هەبووە، هاتووە بۆ ئەوەی بزانێت كچەكەی بۆ تەعین ناكەم!! هیچ چالاكیەكی نەبووە ڕاپۆرتی لەسەر مەلای مزگەوت داوە!!

یەعنی ئەمە خیانەتێکە تۆ دەیکەیت بەو شوێنەی بۆ عیبادەتە، لەپێناوی کارێکی بچکۆلەی خۆتدا، بۆ ئیمزایەك، خۆ ئەمە بکەین پێی سوك دەبین، چونکە پێش ئەوەی ئەو ئینسانە لەو ژوورە بچێتە دەرەوە، بەو مامۆستایە دەگاتەوە، کابرا خۆی خۆشەویست دەکات.. دەڵێت: مامۆستا من دڵسۆزی تۆم، هەر ئەو ناگاتە دەرەوە بەتەلەفون دەیبیستێتەوە، ئەو راپۆرتەکەت بۆ ڕا دەکێشێت، لەبەری دەگرێتەوە بۆت، دەڵێت: ئەوە راپۆرتی فلان کەسە..

بەس ئێمە جاری وا هەبووە مامۆستایەکی مزگەوت قەت لە دڵ نابن، کابرا لەوێ دەبینێتەوە هەر بەخەیاڵیشماندا نایەت.. چونکە دەزانیت ئەمە خلیسکانە، کابرا ئیشێکی هەبووە، من زۆر جار بۆ خۆم دڵنیا بووم کابرا ئیشێکی هەبووە لە فلان حیزب و لە فلان حکومەت بۆیان نەدەکرد.. وتویەتی باراپۆرتێکم پێ بێت، وەکو چالاکی لەسەر فلانە کەس، مامۆستا باسی زەمی حکومەتی کردووە، ڕەخنەی لەفلان دائیرە گرتووە، ئەمە قاچ خلیسکانە.. دەبێت ئێمە لێبوردنمان بەرامبەر بەوانە هەبێت، ئەو کەسەش بەخۆیدا بچێتەوە، بڵێت قاچم خلیسکا داوای لێبوردن لەخودای پەروەردگار بکات..

خیانەت کردن لەم نیشتیمانە بەڕێزان بەچی دەبێت؟ بەبێ شەرعی، هەر کەسێك بێ شەرعی بکات خیانەت لەم نیشتیمانە دەکات، ئێستا ئەو کەسەی دزی دەکات خیانەتی بەنیشتیمان کردووە.. چونکە نا ئەمینی بڵاو کردۆتەوە، ئەگەر خوانەکردە بەم ڕەمەزانە ببیستین دوو سێ ماڵ تالان کراوە، لەنوێژی تەراویحەکەدا لەخۆت ئەمین نیت، خێزانەکەت ناوێرێت بێت بۆ نوێژی تەراویح ماڵەکە بەجێ بهێڵێت. ئەی ئەگەر لەخودا بەزیاد بێت نەیبیستین کەس ماڵی براوە، ئەو خەڵکە زیاتر گەرم و گوڕ ڕوو لەمزگەوت دەکەن.. کەواتە:

دزی کردن بێ شەرعیەکە خیانەت کردنە لەنیشتیمان..

زینا کردن پەنا بەخودا، پەیوەندی ناشەرعی نێوان کوڕ و کچ بە ناشەرعی خیانەتە لە نیشتیمان.. چونکە ئایدز بڵاو دەبێتەوە، ئەو کاتە سەروەت و سامانی ئێمە دەبێت

بدرێت بە دەرزی بۆ ئایدزاویەکان، لەجیاتی بدرێت بەکولێرە و نان بۆ برسی و هەژاران، ئەمە خیانەتە، هەرچی بێشەرعی بێت خیانەتە.

بەداخەوە دوێنێ شەو گەنجێك لە شاری سلێمانی، ئاوا خیانەت بەخۆی، خیانەت بەم گەلە، خیانەت بەم ئاینە، لەپارکی ئازادیدا شوێنێك بەحیساب پارکی ئازادیە، ئینسان دەبێت ئازاد بێت.. ئازادی عەقڵ، ئازادی فیکر، ئازادی بیر و باوەڕ.. کەچی بەداخەوە لە پارکی ئازادی خۆی کۆیلە کردووە، ئەوەندەی عارەق خواردۆتەوە، ئەوندەی عارەق خواردۆتەوە ئیتر عەقڵەکەی هین بووە، گیانی لەدەست داوە، مەیتەکەی دۆزراوەتەوە، لە تەلەفزیۆن پیشانی دا.. یەعنی بەڕاستی ئەوە جێگەی داخە لە پارکی ئازادی، نەك هەر ئازاد نەبوو، بەڵکو خۆی کوشت، بەچی؟ بەعارەق، لە کەیدا؟ لەم مانگە پیرۆزەدا..

لەبەر ئەوە ئەمانە هەمووی خیانەتن بەمێژووی ولاتێك، کە ئەهلەکەی خەڵکێکی مسوڵمانی وەکو جەنابتانن، کەلەم کاتەدا ڕودەکاتە ماڵی خودا، خیانەت کردن بەم نیشتیمانە بە پیس کردنی، بە داخەوە نەك ئێمە جادە و شەقامەکانمان پیس دەکەین، ڕێزی ئەوانەش ناگرین کە پاکی دەکەنەوە..

بابەتێکم لەبەردەستدایە، ئەڵێت: ژینگە پارێزێك "کەلەولاتی خۆمان پێی دەڵێن کەناس" ئاخر ئەو وشەیە جوان نیە، کەناس واتە گسك لێدەر، ئەوە شەرەفە، لەئەوروپا لەبەریتانیا و بەتایبەتی لەدوو ولات: لەبەریتانیاو لە ولاتی سویدە، کەسێك بێتە جادە پاك کەرەوە، مانگی (٨٠٠٠) یۆرۆ ی هەیە. مامۆستایەکی جامیعە ئەو پارەیەی نیە، ئینجا هەر کەسێك ئەم پیشەیە هەڵبژێرێت، سەیر دەکەیت ماستەری هەیە، دکتۆرای هەیە، بەکالۆریۆسی هەیە، لە شارەوانی تەعین بووە، جادە دەماڵێت.. کە سەیری شەهادەکەی ناو باخەڵی دەکەیت ماستەری تیایە، حوکمەت لە پێناوی ئەم پیشە پیرۆزە دا، لەزۆربەی زەریبە عەفووی دەکات..

لەو وڵاتانەدا جەنابتان کەس و کارتان لە ئەورووپا هەیە،دەزانن حوکمەت لەسەر زەریبەی هاوڵاتیانی دەژیا، ئەوەندەی پارە لەخەڵکی دەسێنێت.. ڕاستە کارەبا، ئاو، مواسەفاتی جادە و بان، بەردەوام هەموو شتێك هەیە، بەڵام جەرگی هاوڵاتیەکەی خۆی بڕیوە.. هەموو شتێك بە پارەیە، بەغەرامە کابرایەك هێڵێك سوری مرور ببەزێنێت ئەوەندە غەرامە دەکرێت، جارێکی دیکە ئەو کارە ناکات، وەکو ئێرە نیە، لێرە حکومەت خزمەتمان ناکات، ئێمەش خزمەتی حکومەت ناکەین، هیچی وا نادەین، ئەوان لەوێ بەزەبری غەرامە، بەزەبری ئەو هەموو باجە کەلە هاوڵاتی دەسێنێت، دەوڵەتێکی قانوونی ڕێکخراوی پێکەوە ناوە..

لەوەێ کابرایەك بەفەخرەوە دەبێتە کەناسی شارەوانی، هیچ موشکیلەیەکی نیە، حکومەت لەزۆربەی باجەکان عەفووی دەکات.. ئەمجا چیان پێدەڵێت؟!

لەو ڕاپۆرتەی لەبەر دەستی مندایە پێیان دەڵێت: ئەندازیارانی پاراستنی ژینگە، پێیان ناڵێت کەناس، پاك کەرەوە.. دەڵێت: ئەندازیارانی پاراستنی ژینگە و وڵات..

ئەمانە دەوریان لە ئەندازیار گرنگ ترە.. ئەو ئەندازیارەی زەویەکە پاك دەکاتەوە، جیاوازیان نیە، ئەمیش خزمەتی وڵاتەکەی کردوە، بەڕێزان: سەگ دەچێت بۆ بازاڕە کانیان، دەڵێت ئەو سەگەی دەچێت بۆ بازاڕەکانیان کیسەیەکیان بە شتێکدا هێن کردووە، لەهەر شوێنێکدا بوەستێت، پاشەڕۆی خۆی "دور لە ڕوتان" دەکات..

یەکسەر ئەو کابرایە خۆڵ ڕێژێك لەگەڵ کیسەیەکدا هەیە پاکی دەکاتەوە و دەیکاتە ناو کیسەکە هەتا دەیگەیەنێتەوە بۆ ماڵەوە، دەیکاتە ناو زبڵدانەکەوە.. نابێت ئەو سەگە لەسەر جادە، لە سوپەر مارکێت، لەناو بازاڕ، پیسایی بکات.. دەزانن چییان لەسەر ئەو زەرفانە نووسیوە؟ نووسیویانە (کیسەی ڕەوشتی بەرز) کە نایەڵێت پاشەڕۆی سەگەکەی لەسەر جادەیەك بکەوێت.. خەڵك قیزی لێبکاتەوە.. ئەمە ڕەوشت بەرزیە، ئەمە ئیسلامە، بەس ئەو جێبەجێی دەکات..

بەڵام بەداخەوە لە وڵاتی ئێمەدا کابرا ساردیەکەی دەخواتەوە، شوشەکەی فڕێدەدات ولەسەر ڕێگاکە دەیشکێنێ، ئەوە خیانەتە، ئەوە ئێمە باسی (حاطبی إبن أبي بَلتَعَة)مان کرد، ئەها خیانەتی کرد، خیانەت کردن بە نامە، ئێستا خەڵك بەکردەوە، خیانەت دەکات بەزێدی خۆی. ئەوەی کە مسوڵمانەکە دەڕوات ئەو سەیارەی ئازار دەدات، ئەو هاوڵاتیەی ئازار دەدا، ئەو منداڵەی ئازار دەدات، قاچی بەشوشەدا دەچێت..

ئەی مەسەلەیەکی حەساسی تر: ئێستا مانگی ڕەمەزانە، مسوڵمانانێك زۆر هاواریانە دەڵێن (الحمد لله) یەك بیر ئاوی کاملی هەیە، ئەوەندە سۆندەیەك ئاو، ئینجێك ئاو، فڕێدەدات، کە چی ئەو ئاوە ڕەیسیەی کە دێتەوە،بە بێ پێویستی دەیکاتە سەر زێرابەکەی، بەس بۆ ئەوەی دراوسێکەی بۆی نەچێت، هەر پێی عەیبە دەڵێت موڵکی خۆمە، ماڵی خۆمە، دەی قەیچێکە خودای گەورە ئەو بیرەی پێ بەخشیویت.. ئیتر بۆ ئاوەکە ناگرێتەوە؟! با بۆ خەڵکەکە بچێت، کە ئاوی نیە، بیری نیە، کە بە تەنکەر بۆیان دەچێت.. ئەها ئێمە دەڵێین ئەم وڵاتەمان خۆش بوێت، لە ئێمەوە خەڵك فێری ویژدان بێت..

ئەمە دەرسی ئەمشەومان بوو، (إنشاء الله) دەرسی لێ وەربگرین، خودایە پەنامان بدەیت لە خیانەت کردن لە بیرو باوەڕمان، خودایە پەنامان بدەیت لە خیانەت بە نیشتیمانمان، لە هاوڵاتیمان، لە هەموو جۆرە خیانەتێ خودایە بمان پارێزی..

(وَصَلی اللهُ عَلی سَیِّدِنا مُحَمَّد وَ آخِرُ دَعوانا الحَمدُ لله)

## وانەی یانزەیەم

## شوو بەکێ بکەم ؟

* عَنْ أَبي بَكْرِ بْنِ أَبي الجَهْمِ ، قالَ : سَمِعْتُ فاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ ، تَقُولُ أَرْسَلَ إِلَيَّ زَوْجي ، أَبُو عَمْرٍ وبْنُ حَفصِ بنِ المُغيرَةِ ، عَيّاشَ بْنَ أَبي رَبيعَةَ بِطَلاقي ، فَخَطَبَني خُطّابٌ، مِنْهُمْ :مُعاوِيَةُ ، وَ أَبُوالجَهْمِ وَ أُسامَةُ ، فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إِنَّ مُعاوِيَةَ تَرِبٌ ، خَفيفُ الحالِ . صَعْلوكٌ لا مالَ لَهُ . وَ أَبُوالجَهْمِ مِنهُ شِدَّةٌ عَلى النِّساءِ . فَرَجُلٌ ضَرابٌ لِلْنِّساء . فَإِنَّهُ صاحِبُ شَرٍّ لا خَيْرَ فيهِ ، لا يَضَعُ العَصا عَنْ عاتِقِهِ ، ولكِنْ عَلَيْكِ بِأُسامَةَ بنِ زَيْدٍ ، قالَتْ : فَتَزَوَّجْتُهُ فَشَرَّفَني اللهُ بِابْنِ زَيْدٍ ، وَ كَرَّمَني اللهُ بِابْنِ زَيْدٍ). ـ رَواهُ مُسْلِم : (٣٦٩٦) وَ أَبُوداود في ـ السُّنَن ـ : (٢١٤٦) وَ إِبْنُ ماجَة : (١٩٨٥).

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (لَنْ يَضْرِبَ خِيارُكُمْ). ـ رَواهُ البَيْهَقي في ـ شعب الأيمان (٧ / ٣٠٤) .

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَـٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ﴾البَقَرَة : ٢٢١ .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ( إِذا أَتاكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ خُلُقَهُ وَ دينَهُ ، فَزَوِّجُوهُ إِلاّ تَفْعَلوا تَكُنْ فِتْنَةٌ في الأَرْضِ وَ فَسادٌ عَريضٌ) .

ـ رَواهُ الترمذي : (١ / ٢٠١) وَ إِبْنُ ماجَة: (١٩٦٧) . وَ حَسَّنَهُ الأَلْباني في ـ السلسلَة الصَّحيحة : (١٠٢٢) .

* قالَ رَجُلٌ لِلْحَسَنِ البَصْرِيِّ : إنَّ لي بنية ، فَمَنْ تَرى أنْ أُزَوِّجَها ؟ قالَ : زَوِّجْها مِمَّنْ يَتَّقي اللهَ ، فَإِنْ أَحَبَّها أَكْرَمَها ، وَ إنْ أَبْغَضَها لَمْ يَظْلِمْها). ـ مُخْتَصر مِنْهاج القاصِدين. ابنُ قُدامَة المقدسي، ص ١٠٢ .

* قالَ الأمام عُمَر ابْنُ عَبْدُالعَزيز : (إذا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ يَطيلُ الصمتَ ، وَ يهربُ مِنَ النّاسِ ، فاقْتَرِبوا مِنْهُ ، فَإِنَّهُ يُلقَى الحِكْمَةَ). ـ فتح الباري . إبن حَجَر العَسْقَلاني : (٤٢٣٢) .

## سەرچاوەکان :

١) صَحيح مُسْلِم ، بِشَرح الإمام النَوَوي ج (٩ ـ ١٠) ، رَقم : (٣٦٩٦ ، ٣٦٩٧ ، ٣٦٩٨) ص ٣٤٤ . ط : ١٩ ، ٢٠١٢ ، دارُ المَعْرِفَة ، بيروت ، لُبْنان .

٢) زەواج لە قورئان و فەرموودە لە صەحیحەکاندا ، محمد مەلا فائق شارەزوری ، (٤٧ ـ ٥٠) .

٣) گۆڤاری بڕیار ، ژمارە : ٤٨ ، ئایاری ٢٠١٢ ، ل٢٢ . بابەتی : وەفاداریە بۆ بەڵێنەکانت. لەنوسینی :محمد عبدالله مێرگەیی .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلِهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیمانداران و خوداناسانی بەڕێز: دانیشتنی ئەمشەویشمان هەر لە مەجلیس و کۆڕی پێغەمبەری خودایە ﷺ، لە زنجیرە باسەکەی خۆمان بە ناوی ﴿ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشە و گرفتم و هەیە﴾ هاتوومەتە خزمەتت هەتا ڕێنمایم بکەیت.. بۆم حەل بکەیت.. ئەمشەو بزانین کێ گرفتی هەیە؟ بابزانین ئەو کەسەی بەرنامەی ئەمشەومان لە خزمەتی دایە؟ بابزانین لەزەمانی پێغەمبەردا ﷺ، دڵە ڕاوکێی بۆ دروست بووە، سەری لە کارەکەی دەرنەکردووەو هاتووەتە خزمەت خۆشەویستی خودا کێیە؟!

ئافرەتێکە، دانیشتنی ئەمشەومان بەسەرهاتی ئافرەتێکە کە هاتووە بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، بە ناوی (فاطمە ی إبنت قیس)ەوە (فاطمە)خان دێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئێمەش لەم کاتەدا کە لە مەجلیسی پێغەمبەری خودادایین ﷺ.. لە مانگی ڕەمەزان و لە ماڵی خودا، با لە خۆشەویستمان نزیك ببینەوە، با ئێمەش گوێ رابگرین بزانین بەسەرهاتی ئەم ئافرەتە چیە؟ و پرسیار و کێشە و گرفتی چیە، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ؟!

بێ ئەدەبی دەبێت ئەگەر بەبێ سەلام کردن، بەبێ سڵاوات لێدان، بچینە خزمەتی جابۆ ئەوەی لەوە بە دووربین، بۆ ئەوەی ڕەحمەت و بەرەکەتی خودامان زیاتر بەسەردا بڕژێت، ڕوومان بێت بچینە مەجلیسی (رَسُولُ الله)وە ﷺ، با بەیەکەوە سڵاواتەکانمان بۆ دیداری خۆشەویستمان بنێرین:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

## لەو سیانە.. شوو بەکامیان بکەم ؟

(فاطمە ی إبنتُ قیس) دێتە خزمەتی و دەفەرمووێت: ئەی خۆشەویستی خودا، بەڕاستی من لە دڵە ڕاوکێدام، موشکیلە و گرفتێکم هەیە سەری لێ دەرناکەم، هاتوومەتە خزمەت جەنابت پرست پێ بکەم، خۆشەویستیش دەفەرمووێت: دەخوشکی خۆم، کچی خۆم بڵێ، دەڵێت:

قوربان من هاوسەرەکەم ناوی (أبو عمری إبن حفص) بوو، ئەم پیاوە لەگەڵمدا زۆر خراپ بوو تەنانەت ڕۆژێکیان من ئاگام لێنە بوو، من بۆ ئیش و کار ڕۆشتبوومە دەرەوە، کەسێکی نارد بۆلام بەناوی (عەیاشی إبن ڕەبیعە) ناردی بۆلام وتی: بەخێزانەکەم بڵێ بە (فاطمە ی إبنت قیس) بڵێت، من سێ بە سێ تەلاقم داوە.. فرم پێوەی نەماوە..

ئیتر ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جاری واهەیە ئەگەر ئافرەتێك بۆ نمونە دەڵێ:

من تەلاقم وەرنەگرتووە، یان ئاگام لێی نیە ئەوە تەڵاقی هەر دەکەوێت، ئەگەر پیاوێك بەژنێك ڕازی نەبوو نابێت ژنەکە سوکایەتی قبوڵ بکات، دەبێت ئەویش بەو ڕازی نەبێت.. لەبەر ئەوە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تەئکیدم لەسەر ئەوە کردەوە کە ئایا ئەم هەواڵە ڕاستە؟ بەڵێ پیاوەکەم وتی ڕاستە، من سێ بە سێ خێزانەکەی خۆمم تەلاق داوە، منیش بۆخۆم دانیشتم لە شوێنێکدا، لە پەنای ماڵی باوکم دا، ئێستە لەگەڵ ئەودا عیدەم تەواو بووە.. کۆتایم پێهێناوە.. سێ کەس ئێستا هاتوونەتە خوازبێنیم سێ پیاو ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تۆ هەر سێکیان دەناسیت:

یەکەم: (معاویە)یە، دووەم: (ئەبو جەهەم)ە، سێیەم: (ئوسامەی ئیبن زەید)ە، وەڵاهی من تێماوم نازانم شوو بە کامیان بکەم، باشە؟

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: دەی گوێم بۆ بگرە ئێستا من ڕێنمایت دەکەم، من هەرسێکیان زۆر باش دەناسم، (إنَّ معاويَةَ تربٌ خفيف الحالِ صَعلوكٌ، لا مالَ لَهُ) (معاويە) پیاوێکە زۆر باشە لە دینداری و خوداناسیدا، بەڵام بێ ماڵ و بێ حاڵ و بێ دەرەتان و.. دەڵێت لە کوردەواری خۆماندا، پەنجا فلسی لە گیرفانیدا سەوزەڵە خانمیەتی، بە تەمەنی

خۆی دینارێك لە گیرفانی ئەم پیاوەدا نەبووە، نە خانووی هەیە، نەماڵی هەیە، هەر بۆ خۆی ڕۆژانە یەکێك دەیباتەوە، ئێواران یەکێك دەیباتەوە، بەیانیان یەکێك دەیباتەوە، وەلا ئیتر نازانم شوو بە کێ بکەیت؟! بچی لە ماڵی کێدا دابنیشیت؟! ئەوە حاڵی (معاویە)یە، کە نە ماڵی هەیە، نە پارەی هەیە، نەهیچی هەیە.. (صعلوكٌ لا مالَ لَهُ) ڕووت و قوت بێ ماڵ و حاڵ..

(وَأما أبو جَهَم) (ئەبو جەهەم)یش ژنێکی تری تەلاق داوە (ضَرَّابٌ للنساء) لێدەرە ئەمما لێدەرە لە ژن، ئەو ژنەی تریشی کە تەلاقدرا هەر لە ترسی لێدان و گۆچان و قامچی بوو.. (لا يَضع العَصا عَن عاتقه) بەردەوام گۆچانەکەی لەسەر شانیەتی هەر قسە بکەیت لێت دەدات، تەبیعەت توندێکە هەر نەبێتەوە، داوای ئاو بکات تا زللەیەکت لێ نەدا ناڵێت ئاوەکەم بۆ بهێنە، ئەوە تەبیعەت توندی وەکو ئەو پیاوە هەر نیە، (إنَّهُ صاحب شَّر لا خير فيهِ) هەر مەرحەباکەشی شەڕی لێدەبارێت.. هەر خێری تیدا نیە، چونکە ئەوەندەی لە ژنان داوە، ئەوە (ضَرَّابَ)ە "ضراب صیغەی مبالغە ی(ضَرْب)ە" یەعنی هەر بەردەوام لە ژن دەدات..

بەلام (ولكن عليك بِأُوسامه بن زيد) وەرە شوو بکە بە (أوسامە ی إبن زيد)، گەنجێکی ڕێك و پێك، پیاوێکی دیندار، هێمن، لەسەرخۆ، بەشی خۆی کولانە و خانوویەکی هەیە، ماڵ و حاڵ و پارەیەکی هەیە، کوڕێکی دیندار و ڕێك و پێك و لەسەر خۆیە، ئیتر شوو بکە بەویان، (فاطمە) دەفەرمووێت: (فَتَزَوَّجْتُهُ) یەکسەر ناوی خودام لێ هێناو شووم پێکرد لەسەر فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ، شووم پێکرد و ئوسامەم هەڵبژارد، (فَشَرَّفَني الله بِابن زيد و كرَّمني بِابن زيد) خوای گەورە ڕێزی لێگرتم، توشی باشترین هاوسەری ژیانم بووم، بەڕاستی نمونەی وەفاداری هاوسەر بوو..

جا بەڕێزان: ئەمە بابەتی ئەمشەومانە، ئێمە هەموو شەوان دەڵێین: حیکایەت ناگێڕینەوە، بەسەرهاتەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەمڕۆی ئەم ئومەتەیە، ئێمە

ئێستا لێرەدا دەژین، ئایە کچەکانی ئێمە، ئایە کوڕەکانی ئێمە،تا چەند سودی لێوەردەگرن؟

## وانەکانی ئەم حەدیسە:

## وانەی یەکەم: پەلە مەکەن لە شووکردن

ئافرەت لەکاتی شوو کردندا پەلە نەکات، لەبڕیارداندا، هەر ئەوە کوڕێکی بینیوە، وەلا قۆز بوو، قاتێکی شاڵی لەبەردابوو، خودا دەزانێت قەرزی کردووە لەگەڵ جوتێك کلاشدا، یەکسەر پێی موعجب بێت، یان تەلەفونی کردووە سەد جار بەقوربان و بەساقەی بووە، شوو کردن ئاوا نابێت.. دەرسی ئەمشەومان زیاتر تایبەتە بەکچان، یەعنی بابەتەکە ئاوایە: ﴿ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ شوو بەکێ بکەم؟﴾

ئەمە ناونیشانی بابەتی ئەمشەومانە، کچ دەبێت زۆر ورد بینانە هاوسەری ژیانی هەڵبژێرێت.. (فاطمە) خان ناهەقی نەبوو، ئەمە هەڵبژاردنی کراسێك و جل و بەرگێك و خانوویەك و پۆشاکێك نیە، لێی وەرەس ببیت بە زەرەر بیفرۆشیەوە، یان کورە نەتەوێت، ئەمە ژیانتە، هاوسەر یەعنی ژیان.

لەبەر ئەوە دەبێت زۆر بەوریایەوە، کچان بەتایبەتی هەنگاو هەڵبهێنن، خۆی باش بیناسێت، ئەگەر نەیدەناسی با پرس بەکەسێك بکات کە ئەو دەیناسێت.. وەکو چۆن (فاطمە) پرسی بە پێغەمبەری خودا ﷺ کرد.

## وانەی دووەم: دڵنیا بوون لە پرس پێکراو

بەڕێزان: پرس پێکراو دەبێت ئەمین بێت، نابێت بڵێت وەلاهی ئەوەی کەتۆ دەتەوێت شووی پێبکەیت، بەخودا کوڕی چاکە، لەجەماعەتی بەیانیانیش بینیومە لە مزگەوت، وەلا باوکم جومعەکەرە، بەڕۆژوو دەبێت، عەمرەشی کردووە.. ئەمە ناسین نیە، لە مزگەوت دیومە ئەمە عیبادەتی خودا دەکات، ئەمە واجبی خۆیەتی بێتە مزگەوت، ئەو

کەسە کەپرست پێدەکات، دەبێت ورد و درشتی ئەو کەسە بناسیت ئەمجا رەئی بۆ بدەیت، ئێستا زۆر کەس هەیە دەڵێت، یەعنی: کچ هەبووە پرسی کردووە وتویەتی:

دەبێت شوو بەفلان کەس بکەم ئەبێ چۆن بێت؟ وتویانە بە خودا کوڕی چاکە، ئەم کوڕی چاکە تۆ لەمزگەوتدا بینیوتە، خۆ قابیلە لە مزگەوتدا بەگژتا بێت! نە معامەلەت لەگەڵی دا هەبووە، نە دراوسێی بووی، نەشەریکی بووی، نە هیچ کێشەیەکت لەگەڵیدا هەبووە، قابیلە بەبنا گوێت بکێشێت وەکو (ئەبو جەهەم)؟ نابێت.. دەبێت ورد و درشتی ئەو ئینسانە بناسیت..

ئەها پێغەمبەری خودا ﷺ چۆن ئینسانەکان دەناسێت، دەفەرمووێت: (أما معاوية فَصعلوكٌ لا مال لَهُ) کاکە (معاويە) هیچی نیە، نەخانووی هەیە، نە ماڵی هەیە، نەپارەی هەیە، خەڵك خێری پێدەکات، خەڵك دەیباتەوە بۆ ماڵەوە، ئەی دەباشە ئێواران بردیانەوە بۆ ماڵەوە ئەی مەعقولە بڵێن ژنەکەت لەگەڵ خۆت بهێنە، ئەم زوور و هۆدەیە بۆ تۆ! ! ئەمە نابێت، خۆ ژن هێنان گاڵتە نیە..

پێغەمبەر ﷺ نەفەرەکە دەناسێت، خۆ ئەمانە هەمووی صەحابەن، ئەمانە ئەوپەڕی ڕێزدارن لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ، بەلاّم بە کەڵکی ژن هێنان نایەت، ئەم پیاوە دەبێت شارەزای ڕابردووی کەسەکە بێت، بنەماڵەکەیان بناسێت.. دەفەرموووێت: (أبو جَهَم ضَرابٌ للنساء) لێدەری ژنانە، ئەم بنەماڵەیە هەر بەتایفە چەوسێنەرەوەی ژنانن، بنەماڵەی واهەیە هەر عادەتەن بۆ ژن خراپن، جاری واهەیە لێدانە خراپەکەیان، جاری واهەیە بنەماڵەی واهەیە: دڵ پیسن، یەعنی: (دایمە بە گومانن) یەخوا ئافرەت نەچێتە ماڵیانەوە.. ناوێرێت بەحەیاتی لەپەنجەرەیەکەوە سەر دەربێنێت.. تەلەفونێکی بۆ بێت، دەڵێت ئەوە ئەبێت کێ بوبێت؟ ئەوە دڵ پیسە، ئەبێت وریا بیت کچەکەت نەچێتە ماڵی دڵ پیسانەوە..

هی وا هەیە قسەیەکی پێدەڵێیت، قەت عەفوت ناکات کینەلە دڵە..

هی وا هەیە دوو زمانە بنەماڵەیەکی دوو زمانن..

هی وا هەیە درێژ دادڕن لە قسەدا، یەخوا قسە دانەمەزرێنن، لەگەڵیدا مێشکی سەرت دەبات، ئەوەش خراپەیە..

هی وا هەیە ڕیا بازە، هی واهەیە دزن، هی واهەیە ترسنۆکە، هی واهەیە ساختە چیە، هی وا هەیە لۆ مە کەرە، هی وا هەیە دوو زمانە، ئەبێت ئەو کەسەی کە پرست پێدەکات: ئەرێ فلان کەس من کچم هەیە، یان کچەکە دەڵێت فلان کەس من شوو بکەم بەو کەسە؟ ئەبێت تۆ ورد و درشتی ئەم ئینسانە و ئەم بنەماڵەیە بناسی، بە تایبەت ئینسانەکە، خۆیت ناسیبێت.. ئەمجا بلێیی: ئا، نابێت پرس پێکراو بلێت: دڵێ فلان کەسم لێ دێشێ ئەها پێغەمبەری خودا ﷺ بەلایەوە موشکیلە نەبوو (معاویە) پێی ناخۆشە، یان نا، (أبو جهم) پێی ناخۆشە یان نا..

ئەمە ژیانی ئینسانێکی لەسەر بەندە، ئەو پەڕی بلێی: وەڵاهی داوای لێبوردن دەکەم، من ناتوانم ڕەئی خۆم دەر ببڕم، خۆزگە لە کەسێکی لە من شارەزا ترت بپرسیایە.. ئیتر نابێت بلێیت وەڵاهی لەبەر فلان کەس با دوایی گلەیم لێ نەکات.. ئەبێت شتی ڕاست وەکو پێغەمبەر ﷺ، بە کامل و تەواویەوە بیکەیتە دەستیەوە..

## وانەی سێیەم: ئافرەتان مەرجی پیاوی باش بزانن

دەبێت ئافرەتەکانمان کچانمان بزانن مەرجی پیاوی باش چیە ؟ مەرجی پیاوی باش:

**مەرجی یەکەم: دین داریە**

﴿وَلَعَبۡدٌ مُّؤۡمِنٌ خَيۡرٌ مِّن مُّشۡرِكٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكُمۡۗ ﴿٢٢١﴾ ﴾ خودای گەورە لەسورەتی (البقرە)دا لە ئایەتی (٢٢١) دا دەفەرموێت: بەندەیەک، کابرایەکی خزمەت کاری ماڵان، خزمەت کاری ماڵان بێت و لەماڵان خزمەت بکات، لەبەر بێ پارەیی و بێ حاڵی و بێ کەس و بێ ماڵ.. ئەم عەبدە مادام ئیمان دارە، مادام بڕوای بە خودا و قیامەت و قەبر و دۆزەخ و بەهەشت هەیە، باشترە لە کابرایەکی موشریک..

ئەگەر چی ئەو موشریکە سەرنجتان ڕابکێشێت بەدەوڵەمەنیەکەی، بەسەیارەکەی، بە کۆشکەکەی، بە خزم و کەس و کارەکەی، ئا ئەم خزمەت کارە هەڵبژێرە ئەی کچ، نەك ئەو کوڕە مەسئولە، دەوڵەمەندە خاوەن قەسر و قسورە کەموشریکە، جا موشریك هەر بەرد پەرست نیە!!

لەم ڕۆژانەدا کچێك وتی: بەتەمام شوو بە شیعەیەك بکەم.. وتم وەلا ئەگەر بەقسەی برای خۆت بکەیت، شووی پێناکەیت، چونکە کابرای شیعە ئەگەر بێ دین بێت، ئەوە هەر نوێژ ناکات.. ئەگەر دین دار بێت، موشکیلە ترە لە بێدینێکەی!! ئەوەندە هاواری (حوسێن) دەکات.. بەحەیاتی ناڵێت (یا الله)، ئەگەر بڵێت (یا الله) گومانی هەیە، ئەگەر بڵێت: (یا علی) هیچ گومانی نامێنێت!! دەی تەوە موشریکە.

شوو بەکوڕە مەسولێك دەکەیت، ڕەسمی فلاّن کەس لەژوور سەریەوەیەتی، ئەوەندە لەو دەترسێت ئەوەندە لەخودا بترسایە پەکی نەدەکەوت، ئەوەنابێت، ئەوە عەبدێك یان کرێکارێکی سەرجادە، لەو کوڕە مەسولە خاوەن کۆمپانیایە باشترە، کەبڕوای تەواوی بە خودای پەروەردگار نیە، با سەرنجی تۆش ڕابکێشێت، یەکەم دینداری هەڵبژێرە.

### مەرجی دووەم: ڕەوشتی جوان

(إذا أتاكم من ترضون) ئەگەر کەسێك لەدەرگای دایت هاتە خوازبێنیت، هاتە خوازبێنی کچت، سەیری دوو ڕەوشتی بکە: (خُلُقَهُ) ئەها پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم حەدیسە کە لە صەحیحی (موسلیم)دا هاتووە بەغەڵەت دەیخوێننەوە (دِينَهُ و خُلُقَهُ)، بەلاّم بەپێچەوانەوە: (خُلُقَهُ وَ دِينَهُ) سەیری ئەخلاقی بکە، یەکەم جار: نەرم و نیانی، هەڵسوکەوتی جوانی، ڕاستگۆیی، عارەق نەخۆری، ڕەفیقی باش، بنەماڵەیەکی بەڕێز، بێ دەنگ و بێ تەقە و بێ ئاژاوە..

ئەمجا سەیری دینی بکە: بزانە دینی هەیە، هاتوچۆی مزگەوت دەکات، نوێژ و عیبادەت دەکات، (فَزَوِّجُوهُ) ئەوجا کچی پێبدە، یان کچەکەت شووی پێبکات..

خۆ (ئەبو جەهەم) بە حەیاتی جەماعەتیشی نەدەفەوتاند، بە خودا جومعەی دەكرد، عیبادەتی دەكرد، ڕۆژووی دەگرت، حەجیشی دەكرد.. بەس چونكە لەژنانی دەدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شووی پێمەكە، (لَن يَضرِبَ خِيارُكُم) پیاوی چاك لە ژن نادات، هەركەسێك لە ژن بدات پیاوی چاك نیە، لە ئیسلامدا: ڕەوشت جوانی یەعنی وەفاداری، ئەوەنەبێت بە تەلەفونێك قسەی لەگەڵ كردبێت، ئێستا زۆر كچ بۆیە موشكیلەی هەیە و تەلاق دەدرێت چونكە ئەو كوڕە بە تەلەفون بە ساقە و بە قوربانی بووە..

دەڵێن كاتی خۆی، كچێك و كوڕێك لە دەرەوە بە ناشەرعی بەیەكەوە بوون، كچەكە وتی: ئەو مانگە چەند جوانە! كوڕەكە وتی: ئەوە مانگ نیە، ئەوە دەم و چاوی تۆیە چۆتە سەرەوە.. دوایی گواستیەوە، مانگێك لەلای نەبوو، هێشتا هەر (شهرُ العسل)یان تەواو نەكردبوو.. دەڵێت: كچەكە ئەمەی هەر لەبیر مابوو، وتی: ئەو مانگە چەند جوانە! ئەوە چیە؟ وتی: ئەوە مانگە، وتی: ئەوە مانگە، وتی: خۆ كوێر نیت، ئەوە مانگە خۆ ڕۆژ نیە، ئەو لەبیری چووبوویەوە كەبەوی وتبوو دەڵێی مانگی..

تەواو ئەو زەمەنە ڕۆی، وەفاداری یەعنی: ئێستا ئەم كچەی لەبەر جوانیەكەی دەوێت. ئەی ئەگەر سبەینێ خوا نەخواستە ئەم كچە سوتا، ئەگەر جوانیەكەی لەدەستدا، ئەگەر دەم و چاوی تێكچوو، ئەم كوڕە هەر دەیەوێت وەكو جاران؟!

ئەوە وەفاداریە، ئایا بەدەم و چاوی تێكچوویشەوە دەیەوێت؟

هی واهەیە ژنەكەی سوتاوە، یەكسەر تەلاقی داوە.. یان یەكسەر لە خەستەخانە لەو دەقیقەیەدا بیر لە ژنی دووەم دەكاتەوە! دەڵێت: تەواو بوو، من وەختێك ئەوم دەویست ئەو حۆری بوو، من ئەو پیرە ژنەم بۆ چیە؟ یان جاری واهەیە سەیر دەكەیت كابرا هەر بەگەنجی دەمێنێتەوە، ژنەكە بە منداڵ دادەڕزێت.. وردە وردە سێ چوار منداڵی بووە، بەنەخۆشی بەتایبەتی ئافرەتی ئەم زەمەنە بەفەقەرات، یەعنی سەیر دەكەیت ئافرەتەكە تەپیوە، ئایا ئەم كوڕە وەفادارە بەرامبەری وەكو جاران؟!

کچی ژیر دەبێت کوڕەکە تاقی بکاتەوە، نابێت بە تەلەفون شوو بکات و هەر بەتەلەفون تەلاق بدرێت، ئەوە خەتەرە، ئەوەی بە تەلەفون شوو بکات، هەر بە تەلەفون تەلاق دەدرێت.. ئەوەی لە دەرگای ماڵی بدرێت و، دەستی باوك ماچ بكرێت و، بە حورمەتەوە کوڕێك نەیتونیبێت ڕێزی بشکێنێت، ئەگەر تەلاقیشی بدات، لەبەر دەرگای ماڵی باوکی تەلاقی دەدات، بە تەلەفون تەلاقی نادات..

دەبێت کچەکانمان، خوشکەکانمان، زۆر وریابن..

## لەگەرمەی جەنگدا هاوسەری هەڵبژارد !

بەسەرهاتێکم خوێندەوە زۆر سەرنجی ڕاکێشام لە جەنگی جیهانی دووەم دا، لەوڵاتی ئەڵمانیادا، کەنازیەکان خەریکبوو دەشکان، موحافیزێك ئەمەی بەفکردا هات و وتی: کوڕی گەنج بەقسەی کچ زۆر موعجیب دەبێت، ئەو کوڕە گەنجانەی ئێمە خەریکە لەبەرەکانی جەنگدا دەشکێن، بۆ ئەوەی هێزیان بەبەردا بکەینەوە، داوا لەکچەکان، بەکچی موحافیزەکەشەوە بکەن، نامە بنوسن بۆ بەرەکانی شەڕ، بۆ ئەو لاوانەی لەبەرەکانی شەڕن و کوڕی ئەم شارەن، بڵێن:

ئێوە کوڕی قارەمانن، ئێوە تێکۆشەرن، ئێوە شەرەف و ناموسی ئەم خوشك و کچانەی ئەم وڵاتە بە دەست ئێوەوەیە، هانیان بدەن، جا ئەگەر کوڕ نامەی کچ بخوێنێتەوە، ئەگەر بەدڵی بێت، هەر شێت دەبێت! شەرم لە گولەی (بی کەی سیش) ناکات! . ئیتر وایان لێکردن بۆ ئەوەی مەیدان چۆڵ نەکەن، ئەوە فێڵێکی سیاسی بوو..

دەڵێت یەکێك لەوانەی نامەکەی بەدەست گەیشت، بەدەست و خەتێکی گەلێك جوان نامەکە نوسرابوو، زۆر بەئەدەبی و بە وشەی جوان ڕازاندبوویەوە، چوار پێنج نامەی بۆ چوو.. هەموو جارێك ئەم نامەیە بەنسیب کێ بوایە، ژمارەکەی وەردەگرت و هەمان نامەی بۆ دەچوویەوە.. پێنج شەش مانگ دوای ئەوە، دەڵێت: کوڕەکە جوابی نامەیەکی دایەوە، دەڵێت: من دەمەوێت زەواجت لەگەڵ بکەم، ئەم دەست و خەتە جوانەی تۆ، ئەم

وتە شیرینانەی تۆ، خۆزگە ئێمە نەك هەر لەسەربازی گەڕامەوە، ولاتی ئێمە لەشەڕ سەرکەوتووبوو..

وتی با زەواج بکەین. کچەکە وتی: ڕازیم ئەویش وەلامی کوڕەکەی بەدڵ بوو..

بەلام سەیری ژیری ئەم کچە بکە! دەڵێت: لەنامەیەکدا بۆی نووسی: کەی دەگەڕێیتەوە؟ کوڕەکەبۆی نوسی فلان ڕۆژ لە وێستگەی فلان شەمەند نەفەر دادەبەزم.. کچەکە وتی: باشە من دێم بە پێشوازیتەوە بۆ ئەوەی یەکترین ببینین.. منیش زەواجت لەگەڵدا دەکەم و ڕازیم.. چەپکە گوڵێکم بەدەستەوەیە، وەرەقەیەکی لەناودا نوسراوە: من ئەو کەسەم بمناسەوە، کە ئەو چەپکە گوڵەت بینی، ئەوە منم..

دەڵێت: کوڕەکە وتی: خودایە من چۆن ئەو قسەیەم کرد، ئەبینێت کچەکە بالای کورتە، ناشرینە، بەدڵم نیە، من چۆن وەعدێکی ئاوام دا؟! وەلاهی غەڵەتم کرد.. بەلام هەرچۆنێك بێت بزانم چۆن دەبێت؟.

دەڵێت: کە لەوێستگەی شەمەندنەفەر دابەزی، چاوی گێڕا خەڵکی زۆر هاتبوو بەپیری دەستگیران و ئەوانەی خۆیانەوە کە بەڵێنیان پێدابوو، کچێك نامەیەکی لەناو چەپکە گوڵێك دانابوو بۆ ئەوەی بیناسمەوە، کەسەیری کرد:

کورتە بالایەکە هەر سێ بست دەبێت، هەتا بڵێیت دەم و چاو ناشرین، قژ ئاڵۆسکاو، یەعنی لەگەڵ حورمەتم بۆ سیفەتی بەشەریەت، لە کتێبەکەدا ئاوا نوسراوە، هەرچی سیمای جوانی بێت نیەتی، بەتەمەندا چۆتە تەمەنەوە، قژی سپی بووە..

وتی: ئای دەستی شکاوم چیم بەخۆم کرد؟! باشە منە بەدەست و خەتەکەی تێکەوتم، من چوزانم ئائەم دێوەیە! جاوەرە شەو لەگەڵ ئائەمەدا بکەیتەوە..

دەڵێت: زۆر پەشیمان بووم، بەلام ویستی خۆی لێ بدزێتەوە.. دەڵێت: لەدوایدا وتی: نا ئاخر من ئەم کچەم هەڵخەڵەتاندووە من پێنج شەش مانگە نامەی بۆ دەنێرم.. ئەی بێوەفایی بۆ من؟ ئەم مادام منی لە بەرەکانی جەنگدا ڕاگرت، بە دڵسۆزانە، من تەسلیم بە دوژمن نەبووم، زۆر سەرکەوتوانە ئازایەتیەکانمان بەهۆی نامەکانی ئەمانەوە بوو..

نەخێر، ئەمە عەیبە، ئەمە شورەییە، ئەمە نا ئینسانی و نا پیاوییە، ئینسان پەشیمان بێت لە وەعدی خۆی، وەڵاهی ئەگەر دێویش بێت تازە وەعدم داوە زەواجی لەگەڵ دەکەم!!

دەڵێت: چووە پێشەوە وتی من ئەو کوڕەم کەنامەکانم بۆ دەناردی، بەئەوپەڕی دڵسۆزییەوە، ڕاستە من ئێستا سەیری تۆ دەکەم بەشکڵ و شێوە بەئاواتی خۆم ناگەم، بەڵام بەو وەفاداریەت خۆشحاڵم، کە تۆ بەو وشە جوانانەت منت بەسەر کردەوە..

دەڵێت: لەو کاتەدا کچەکە وتی: داوای لێبوردنت لێدەکەم بەڕێز، من نیم، من خزمەتکار و بەردەستی ئەو خاتوونەم کەنامەکانی بۆ تۆ ناردووە.. ئەو منی ناردووە بەپێشوازیتەوە، ئەها خۆی لەکوێ وەستاوە! دەڵێت خۆی لەوێیە..

دەڵێت: کەچووم مانگ ئاسا!! کچێك هەر شێوازی مانگی چواردەی دەدا، کچی پارێزگاری شار بوو.. بەڵام هەتا بڵێیت ژیر.. وتی: ئەمەت بۆچی پێکردم؟

وتی: تاقیم کردیتەوە کەتۆ منت ببینیایە یەکەم جار موعجیب دەبووی بەجوانیەکەم، جوانیەکەی من سەرنج ڕاکێشە، چەندین کەسم ڕەفز کردۆتەوە، بەس ئائەمەم ناردە بەردەستت بزانم، ئەگەر ئەمت قبوڵ بێت ئینجا ڕاست دەکەیت کەمنت خۆشدەوێت.

سەیری ئەو ژیریە؟! چۆن تاقی کردۆتەوە، تۆ بەو دەم و چاوە ناشرینەوە منت قبوڵ بێت، بەم جوانیەوە هەر لەخزمەتمدا دەبی.. ئەگەر ئەوت ڕەفز بکردایەتەوە، ئەوە بەعومرت چاوت بەمن نەدەکەوتەوە، چونکە دەمزانی تۆ بەدوای جوانیەکەی مندا وێڵیت نەك بەدوای شتەکانی تردا!! لەبەرئەوە دەبێت کچ ئاوا جارێك کوڕ تاقی بکاتەوە، بەدوو قسە کۆتایی بەبابەتەکان نەهێنێت.. ئەگەر نەتزانی ڕەوشتی چۆنە سەیری هاوڕێکانی بکە..

پێغەمبەر ﷺ نافەرموێت (المرءُ على دينِ خَليلِهِ) دەفەرمووێ: ئینسان لەسەر ڕەوشتی برادەرەکەیەتی، ئەگەر دەتەوێت کوڕێك بناسیت، ئەگەر ناتوانیت تەداخولی ناو ماڵیان بکەیت.. سەیری هاوڕێکانی بکە، بڵێ ئەوە ئەم کوڕە ڕەفیقی کێیە؟

ڕەفیقی ئارەق خۆرە؟ ڕەفیقی قومار چیە؟ ڕەفیقی ئەو گەنجانەیە کە تا دوانزەی شەو لەکۆلانان تەقەی دۆمینەیان دێت؟ ئەگەر ڕەفیقی ئەوە بێت، ئەویش ئەوەیە، ئەوە ببینە.. چونکە ئەوە تەمسیلی ڕەفیقەکانی دەکات، بە ڕەفیقەکەیدا بیناسە.. (المرءُ عَلی دینِ خلیلِهِ)

پاشان بەڕێزان حەزرەتی (عمری إبن عبدالعزیز) خەلیفەی پێنجی ڕاشدین وشەیەکی زۆر جوانی هەیە دەفەرمووێت: (إذا رَأیتُمُ الرَّجُلَ یَطیلُ الصَّمْتَ، و یَهرُبُ مِنَ النّاس فاقتَرِبوا منهُ، فأنَهُ یُلقَی الحِکمَةً ) بەڕاستی وشەیەکی بەجێیە، ئەگەر گەنجێکتان، کەسێکتان، بینی دایمە بێ دەنگە، درێژ دادڕ نیە، زمانی پارێزراوە، وە کەسێکی بێ دەنگ و سەنگینە، خۆی زۆر لەخەڵك نزیك ناکاتەوە، دەچێتە سەرکار و پیشەی خۆی، دوو سێ برادەری جوانی هەیە، ڕێك و پێك حەز زۆر بەتێکەلاوی ناکات..

من دەڵێم مەرحەبای هەموو کەس بکە، ناسیاوت زۆر بێت، ئێمە هەمووبمان لە مزگەوتدا ناسیاوین، بەلام مەرج نیە هەموومان برادەری یەکتربین، هەموومان هاوڕێی یەکتر بین، سەیر بکە بزانە: هاوڕێکانی کەمن، با ناسیاوی زۆربێت.. قەیناکە مەرحەبای هەموو کەس بکات، ڕێك و پێك بێت، بەس با هاوڕێکانی کەم بن..

ئەگەر ئاوابوو کچی بدەنێ، لێی نزیك بەوە، ئەگەر کەسێك بوو زمان نەشتەر بوو.. هیچی نەهێشتبوویەوە بتوتایە موحافیزی شار، دەیوت: برادەرمە! بڵێ: فلان وەزیر، دەڵێت: دەیناسم ئەوە هیچ نیە، ئەوە هیچ نیە ئەگەر هەموو کەسێکی ناسی.. یەعنی بۆ خۆی باش نیە لەگەڵ هەموو کەسێکدا تێکەلاو بووە، هەوڵبدە لەوانە نزیك بەوە..

## مەرجی سێیەم: هاوشان بوون

هاوشان بێت لە دینداریدا، حەیفە کچێك ئەهلی شەونوێژ، خەتمی قورئان، دیندار.. شوو بەکوڕێك بکات حەزی لەم شتانە نەبێت.. بڵێت: من نوێژ دەکەم، بەلام حەزم لێنیە تۆ بچیت قورئان بخوێنیت.. حەزم لێیی نیە تۆ بچیت شەو نوێژ بکەیت..

ئەمە باش نیە دەبێت هاوشانت بێت. هاوشانتە لە دینداریدا، لە ماڵ و ساماندا، کچی پیاوێکی دەوڵەمەند بڵێت شوو بەهەژارێك دەکەم، جار هەبووە خوشکمان هەبووە وتویەتی: لە خێمەدا ئیدارەی لەگەڵ دەکەم.. کەچی دوایی سەیر دەکەیت لەخێمەدا ئیدارە ناکات، لە خانووی سەد مەتریدایە، داوای خانووی دووسەد مەتری دەکات.

ئەوە فسرەتی ژیان وایە، هەر پاش ماوەیەکی دیکە لەخێمەدا ناژین، لەبەر ئەوە دەبێت هاوشانی خۆت بێت، ئەمجا هاوشانی کچ تۆ کچی پیاوێکی فەقیری، شوو مەکە بەکوڕی پیاوێکی دەوڵەمەند، هەموو ڕۆژێك سفرەکەی لە جەژنی ماڵی باوکت ڕازاوەترە، چونکە هەموو ڕۆژێك بە چاوتدا دەداتەوە، دەڵێت لەماڵی مندا تێری خوارد!!

باوەڕ بکەن من بەگوێی خۆم بیستومە، ئافرەت هەبووە ڕێك و پێك، ماڵی باوکی کوڕەکە وتویانە: کێی لێیە؟ وتویانە: خەزوری کوڕەکە لە وێیە، دەی هاتووە با تێر بخوات لەماڵی ئێمەدا، لەماڵی خۆیان هەر برسی بوون!! یەعنی بەڕاستی کابرا فەقیرە هاتووە سەردانی کچەکەی بکات، یەکسەر خەسووی کچەکەی وتویەتی: باوکی گەیشتە ئێرە؟ ئەویش با لێرە تێر بخوات، دایمە برسین..

نا، هاوشانی خۆت هەڵبژێرە، ڕەنگ بێت هەموو کەس وانەبێت، دەوڵەمەندی بەعیزەت هەیە، ئەو ماڵە بە ماڵی خودا دەزانێت.. دەڵێت: منیش دوێنێ فەقیر بووم، بەڵام هەموویان وانین، هی واهەیە کە دەوڵەمەند بوو خۆی بەهاوشانی فەقیر نازانێت، چاك وایە هاوشانی خۆت بێت لە بواری دارایدا، لە بواری سەقافەت و ڕۆشنبیریدا، وەکو یەك بن، هەتا تەنانەت زانایانی مەزهەبی شافیعیش دەفەرموون:

سەیری کارو پیشەکەی بکەی باشە، کچی حەماڵێك شوو بکات بە کوڕی وەزیرێك بە خودا ڕەنگە ژیانیان لەدوایدا وەکو یەك تەرازوو نەبێت..

ئەمە کۆمەڵە خاڵێك بوو بەکورتی عەرزی خوشکانی بەڕێزم کرد، بەناونیشانی: ﴿کێ بەهاوسەری ژیانم هەڵبژێرم﴾ ئومێدەوارم هەموو کچانمان، هەموو خوشکانمان، بەختەوەر

بن.. بە هاوسەری باشی خۆیان شاد بن.. خودای پەروەردگار ڕەحم بەحاڵی هەموو لایەکمان بکات.. تا شەوێکی تر و زنجیرە باسێکی تر بە خوداتان ئەسپێرم

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتهُ) .

# وانەی دوانزەیەم

## چ ئافرەتێك بكەمە هاوسەرم؟!

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ النساء : ٣ .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (تُنْكَحُ المَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ : لِمالِها ، وَ لِحَسَبِها ، وَ جَمالِها ، وَ لِدِنِها ، فَاظفَرْ بِذاتِ الدِّينِ ، تَرِبَتْ يَداكَ). ـ رَواهُ البُخاري : (٥٠٩٠) وَ مُسْلِم : (١٤٦٦) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إذا تَزَوَّجَ العَبْدُ فَقَدْ اسْتَكْمَلَ نِصْفَ الدِّينِ ، فَلْيَتَّقِ اللهَ في النِّصفِ الباقي). ـ رَواهُ البَيْهَقي ، وَحَسَّنَهُ الأَلْباني في صَحيح الجامع :(٤٣٠) .

* جارێك لە زانیایەكی بواری ماتماتیك دەپرسن : ئایا ئافرەت چۆن بێت باشە ؟
ئەویش دەڵێ : ئەگەر ئافرەتەكە خاوەن (ڕەوشت) بێت ، ئەوا دەكاتە = ١ .
ئەگەر جوان بێت ، ئەوا سفرێكیشی بۆ زیاد بكە ، كە دەكاتە = ١٠ .
ئەگەر ئافرەتەكە خاوەن (ماڵ و سامان) بوو ، ئەوا سفرێكی دیكەی بۆ دانێ كە دەكاتە = ١٠٠ .
ئەگەر ژن خانەدان و خاوەن (كەس و لەخێزانێكی دیار) بوو ، ئەوا سفرێكی دیشی بدەیە = ١٠٠٠ .
بەڵام ئەگەر ژمارەی یەكەمی (١) نەما ، ئەوا تەنها سفرەكانی دەمێنێتەوە ئەویش دەكاتە : هیچ !!

## سەرچاوەکان :

١) موسوعَة الآداب الإسلاميَّة ، أيْمَن المزين ، ص ٤١٩، ط : ١ ، ٢٠١٣ ، مَكْتَبَة الفياض.

٢) گۆڤاری (پزیشك) ژمارە : ٢٢ ، ل ٤٤ .

٣) گۆڤاری (نواڵەی نوێ) ژمارە : ١٠٢ ، کانوونی دووەمی ٢٠١٢ ، ل١ .

٤) الزَّواج في القُرآنِ وَالسُّنَة الصَّحيحة ، محمد ملا فائق الشهرزوري ، ص ٤٧ ، ط : ١ ، ٢٠١١ .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز: دانیشتنی ئەمشەویشمان لەو زنجیرە باسەی کە ئەمساڵ لە خزمەتیدابووین، بە ناوی: ﴿ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشەو گرفتم هەیە﴾ هاتوومەتە خزمەتت بۆم چارەسەر بکە، با ئەمشەویش بچینەوە خزمەت خۆشەویستمان و سڵاوات لەسەر ئەو کەسە بدەین.. لەسەر ئەو زاتە، ئەو ڕەحمەتە بدەین، کە خودای پەروەردگار خۆی سڵاواتی لەسەر داوە و فەرمانی کردووە فریشتەکان و هەموو ئیمانداران سڵاواتی لێبدەن:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

خۆشەویستان و بەڕێزان: ئێمە دوێنێ لە خزمەت مەجلیس و دانیشتنی پێغەمبەری خودادا بووین ﷺ، کاتێك ئافرەتێکی ژیر و وریا و بەڕێز، بە ناوی (فاطمە ی إبنت قیس)ەوە هاتە خزمەتی و باسی ئەوەی کرد کە: هاوسەرەکەی بە کەسێکدا کە ناوی (عەیاش)ە، ئەو (ابوعمر)ی هاوسەری جوابی بۆ ناردووە وتویەتی: من تۆم ناوێت و تەلاقم داوی، دواتر لە هەواڵەکەی کۆڵیوەتەوە ڕاست بووە.. دوای بەسەر چوونی عیدەی..

لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ کۆمەڵگا زۆر پێشکەوتوو بووە، ئێستا زۆر شت هەیە لەسەر ئیسلام حیساب دەکرێت، کە دوێنێ شەو کات نەبوو ئاماژە بەو خاڵە گرنگە بکەم، ئەویش ئەوەیە: جاری واهەیە لەوڵاتی ئێمەدا کەسێك هاوسەرەکەی دەمرێت.. یان

مێردەکەی تەلاقی دەدات. ئەگەر دوای سێ چوار ساڵ شوو بکاتەوە.. خەڵك هێشتا پێی عەیبەیە دەڵێن: کوێرا شووی کردەوە؟!

ئەم ئافرەتە بەرێزە، یەکسەر کە عیدەی بەسەر دەچێت، عیدە واتە: (مەسەلەی پاك بوونەوەیە) عیدەی ئافرەتێك کە تەڵاق درابێت ئەگەر حەملی هەبێت، سکی هەبێت، دەبێت سکەکەی دابنێت، هەر ئەو دەقیقەی سکەکەی دادەنێت ئیلاقەی بە مێردە پێشوەکەیەوە نامێنێت.. لەو دەقیقەیەدا بۆی هەیە شوو بکاتەوە، ئەگەر هاتوو حەملی نەبێت، سکی نەبێت، ئافرەتەکە پێویستە سێ جار بکەوێتە بێ نوێژیەوە، سوڕی مانگانەوە، پاك بێتەوە، لەجاری چوارەمی پاك بوونەوە بۆی هەیە شوو بکاتەوە..

ئەگەر لە سوڕی مانگانە وەستا بوو، یان لێی تێکچوو بوو، سێ مانگ دادەنیشێت.. لە چوارەم مانگدا بۆی هەیە شوو بکاتەوە.. ئەگەر یەکێك مێردەکەی مردبوو، مێردەکەی وەفاتی کردبوو.. دەبێت چوار مانگ و دە ڕۆژ دابنیشێت.

ئەگەر حامیلەش بوو حەملەکەی دابنێت، دوای ئەوە یەك دانە ڕۆژ بە عەیبە حیساب نەبووە لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ، ئەم ئافرەتە کە عیدەی تەواو کرد داوی سێ پاك بوونەوە، جاری واهەیە سێ مانگیشی پێ ناچێت، یەکسەر خوازبێنی کار هات، سێ پیاو لە دەرگایان داو هاتن بۆ خوازبێنی، خۆی سەری لێیان دەرنەدەچوو کامیان باشە، باسمان کرد کە چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی:

شوو بە فلان و فلان مەکە، چونکە (معاویە) ماڵ و سامانی نیە، بۆ خۆی لەدەرکی خەڵکە چۆن ژن لەبەر دەرکی خەڵك بەخێو دەکرێت؟!

(أبو جَهَم ضَرَّابٌ لِلنِساءِ) (ئەبو جەهەم) پیاوێکە توند و تیژە، دایمە گۆچانێك لەسەر شانیەتی، هەر قسە بکەیت بەلا ملت دەکێشێت.. ئەویش بەگۆچان دەتکوژێت ڕۆژێك، ئەویش بەکار نایەت.. (فعليك بأُسامَة بن زيد) وەسیەتت بۆ دەکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی شوو بکە بە (ئوسامەی کوڕی زەید) کە کوڕێکی گەنجە، هێمن و لەسەرخۆیە،

خاوەن ماڵ و پارە و خانووە، دەفەرمووێت: شووی پێکرد و باشترین هاوسەری ژیانی بوو..

## کوڕان چ کچێك هەڵبژێرن ؟

دوێنێ باسی کچانمان کرد، ئەی کوڕان؟ئەگەر کوڕێك بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من کێ بێنم؟ ئەی من هاوسەری ژیانم چۆن دیاری بکەم؟

پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر گەنجانمان دەفەرمووێت (تُنْكَحُ المَرأةُ لِأَربعٍ) لە صەحیحی (بوخاری) و (موسلیم)دا ئەم حەدیسە هاتووە.. ئافرەت کە ئینسان دەچێتە خوازبێنی، کە مەیلی پیاو ڕادەکێشێت، کەسەرنجی ئافرەتێك بدات، ئەم هۆکارانە پیاو، کوڕی گەنج، کەتەمەنی ژن هێنانی دێتە پێشەوە.. داوای لێدەکات کە بڕوات بۆ خوازبێنی ئافرەتێك، کەشەریکی ژیانی هەڵبژێرێت، بۆ ئەم شتانە:

هی واهەیە لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندە، سەیر دەکات ئەم ئافرەتە سەروەت و سامانێکی زۆری هەیە، هی واهەیە سەیارەی هەیە، خانووی هەیە، موچەی هەیە..

دەڵێت: ئەوە زۆر چاکە، من ئەگەر موچەم نەبێت ژنەکەم هەیەتی، سەیارەی هەیە، خانوویەکی بەناوەوەیە، باوکی میراتی زۆری بۆ بەجێهێشتووە، تموحی ماڵەکە وای لێدەکات کەسەرنجی ئافرەتەکە ڕایبکێشێت، ئەمە بۆ من باشە..

(وَلِحسبها) یان حەسەب و نەسەب و بنەماڵەی، ئەمە لەعەشیرەتی فلان کەسە، ئەمە کچی فلان کەسە، ئەوە بنەماڵەی فلان کەسە، ئەوە خانەدانە، ئەوە دەست ڕۆشتووە، ئەوە بەیانی من دەبمە کوڕی ئەو ماڵە، ئەو هەموو چەکدارەیان هەیە، کێ دەتوانێت قسەم پێبڵێت؟ پشت و پەنام دەبێت، بە ئومێدی ئەوە دەڵێت: با بچمە خوازبێنی فلان کەس ،خوشکی فلان کەس، بە ئومێدەی حەسەب و نەسەبێکی بەقوەتی هەیە..

(وَلِجَمالها) یان سەرنج دەدات زۆر جوانە ئافرەتەکە، سیمایەکی زۆر جوانی لەلایەن پەروەردگارەوە پێبەخشراوە، هەر بەبینینی ئەم کوڕە عاشق و شەیدای دەبێت، ئەوەی کەتەماشای دەکات بەس جوانیەکەیەتی دەچێتە خوازبێنی ..

(وَلِدینها) یان تەماشا دەکات ئەم کچە، ئەم ئافرەتە بەڕاستی دیندارە، داپۆشراوە، حەیا و حورمەتدارە، ئەهلی نوێژە، ئەهلی جومعەیە، ئەهلی دەرس و دەوری قورئانە، لەگەڵ کۆمەڵێك خوشکی مو حەجەبەدا سەری بەیەکەوەناوە لەو زەمەنی فیتنەیەدا، ئەم بۆ خۆی خەریکی خزمەت کردنی حەدیس و قورئان و شەرعە..

دوو منداڵی داناوە دەرسیان پێدەڵێت.. ئەم پیاوە سەیری ئائەمە دەکات، دەڵێت: هەی ئافەرین لەم زەمەنەدا کە خەڵك خۆی ڕووت دەکاتەوە، لەم زەمەنەدا کە ئافرەتان بە داخەوە هەموو دەرگای فەسادیان بۆ کراوەتەوە، ئەم ئافرەتە بەم گەنج و جوانیەی خۆی، جاری واهەیە سەیر دەکەیت بێجگە لە حیجابەکەی عابایەکی داوە بەسەری خۆیدا، ئەمە دەبینیٚ، ئەخلاق و دینی تێدا دەبینێت..

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (فاظفَر بِذاتِ الدِّینِ تَرِبَت یَداك) تۆ هەوڵبدە چاوت لەو ئافرەتەیان ورد بکەوە، کە خاوەنی دینە، جا کە خاوەنی دینی ڕاستەقینەی بوو، خاوەنی ڕەوشتیش دەبێت.. چونکە ڕەوشتی جوان بەرهەمی دینە، بەرهەمی تێگەشتنێکی واقعیە لە دین، ئەوە بەڕاستی تۆ دەستی خۆتت وەشاندووە، ئەوە بەڕاستی تۆ گرەوت بردۆتەوە..

(تَرِبَت یَداك) یەعنی دەستت ناچێت بەخۆڵدا، ئەوە بەڕاستی تۆ کاسی ئاڵتونت وەرگرتووە، ئەوە تۆ خەزێنەی دنیاو قیامەتت وەرگرتووە، ئەوە تۆ بەڕاستی بەختەوەرە بوویت ئەی کوڕی گەنج، دەی کوڕی گەنج تەماشای ئەو ئافرەتە بکە کە دین و ئەخلاقی هەیە، پێغەمبەر ﷺ باسی ئەوانی تریشی کرد، یەعنی ئەوانی تر لەگەڵیدا بن زۆر باشە، نمونەی حەدیسەکە وەکو زانستێکی بیرکاری ڕوون دەکەینەوە:

ئەگەر ئافرەتێك خاوەنی ڕەوشت و دین و ئەخلاقی پەسەند بێت، وابزانە ژمارە یەکە(١) بنوسە ئەم ئافرەتە ژمارەکەی: یەکە، ئەگەر لەگەڵیشیدا دەم و چاوی جوان بوو، ئەوە بۆی بکە بە دە(١٠)، سفرێك بۆ یەکەکە دابنێ، دەبێت بەچەند؟ دەبێت بە دە، لە خودا بەزیاد بێت هەم دینی هەیە، هەم ئەخلاقی هەیە، هەم سیماشی جوانە.. پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: ئەگەر چوویتە ماڵەوە نیشانەی ئافرەتی باش ئەوەیە کە سەیری دەم و چاوت کرد.. قەناعەتت بێت، ئەوەندە جوان بێت لە بەرچاوت، نەچیت بیر لە ئافرەتی تر بکەیتەوە، ئەوەش یەکێکە لە سیفەتە جوانەکان، (نُورٌ عَلَى نُور) ئەوە بوو بە دە، سفرێکی دیکە بخەرە بەردەم یەکەکە..

خۆ ئەگەر ماڵ و سامانیشی هەبوو هەر چاکە، موچەیەکی باشی هەیە، لەباپیرانیەوە دەوڵەمەند بوون، قەیچێکە، خۆ ئەمەش بۆ خۆی خەلاَتێکە، سفرێکی دیکە بخەرە بەردەم یەکەکە، دەبێتە ژمارە سەد(١٠٠) هەم دیندارە و بە ڕەوشت، هەم سیما جوان ڕێك و پێك، بوونی بنەماڵەیەك نا،چەکدار و شەڕانی، بنەماڵەیەك حورمەتدار لای خەڵك، ڕێز و حورمەتیان لەخەڵك دەگرت، کۆمەڵێك برای هەبوو شەکرە پیاو..

کۆمەڵێك ئامۆزای هەبوو دیندار و خوداناس، عالم، زانا، دەرچوی جامیعە، مامۆستای جامیعە، ئەو دکتۆر بوو، ئەو ئەندازیار بوو، ئەویان محامی بوو، تۆ ئیشت بەکامیان بوو، ئەویان مودیری شورتەیە، ئەو مودیر ئاسایشێکی ڕێك و پێك بوو.. یەعنی سەیر دەکەیت ئەم بنەماڵەیە هەموو دام و دەزگاکانی وڵاتیان بەدەستەوەیە، بۆ هەر کار و بارێك دەچیت یەکێکیان هەیە، دەی ئەمە بۆ خۆی بەرەکەتێکە، تۆ بۆ خۆت لە ماڵی خەزوورتدا خزمت هەیە، ئەوە سفرێکی بۆ زیاد بکە، بوو بەچەند؟ بوو بەهەزار (١٠٠٠).. ئەم ئافرەتە باڵانسەکەی گەشتۆتە هەزار ..

بەس وەرە یەك شت بکە: ئەم ئافرەتە یەکەم ژمارە کە دین و ئەخلاق بوو، لێی بکەرەوە، دەبێتە سێ سفر (٠٠٠) ، سفر لەزانستی بیرکاریدا هیچ قیمەتی هەیە؟! سێ سفر لە تەنیشتیەکەوە ڕیز بکەیت هیچ قیمەتی هەیە؟! نەخێر..

هەزار ملیۆن سفر بەیەکەوە ریز بکە هیچ قیمەتی نیە، بەڵام ئەوە ئەو سفرانە بە یەك شت قیمەتیان وەرگرت، بوو بە دە، بوو بە سەد، بوو بە هەزار، بە ژمارە یەکەکەوە ئافرەت بە دین و ئەخلاقەکەوە دەبێتە هەزار، چەند کەس هەیە هەتا بڵێیت ژنەکەی جوانە،کەچی دەڵێ: خۆزگە لە خۆزگەی خودا ئەو جوانیەت بکردایە بە سەد بەشەوە، نەوەدوونۆ بەشی نەبوایە، بەڵام دین و ئەخلاقی هەبوایە، ڕێزی میوانی بزانیایە، قەدر و حورمەتی مێردی بزانیایە، خۆزگە لە خۆزگەی خودا یەك کەسم لە بنەماڵەی ئەم نەناسیایە، چونکە هیچیان کەڵکی پەنجا فلسیان نیە، هەموویان بەڵان، پێت عەیبە بڵێیت: ماڵی فلان کەس ماڵی خەزورمە، ئەوە ژن برامە، ئەوە ئامۆزای خێزانمە، هەموو شەڕانی، قەرز کوێر، خراپ و هەر لە ڕووت نایە، دەبێت خۆت لە مەجلیسدا بدزیەوە.. ئەگەر ئەمە دین و ڕەوشتی لێبوویەوە دەبێتە سفر، سفرەکان سودیان نیە، سفر لە زانستی بیرکاریدا بێ ژمارە هیچ سودی نیە..

بۆیە دایمە کوڕانی گەنجمان، هەوڵمەدە ئەوەندە بەرز بڕوانیت کڵاوەکەت بکەوێتە خوارەوە، ئەوەندەش سەرت شۆڕ مەکەوە لوتت بدات لە سەر عەرزەکە.. لە ئافرەتدا سەیری ناوەندەکەی بکە..

دەڵێت: لە زانایەکیان پرسی: دەتەوێت چۆن ژنێك بهێنیت؟ وتی: وەڵا ئەگەر خودا بەنسیبم بکات، ئەوەش هەمووی دوای ئەوەی دەبێت داوای یارمەتی لە خودا بکەیت، هیچ کەس بە ئازایەتی خۆی ناگات بەو پلەیە..

ئەوەی هەمانە بەڕێزان، ئەوەی ژنی باشی هەیە، ئەوەی ئەولادی باشی هەیە، ئەوی ماڵی باشی هەیە، ئەوەی حورمەتی هەیە، ئەوەی قسەی هەیە، ئەوەی پلە و پایەی هەیە، وەڵاهی هەر هەمووی هی خودایە، هەر هەمووی هی خودایە، هەمووشی تاقیکردنەوەیە.. هەر هەموومان تاقیدەکرێینەوە بەوەی کە پەروەردگار پێی بەخشیوین..

ئایا دەڵێین: (هذا مِن فَضْلِ رَبِّي) ئەوە هی خودایە، ئەینا من ئەو پیاوە ئازایە نەبووم ئەم ژنەم هەڵبژاردایە، خودا ڕەحمی پێکردم، بە قسەی پێغەمبەری خودام ﷺ کرد، چاوم لە دین و ڕەوشت کرد سوپاس بۆخوا، کۆمەڵێك مواسەفاتی تریشی تێدابوو..

وتیان: زاناکە تۆ چ ژنێك هەڵدەبژێریت؟ وتی: ئەگەر خودا ڕەحمم پێ بکات، حەز دەکەم ژنەکەم زۆر جوان نەبێـت، بۆ هەر شوێنێك ڕۆشتم سەد کوڕ ئاوڕی لێبداتەوە، ژنی وا هەر بەلایە، هەیە فەقیرە ناوێرێت لە ماڵ بێتە دەرەوە.. یەعنی هەندێك ژن هەن سیمایەکی هەیە بەلایە بۆ مێردەکەی، حەزناکەم ئەوەندە جوان بێت، خۆزگە ئەوەندە ناشرینیش نەبێت باس باسی ژنەکەی من بێت لەناو کۆڕ و مەجلیسدا، پێی تەریق ببمەوە.. هێندە درێژ نەبێت لە ئاستیدا سفریم، ئەوەندە درێژ بێت وابزانن من سفرم لە تەنیشتیەوە..

وتی: ئەوەندەش کورتە باڵا نەبێت وابزانن من یەکم و ئەویش سفرە لە تەنیشتمەوە، بۆی دانەوێمەوە، ئەوەندە قەڵەو نەبێت لە ئاستیدا بەری ڕۆژم لێبگرێت.. ئەوندەش لاواز نەبێت گۆشتی پێوە نەبێت..

وتی: سپی نەبێت وەکو بەفر، ڕەشیش نەبێت وەکو خەڵوز، هەر لە هەمووشیاندا هەر ناوەند باشە، هێندە سەخی تەبیعەت نەبێت دینارێك لەماڵمدا نەمێنێت، ئافرەتی واش خراپە، تۆ دینارێك پەیدا بکەیت ئەو دینار و نیوێك سەرف بکات.. ئیتر ئەوە ماڵ وێران دەکات، ئەوەندەش ڕەزیل نەبێت، بۆ چایەك ئێواران بچمە ماڵی دراوسێکان.. ئافرەتی واش هەبووە: چای بۆ منداڵەکانی لێنەناوە، بە خودا ئەمشەو دەبێت بچین بۆ ماڵی فلان کەس، چایەك بخۆین، لەم هەموو شەکر و چایە هەرزانەدا، ئەوەندەش ڕەزیل نەبێت بمان کوژێت، لە ناوەندا بێت..

بڵێ: خودایە ژنێکم بە نسیب بکەیت ناوەند بێت، نە زۆر شاز بێت، نە زۆر خراپ بێت، لەو ناوەندەدا ڕەنگە لێی بحەسێیتەوە..

## خوت بپارێزە لەم ئافرەتانە بۆهاوسەرگیری:

شارەزایانی بواری دەرونی دەڵێن: گەنج خۆی بپارێزێت لە کۆمەڵێك ژن، ئەمە خوانەخواستە بێ حورمەتی بە ئافرەت نیە، ئەمە ئامۆژگاریە بۆ خوشکانی بەڕێزم، بۆ کچەکانمان، بۆ خوشکەکانمان، کە هەوڵبدەن ئەم سیفەتانەتان تێدا نەبێت.. ئێوە لەوە گەورەترن، ئافرەت مرۆڤە، ئافرەت نیوەی کۆمەڵگایە، دایکی نیوەکەی تریەتی.. زۆر گەورەترە لەوەی کە ئەم سیفەتە بچوکانەی تێدا بێت، ڕەحمەت لەو خوشکەی لەم ڕەمەزانەدا گوێ لەم حەدیسە دەگرێت، ئەگەر ئەو سیفەتانەی تێدا بوو وازی لێ دێنێت.. چونکە تۆ لەوە گەورەتری، تۆ خاوەنی پەیامی، تۆ ئینسانیت، خودا ڕێزی لێگرتوویت، ڕێزگرتنت هەیە بە ئینسانیەتی خودا، جارێکی دیکە ڕێزی لێگرتوویت کە بەرگی ئیمانی بەبەردا کردوویت.. دەڵێت خۆت بپارێزە لەم جۆرە ژنانە:

**یەکەم: (الأنانە) ناڵەناڵ دەکات**

ئەوەی دایمە ناڵە ناڵیەتی، هەر دەچیتە ماڵەوە قسەی خۆشی ئای سەرم تەقی، ئای سکم تەقی، هەموو دەمێك دەناڵێنێت، ئەوە زۆر خراپە تۆ لەجیاتی هەموو شتێك هەر ناڵە ناڵ و هاوار هاوار بکەیت..

**دووەم: (الحنانە) بەراوردی مێردەکەی بەکەسی تر دەکات**

دایمە مێردەکەی هەڵدەسەنگێنێت بە پیاوی خەڵك، بڵێیی ئافرەت پەرداخێك ئاوم بۆ بهێنە، ئەوە پیاوی فلان کەس دەڵێن پەرۆ بۆ ژنەکەی دەشوات، کورە بابە من دەڵێم پەرداخێك ئاوم بۆ بهێنە تۆ بۆ بەراوردم دەکەیت بە پیاوی خەڵك؟! من حەقم چیە بەپیاوی فلان کەسەوە؟ بەردەوام پیاوی خەڵك دەبینێت، ترازوەکەی پیاوی خەڵکە بەرامبەر بە مێردەکەی، پیاوی فلان کەس سێ معاشی هەیە، پیاوی فلان کەس دەستی دە کەس دەبرێت بۆ ئەوەی نان بۆ ماڵ و منداڵەکەی پەیدا بکات، ئاخر ژنەکە من

نامەوێت سێ چوار معاشی بەلاشم هەبێت لە حکومەتدا، من ماستاو چیەتیم پێ ناکرێت، ئەم پیاوە دەبێت بەردەوام لە خەتی دیفاعدا بێت، گوڵێکی بۆ ناکرێت..

سێیەم: (المنّانە) منەت دەکات

بەردەوام منەت دەکات، دەڵێت جا تۆ چیت هەبوو؟ من وەختێك شووم بەتۆ کرد، سێ بەرە شرەمان بوو، پیاوی واهەیە فەقیرە خانوویەکی سێ قاتی هەیە، دایم ژنەکە دەڵێت: ئەرێ لەبیرتە کەمن شووم پێکردی لە کەپرێکدا بووین؟! ئەی خۆ هەتا ماوە لە کەپرێکدا نابێت! ئێستا لە خودا بە زیاد بێت لە سێ قاتدایە، تۆ ئەمەت لەبیر نەچۆتەوە، دایمە منەت دەکات، ئەمە زۆر خراپە، ئەوە لەبیرت چوو یەوە من شووم پێکردی هیچت نەبوو؟

چوارەم: (البراقە)

ئەوەی دایمە ئیش و کاری بەر ئاوێنەیە، بەس دایمە لەبەر ئاوێنەیە هەر بە موکێشێك برۆی دەکات بە قەیتان و هێشتا هەر وازی لێ نایەنێت، ئەمە بەس موکێش بە دەستیوەیەتی ئیشی بەس موو هەڵکەندنە، ئەوە خراپە، ئاوێنەکە وەرەس بوو ئەم هەر وەڕەس نابێت..

پێنجەم: (الحداقە) حەزی لەهەموو شتێکە

ئافرەتێکی تر (الحداقە) چاوی بەهەرچی کەوت حەزی لێیەتی، دەبێت سەیرێکی گیرفانت بکەی بزانیت داخۆ گیرفانت حەزی لە چیە؟ نەك ئافرەتێك بچێتە بازاڕ سەیر دەکەیت پەنجا هەزاری پێیە، بای پێنج سەد هەزار بە قەرز لە دوکانەکان نوسیوە.. ئەوە بە قیست بۆت دێنن، مێردی داماو سەیردەکەیت پێشمەرگەیە، مۆزەفە، فلانە، سەیر دەکەیت حەوت سەد هەزار معاشەکەیەتی، ئەم بەیەك ڕۆژ پێنج سەد هەزاری سەرف کرد. ئەم قەرزە نادرێتەوە، دوایی مەنجەڵەکە لە کارتۆنەکەدا هەڵنەپچڕاوە، بەتازەیی بۆ دوکانەکەی دەباتەوە.. بە بەلاشیش نایەوێتەوە.. دەڵێت:

بابە کێ ئەمەی دەوێت؟ ئەمە مۆدێلی بەسەرچووە.. جا ئەم مۆدە پشتی خەڵکی فەقیری شکاند، سەیردەکەیت قەنەفەکەی عەیبی نیە، قەیچێکە با تۆزێك کۆن بێت، بە خودا ئەگەر میوانێك بێت بۆلای تۆ، من زۆر جار ئەوەم وتووە:

دۆستی ڕاستەقینە ئەگەر هات لەسەر حەسیر دانیشێت موشکیلەی نیە، چونکە ئەو نەهاتووە بۆ لای ماڵەکەت، ئەو هاتووە بۆلای تۆ، جا ئەگەر تۆ لەسەر حەسیر دابنیشیت، ئەو لەسەر حەسیردا دابنیشێت گرفتی نیە، بە خودا ئەگەر دۆستی ڕاستەقینە نەبێت، ئەگەر قەنەفەکە بای دووسەد وەرەقە بێت، زەمت دەکات، چونکە ئەو هاتووە بۆلای ماڵەکەت، خۆ بۆ لای تۆ نەهاتووە ! !

لەبەر ئەوە لای دۆستە ڕاستە قینەکانت مەترسە لەماڵەکەت، ئەو هاتووە بۆ لای تۆ، جا تۆ بۆخۆت بەحەسیری شڕ ڕازیت، ئەو بۆ ڕازی نیە؟ لەبەر ئەوە فەقیرە دەچێت دەیکڕێت، وەڵا لەماڵی فلان کەس چاوی بەو قەنەفەیە کەوتووە، بەو کەوانتەرە کەوتووە، بە قیستە، قەیچێکە مانگی دوو وەرەقە دەدەیت.. کوڕە مێردەکەی تۆ سێ وەرەقەی دەست دەکەوێ، وەرەقەیەکی بە ئاو و کارەبا دەڕوات.. ئینجا چی بۆ دەمێنێتەوە؟! ئەی خۆ هەوا نا خۆی؟ ئەوە ئافرەتی حەداقەیە، موشکیلەیە، چاوی بەهەر شتێك کەوت دەچێت دەیکڕێت! !

**شەشەم: (الشداقە) بەفیزەوە قسە دەکات**

ئەوەیە کە بەفیزەوە قسە دەکات، قسە هەڵدەبژێرێت، وەلەجیاتی بڵێت: باشە دەڵێت (ok)، لەهەموو زمانی ئینگلیزیدا ئەوە فێر بووە، لەجیاتی بڵێت خودا حافیز، دەڵێت: بای بای، ئەی تۆ هیچ وشەیەکی تری ئینگلیزی نازانیت، ئەمە هەر عەیبە پیاو (ok) و بای بای بزانێت، ئەم دوو وشەیە دەزانێت، خۆی پێوە هەڵدەکێشێت، هیچ شەهادەیەکی نیە قەڵەمێك بەسەر شانیەوەیەتی ! !

**حەوتەم: (العصبیە) پێکەنین وگریانی خێرایە**

ئافرەتی عصبیە، عەصەبیە یەعنی: بەیەك قسە پێدەکەنێت، بەیەك قسە دەگری، لەناو مەجلیسدا لە دە دەقەدا، هەر دوو بارەکەی بەسەردا دێت، پێدەکەنێت لەکت و پڕدا دەگریەت، دڵ خۆشە، لەکت و پڕدا عاجز دەبێت.. ئەوەش زۆر موشکیلەیە تۆ نازانیت بە کامیان بڕوا بکەیت..

**هەشتەم: (الخیالیە) لە خەیاڵدا دەژی**

ئافرەتی وا هەیە دایمە لە خەیاڵدایە، بەردەوام لە خەیاڵدا دەژیا، قەسرەکەی وابێت، سەیارەکەی وابێت، بای شەش دەفتەر بێت، ئەو ماڵە وابێت، ئەم خەیاڵ بلاوەیە زۆر خراپە، ئینسان بەخەیاڵ ڕاستە باشە، بەلام دەبێت بە سنوری خۆیدا بێت، دوایی وا نەچێتەئاسمان و باڵۆنەکە بتەقێت سەرت بدات بە ئاسنێکدا !!

**نۆیەم: (العنیدە) عینادە**

ئافرەتی وا هەیە عینادە، یەعنی قەیچێکە بائافرەت گوێ ڕایەڵی مێردەکەی بێت، عینادی لەگەڵدا وانەکات، کە وتی ئەوەمەکە بڵێ قەیچێکە بەسەر چاو، مادام کەتۆ پێت خۆش نەبێت، وامزانی ڕازیت نایکەم، ئافرەتی وا هەیە عینادە زیاتر بەرقدا دەچێت!

**دەیەم: (الآکولە) ئاواتی خواردنە**

ئافرەتی وا هەیە بەس ئاواتی خواردنە، هیچ فەن و هونەرێکی نیە ئیلا خواردن نەبێت، خۆ ئافرەت ئەگەرکۆمەڵە خواردنێك بزانێت، بۆ خزمەت کردنی ماڵ و مێردەکەی، مێردەکەی میوانێکی دەبێت ماڵەکەی بە پوخت و خاوێنی بۆ دەڕازێنێتەوە.. بەلام هەموو هونەرەکەی هەر خواردنە!

**یانزەهەم: (اللّباسە) هیوایەتی جل و بەرگە**

ئافرەتی وا هەیە هیوایەتی جل و بەرگە، دەزانێت کامە ماکسی هاتووەتە نێو بازاڕەوە، هێشتا لە تورکیا دەر نەچووە ئەم لێرە دەزانێت لە کوێیە؟! ئەم هەموو دۆلابە، وەلاهی ئێمە خەڵکی شەرق بەوە دواکەوتووین، ئەو ئەورپیانە من زۆرم بیستووە

دەڵێت کابۆیەکی هەیە، لەگەڵ کراسێکدا، ئەگەر ئەمە دەدرێت ئەمجا دانەیەکی تر دەکات، وەڵاهی ئێمە ئەو هەموو ماکسیە شرە، ئەو ڕۆژە لەبەر دەمی ئەو مزگەوتە دوو فەردە ماکسیە شرە فرێدرابوو.. هەموو تازە و نوێ، بڕوا بکە خەڵك لە گرانیەکەدا شتی وای دەست نەدەکەوت، دابویان بەسواڵکەر هەر لەبەری نەکردبوو..

دەڵێت مۆدی بەسەر چووە دابویان بە سواڵکەر، سواڵکەرەکەش لەوێ پێی ڕازی نەبوو فرێی دابوو، سواڵکەرەکەش وتویەتی مۆدی بەسەر چووە، ئەویش نایەوێ!!

یەعنی سەیری ئەو هەموو دۆڵابە جلە بکەن، ئەمە هەمووی بە پارە دەکڕێت..

بەڕێزان تا دەتوانی لە جیاتی ئەوە کتێبێك بکڕیت، ئافرەتی وا هەیە ئەگەر بیدات بە کتێب، یەك کتێب خانە دروست دەبێت بۆ منداڵەکانی بۆ داهاتوو.. هەر دەیکاو دەڵێت ئەم جلە کوردیە داهاتووە، بۆ یەك موناسەبە لەبەر نەکراوە، وەلا مۆدیلی بەسەر چووە، خۆ ئەوە دەمێکە باوی نەماوە، ئەوانە فەنانن ئەو مۆدیل بازاڕانە، بۆ کێشانەوەی پارە لەم خەڵکە، وایە هی وا هەیە (اللّباسه)، هیواو ئاواتی بەس جل و بەرگە، بەس خۆ ڕازاندنەوە..

### دوانزەهەم: (الصَّياحة) مێردەکە بە شتەوە دەوێت

ڕووی خۆشی لەگەڵ مێردەکەیدا، سەیری دەستی مێردەکەی دەکات ئەو ئافرەتانەش بەڵان.. ئەگەر مێردەکەی دەستی پڕ بێت ئەم ڕوی خۆشە، ئەگەر سفرەی ڕازاوەی بێت و چی بوێت بۆی بکڕن.. ئەوە باشە، ئەگەر ڕۆژێك نەیبوو ئەم ڕوی تاڵە..

## دوای فەقیر بوونی .. خێزانەکەی سوك سەیری دەکات !!

ئەڵێت: کابرایەك هەبوو، خودای گەورەیە بە قەدەری خۆی بەسەری کردبوویەوە، تاقیکردبویەوە بەوەی: حورمەتمان هەیە، چاوێکی کوێر بوو، لە منداڵیدا زەبرێکی بۆ ڕێك کەوتبوو، چاوێکی نوقسان بوو، دەستێکیشی مەیلەو گۆچ بوو، ئاوا بە بۆنەی شەلەل و ئەوانەوە پەنجەکانی خوار بووبوون، ئەمە وەکو عەرزم کردن هیچ عەیبەیەك نیە بۆ

ئینسان، چونکە هیچ کەسێك بەئازایەتی خۆی سەلامەت نیە، هەمووی تاقیکردنەوەی خودایە، ئەوانە هەموویان ئەجریان لای خودای پەروەردگار هەیە..

ئەوانەی کە کەم ئەندامن دەبێت شایەنی ڕێز بن لەم کۆمەڵگایەدا، ئەم پیاوە ئاوا بوو، بەڵام دەوڵەمەند بوو، چووە خوازبێنی ئافرەتێك، ئافرەتەکە زۆر بەدڵ خۆشیەوە شووی پێکرد.. چەند ساڵ بەیەکەوە بوون، چەند منداڵێکیان بوو، کابرا کە هەموو ڕۆژێك دەهاتەوە بەدەستە ساغەکەی دوو سێ عەلاگەی دەگرت، پارەی فرێ دەدا بۆ ژنەکەی، دەیگوت: چیت حەز لێیە بۆخۆت بیکڕە (سبحان الله) بازرگانی دەکرد، ئەم پیاوە موعامەلەچی بوو، جار بۆ جار لەشکست بوو، هەرچی دەیکڕی زەرەدی دەکرد.. دواتر قەرزی کرد.. دواتر لەبەر قەرز هەڵهات.. ماڵەکەی بار کرد بۆ شوێنێکی دیکە، خانوویەکی بچکۆلەی بە کرێ گرتبوو..

دەڵێت: ڕۆژێکیان کە گەڕایەوە هیچ لە گیرفانیدا نەبوو، بە دەستی خاڵی، ژنەکەی ڕۆی بە پیریەوە عەلاگەکانی لێوەر بگرێت. بەڵام ئەمڕۆ هیچی پێ نیە..

دەڵێت: سەری هەڵبڕی وتی: ئەوە چیە دەستت خاڵیە، بە چاوێکی نابیناوە، بە دەستێکی گۆجەوە هاتوویتەوە؟!

ئەو هەموو ساڵە هیچی پێنەوتبوو، چونکە دەستەکە پڕ بوو، یەك ڕۆژ عەلاگەی پێنەبوو، یەکسەر دایەوە بە ناوچاویەوە، کە تۆ چاوێکت کوێرە و دەستت گۆجە..

یەعنی بەڕاستی ئەو ئافرەتانەش موشکیلەن، کە بەڕاستی دەستی مێردەکەیان دەبینن، نەك سەنگینی مێردەکەی، نەك حورمەت و ڕێزی مێردەکەی، جا بەڕاستی خوشکانی بەڕێز، ئەم سیفەتانە کە دوانزە سیفەتن لە هەر ئافرەتێکدا هەبن ماڵ دەکەن بە دۆزەخ، ژیانی هاوسەری بەختەوەر ناکەن، ژنی بەڕێز نیوەی ئیمانە، گەنجی بە حورمەت و بەڕێزو پابەند بوون بەئیمانەکەیەوە، بە حورمەتەکەیەوە، نیوەیەتی، کە ژنی هێنا ئیمانی تەواو دەبێت، لە زۆر بەلا نەجاتت دەبێت..

لەبەر ئەوە فەیلەسوفێك دەڵێت: کوڕی خۆم ژن بهێنە، باوکە ناوێرم، کوڕی خۆم ژن بهێنە دوو سیفەتی باش هەیە: ئەگەر ژنی ساڵیحە و خوداناس بێت تۆ پێش قیامەت لە بەهەشت دایت، پێش قیامەت ئەم دونیات بەهەشتە، لەگەڵ حۆریەکدا ژیان بەسەر دەبەیت، ئەگەر خوداناس و ڕەوشت بەرز بێت..

کوڕی خۆم: ئەگەر ژنەکەت خراپ بێت دەبیت بە فەیلەسوف، هێندە ڕەفتاری نالەبار دەبینیت، هێندە فرت و فێڵ دەکەیت بۆ ئەوەی ژیانت تێك نەچێت، هێندە ئەو کارێك دەکات تۆ نابێت بهێڵیت خەڵك بزانێت، ئاخری دەبیت بە فەیلەسوف بە ژنێکی خراپ.. کەواتە لە هەردوو بارەکەدا باشە، ئێمە نامانەوێت ببین بە فەیلەسوف، دەمانەوێت ژیانمان بەختەوەر بێت، جا لەوانەیە کوڕێکی بەڕێز بڵێت:

من چوزانم ئەم سیفەتانەی هەیە، یان نا؟ دەتوانیت لە بنەماڵەکەیەوە سەیریکەیت، ئەها کچی واهەیە ڕۆژ تا ئێوارە لەو دوکانانە دەسوڕێتەوە، ئەوە حاڵ نیە کچی واهەیە ڕۆژ تا ئێوارە لەبەر دەرگا دانیشتووە، جا ئافرەتێك ڕۆژ تا ئێوارە موراقەبەی خەڵك بکات، تۆش لەمەوە دەتوانیت خۆی و بنەماڵەکەی بناسیت، ئەو ئافرەتانەی لەبەر دەگا دانیشتوون، حەیفە کوڕی گەنج خۆیانی لێ بدات.. بە سەراحەت دەڵێم: ئەمانە نە خەریکی کار و باری دینن، نەخەریکی کار و باری دونیا، کەسانی بە مەبدەء ئەوەندە مەشغوڵە، سەری ناپەرژێت، بۆیە ئافرەتێکی بەڕێز ببینە بە عومری نایەتە بەر دەرگا، فریا ناکەوێت، خزمەتی ماڵ، خزمەتی منداڵ و پیاو، میوان و پاك و خاوێن کردنەوەی ماڵ، ئەی ئەو ئافرەتانەی دایمە لەبەر دەرگان؟!

یەعنی خەریکی هیچ نین، لەو ئافرەتانە بەدوور بە کە دایمە لە بازاڕدان، تو خودا ئەگەر داخوازیت کرد بڕۆ لە دوو سێ دوکان پرسیار بکە، کە قەرزیان لایە بزانە قائیمەی ئەم ماڵە قەرزی گەشتۆتە کوێ؟ هی واهەیە دەڵێت: قەرزی حەوت، هەشت ساڵی لەمەوبەری ژنانم لەلایە.. یەعنی: فەقیرە هەر شتی بردووە وتویەتی بینوسە، ئەوە خەتەرە، سبەینێ تۆش توشی ئەمە دەبیت، ئەو ئافرەتە لەو ماڵەدا بووە، هەوڵبدە بزانە

بەڵکو بزانیت هەر قائیمەی قەرزی نەبێت، بە قەناعەت بێت، ئینجا هەولبدە بزانە ئەم ئافرەتە ڕەفاقەتی کێ دەکات؟

ئەگەر لەگەڵ ئافرەتێکدا بێت هەتا سەر ئەژنۆی ڕووت بێت، قابیلە دوایی ببێت بە موحەجەبە! ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە، زۆر کوڕ خۆی هەڵخەڵەتاند، وتی: فلانە کەس موحەجەبە نیە، ڕێك و پێك نیە، بەڵام بە ئیزنی خودا وای لێدەکەم دەیکەم بە فریشتە.. بەڵام لە دوایدا سەیر دەکەیت دینەکەی خۆشی بۆ ئەو دەدۆڕێنێت..

کاکە ئەگەر دارێك بەنەمامی، بە بچوکی نەچەمابێتەوە، نەکرابێت بە گۆچان، بە ڕەقی ناکرێت! دەبێت بیشکێنیت، (وكَسرُها طَلاقُها) شکاندنەکەشی تەلاق دانیەتی، سەیری دایکی بکە، سەیری خوشکی بکە، سەیری باوکی بکە، بزانە ئەمانە چ بنەماڵەیەکی ڕێك و پێکن، سەیری ڕەفیقەکانی کچەکە بکە، بزانە لە مەکتەب ڕەفیقی کێیە؟ بزانە لە مەکتەب ڕەفیقی ئافرەتانی سەنگینە، یان مامۆستاکانی لێی ڕازیبوون، ئایە لە کولیە ئەم ئافرەتە هەر خەریکی نامە گۆڕینەوە ومۆبایل بازیە، یان خەریکی دەرەجەهێنانە و دەخوێنێت؟ ئەمانە هەمووی چاو ورد بوونەوەی دەوێت، بەڕێزان یەخوا نەکەویتە دەستی ئافرەتی خراپ..

حەزرەتی (عمر) فەرمووی: ئافرەتی واهەیە وەکو زنجیری ئاسن وایە لە ملی پیاودا، نەدەیەڵێت بیپچڕێنێت، نە دەیەڵێت لە شان و ملتی بکەیتەوە، و ئیسراحەت بکەیت!

ئومێدەوارم کە (انشاء الله) کوڕە گەنجەکانمان، بەختەوەربن، ئومێدەوارم کە کچەکانمان بەختەوەربن، هاوسەری شیاو و خاوەن دین خاوەنی ئەخلاق، پاشان (انشاء الله) نمونەی جوانی ڕەوشت و ئەخلاق، جوانی سیما، بنەماڵەی بەڕێز و حورمەتدار، بوونی سەروەت و سامانێکی حەڵاڵ، (انشاءالله) لە قیامەتیشدا بەیەکەوە دەبن و بە منداڵی چاوگەشیش نور و ڕۆشنای چاوەکانیان دەکرێتەوە..

تا شەوێکی تر و بەرنامەیەکی تر بە خوداتان دەسپێرم..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ الله وَبَرَكاتُهُ) .

# وانەی سیانزەیەم

## تەیەموم

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى : ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ﴾ المائدة : ٦ .

* عَنْ عائِشَةَ ، قالَتْ : خَرَجْنا مَعَ النَبِيِّ ﷺ في بَعضِ أسفارِهِ، حَتَّى إذا كُنَّا بِالبَيداءِ، إنقَطَعَ عقدٌلي، فَأَقامَ النَبيُّ ﷺ عَلى التِماسِهِ ، وَ أَقامَ النّاسُ مَعَهُ ، وَ لَيْسُوا عَلى ماءٍ ، وَلَيسَ مَعَهُم ماء ، فَأَتَى النّاسُ إلى أَبي بَكْرٍ فَقالُوا : الا تَرى إلى ما صَنَعتْ عائِشَةَ ؟ فَجاءَ اَبو بَكْر ، وَ رَسُولُ اللهِ ﷺ واضِعٌ رَاسَهُ عَلى فَخذي قَدْ نامَ ، فَعاتَبَني ، وَقالَ ماشاءَ الله لَهُ أَنْ يَقُول ، وَجَعَلَ يطعن بيده في خاصِرَتي ، فَما يمنَعُني مِنَ التَّحرُكِ إلاّ مَكانَ النَبِيِّ ﷺ عَلى فَخذي، فَنامَ حَتَّى أصبَحَ عَلى غَيْرِ ماءٍ ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعالى آيَةَ التَّيَمُمِ ، فَقالَ اسيد بن حضير : جَزاكِ اللهُ خَيْراً ، فوَ اللهِ ما نَزَلَ بِكَ أَمْرٌ قَطُّ تكرهينه ، إلاّ جَعَلَ اللهُ لَكَ فيهِ خَيْراً . ماهذا بأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يا آلَ أَبي بَكْرٍ ، قالَتْ : فَبَعَثْنا البَعيرِ الَّذي كنتُ عَلَيْهِ فَوَجَدْنا العقد تَحْتَهُ ، فَقالَ أَبي : وَ اللهِ ما عَلِمْتُ يا بنيَةَ إنَّكِ لَمُبارَكَةٌ ، ماذا جَعَلَ اللهُ لِلْمُسْلِمينَ في حبسك إيّاهُمْ مِنَ البَرَكَةِ وَاليُسْرِ .

ـ رَواهُ البُخاري (٣٣٤) وَمُسْلِم : (٣٦٧) . وَ أحمد في مُسْنَدِهِ .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (إنَّ الصَّعيدَ الطَّيِّبَ طَهُورُ المُسْلِمِ ، وَ إنْ لَمْ يَجِدِ الماءَ عَشْرَ سِنِينَ ، فَإذا وَجَدَ الماءَ ، فَلْيُمِسَّهُ بَشَرَتَهُ فَإنَّ ذالِكَ خَيْرٌ) ـ صَحيحٌ ، رَواهُ أبُوداود : (٣٣٣) وَ الترمذي : (١٢٤) . وض أحمد : (٢١٠٥٨) . وَ صَحَّحَهُ الألْباني في الإرْواء (ج١ ، ١٨١ ، ح : ١٥٣) .

* عَنْ عَمْرو بنِ العاصِ ، قالَ : احْتَلَمْتُ في لَيْلَةٍ بارِدَةٍ شَديدَة البردِ ، في غَزْوَةِ ذاتِ السَّلاسِلِ ، فَأَشْفَقْتُ إنْ اغْتَسَلْتُ أنْ أهْلَكَ ، فَتَيَمَّمْتُ ، ثُمَّ صَلَّيْتُ بِأصحابي الصُّبْحَ ، فَذَكَرُوا ذالِكَ لِلنَبِيِّ ﷺ فَقالَ : (يا عَمْرُوا ، صَلَّيْتَ بِأصْحابِكَ وَأنْتَ جُنُبٌ ؟!) فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذي مَنَعَني مِنَ الإغْتِسالِ ، وَ قُلْتُ : إنّي سَمِعْتُ اللهَ تَعالى يَقُولُ : ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾﴾ النساء : ٢٩ . فَضَحِكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَلَم يَقُل شَيْئاً) ـ صَحيحٌ ، رَواهُ أحْمَد في مُسْنَدِهِ : (١٧٧٣٩) . وَصَحَّحَهُ الألْباني في صَحيح سُنَن ابي داود ، بِرَقَمْ : (٣٣٤) .

## سەرچاوەکان :


١) نِداءَاتُ الرَّسُول لِأصْحابِهِ ، محمد عبدالعاطي بحيري ، ج٢ ، ص١١٥ .

٢) رَوْضَةُ المُتَنَزِّه ، شَرح بدايَة المُتَفَقِّهِ ، أيْمَنْ علي مُوسى . ج١ ، ص١٢٣ ، ط : ١ ، ٢٠١٠ دار إبن رَجَب .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز: مسوڵمانانی خۆشەویست: ئەمشەویش بە پشتیوانی خودای پەروەردگار لە خزمەت پێغەمبەری خودادا دەبین ﷺ، بە ڕاستی ئینسان کە لەم زنجیرە باسانەدا هەر شەوەی لە گۆشەیەکەوە دەچێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ دەبێ بیهێنێتە بەرچاوی خۆی، ئەو هەموو صەحابە ڕێك و پێکە وا لە خزمەتیدان، لەو کاتانە چ موشکیلەیەك ڕوودەدات.. چۆن گرفتێك دێتە پێشەوە و پێغەمبەری خودا ﷺ بە حەکیمی و لێزانی خۆی چارەسەری بۆ دادەنێت..

## ونبونی ملوانکەیەك.. تەیمومی هێنا !

ئەمشەو دەچینە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، بزانین چ موشکیلەیەك و چ گرفتێك ڕوودەدات، بەڵام ئەمشەو باس لەوە دەکەین: زۆر جار کەسێکی ناڕەحەت، کە ڕوداوێکی لێ ڕوداوەو بەهۆیەوە ناڕەزای ڕوودەدات، خودای گەورە لەپشتی ئەو ناڕەحەتیەوە، ئەو موشکیلەوە، خێرێکی گەورەی حەشار داوە.. هەتا ئەم موشکیلەیە ڕوونەدات ئەم دەرگای خێرە ناکرێتەوە..

بابەتی ئەمشەومان لەسەر ئەو مەوزوعەیە، کە خاتوو (عائیشە) بۆمان دەگێڕێتەوە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێبێت) ئەم فەرموودەیە: ئیمامی (بوخاری) و ئیمامی (موسلیم) و ئیمامی (أحمد) لە موسەنەدەکەیدا گێڕاویانەتەوە.. حەدیسێکی (مُتفقٌ علیه)یە، خاتوو عائیشەی دایکمان دەفەرمووێت:

لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دا بووم بۆ غەزایەك ڕۆشتبووین، گەڕابووینەوە، ماندوو، لەشکرێکی یەکجار زۆر، ئەو هەموو صەحابەیە لە خزمەت پێغەمبەری خودادا ﷺ بەرەو

مەدینە دەگەڕاینەوە، گەیشتینە شوێنێك پێی دەڵێن (بەیدا) چەند کیلۆ مەترێکی زۆری مابوو بۆ مەدینە شوێنێکی لێ دەربکەوێت.. دەفەرمووێت: ئێوارەیەکی سەر لە درەنگ، ئێوارەیەك بوو ئەگەر بڕۆشتینایە ڕەنگە بگەشتینایەتە ئاوەدانی، ڕەنگە بگەشتینایەتە کانی و ئاوێك، شوێنێك، بەڵام قەدەری خودای پەروەردگار وابوو، ملوانکەیەکم لە ملدا بوو، زۆرم پێ جوان بوو، دایمە دامدەناو لە ملم دەکرد و تەماشام دەکردوو تازە پێغەمبەری خودا ﷺ بۆی کڕی بووم.. وەڵا ئاوام کرد سەیر دەکەم ملوانکەم لێکەوتە خوارەوە، ئەو کاتە ئافرەتان لەسەر پشتی حوشتر، وەکو کابینەیەك پێیان وتوە کەژاوە..

دەفەرمووێت: وەڵا ئاوام کرد لە دەستم کەوتە خوارەوە، لە کەلێنی تەختەکانی حوشترەکەوە کەوتە خوارەوە، هاوارم کرد قافڵەکە بوەستێنن.. وەڵا ملوانکەم لێکەوتە خوارەوە حوشتریان ئیخ داو هاتمە خوارەوە..

(سبحان الله) ئەو ناوە هەرچی صەحابە بوو گەڕان ملوانکە بوو بە ئاو و بە ئەرزدا چوویە خوارەوە کەلێنی ئەرز دەگەڕان، ئەملا، ئەولا، گەڕاینەوە بەرەو دواوە، تۆزێك بەرەو پێشەوە، وەڵا ئەو ملوانکەیە، ئەو گەردن بەندەیە نە دۆزرایەوە.. هەتا وامان کرد سەیر دەکەین تاریکی داهات، شەو داهات، ئەو زەمانە خۆ لایت نەبووە، شەویش لەشکرێکی ئاوا بڕوات نابێت، ئیحتیماڵە تۆ بەسەر کەمینێکدا بکەویت.. دڕندەیەك، مارێك، دووپشکێك لە ڕێگاتدا بێت..

وەڵا ناچار خەڵکەکە، هەتا وامان کرد تاریك بوو، ناچار لەوێ ماینەوە.. ماینەوەو هەر کەسێك لە ئاستی خۆی حوشترەکەی خۆی ئیخ داو، خێمەیەکی بچکۆلەی پێبوو هەڵیدا.. ئەوی گرفتە لێرە ئەوەیە (لَيسوا عَلى ماءٍ) ئێمە لەسەر کانی و ئاوێك نەبووین (وَلَيسَ مَعَهُم ماء) خەڵکەکەش ئاویان پێ نەبوو.. هی واهەبوو بەس بەشی خۆی و سێ چوار قوم ئاوی لێبخواتەوە..

ئەی خودایە نوێژی مەغریب، خودایە نوێژی عیشا، ئەی نوێژی بەیانی، ئەی ئەو خەڵکە (قضاءالحاجە) بەچی بکات؟!

دەفەرمووێت: گوێم لێ بوو خەڵك (فأتى النَّاس إلى أبى بكر) خەڵکەکە چوون بۆلای ئیمامی (أبو بکر)، لەڕوویان نەهات لەلای پێغەمبەر ﷺ هیچ بڵێن.. (فقالوا: ألا ترى إلى ما صنعت عائیشە)، وتیان: نابینیت عائیشەی کچت چ بەزمێکی نایەوە؟!

ئەمە هەمووی بەهۆی ئەوەوە بوو، ئەو گەردن بەندەی بۆ لێکەوتە خوارەوە.. بە هۆی ئەوەوە ئەو هەموو لەشکرە مەحتەل بوو، ئاخر ئەمە شوێنە لەم بیابانە بێ ئاوەدا، نە ئاومان پێیە، ئەی باشە ئێمە ئەو نوێژە جوانانەمان بفەوتێت؟ ئەها صەحابەکان چەند خەمی نوێژیان بوو، خودایە گیان ئێمە دەست نوێژ بەچی بگرین؟!

دەفەرمووێت: (فجاء ابو بکر و رسول الله ﷺ واضع رأسه علی فخذی قد نام) خاتوو عائیشە دەفەرمووێت: باوکم هات بۆلام توڕە بوو، پەست بوو، کە هات سەیری کرد پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕانم خەوی لێکەوتووە.. قاچم ڕاکێشا پێغەمبەر ﷺ سەری کردە سەر ڕانم، ماندوو بوو، زۆر جوان خەوی لێکەوتبوو.. سەیری ئەو خۆشەویستیەی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ خێزانەکانی!

نالێت: بێقەزا بیت چیت کرد؟ ئەم لەشکرە، ئەوە کەی حاڵە و ئەم ملوانکەت بۆ هێندە دانا، کەی وەختی ئەوەیە.. نەخێر، پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ئەوەی دڵی خاتوو (عائیشە) بداتەوە، یەعنی: ئەی (عائیشە) هەر دڵگران مەبە، بە خەیاڵمدا نایەت، دەفەرمووێت: قاچت ڕابکێشە بۆم بکە بە سەرین، سەر دەکاتە سەر ڕانی خاتوو (عائیشە)، وەکو ئەوەی پێی بڵێت: ئەمە هیچ موشکیلە ڕووی نەداوە.. ئەو پێغەمبەرە نەرم و نیانە، ئەو پێغەمبەرەی کە هەرگیز کێشە بچوکەکانی گەورە نەدەکرد، لە بچوکیدا بچوکتری دەکردەوە، ئالێرەشدا با ئێمە سڵاواتی لێبدەین و بڵێین:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلی عَلی شَفیعِنا مُحَمَّدٍ وَعَلی آلِهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)

دەفەرمووێت: کە باوکم هات پێغەمبەری لەو خەوە خۆشەدا بینی، ئەو عارەقە لەنێو چەوانیەتی، سەری لەسەر ڕانمە، دەفەرمووێت: ( فَعاتَبَنی وَ قال ماشاء الله له أن یقولَ) زۆری لۆمە کردم، باوکم لێوی خۆی لێدەگەستم لەبەر پێغەمبەر ﷺ دەنگی بەرز نەدەکردەوە، بۆ ئەوەی خەبەری نەبێتەوە، (و قال ماشاء الله له أن یقول) چی خودا بەدەمیدا هێنا بەنسیبم بوو، ئاگام لێبوو لە ژێر دەمیەوە دەیگوت:

ئەی (عائیشە) تۆ چۆن ئەم خەڵکەت بە هیلاك برد! (و جعل یطعن بیده في خاصِرَتي) خاتوو (عائیشە) دەفەرمووێت: باوکم بە دەستی دەیدا بە کەلەکەمدا دەیوت تۆ بۆ ئەم خەڵکەت والێ کرد خاتوو عائیشە دەفەرمووێت: (فما یمنعنی من التَّحرك إلا مکان النَّبیِّ علی فخذي) وەڵاهی ئەوندەم ئازار پێگەشت کەلە کەلەکەمی دەدا و ئازاری دەدام، بەڵام بۆ ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ نەشڵەژێت و خەبەری نەبێتەوە..

زۆر توند خۆم گرتبوو.. بۆ ئەوی نەجوڵێمەوە، بۆ ئەوەی ڕانم نە جوڵێت لەتاوی پێغەمبەری خودا ﷺ، باوکیشم لەلۆمەی ئەو خەڵکە، ئێستا ئەم ئەهلی مزگەوتە ڕوو بکەنە کەسێك بڵێن خەتای کچەکەی تۆ بوو، ئەویش لە تاوان دەچوو پەلاماری کچەکەی دەدا.. خاتوو (عائیشە) دەفەرمووێت: زۆر توند خۆم گرتبوو بۆ ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر ڕانم خەبەری نەبێتەوە..

دەفەرمووێت: (فنام حتی أصبَحَ علی غیر ماء) وەلا خەڵکەکە ناچار لێی خەوتن، پێغەمبەری خودا ﷺ هەتا نیوەی شەو هەستا بۆ شەو نوێژێك بەڵام هیچ ئاو نەبوو.. هەر ئەوی لەو دەبانەدا لامان بوو، ئەویش بۆ خواردنەوە دەشیا..

(فأنزل الله تَعالَی آیة التَّیَمُّم) لەبەری بەیانیدا خودای گەورە ئایەتی تەیمومی بۆ پێغەمبەر ﷺ ناردە خوارەوە، فەرمووی لەمەودوا ئەو گرفتەتان نەما، ئەگەر لە شوێنێك بوون حاڵەتێکی ئاوا هاتە پێش، ئاو نەبوو، دەی ئەو خاکە هەر ئاوە، دەستی پێدا بدەن، دەست بەسەر دەم و چاوتاندا بهێنن.. ئەوە دەست نوێژە، دەست نوێژی خۆتان شت..

دەفەرموویێت: ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە خاتوو (عائیشە) دەفەرموویێت: (أُسَید إبن حضیر) هات بۆلام وتی: (جزاكِ اللهُ خیرا) پاڕەبی خودا جەزات بداتەوە، وەڵاهی خاتوو (عائیشە) هەر شتێك بەسەر تۆدا بێت خودای گەورە لە پشتیەوە خێرێکی گەورەی داناوە.. (ماهذا بأول برکتکم یا آلَ أبي بکر) وەڵاهی ئەی ئەهلی (أبو بکر) ئەمە یەکەمجار نیە، ئێوە بەردەوام خێرن بۆ ئەم ئیسلامە..

خاتوو (عائیشە) دەفەرموویێت: (فبعثنا البَعیر الّذي کنت علیه) ئەو خەڵکە زۆر دڵخۆش بوون لە خودا بەزیاد بێت جا ئەگەر بمێنینەوە، دەست نوێژمان ئەو تەیوممەیە، دەست بەو خاکە پاکەدا دەدەین و بە دەست و دەم و چاومانی دادێنین و ئەوە دەست نوێژمان هەیە، موشکیلەی بێ ئاویمان نەما، لەبارەی دەست نوێژ و خۆشتن و ئەوانەوە..

دەفەرموویێت: کە حوشترەکانمان جوڵاند بڕۆین (فوجدنا العُقدَةَ تحته) سەیر دەکەین ملوانکەکەم لە ژێر حوشترەکەدا کەوتووە.. هەر ڕێك کە کەوتبووە خوارەوە حوشترەکەیان ئیخ دابوو، بۆ ئەوەی من دابەزم، ڕێك لە ژێری دابوو، ئێمە ئەم هەموو چواردەورەی بۆ گەڕابووین.. حکمەتی خودا لەمەدابوو ئائەمە ڕوو بدات، بۆ ئەوەی ئەم ئایەتە بێتە خوارەوە، ئەم ڕەحمەتە بە ئومەتی ئیسلام بکرێت..

دەفەرموویێت: هەر ڕێك لەژێر حوشترەکەدا بوو، هەستا حوشترەکە یەکسەر چاومان لێبوو ملوانکەکەشمان دۆزیەوە.. دەفەرموویێت: ئەمجا باوکم هات، فەرمووی: تو خودا ڕۆڵە گیان گەردنم ئازاد بکە، وەڵاهی نەمزانی ئەو هەموو خێر و بەرەکەتە هەمووی بەهۆی ئەم کردارەی تۆوە بوو، ئێمە لە ئێوارەوە چەند دڵ ناڕەحەتین! ئای خەفەتم خوارد لە ئێوارەوە، باوەڕبکە لەبەر پێغەمبەر ﷺ نەبووایە لەوانەیە لێم بدایتایە، ئەوە پێغەمبەر لەسەر ڕانت بوو، هیچ دەسەڵاتم نەمابوو، هەر نەبوو لەکەلەکەت بدەم، لێوی خۆم بگەزم، لەداخا، دەستم نەدەگەشتی هیچم بۆ نەدەکرا، بەڵام نەمزانی ڕۆڵە گیان ئەمە هەمووی مایەی خێرو بەرەکەت بوو..

دەفەرمووێ: صەحابەکان دڵخۆش بوون بەم ئایەتی تەیومە، کەبەڕاستی ڕەحمەتێکی گەورەیە..

## حاڵەتەکانی تەیموم کردن:

### حاڵەتی یەکەم: نەخۆش بیت

ئەوەیە کاتێك نەخۆش بیت، زۆر وای لێ دێت ئینسان شوێنێکی خۆی دەبرێت دەدورێتەوە، نەخۆشیەکی خودا نەخواستە پێستی هەیە، بەدەم و چاویەوە بەهەر شوێنێکیەوە، ناتوانی خۆت بشۆیت، ناتوانی دەست نوێژ بگریت، ناتوانی ئەو ئەندامە تەڕ بکەیت، تەیموم دەکەیت، تەیموم ئەوەیە: دەڵێیت نیەتمە نوێژ لە خۆم حەلاڵ دەکەم، تەنانەت کەسێك کەلەشگرانی لەسەرە، ناتوانێ خۆی بشوات، پێویست نیە دەست بەسەر هەموو جەستەیدا بهێنێت..

دەفەرمووێت: جارێك بەدەم و چاوتدا، جارێك دوو جار سێ جار بێت باشتر، جارێکیش ئەو دەستەت هەڵبگریت، سەعات و موستیلە دابکەنیت، ئاوا دەستی پیا دێنی و دەڵێی نیەتمە نوێژ لە خۆم حەلاڵ دەکەم.. هەر زۆر ئاسانە بەڕێزان، مەسحی سەر و قاچی نیە، کوێ ساغە دوای برۆ بیشۆ، لە پێشدا دوای وشکی بکەوە بە خاولی و ئەم تەیومە بکە و برۆ بۆخۆت نوێژەکانت بکە، هەموو فەرزێك تەیومی تایبەتی خۆی بۆ بکە، چونکە ئەمە ڕەحمەتە.. جارێکیان دوای ئەمە ڕوداوێك ڕویدا..

دەفەرمووێت: (جابر) دەفەرمووێت صەحابەیەك لە غەزایەکدا تاوێرە بەردێك لە شاخێکەوە ترازا و دای بەسەریدا، یەك برینی گەورە کەوتە سەریەوە، وەلا لەو کاتەدا سەری برینەکە پێچراوە، کە بەیانی لە خەو هەستا ئیحتیلام بوو.. شەوی لەشگرانی بەسەردا هاتبوو..

دەڵێت: لە صەحابەکانی پرسی بۆ خاتری خودا من چی بکەم، ئەم برینە لەسەرم یەك لای کونە، ئەگەر خۆم بشۆم ئاو دەچێتە سەرمەوە، ئەگەر خۆم نەشۆم نوێژەکانم

دەفەوتێت.. وتیان: کاکە چار نیە دەبێت ئیلا خۆت بشۆیت، وەلا فەقیرە حەوزە ئاوێك لەوێ بوو، چووە ناویەوە، کە خۆی نوقم کرد یەك پارچە سەری پڕ بوو لە ئاو، بوو بە ئینتهاب و جەراعەت و سەری ئاوسا!! وەلا بەو نەخۆشیە مرد.. ئەو برینە لێی پیس کرد و مرد!!

کە هاتنەوە بۆ مەدینە و بۆ پێغەمبەریان ﷺ باس کرد، پێغەمبەر ﷺ زۆر تورە بوو، فەرمووی: (قَتَلُوهُ قَاتَلَهُمُ الله) بە نەزانی کوشتیان یاڕەبی خودا بتان کوژێت، ئەو کەسەی بەنەزانی ئەم فتوایەی بۆ دا ئەمە ئەم پیاوەتان بۆ بە نەزانی کوشت..

شیفای نەزانین پرسیار کردنە، ئەگەر شتت لەخۆتەوە نەزانی خۆت مەکە بە مامۆستا، شت لە خەڵك قورس مەکە، ئەمە تەنها پێویستی بەوە بوو دەستی بە عەرزەکەدا بهێنایە و بە دەم و چاویدا بهێنایە، دەستی بە هەردوو دەستی بهێنایە هەتا ئانیشکی، باقیەکەی لێرەوە ساغ بوو، دەیتوانی هەتا سەری بچوایەتە ناو ئاوەکەوە، ئەم تۆزەشی دەم و چاوی ئاوی پێدا کردبا، بەلاَم پێویست نەبوو ئەم سەرەی پڕ بێت لە ئاو، پڕ بێت لە جەراعەت و بیکوژێت، کوشتیان خودا بیان کوژێت!!

پێغەمبەری خودا ﷺ قەت دووعای شەڕی نەکردووە، بەلاَم زۆر پەرۆشی ئەو صەحابەی بوو، کە دین ئەمەی تێدا نەبوو، لێیان کرد بە دین!! کوشتیان بە ناحەق دەفەرمووێت: زۆر پێی عاجز بوو، ئەمە لە حاڵەتێکدا کە تۆ ئەو برینەت هەیە، ئەو لەش گرانیەت لەسەرە، ئەو بێ دەست نوێژیەت لەسەرە، خودای گەورە ئەو ڕەحمەتەی ناردووە، گڵ لە جیاتی ئاوە..

## حاڵەتی دووەم: لە کاتی سەرمادا

لە حاڵەتی سەرمادا سەرمایەکی بە هێزە ، بەیانی هەستاوی، بە مەرجێك نەتوانیت ئاو گەرم بکەیت، ئێستا غاز هەیە، بۆیلەر هەیە، دەتوانیت ئاو گەرم بکەیت، بەلاَم سەیر دەکەیت غازت نەبێت، بۆیلەرت نەبێت، کارەبات نەبێت.. بەیانی هەستاوی خۆ چیلکە و

دارت پێ کۆناکرێتەوە، یان ناتوانی دەستت بەوە ڕاناگات، هیچ خۆت صەغڵەت مەکە، بە هێواشی تەیەمومی خۆت بکە، ئەمجارە برۆ نوێژەکەت بکە..

هەر وەختێك نیوەڕۆ بوو خۆت شت ئێوارە بوو خۆت شت، غوصلێکی پاك و خاوێن لە خۆت دەربکە، هەتا ئاوی گەرمت دەستکەوت، ئاوەکەت بۆ گەرم نەکرێت، یان حەمام هەبێت پارەی حەمامەکەت پێ نەبێت، پێویست نیە بچیت قەرز بکەیت.. کە پارەت پێ نەبوو قەرز مەکە بۆ کرێی حەمام، کە ئاوی گەرمی لێیە، یان جل و بەرگت لەبەردا نەبوو، یەعنی کراسێکی شڕەت لەبەردایە، پاڵتۆ شڕێکت هەیە، ئەگەر خۆت بشۆردایە پێی گەرم نەدەبویتەوە.. هی واهەیە جاری وا بە ئاوی سارد خۆت بشۆیت، جلەکانت هێندە گەرمن، خێرا خاولیەکە لەخۆتەوە دەپێچیت، پاڵتۆیەك لە خۆتەوە دەپێچیتەوە، گەرمت دەبێتەوە.. بەڵام سەیر دەکەیت کابرا ئەم بەرگەشی لەبەردا نیە، یان مەئوایەکی نەبوو، کابرا لە خێمەیەکدا دەژیا، لە کەپرێکدا دەژیا، ژورێکی نەبوو..

ئێستا لەبەر ئاوی سارد خۆت بشۆیت، کە ڕات کردەوە بەر زۆپایەکی گەرم، هەر چاکە، کابرا زۆپای گەرمیشی نەبوو، کە تۆ لەم حاڵەتەدا بەم ئاوە ساردە خۆت بشۆیت، توشی نەخۆشی دەبیت، بەڕاستی لەوانەیە لێت پیس بکات و لانی کەم هەڵامەتێکی درێژ خایەن بگریت هیچ پێویست نیە، تەیموم بکە هەتا بە ئیسراحەت توشی ئاوی گەرم دەبیت.

لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ (عەمری کوڕی عاص) لەگەڵ سریەیەکدا بوو، دەفەرمووێت: ئەو ئیمامیان بوو، پێشەوایان بوو، ڕەئیسی ئەمیری سریەکەبوو.. بەیانی هەستا وەڵا ڕێك پێش نوێژی بۆ کردن و بەڵام صەحابەیەك سەیری کرد تەیمم دەکات، دەستی بە دەم و چاویدا دەهێنێت و، وەڵا نوێژەکەشی بۆ کردن.. لێیان پرسی: ئەوە بۆ واتکرد؟

وتی: وەڵا کاکە من لەشم گران بوو.. باشە وتیان بۆ خۆت نەشۆرد بەو ئاوە ساردە؟
وتی: خۆم بشۆم وەڵا ڕەق دەبووم، ئەی چۆن ئیمامەتیت بۆ ئەو هەموو خەڵکە کرد!

وتی: کاکە من ئیمامەتی خۆم کردووە، بابە با ئەم شەرعە بەرینەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، دەفەرمووێت: چونەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم کارەشت کرد ئەی خودا لە قورئاندا نافەرمووێت: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ النساء﴾ بە دەستی خۆتان خۆتان مەکوژن خودا لەوە گەورەترە، خودا بەڕەحمە، بەبەزەییە، میهرەبانە، وەڵاهی من خۆم نەکوشت بەو ئاوە ساردە و پشتیوانم بە ڕەحمەتی خودا بوو، ئەو تەیەممەم کرد.. دەفەرمووێت: (فَضحِك رسول الله ﷺ ولَم يَقُل شيئًا) پێغەمبەر ﷺ تەواو پێکەنی و هیچی نەگوت.. یەعنی: قسەکەی بە جێیە.. دەفەرمووێت بە جێیە بۆیە لەسەر ئەم حەدیسە عولەمایان زۆر جوانیان فەرمووە.. لە مەزهەبی شافیعیدا دەفەرمووێت:

پێویستە دوایی نوێژەکانت بگێڕیتەوە.. بەڵام عولەمایانی حەدیس زۆر جوانیان پێکاوە دەفەرموون: پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو کە تۆ دوایی نوێژەکەت بەتەیموم کرد بیگێڕەوە.. ڕەحمەتی خودا لە پێشەوا (شافیعی) بێت، ئیحتیماله ئەو حەدیسەی وەکو پێویست پێ نەگەیبێت.. بەڕێزان: نوێژەکە قەزای ناوێت، ئەگەر پێویستی بکردایە پێغەمبەر ﷺ بەم صەحابەی دەگوت نوێژەکەت بکەوە، نەیفەرموو بیکەوە، زەردەخەنەی بۆ کرد و پێکەنی و ئیقراری لەسەر ئەوە کرد کە کارەکەی زۆر بەجێ بووە! چاکت کردووە، کە خۆت نەکوشتووە..

## حاڵەتی سێیەم: لەکاتی ترسدا

کانی و ئاو هەیە بەڵام ترست هەیە، ترست هەیە، ئەگەر بڕۆیت هەتا دەچیتە سەر ئەو کانیە جەردەیەك ڕووتت دەکاتەوە، یان لە حاڵەتی شەڕدا لەوانەیە پارچە تۆپێکت بەر بکەوێت، لەوانەیە دوژمن بت بینێت و فیشەکت پێوە بنێت، ناتوانی بگەیتە ئاوەکە، یان ترسی ئەوەت هەیە لەوانەیە ئەو کانی و ئاوەو بێشەڵانێکە بەرازی تێدا بێت، ورچی

تێدا بێت، پڵنگ و شێری تێدا بێـت، پەلامارت بدات.. لەوانەیە پڕ بێت لە مار، مارێك پێوەت بدات..

لەترسی ئەوە خۆت مەخەرە هیلاکەوە، بڵێی بە خودا خۆم بەناو ئەو ئاوەدا دەکەم، نا.. گیانی خۆت مەخەرە مەترسیەوە، ماڵی خۆت مەخەرە مەترسیەوە، تەیومەکە بکە، هەتا دونیا ڕووناك دەبێتەوەو لەمەترسیەکە ڕزگارت دەبێت.. یان: ئاوت پێیە، لە شوێنێکدایت ئەگەر بۆ خۆت ئاوەکە بۆ دەست نوێژ بەکاربهێنیت، یان بۆ خۆشۆردنی واجب، سەیردەکەیت دوایی لە تینواندا دەخنکێیت، نا.. نەفسی خۆت لە پێش دەست نوێژەکەوەیە، بە تەیموم دەست نوێژەکە بگرە، ئاوەکە بخۆرەوە.. هەتا دەڵێت: ئەگەر ئاوەکە لە خۆت زیاد بوو.. بەڵام گوێ درێژێکت پێبوو، سەگێکت پێبوو، پشیلەیەکت پێبوو، مریشکێکت پێبوو، مەڕێکت لابوو، ئەو پێویستی بەو ئاوە بوو.. ئەو لە تینواندا دەخنکا، نەفسی ئەو پشیلە، ئەو بزنە، ئەو مەڕە، ئەو سەگە، لەپێشترە ! !

دەبێت ئاوەکە لە دەست نوێژەکەدا بەکار نەیەنیت و بەدەمی ئەویدا بکەیت! ! تەیومەکە بکە، (سبحان الله) لەشەرعدا دەڵێت: ئەگەر لەو لاوە کابرایەك سەگێکی پێبوو، (سبحان الله) سەگێکی پێبوو وتی تو ئەو خودایە ئەو سەگە زۆری تینوە، بەشی خۆم ئاوم پێیە، بەس سەگەکەم لە تینواندا دەخنکێت، تۆش ئاوی زیادت پێبوو لە خۆت زیاد بێت، دەبێت سەگەکەی ئەو پیاوەی پێ تێر ئاو بکەیت..

نابێت دەست نوێژ بگریت، دەبێت تەیموم بکەیت، خودا ئاسان کاری بۆ کردوویت، نەفسی ئەو سەگە ڕزگار بکە لە تینویەتی. (سبحان الله) ئەم دینە چ بەرەکەتێکی پێوەیە..

بەم بەسەرهاتەی خاتوو (عائیشە) کە لە شەوەوە، لە ئێوارەوە ئیمامی (ئەبوبەکر) و ئەو هەموو صەحابە خەفەتیان پێخوارد، بەڵام پێغەمبەری ﷺ ڕەحمەت بە جوانی لە سەر ڕانی خاتوو (عائیشە) خەوت، نەیکرد بە هەرا.. خودای گەورە ئەم دەرگای

تەیەممەی لەم ئومەتی ئیسلامە کردەوە، لە خودا بە زیاد بێت، ئەم بابەتە پێویستە، لەم دینە تێبگەین هەندێك بابەتی ئاسان کاری زۆرجوان هەیە، (إنشاء الله) لە شەوی داهاتودا پشتیوان بە خودای گەورە هەندێکی تر باس دەکەین، تا شەوێکی تر و بەرنامەیەکی تر بە خوداتان دەسپێرم..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وبَرَكاتُهُ) .



# وانەی چواردەیەم



## بابەت

## کۆکردنەوە و کورت کردنەوەی نوێژ



# وانەی چواردەیەم

## کۆکردنەوە و کورت کردنەوەی نوێژ

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾ البَقَرة : ١٨٥ .

* وَقالَ سُبْحانَهُ : ﴿ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ﴾ البَقَرة : ١٧٨ .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (يَسِّرُوا وَلا تُعَسِّرُوا ، وَ بَشِّرُوا وَلا تُنَفِّرُوا) - رَواهُ البُخاري وَ مُسلِم .

* وَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بُعِثْتُ بالحنيفِيَّةِ السَّمْحَةِ) - رَواهُ أحمد : (٢١٠٧) وَصَحَّحَهُ أحمدشاكر ( ٢ / ٥٢٢) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إنَّ اللهَ يُحِبُّ أنْ تؤتى رُخَصَهُ ، كَما يكره أنْ تؤتى مَعْصِيَتَهُ) - رَواهُ أحمد في مُسْنَدِهِ بِإسْنادٍ صَحيحٍ .

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ النِّساء : ١٠١ .

* عَنْ يَعْلي بنِ أُمَيَّةَ قالَ : قُلْتُ لِعُمَرِ بنِ الخَطّابِ (فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ ....) النِّساء : ١٠١ ، فَقَدْ أَمِنَ النّاسُ !! ، فَقالَ عَجِبْتُ مِمّا عجِبْتَ مِنْهُ ،

فسألتُ رسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذلِكَ فقالَ : (صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللهُ بِها عَلَيْكُمْ ، فَاَقْبِلوا صَدَقَتَهُ) ـ رَواهُ مُسْلِم : (٦٨٦) . وَ أَبُو داود : (١١٩٩) والترمذي : (٣٠٣٧) .

* عَنْ إبْنِ عَبّاس : (اَقامَ النَبِيُّ ﷺ تِسْعَةَ عَشَرَ يقصر ، فَنَحْنُ إذا سافَرْنا تِسْعَةَ عَشر قصرنا وَ إنْ زِدْنا أتْمَمْنا) ـ رَواهُ البُخاريُّ : (١٠٨٠) .

* عَنْ إبْنِ عُمَر أنَّهُ : (اَقامَ بِأذربايجان سِتَّة أشْهُرٍ ارتَبجَّ عَلَيْهِمُ الثَّلْجُ فكانَ يُصَلِّي رَكعَتَيْنِ) ـ إسْنادُهُ صَحيحٌ . أخرجه البَيْهَقي (٣ / ١٥٢) وَ أحمد : (٢ / ٨٣ ، ١٥٤) .بِسَنَدٍ حَسَن .

* عَنْ إبْنِ عَبّاسٍ ، قالَ : (أنَّ النَبِيَّ ﷺ جمع بالْمَدينَةِ مِنْ غَيْرِ خَوْفٍ وَلا مَطَرٍ) .
ـ رَواهُ مُسْلِم (٧٠٥) وَ أَبُو داود : (١٢١٢) .

* قالَ في كفايَة الأخيار : (ذَهَبَ جَماعَةٌ مِنَ العُلَماءِ إلى جَوازِ الجَمْعِ في الحَضَرِ لِلْحاجَةِ ، لِمَنْ لا يتخذه عادَةً) . وَالحاجَةُ لَها اعتبار شَرْعاً لِنَحْوِ : طَبيبٍ يَعْمَلُ عَمَلاً جَرّاحِيَّاً يَسْتَغْرِقُ زَمَناً طَويلاً ، وكَذا نَحْوَ جُنْدِي الحَراسَةِ ، وَالطالِبِ خِلالَ الإمْتِحان) ...

* قالَ شَيْخُ الإسلام إبْنُ تيمِيَّةَ في : (مَجْمُوع الفتاوى : ج ٢١ ، ص ٤٥٨) : (وَالصُّناعُ والفَلاّحُونَ ، إذا كانَ في الوَقْتِ الخاصِ مشقة عَلَيْهِمْ : مِثْل أنْ يكونَ الماء بَعيداً في فِعْلِ الصَّلاةِ ، وَ إذا ذَهَبُوا إلَيْهِ وَ تطهَرُوا تعطَّلَ العَمَل الَّذي يَحْتاجُونَ إلَيْهِ ، فَلَهُمْ أنْ يُصَلُّوا في الوَقْتِ المُشْتَرَك ، فَيَجْمَعُوا بَيْنَ الصَّلاتَيْنِ) .

## سەرچاوەکان :

١) نِداءات الرَّسُول لأصْحابِهِ ، محمد عبدالعاطي بحيري ، ج٢ ، ص١١٥ ، المكتبَة التوفيقيَّة .

٢) صَحيح فِقْهُ السُّنَة ، أبي مالِك كمال بن السَّيْد سالم ، ج١ ، ص ٤٧٤ ، ص٤٩٤ . ط : ١٢ ، المكتبَة التوفيقِيَّة .

٣) كِفايَة الأخيار في حَلِّ غايَة الأخْتِصار ، تقي الدِّينِ أبي بكر بن محمد الحصيني ، ص ٢١١ . ط : ١ ، ٢٠١٣ ، دارُ الفيحاء ، دمشق .

٤) وەلاّمەكانى تۆ ، م . أحمد شافعي ، ل ١٢٨ ـ ل ١٣٦ .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز: ئەمشەویش وەکو شەوانی تر دەچینە خزمەت ئەو خۆشەویستە بەوە دەست پێدەکەین کە هەموو شەوێك دەچینە خزمەتی هەندێك دڵی خۆمان ئاو دەدەین و چاوی خۆمان ڕۆشن دەکەینەوە:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسلَّم)
(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسلَّم)
(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسلَّم)

خۆشەویستان: ئێمە دوێنێ شەو لە خزمەت ئەو ڕووداوەدا بووین کاتێك کە خاتوو (عائیشە)ی دایکمان (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لەسەر بێت)، ملوانکەکەی لێ بزر بوو، دواتر بوو بەمایەی خێر و ئایەتی تەیموم هاتە خوارەوە..بۆیە بووبە ڕوخسەتێك بۆ مسوڵمانان لەکاتی نەبونی ئاودا ..

## ڕوخسەتەکانی ئیسلام:

### یەکەم ڕوخسەت: تەیەموم کردن

(عەماری کوڕی یاسر) دەفەرمووێت: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووم ئەو کاتەی کە ئایەتەکە هاتە خوارەوە، وا لە تەیموم حاڵی بووم کە ئەوەیە: کە دەبێت هەموو لەشی خۆت خۆڵاوی بکەیت، دەڵێت: من لەشم گران بووبوو، پێویستم بە خۆشتن هەبوو، لە خەونمدا ئیحتیلام بووم، کاتێك کە لە خەو هەستام جلەکانم داکەند و دوورکەوتمەوە لە خەڵك و هەموو لەشم لەو خۆڵە وەردا..

وتیان: کابرایەك ئاو نەبوو، کەسەیری کرد بەهار بوو، گیا تا ئەژنۆ هاتبوو، دەستی لە گیایەکەدا، وتی تەڕە، دوو سێ جار خۆی تێدا بادا، وتی: تەواو لەشم تەڕبوو خۆشتن هەر خۆشتنە!!

دەڵێت: منیش تەواوی لەشم بوو بە تەپ و تۆز، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ وات لێهاتووە.. وتم: وەڵا بە حیساب تەیمومم کردووە..

فەرمووی: دەی ئەوەی نەدەویست برا، تەیموم وانابێت، تەیموم هەردوو دەستت هەڵدەکەیت هەتا ئانیشکت، ئەگەر برینێك بە شوێنێکتەوە هەبێت پێچراوە، ئەوەی ساغە بیشۆ، ئەوەی کە نەشۆردراوە جا لە جیاتی خۆشتن بێت، یان دەست نوێژ بێت، دەست بە خۆڵەکەدا بدە و بڵێ: نیەتمە بێ دەست نوێژی لەسەر خۆم لادەبەم، نیتمە بێ دەست نوێژی لەسەر خۆم لا دەبەم، یان نیەتمە نوێژ لە خۆم حەلاڵ دەکەم.. لەبەر ئەوەی نوێژ هێشتا لە تۆ حەرامە، هەرچەندە دەست نوێژت گرتووە، بەلأم ئەندامێکی لاشەت نەشۆردراوە، یان خۆت نەشتووە، نیتمە نوێژ لە خۆم حەلاڵ دەکەم، جارێك یان دوو جار یان سێ جار، بۆ دەم و چاوت، دوایی بەو دەستانەت نیتمە نوێژ لە خۆم حەلاڵ دەکەم.

تەنانەت لە حەدیسی (بوخاری) و (موسلیم)دا دەفەرمووێت: کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی بە خۆڵەکەدا دا، فوشی لە دەستی کرد، بۆ ئەوی دوای خەڵك نەتبینن بڵێن ئەو خۆڵە بۆ بە دەم و چاوتەوەیە؟!

هەتا دەفەرمووێت: کە دەستی بە خوڵەکەدا دا فوشی لە دەستی کرد فوی لێکرد، ئەمجا هێنای بە دەم و چاویدا، ئەمەش حیکمەتی لە ڕووی زانستیەوە، کەسێك لەوانەیە بڵێت: باشە ئەم خۆڵە، ئەمە چ دەستورێکە؟!

دکتۆر (زەغلول نەجار) هەیە، پیاوێکی زۆر عالمە دەڵێت: لە ئەڵمانیا لە دکتۆرێکی گەورەم پرسی وتم باشە پرسیارێکت لێ بکەم، کاتێك کە ئینسان ئاوی دەست نەکەوت لە شوێنێك، واجبە بەردەوام دەستی بشوات پێش نان خواردن، باشە ئەگەر ئاوی دەست نەکەوت ئێوە وەکو زانایانی بواری پزیشکی رەئیتان چیە ئەم ئینسانە وا لەشوێنێکدا

بوو، ئاو نەبوو؟! وتی زۆر ئاسانە، بابێت خۆڵێکی پاك بدۆزێتەوە، دەستی لە خۆڵەکەدا بجوڵێنێت، بچێت نان بخوات، هیچ میکرۆبی پێوە نامێنێت!! وتم: (سبحان الله) چی؟! تۆزێکی پاك؟ وتم: دەی ئەوە باسی قورئانەکەی ئێمەیە:

﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا ﴿٦﴾﴾النساء:٤٣، ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت بە خۆڵێکی پاك تەیەموم بکەن..

وتی: وەڵا من ئەوە نازانم، ئەوە ڕەئی زانستی پزیشکیە، وتم: وەڵاهی ئەوە لە قورئانی ئێمەدا هەیە، ئەو نەصە عیلمیە ڕێك قورئانەکەی ئێمەیە.. دەڵێت: ئەو پیاوە کاریگەری قسەکەی منی لەسەر دروست بوو، دواتر دیراسەیەکی قوڵی ئیسلامی کرد، بە فەزڵی خودا مسوڵمان بوو.. یەعنی ئەو زانایە ئاگای لە دین نەبوو، بەڵام وتی قەیچێکە ئاوت دەست نەکەوت بە خۆڵ دەستەکانت بشۆ، میکرۆب دەکوژێت!! جا دوای بچیت نان بخۆیت..

ئەو دینەی ئێمە هەمووی پێش کەوتنە، هەمووی بواری زانستیە، جا ڕەحمەتی ئەم دینەی ئێمە لەوەدا دەردەکەوێت بەڕاستی کە ئینسان لێی حاڵی بێت، ئەم دینە ئاسان کارییە.. پێغەمبەر ﷺ بەردەوام ئامۆژگاری صەحابەکانی دەکرد و دەیفەرموو:

(یسروا ولا تعسروا) (وبشروا ولا تنفروا) واتە: ئاسان کاربن، دین گران مەکەن، موژدەدەربن.. خەڵکی مەتەکێننەوە لە دین، بە قورسی، چونکە ئەم دینە هی هەموو زەمانێکە، بۆ هەموو خەڵکیە، ئێستا خەڵکی واهەیە زۆر ئازایە دەتوانێت سەهۆڵ بشکێنێت و خۆی بشوات.. خەڵکێکیش هەیە بە ئاوی گەرم خۆی بشوات نەخۆش دەکەوێت.. ئەم دینە بۆ هەردووکیانە، بەڕێزان خەڵکێك زۆر توند و تۆڵە بۆ نوێژی درێژ، خەڵکێکیش هەیە یەك تۆز نوێژەکە درێژ بێت بە ئەژنۆیەوە دیارە..

ئەم دینە بۆ هەردووکیان هاتووە دەبێت دین موراعاتی حاڵی هەردوکیان بکات، بەڵکو زەعیفەکەیان تەماشا بکات، تەماشا ناکات کامە بە قوەتە دین بۆ ئەوەیە، کامەی زەعیفە

دین بە پێی ئەوە موراعاتی کردووە.. یەکێك لەو ڕەحمەتانە: خودای گەورە پێی خۆشە ڕوخسەتەکانی قبوڵ بکەیت، هی واهەیە وادەزانێت کام دینداریە قورسە ئەوە باشە، بەڵام بە پێچەوانەوە..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموویێت: (إنَّ اللهَ يحِب أن تَأتيَ رُخصة كَما يُكرَه أن تَأتِيه مَعصِية) خودا زۆری پێ خۆشە ڕوخسەتێکی ئاسان کاری لەم دینەدا دراوە، وەری بگریت، هەر وەکو پێی ناخۆشە گوناح و سەرپێچی خودا بکەیت، یەعنی خودا زۆری پێخۆشە کە ڕوخسەتێك دەدرێت لەم دینەدا تۆ بەقسەی بکەیت یەکێك لەو ڕوخسەتانە ئەم تەیمومەیە کە دوێنێ شەو باسمان کرد..

## دووەم ڕوخسەت: نوێژ بە دانیشتنەوە

لەو ڕوخسەتانە کەشەریعەتی خودای گەورە بۆ ئێمەی داناوە: دانیشتنە بۆ کەسێك کە توانای بە پێوە وەستانی نەمابێت، وەستان بە پێوە واجبە، کەسێك نەیتوانی دەتوانێت بە دانیشتنەوە، بەڵام کەی بە دانیشتنەوە؟ کە بەڕاستی نەتوانیت، ئەگەر تۆ لەماڵی خۆتدا حیساب بکە میوانت هاتووە، هەر پێنج دەقیقەیەك میوانێك هات، تۆ ڕێك هەستایتە سەر پێ لەبەردەمی، ئەوە واجبە بە پێوە لە نوێژدا بوەستیت.. تۆ بۆ عەبدێك پەنجا جار هەستیەوە، ئەی بۆ بۆ نوێژەکە ناتوانیت؟!

واجبە ئەگەر بۆ میوانەکەت توانیت ئەمجا لە نوێژیشدا عوزرە بە ڕاستی کە نەتوانی هەستیتەوە یان ببیت بە ئازار بۆ کەسێکی تر، لە نوێژدا لە مزگەوتدا خۆت بخەیت بەسەر ئەم خەڵکەدا، نەخێر کە لە رکاتی دووەم دانیشتیتەوە هەڵمەسەوە،بۆ تۆ عوزرە (انشاء الله)، ئەگەر نەتتوانی، بە ڕاکشانەوە، ئەگەر هەر نەتتوانی لەسەر تەنیشت، ئەگەر هەر نەتوانی لەسەر پشت، نوێژەکەت هەرچۆنێك بۆ دەکرێت بیکە..

هەتا ئەو تەیمومەی بەڕێزان بۆ ئەو کەسانەی کە نەخۆشن زۆر ئاسانە، زۆر کەس هەیە دەڵێت وەڵاهی بە داخەوە خەمی نوێژەکانمە، مامۆستا قەت نوێژم نەفەوتاوە،

حەیفە لەم نەخۆشیەدا فەوتا، ئەی برا بۆ نوێژت بۆ ناکرێت؟ دەم و چاوت نەشتووە؟!
بەرەوەلاّ، ئاویان بۆ دەهێنام دەم و چام دەشت، بەلاّم وەلاّهی تاراتم وەکو پێویست بۆ نەدەگیرا، میز و پیسای دور لەڕووتان لەبەر بڕوات تۆ بەقەدەر پێویستی خۆت لەبەر ئەوی لەشت پاك بێت..

دایمە ئینسان هەر لەبەر پاك و خاوێنی خۆی ئەگەر دینداریش نەبێت خۆی هەر پاك دەکاتەوە، یان کەس و کار پاکی دەکاتەوە، ئەوەندەی کە بۆ پاك و خاوێنی خۆت بۆت دەکرێت ئەی نەخۆش خۆت پاك بکەرەوە.. ئیتر مەبە بە زەحمەت بەسەر خەڵکی ترەوە..

دەڵێت وەلاّ دەبێت پێنج فەرزە تاراتم هەبێت، بە قەدەر توانای خۆت بۆ تەندروستی خۆت خۆت پاك بکەوە، دواتر میزت پێوەیە، پیسایت پێوەیە، گوێی مەدەیە، وەختی نوێژەکە توانیت دەست نوێژت پێ هەڵبگرن، بۆ پاك و خاوێنی خۆت خۆشە، نەبوو بەرماڵێکت بۆ بهێنن بەرماڵەکە تۆزی پێوە بێت، و دەستی پێدا دەدەیت بە هێواشی بۆ دەم و چاوت، دواتر بۆ دەستەکانت، ئەمەشت پێنەکرا، ئەمەش نەدەگونجا، وەختی نوێژەکە بڵێ: ڕووم بکەنە قیبلە، نەدەگونجا جێگەکەت بۆ بسوڕێنن، نەیان توانی بت جوڵێنن، هەر ئاوا ڕووبکەرە ئاسمان، نەدەتتوانی لەسەر دەم، ئەگەر هەر نەتوانی لەسەر تەنیشت بڵێ:

خودایە وامن ڕووم کردە تۆ ﴿ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ﴾ (١١٥) البقرة ) ڕووبکەیتە هەر شوێنێك خودای گەورە دەتبینێت، ڕووی خودا هەر قیبلەی خودایە، بڵێ خودایە ئەوا من ڕووم کردە تۆ، ئەوەندەم دەسەلاّت هەیە نیەتمە چوار ركات نوێژی عیشا دەکەم (الله أکبر)، خودا ئەو نوێژەت لێ قبولْ دەکات (انشاء الله)، کە مردیت یەك نوێژ قەرزداری خودای پەروەردگار نیت.. دین ئاسان کاریە بەڕێزان، هیچ گرانیەکی تێدانیە، هیچ گرانیەکی تێدانیە، نە بۆ خۆت، نەبۆ کەس و کارت، لەبەر ئەوە یەك نوێژ مەفەوتێنە..

## سێیەم ڕوخسەت: کۆکرنەوەو کورتکردنەوەی نوێژ

ڕوخسەتێکی تر کە خودای گەورە بە ئێمەی بە خشیوە (کورت کردنەوەی نوێژەکانمانە) کورت کردنەوەی نوێژ، ئەمە خاڵێکە حەز دەکەم جەنابتان زۆر تەئکیدی لەسەر بکەنەوە، خودا بە نەصی ئایەت دەفەرمووێت: (فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَقۡصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنۡ خِفۡتُمۡ أَن يَفۡتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْۚ ﴿١٠١﴾ النساء) ئەگەر هاتوو لەسەفەردا بوون، تاوانی نیە، هیچ خراپەی تێدانیە، نوێژەکانتان کورت بکەنەوە، ئەگەر ترسان دوژمن زەفەرتان پێ بەرێت، لە کەمینی دوژمن دەترسان لە عەسردا، نوێژی نیوەڕۆ و عەسر بە کورت کراوەی بکەن.. دوو رکاتی نیوەڕۆ و دوورکاتی عەسر بکەن.. سێی مەغریب بکە و دووانی عیشا لە پاڵیدا..

صەحابەیەکی بەڕێز کە (ئەنەس)ی ناوە، دەفەرمووێت: بە (عومەری کوڕی خەتاب)م گوت: قوربان باشە ئێمە ئەوە خودا دەفەرمووێت لە دوژمن ترسان، بەلاَم دەچین بۆ سەفەرێك نە ترسی دوژمنمان هەیە، نە ئازار و ناڕەحەتیمان هەیە، نە هیچ خەمێکمان هەیە، نە بێ ئاویە، هەر نوێژ کورت بکەینەوە؟

فەرمووی: منیش ئەو پرسیارەم لە پێغەمبەری خودا ﷺ کرد. وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئاخر من بە سەیارە دەڕۆم، نە ماندوو دەبم، دەچمە ئەو شوێنە ئاوی پاك و خاوێن، حەمام، تەوالێت، هەموو شتێك ڕێك و پێکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

برام (صدقة تصدق الله بها عليكم فأقبلوا صدقه) ئەم قەسر و جەمعە خودای گەورە پێشکەشی ئەم ئومەتەی کردووە، لێی وەربگرن، لە خودا.

عولەمایان دەفەرموون: مەزهەبی ئیمامی شافیعی "(سبحان الله) ئەوانە هەموویان کەراماتیان هەبووە" ئیمامی شافیعی ئەو زەمەنە فەرموویەتی: ڕۆژێك دادێت خەڵك سواری شتێك دەبێت، چاو لەسەر یەك دادەنێت کە چاوی کردەوە هەشتا کیلۆ مەتری بڕیووە، هەر وەك تەیارەی ئەمڕۆ، ڕۆژێك دادێت لە تەیارە خێراتر دادێت، عولەمایانی

شەرع باسی ئەوەیان کردووە ئەچیتە ناویەوە دادەنیشیت، لەسەر کورسیەکە چاو دادەخەیت، کە کردتەوە سەیر دەکەیت دوو دەقیقەی پێ نەچووە، یەکسەر دەقیقەیەکی پێ نەچووە، هەشتا کیلۆمەترت بڕیووە..

فەرمووی: لەو زەمەنەدا تۆ هەرچی ناڕەحەتی بێت نەتچەشتووە، هەر بۆت هەیە قەسر و جەمع بکەیت، هەر بۆت هەیە با بە تەیارەش گەشتت کردبێت، کە هیچ (موشەقەتی)ناڕەحەتی تێدا نیە، ئەمە هەدیەی خودایە، هەدیەی خودا قبوڵ بکەن و ڕەتی مەکەنەوە..

(إبن عمر) دەفەرمووێت: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووم، لە خزمەت (ئەبوبەکر) بووم، لە خزمەت (عومەر و عوسمان) بووم، قەت لە سەفەردا نوێژیان بە تەواوەتی نەدەکرد، ئیلا قەسر و جەمعیان دەکرد،

ئیمامی ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەفەرمووێت: هەر کەسێك لە سەفەردا نوێژ بە تەواوەتی بکات خودا لێی قبوڵ ناکات! ! چونکە هەدیەی خودای ڕەت کردۆتەوە.. واجبە بە قەسر و جەمع بیکەیت..

لای مالیکیەکان دەفەرموون: سونەتێکی گەورەیە، هەرە خێرێکی گەورەیە، ئەگەرنوێژەکەت بەتەواوەتی بکەیت نیوەڕۆ لە شوێنی خۆیدا و عەسر لە شوێنی خۆیدا، خودای گەورە ئەگەر هەشتا چاکەت بۆ بنوسێت، ئەگەر بە قەسر و جەمع بیکەیت سەد چاکەت بۆ دەنوسێت. !

لای شافیعی دەفەرموون: ڕوخسەتە، هی واهەیە ئەوەندە موەسویسە، ئەگەر لەوەختی خۆشیدا کردی خودا بە ڕەحمی خۆی لێی قبوڵ دەکات.. بەڵام خێرە گەورەکەی لە کیس دەچێت.. کەواتە دایمە لە سەفەردا نوێژەکان بە قەسر و جەمع بکە.

ماوەی ڕێگا لای ئەبو حەنیفە (٩٦) کیلۆمەتر دەبێت، لە بەینی ئێرە و ئەو سەفەرەی بۆی دەچیت، ئینجا (قەسر)کورتکردنەوە، واتە نیوەڕۆ دەکەیت بە دوو، عەسر دەکەیت بە دووان، عیشا دووان دەکەیت، چوار ڕکاتەکان دەکەیت بە دوو، ئەوە کورت کردنەوەیە

دواتر کۆیان دەکەیتەوە بە یەکەوە.. نیوەڕۆ لەگەڵ عەسر، مەغریب لەگەڵ عیشا بەیەکەوە.. بەیانیش هەر لەشوێنی خۆیەتی..

لای شافیعیەکان دەبێت (٨١) کیلۆ مەتر بێت، بەڵام ئەو مەسەلەی زۆر لەگەڵ حەدیس و نەصی قورئاندا گونجاوە، مەزهەبی داودی زاهیری و (ابن الحزم) لە موحەللادا کە دەفەرمووێت: هەر وەختێك چوویت بۆ شوێنێك، خۆت بە سەفەری زانی، قەسر و جەمع بکە، خۆت بەسەفەری زانی، ئێستا من هاتووم بۆ ئێرە، جامانەم لەسەر نەکردووە کڵاوێکم لەسەردایە، لەوانەیە هەر پێنج سەد دیناری تەبع لە گیرفانیدا بێت، ئەها بۆ؟ خۆم بەسەفەری نەزانیوە، گۆرەویم لە پێ نەکردووە، پێڵاوێکم بەسەر پێمەوە لەپێ کردووە.. بەڵام ئەگەر بمەوێت بچم بۆ هەولێر، بچم بۆ کۆیە، بۆ ڕانیە، بۆ سلێمانی، دەچم جوتێك پێڵاو لەپێ دەکەم، سەیری گیرفانم دەکەم، ئاخۆ بزانم هەویەم پێیە، پارەم پێیە، ئەی وانیە؟ جامانە لەسەر دەکەم، خۆم دەگۆڕم.. لە هەر شوێنێك خۆت بە سەفەری زانی، لە ماڵ بە نیەتی سەفەر چوویتە دەرەوە، بۆت هەیە قەسر و جەمع بکەیت..

(ئەنەس) دەفەرمووێت: لە صەحیحی موسلیمدا حەدیسەکە هاتووە (کان رَسُول ﷺ إذا خَرَجَ مَسيرة أميال أو ثَلاثة فَراسِخَ صَلى رَكعَتَين) پێغەمبەری خودا ﷺ هەر وەختێك چەند میلێك یان چەند فەرسەخێکی بڕی بێت ئیلا قەسری کردووە نوێژی کورت کردۆتەوە وە بە اعتیباری ئەمڕۆ لە کیلۆ مەتردا، بیست کیلۆمەترە، سەفەرەکەت بیست کیلۆ مەتر بێت بۆت هەیە قەسر و جەمع بکەیت.

(سبحان الله) دین چەند ئاسان کاریە، لە کوێدا قەسر و جەمع دەکەیت؟! لە سنوری شارەوانیەکەی خۆت بچیتە دەرەوە، لە کوێ نوسراوە شارەوانی پیرەمەگرون خودا حافیزیتان لێدەکات، کە چویتە دەرەوە مەسافەی قەسر و جەمعی تۆ دەست پێدەکات، نیوەڕۆیە بانگی داوە ڕەفیقەکانت ڕاوەستاون سەیارە ئامادەیە، دەتوانیت نوێژی نیوەڕۆکەت نەکەیت، لە ڕێگا قەسر و جەمع لەگەڵ عەسردا بیکە.. گەشتە کارێزی سەعید

بۆت هەیە قەسر و جەمعی تۆ دەست پێدەکات، بۆت هەیە دابەزیت نوێژی نیوەڕۆ بکەیت بە دوو ركات، نوێژی عەسریش بکەیت بە دوو ركات، ئەوە دین ئەوندە ئاسانە..

لای ئیمامی (شافیعی) دەفەرمووێت: ئەگەر چوویت بۆ شوێنێك نیەتت نەبێت دوو ڕۆژ بمێنیتەوە.. لای (ئەبو حەنیفە) دەفەرمووێت: پانزە ڕۆژ، بەلاّم ئەصلّ ئەوەیە دەچیت بۆ سەفەر بۆ نمونە دەچیت بۆ هەولێر ئیشێکت هەیە، یان سەردان دەکەیت، وەلاّ بەیانی دەگەڕێیەوە، دوو بەیانی دەگەڕێیەوە، ئیشەکە ناکرێت..

ئیمامی (عمر) ئەمری کردبوو سوپای ئیسلام لە ئازربایجان بوون، لە سنوری ئێران، فەرمووی هەر وەختێك ئەمرم پێکردن بگەڕێنەوە بەرەو جەبهەی عێراق، شەش دانە مانگ ئەو سوپایە چاوەڕی بوون، ئەمری حەزرەتی (عومەر) بێت و بگەڕێنەوە.. هەر شەش مانگەکە صەحابەکان دەفەرموون: نوێژمان بە قسر و جەمع کرد. شەش دانە مانگ نوێژمان بە قەسر و جەمع دەکرد.. یەعنی شەش مانگ تۆ لەسەفەر مایتەوە بۆت هەیە قەسر و جەمع بکەیت، کەسێك دەچێت بۆ ولاّتی خاریجی، بە تەمایە مانگێکی پێ بچێت، دوو مانگی پێبچێت هەتا دێیتەوە نوێژەکانت بە قەسر و جەمع بکە.. دەچیت بۆ تاران بۆ هەر شوێنێك..

ئەمجا بەڕێزان: (جەمعمان) هەیە، کۆکردنەوە، واتە لێرەوە دە کیلۆمەتر دەڕۆیت دەچیت بۆ سلێمانی، خێزانت لەگەڵە عەیادەت هەیە، نوێژی نیوەڕۆ لە سلێمانی لە مزگەوتی گەورە لات داوە، کە نوێژی نیوەڕۆت کرد، کە سەلامت دایەوە یەکسەر نوێژی عەسر بکە.. یەکسەر بڵێ نوێژی عەسرم هێنایە پاڵ نیوەڕۆ، چونکە تۆ لە عەسردا وا لە عەیادەیت، خێزانت لەگەڵە، منداڵت لەگەڵە، دەچیتە بازاڕ، هەتا ئاوا دەکەیت مەغریب دێت.. لەو بەینەدا نوێژی عەسرت دەفەوتێت..

کە نوێژی نیوەڕۆت کرد نوێژی عەسریشی لەگەڵدا بکە، ئیشی دائیرەت هەیە بە هەمان شێوە، یان ئیشی دائیرەت هەیە سەعات دوو نوێژی نیوەڕۆت خەریکە دەفەوتێت، سەعات دوو مزگەوتێك شوێنێك نزیك نیە، بڵێ: خودایە وا نوێژی نیوەڕۆکەم بردە لای

نوێژی عەسر، ئەگەر لەو مەسافەیەدا مردیت لای خودا قەرزدار نیت، چونکە نیەتت هەبووە بیکەی، هاتیەوە لەگەڵ نوێژی عەسر چوار رکات بکە، سەلامت دایەوە بڵێ نیەتمە چوار رکات نوێژی نیوەڕۆ دەکەم بە دواخستن، چونکە دوات خستووە بۆ عەسر، بە ئیسراحەتی خۆت نوێژەکەت بکە..

ئەو ژنانەی منداڵی شیرە خۆرەیان هەیە، ئەو کاتەی عولەمایان ئەمەیان فەرمووە، دایبی نەبووە، یان ئیستا کەسێك دەبینێت منداڵی بە باوەشەوەیە، میزی پێدا دەکات، ئەم ژنە هەموو فەرزێك ناتوانێت خۆی بشواتەوە، دەفەرمووێت کە نوێژی نیوەڕۆ خۆی خاوێن کردەوە، جلی پاکی لەبەر کرد.. چوار رکاتی نوێژی نیوەڕۆ خۆی خاوێن کردەوە جلی پاکی لەبەر کرد، چوار رکات نوێژی عەسر لەگەڵ نیوەڕۆ بکات، بۆ ئەوەی تا ئێوارە ژنەکە جلی خاوێن نەکاتەوە.. کە مەغریبی کرد عیشاشی لەگەڵدا بکات، بۆ ئەوەی تا بەیانی خۆی نەشوات، چونکە منداڵی شیرە خۆرەی هەیە.. چ کار ئاسانیەکە!

ئەو کەسەی میزە چرکەیەتی، هەموو دەمێك ئەم میزەی پێدا دێتە خوارەوە پەنا بە خودا، ئەوە ئەو کەسە دەتوانێت کە نیوەڕۆ خۆی پاك کردەوە، نوێژی کرد، کەسەلامی دایەوە یەکسەر نوێژی عەسر بکات، لەسەر بەرماڵەکە میز هات نوێژەکە مەبڕە، مەغریبت کرد نوێژی عیشاش، بکە ئەوانەی نەخۆشن دەست نوێژیان پێ هەڵدەگرن بە چاکی، بەڵام ناتوانن هەموو فەرزان، کە نیوەڕۆت کرد ئەی نەخۆش نوێژی عەسریش بە چوار رکاتەوە لە تەنیشتی بکە..

ئەی ئەو کەسەی کە پیربووە، مەیلەو پیر بووە خەڵەفاوە، کە مەغریب هات خەوی دێت خۆی ڕاناگرێت هەتا عیشاش لەبەر پیری کە مەغریبتان پێکرد با عیشاکەشی لە پاڵەوە بکات..بۆ ئەوەی ئەمجا بۆ خۆی بە ئیسراحەت لێی بخەوێت، دواتر ئازاری نەبێت..

ئەو کەسانەی چێشتلێنەرن، لە مەزهەبی ئیبنو تەیمەدا ڕەحمەتی خودای لێبێت ئەوانەی شاگردی (مطعم) چێشتخانەن، ئەها ئێستا چێشتخانە لە سلێمانی زۆرە، فەقیرە لەگەرمەی نوێژی نیوەڕۆدا، لە چێشتخانەکەی گەرمەی چێشت لێنانە، ئەی دەکرێت بڵێت: خەڵکینە نان مەخۆن هەتا ئێمە دەچین نوێژ دەکەین! ناکرێت، هەتا دەوری عەسر ئەم مەتعەمە هەر جمەی دێت، دەتوانن نوێژەکانیان دوابخەن، ئەو چێشتلێنەرانە ئەمجا بە ئیسراحەت لەگەڵ نوێژی عەسردا نوێژی نیوەڕۆش بکەن..

نانەواچیەکان، نانەوا بە هەمان شێوە کابرا سەیر دەکەیت لە گەرمەی مەغریبدا خەڵك سەرە دەگرن، دەتوانێت نوێژی مەغریبەکەی بباتە پاڵ نوێژی عیشاکەی، کەسی لێ نەما ئەمجا بە ئیسراحەتی خۆی نوێژ بکات.. ئەمە هەمووی کارئاسانی ئەم دینەیە بۆ ئەوەی کەس نەڵێت دین قورسە، یان بەهۆی نوێژەکەوە فلانەکەس پێی زانیم، بەهۆی فلانەکەسەوە من ئیشەکەم لێ قورس بوو..

لە سەفەربووی، تۆ سەیر دەکەیت لە ڕانیەیت، لەوێ لەگەڵ نیوەڕۆ لە ماڵێك بوویت نوێژی عەسریشت کردووە.. نان و چات خواردووە هاتوویتەوە، دەگەیەوە ماڵێ بە ئیسراحەت، ئەمجارەکانێ نوێژی عەسر بانگ دەدات، تازە مەڵێ وەڵامن لە ماڵی خۆم بووم بانگی عەسری دا، نوێژی عەسرت لەسەفەرەکەت کردووە تازە تەواو بووە.. نوێژی خۆت قبوڵ بوو، پێویست ناکات جارێکی دیکە بیکەیتەوە، یان ئەگەر حەزت لێی بوو بێیت بۆ مزگەوت بە جەماعەت بێت، ئەینا تازە مەگەر بڵێیت وەڵا زۆر کەس تازە گەشتمە ماڵەوە، مادام لەسەفەر نوێژەکەت کردووە بە قەسر و جەمع، کە گەشتیەوە ماڵێ ئەمجا نوێژەکەبوو نوێژەکە دووبارە مەکەوە، کۆتای هات، نوێژی تۆ لای خودا قبوڵ بوو.. بەجێ هات..

ئەمە کورتەیەك بوو ئەم شەو عەرزی جەنابتانم کرد، لەسەر ئەومەسەلانە کە خودای پەروەردگار کار ئاسانیەکی هەرە گەورەی بۆ ئەم دینە کردووە، یەکێك لەو کار ئاسانیانە

"کە جومعەش عەرزم کردن" ئەو ئافرەتانەی حامیلەن، ئەو ئافرەتانەی شیردەرن، ئێستا زانستی نوێ دەڵێت:

هەر ئافرەتێك شیر دەربێت، ڕۆژو لە کاتی گەرمادا مادەی شیرەکەی زۆر کەم دەکاتەوە، ئەم شیرە کاریگەری خۆی نامێنێت، لەبەر ئەوە ئەو خوشکانەی شیر دەدەن بەمنداڵەکانیان، مەمکە نادەن بە منداڵ، زۆر ئاسایە شیری خۆتان لە منداڵەکانتان مەبڕن، هیچ گوناحتان ناگات، ئەگەر دواتر بۆتان گیرایەوە قەزای بکەن، ئەگەر لەخۆت ڕانەبینی، قەزای بکەیتەوە ئێستا فیدیەی بدە، ئەگەر مێردەکەت پارەی بۆ نەدایت، یان نەبوو نەدار بوون، خزمەتی منداڵەکەت وەکو زیکری خودا وایە، بۆ خۆت گوێ لە قورئان بگرە و زیکری خودا بکە (إنشاء الله) هیچت لەسەر نیە، دین هەمووی ئاسان کارییە..

هەیە دەڵێت: وەلا دەبێت قەزای بکەیتەوە، لەبەر منداڵەکەش فیدیەی بدەی، ئەم ژنە داماوە پارەی لە کوێ بوو؟ تۆزێك لە مێردەکەی وەردەگرێت، مێرد سەیر دەکەیت کرێچیە، برا دین ئەمانەی تێدانیە.. دین هەمووی ئاسان کاریە، خۆ ئەگەر ئینسان لەبەر جیسمی خۆی توانی بە ڕۆژو بێت، چاکتر.. بەڵام ئافرەتی شیردەر کوا دەتوانێت؟!

یان حامیلە لە دوای حەملەکە دەڵێت قەزایان بکەوە، جا لەدوای حەملەکە منداڵی دەبێت، ئەمجا شیر دەدات هەتا ڕەمەزانی داهاتوو، ئەمە شیری داوە لە کوێ قەزای بکاتەوە؟ لەبەر ئەوە ئەگەر فیدیەکەی بدات دڵی منداڵی هەتیو خۆش بکات (إنشاء الله)خوای گەورە پاداشتی تەواوی ڕۆژوەکەی بۆ دەنوسێت، ئەمانە هەمووی کار ئاسانیە، و خودا زۆری پێخۆشە کە (إنشاء الله) کار ئاسانیەکانی قبوڵ بکەین..

هەتا شەوێکی تر و بەرنامەیەکی تر لەم زنجیرە باسەدا بە خوداتان دەسپێرم..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ) .

# وانەی پانزەیەم

## پلەبەندی لە گەیاندنی ئاین دا

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾ البَقَرة : ١٨٥.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (لاتَشددوا ، فيشدد الله عليكُمْ ، فَإِنَّ قَوْماً شددوا عَلى أَنْفُسِهِمْ فَشَدَّدَ اللهُ عَلَيْهِمْ) ـ رَواهُ أبو داود ، وَ حَسَّنَهُ الألْبانيُّ : (٤٩٠٤) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (إِنَّ هذا الدِّينَ مَتينٌ ، فَأوغِلْ فيهِ بِرِفْقٍ ، وَلا تَبْغَضُوا إِلى أَنْفُسِكُمْ عِبادَةَ اللهِ ، فَإِنَّ المنبتَ لا أَرضاً قطع ، وَلا ظهراً أَبْقى) ـ رَواهُ البَزار ، وَالحَديث حَسَنٌ بِشَواهِدِهِ .

* قالَتْ عائِشَة : (فَرَضَ اللهُ الصَّلاةَ حين فَرَضَها رَكعَتَيْنِ رَكعَتَيْنِ في الحَضَرِ وَ السَّفَرِ ، فَأُقِرَّتْ صَلاةُ السَّفَرِ ، وَزيدَ في صَلاةِ الحَضَرِ) ـ رَواهُ البُخاريُّ : (٣٥٠) .

* عَنْ عائِشَةَ ، قالَتْ : (لَوْ كانَ أَوَّلُ ما نَزَلَ مِنَ القُرآنِ ، لا تَشْرَبُوا الخَمْرَ ، لَقالُوا : لا نَدَعُ الخَمْرَ أَبَداً ، وَلَوْ نَزَلَ لا تَزْنُوا ، لَقالُوا : لانَدعُ الزِّنا) ـ فتح الباری .

* الإسْلام دينُ الواقِعِيَّةِ في أُمُورِهِ التَّشريعِيَّة ، وَ لِذالِكَ فَهِيَ تقوم عَلى مبادئ وَ قَواعِد مِنْها :

١) التَّيسير وَرَفع الحَرج .

٢) مُراعاة التدرج في الأحكام .

٣) النزول عَنِ المَثَلِ الأَعْلى إلى الواقِعِ الأَدْنَى لِلْضَرُورَة .

سەرچاوەکان :

ـ نِداءات الرَّسُول لِأَصْحابِهِ ، محمد عبدالعاطي بحيري .ج٢ ص ١١٩ .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز: میوانانی ماڵی خودای پەروەردگار، دانیشتنی ئەمشەویشمان لەدوای سوپاس و ستایش بۆ خودای تاك و تەنها، بە صەلاًوات دان لەسەر خۆشەویست و تاجی سەرمان (محمدی مصطفی) دەست پێدەکەین:

(اللّهُمَّ صَلی عَلی سَیِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلی عَلی حَبیبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلی عَلی شَفیعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

خۆشەویستان: زۆر جار کەسێك حەزدەکات کەسێك بەرەو ئیسلام بێت، جا ئەو کەسە لە ناو ماڵەکەی خۆیدا بێت، بۆ نمونە: تۆ کوڕێکی، کچت، خوشکت، برات، ئەولادت.. دەتەوێت بەرەو دینی ئیسلام بێت، ئەم کەسە هیچ ڕووی لە خودا نەبووە، دەبێت زۆر جار حەکیمانە بانگەوازی بۆ بکەیت، بۆ ئەم دینی پیرۆزی ئیسلامە.. نابێت سەرەتا هەرچی سونەت و فەرز و مەکروهات و موحەڕەماتە هەمووی بدەیت بە گوێی ئەم ئینسانەدا، چونکە ئەو کاتە لەوەدەچێت ئەم دینەی پێ قبوڵ نەکرێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەم دینە حەبلێکی توندە، بارێکی قورسە، گرانە، لەبەر ئەوە دەبێت زۆر بە هێواشی وەری بگرین، ئەها ئێستا شتێکی قورس ئەگەر بتەوێت وەری بگریت، یەکەم کەڕەت بەری بدەنە باوەشتەوە یەکسەر پشتت لە عەرز دەدات.. بەڵام ئەگەر هێواش هێواش شتەکە بێتە ناو باوەشتەوە، وردە وردە قورسایی بکەوێتە سەر دەستت دەتوانیت تەحەمولی بکەیت، هەڵیبگریت، لە شوێنێك دایبنێیت، بەڵام ئەگەر ئەو قورساییە بەیەك جار بکەنە باوەشتەوە یەکسەر دەستت لە عەرز دەدات، ئەم دینەش وایە، دەبێت هێواش هێواش بیخەیتە باوەشی ئەو کەسەی کە تازە

دێتە ناوی.. کچی واهەیە سفورە، لەچك ناكات، حیجاب ناكات، لەسەرەتاوە بەداخەوە ئیهمال کراوە، ئێستا باوك یان دایك حەز دەكات کچەکەی پۆشتەبێت، دەبێت سەرەتا زۆر بە وریاییەوە لەگەڵ ئەم کچە بەڕێزەدا بدوێت، ئەم خۆشەویستی خودای لەدڵدا بچەسپێنرێت، گەورەیی ڕێبازی ئیسلامی لە دڵدا بروێنرێت، باسی قیامەت و لێپرسینەوەی خودای بۆ بكرێت، ئەگەر ئەمانەی لە دڵدا چەسپی، هەر زۆر بە ئاسانی لەچك دەكات.. بەڵام ئەو هێشتا نازانێت ئیسلام چیە؟!

تۆ ئەگەر یەکسەر بڵێیت حیجاب لەبەر بکە، بەلایەوە ناڕەحەتە، کوڕێکت نوێژ ناكات، تا ئێستا یەك نوێژی نەکردووە، بڵێیت کوڕم دەبێت لە جەماعەتی بەیانیانەوە دەست پێبکەیت، نایکات، جاریٚ دەبێت بڵێیت: خودا دەكات نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەکەیت، مەغریب دەکەیت، کورە عیشا ئەگەر خەوت هات، سەعیت هەبوو.. بەیانی خەبەرت نەبوویەوە..

هێواش هێواش لەگەڵیدا برۆ، بۆ ئەوەی ئەم لەگەڵ ئەم سیٚ چوارەدا ڕاهات، ئەمجا ئەوەی تریان بە ئاسانی بەسەریدا زاڵ دەبێت، ئەگەر تەماشابکەیت خودای پەروەردگاری ئێمە، خالقی ئێمە، کە ئەم دینەی ناردووە بۆ ئەوەی خەڵك ئەم موشکیلانەی نەمێنێت لە وەرگرتنی دیندا کە هەموومان پێویستە چاو لە خالقمان بکەین کە (اللە) یە(سُبحانَهُ وَتَعالى) لە ناردنی ئەم دینەدا پلە بەندی کردووە.. هێواش هێواش ئەم دینەی بە بەندەکانی خۆی ڕاگەیاندووە..

## پلە بەندی بۆکردنی عیبادەتەکان؛ (نوێژو ڕۆژ و زەکات بەنمونە)

### یەکەم: نوێژ

بەڕیزان: یەکەم جار هەموو نوێژەکان دوو رکات بوو، بەیانی دوو بوو، نیوەڕۆ دوو بوو، عەسر دوو بوو، مەغریب دوو بوو، عیشا دووبوو، هەمووی دوو رکات دوورکات بوو..

خەڵکەکە هەمووی دەیگوت جا دوو رکات چیە؟ ئاوا دەکەیت دەیکەیت، ئەمە ماوەیەکی زۆر ئاوا مایەوە، هەتا خەڵك لەگەڵ نوێژکردندا ڕاهات..

سەیری خودای پەروەردگاربکە چەند کار بەجێیە، خەڵك بەلایەوە ئاسان بوو، ئاوای دەکرد دوو رکات نوێژی دەکرد، کە لەگەڵ دوو رکاتەکەدا خەڵك ڕاهات، خودای پەروەردگار ئەمجا فەرمووی نیوەڕۆ و عەسر بکەن بەچوار، عیشا بە چوار، مەغریب بکەن بەسێ، بەڵام چونکە بەیانی سەرەتای دەست پێکردنە خودای گەورە هەر بەدوو هێشتیەوە، لە خەو هەڵدەستیت لەشت دێشێت، بەیانی زووە، خودا ئەویانی نەکرد بەچوار، ئێستا بڕواتان هەبوایە چوار بوایە بەدەنی ئەم ئینسانە ناڕەحەت دەبوو..

ئەها دووەکە دەڵێیت زۆر ئاسانە، لە نیوەڕۆدا قوەتێکت وەرگرتووە، لە مەغریبدا ماندووی، لە بەینی شەو و ڕۆژدایت، خودا دانەیەکی لێ کەم کردۆتەوە، سێ ڕکاتە برسیتە بەرەو نان خواردن دەڕۆیت (سبحان الله) لەم دینە جوانە، ئەمجا خودا فەرمووی ئەگەر لەسەفەردا بوون، بچنەوە سەر ئەصڵەکەی جاران، ئەها لەسەفەردا نیوەڕۆ و عەسر و عیشا دووركاتە دەڵێن قەسر و جەمع دوو رکاتە، ئەوە ئەصڵەکەی خۆیەتی، دەچێتەوە سەر ئەو رکاتەی کە یەکەم جار فەرز بووە، ئەوە بۆیە قەسر و جەمع دووركات دووركات دەکرێت..

## دووەم: ڕۆژوو

خودای گەورە کەیەکەم جار ڕۆژووی فەرز کرد، خەڵکی ئازاد کرد، سەیری قورئان بکەن: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ۚ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (١٨٤) البقرة﴾ خودای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە بۆ ئیمانداران، ئەزانن زۆر ناڕەحەتە ئێستا کابرایەکی بێ دین، ئەمریکیەك، بەریتانیەك، فەڕەنسیەك، بێت مسوڵمان بێت.. لە کت و پڕدا پێی بڵێیت:

کاکە لەم مانگی تەموزەدا دەبێت لە (٣:١٥) بەیانییەوە هیچ نەخۆیت، هەتا (٧:٤) دەقیقەی ئێوارە، کوڕە بە خودا ئەم دینە بەکەس قبوڵ ناکرێت، زۆر نارەحەتە، ئەوە ئێمە لەگەڵیدا ڕاهاتووین، نابێت ئاو بخۆیتەوە، نابێت قومە ئاوێك بچێتە قوڕگتەوە، نابێت هیچ خۆراك بخۆیت، نابێت لە خێزانت نزیك ببیتەوە، نابێت کۆمەڵێك شت بکەیت..

کابرا یەکسەر دەترسێت، خودای پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارد، خودا یەکەم جار باسی فیدیەی کرد، هەرکەسێك تاقەت و توانای نیە با بەڕۆژوو نەبێت، فەقیرێك تێر بکات، ئەها لە فیدیەکەوە خودای گەورە بۆی دەچێت، هەرکەسێك پارەی هەیە ڕۆژانە فەقیرێك تێر بکات، خودای گەورە لە جیاتی ڕۆژووەکە لێی وەردەگرێت، خۆ ئەوکەسەی فەقیرێك تێر بکات و ڕۆژووەکەش بگرێت، زۆر زۆر چاکە، خۆ ئەوەی فیدیەکەی پێ نەدرا، ڕۆژووەکەی پێدەگیرێت، ئەوە ڕۆژووەکە بگرێت باشە، ئەگەر بزانن ڕۆژوو چەند چاکە، بۆ جەستەتان، ئەها ئەم نەرم و نیانیە لە ڕۆژوودا، چەند ساڵێك ئاوا بوو..

هی وابوو حەزی لێبوو ڕۆژووەکەی دەگرت هی واهەبوو حەزی لێبوو فیدیە بدات، هی واهەبوو هەردووکیانی دەکرد، دەیوت وەڵا جەستەم ڕۆژووی پێ خۆشە، فیدیەکە دەدەم و ڕۆژووش دەگرم، هەتا ساڵی چەندی کۆچی ڕۆژوو فەرز کرا؟

بەڕێزان ساڵی چەندی کۆچی ڕۆژوو فەرز کرا؟ چەند ساڵ دوای ئەوەی کە پێغەمبەری ئەکرەم کۆچی کرد بۆ مەدینە ئەم ڕۆژووەی ئێستای ئێمە فەرز بوو! !

بەڵێ.. بەڵێ.. ڕەحمەتی خودات لێبێت.. لەساڵی دووی کۆچی، دوو ساڵ پێغەمبەر ﷺ لەمەدینە نیشتەجێ بوو، ئەمجا خودای گەورە فەرمووی:

﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ۖ ﴿١٨٧﴾ البقرة﴾ تا داوی سپی و ڕەش لەیەك جیادەکەنەوە بخۆن و بخۆنەوە..

﴿ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ﴾ هەتا تاریکی شەویش دەبینن لە ئێوارە، تاریکی باڵ بکێشێت بەسەر زەویدا هەر ڕۆژوو بگرن، ئەمجا ئەمە داهات..

یەعنی مسوڵمانان لەگەڵ ڕۆژوودا ڕاهاتبوون، هی واهەبوو لەمانگی ڕەمەزاندا شەش حەوتێكی گرتبوو، دە پانزەیەكی فیدیە دابوو، هەندێكیشی لێخواردبوو، دواتر وردە وردە ڕاهاتبوو لەگەڵ ڕۆژوودا، لەكت و پڕدا خودای گەورە نەیفەرموو لە بانگی بەیانیەوە تابانگی مەغریب هیچ مەخۆن، چەند ساڵ ئەم تەدریبەی پێكردبوون..

## سێیەم: زەكات

زەكات كەیەكەمجار خودای پەروەردگار لە مەككەدا هێنایە خوارەوە، فەرمووی: دەبێت مسوڵمانان زەكات بدەن، ئەها جاری واهەیە لەئایەتی مەككەیدا زەكات هەیە، ئەی یەكێك پێمان ببڵێت مامۆستا خۆ حوكمەكانی زەكات لە ئەحكامی مەدەنین، دەڵێن: زەكات لە مەككەدا خودای پەروەردگار فەرمووی:

ئەی ئەو كەسانەی ماڵتان هەیە زەكات بدەن، بەشێك لە ماڵتان ببەخشن، ئەو بەشە بۆ خۆتان موخەیەرن، خودا نەیفەرموو دەبێت لە ملیۆنێك دینار، بیست و پێنج هەزار بدەیت.. لە بیست مسقاڵ ئاڵتوندا، نیو مسقاڵی بدەیت.. بە ویژدانی خۆت، چەندت پێخۆشە ئەوەندە بدە، حەوڵی بۆ نەبوو مانگێك هەتە، دوو مانگ هەتە، چوار ساڵەهەتە، ساڵێكە هەتە، ئارەزوی خۆت بێت..

ئەی ئیماندار ئەگەر ماڵت هەبوو بەقەدەر ئەوەی ویژدانت مورتاح دەبێت، ماڵ و سەروەتەكەت ببەخشە لە پێناوی خودادا، بە فەقیر و برا و هەژارانی خوشكت، بەڵام با بە ئارەزووی خۆت بێت، پێی خۆشترە، كابرا دەیوت وەڵا لە چل دینار دینارێك دەدەم، هی واهەبوو دەیوت بیست و چوار دینار دەدەم، هی واهەبوو دەیوت دە دینار دەدەم، بەخشندەتر بوو خەڵك موخەیەر بوو.. ڕاهات، ڕاهات وردە وردە، لەگەڵ بەخشیندا ڕاهات..

خودای گەورە ئەمجا چەسپاندی، لە ئاڵتوندا ئەوەندەیە، لەزیودا ئەوەندەیە، لە پارەدا ئاوایە لە دانەوێڵەدا ئەوەندەیە، حوكمەكان چەسپین.. خەڵكەكان دیاری كران

زەکات دەدەیت بە کێ، جاران ئارەزووی خۆت بوو، دەتدا بەهەرکەسێك، ئێستا دەبێت ئەو کەسانە بێت کە خودا فەرزی کردوون، جاران ساڵێك بوو، دوو ساڵ بوو، دەساڵ بوو، نا.. ئێستا کە حەولی بەسەردا ڕۆی، دوازدە مانگ بوو، ئەمجا واجبی زەکاتە ئەها سەرەتا خودا بەنەرمی بۆ کارەکان چوو ئەمجا ئەم ئەحکامە دامەزرا..

## پلە بەندی بۆ وازهێنان لەحەرام کراوەکان: (عارەق خواردنەوە بەنموونە)

خۆشەویستان لە باسی حەرامەکانیش خودا بە پلە بەندی لەسەر مرۆڤەکانی حەرام کرد، دایکمان (عائیشە) دەفەرمووێت:

(لو كان أَوَّلُ ما نَزَلَ من القُرآنِ لا تشربوا الخَمْرَ لقالوا: لا ندعوا الخمر ابدا) ئەگەر یەکەمجار قورئان بیفەرموویایە: ئیمانداران ئارەق مەخۆنەوە، وەڵاهی ئەو صەحابانە چەند بە ئیمان بوونایە، دەیان وت: واز لە عارەق ناهێنین، ئێمە چەند ساڵە عارەق دەخۆینەوە، چۆن وازی لێدەهێنین.. بەڵام بزانین خودای گەورە چەند بە پلە بەندی ئەو خەڵکەی واز لە عارەق پێ هێنا:

### قۆناغی یەکەم:

تەواوی شاری مەککە، پێغەمبەر ﷺو ئیمامی ئەبو بەکر و دوو کەسی تر نەبێت، هەر هەمووی عارەق خۆر بووە، بۆ مەعلوماتتان خودا ئایەتی نارد:

﴿وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًا ۝٦٧﴾ النحل

خودا فەرمووی: لەبەرو بومی ئەو خورما جوانە و ئەو ترێ جوانە دوو شتی لێ وەردەگرن، یەکێکیان شەراب، خەڵك لێی دروست دەکات، هەندێکیان مێوژ و سرکە و دۆشاو، خودا نەیفەرموو هیچیان خراپە یان چاکە، خەڵکینە هەردووکیانی لێ دروست دەکرێت دۆشاوێکی خۆش و تامی شیرین و لە جیاتی خۆراك دەیخۆیت و پێخۆرە، لەگەڵ

مێوژ و ئەو بەرهەمە جوانە، هەندێکی مەوادی سەرخۆش کەر و شەرابی لێ دروست دەکەن، خەڵکێك بە ئاگاهاتەوە وتی:

تو خودا حەیف نیە ئەم ترێ جوانە لەجیاتی بیکەیت بە رزقی حەسەن، بیکەیت بەشەراب و بیکەیت بەمادەی سەرخۆش کەر؟! خودا نافەرمووێت حەرامە، بۆ خۆتان بیربکەنەوە.. دەفەرمووێت: پاش ماوەیەك حەزرەتی (مەعازی کوڕی جەبەل) و حەزرەتی (عومەری کوڕی خەتاب) و جەماعەتێکی ئەنصار، چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتیان:

وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ عارەق مادەیەکە کە ئینسان عەقڵی لە دەست دەدات پێی، خۆزگە خودا بۆی ڕوون دەکردینەوە ئەرێ بیخۆین یان نا؟!

خودا فەرمووی: ئەوە دوای چەند مانگ ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ﴾ البقرة ٢١٩ پرسیارت لێ دەکەن لە بارەی عارەق و قومارەوە، بڵێ سودیشی تێدایە، بەڵام گوناحیشی تێدایە، سودەکەی ئەوەیە کابرا نادی هەیە، شاگردەکەی ئەو عارەق دەفرۆشێت، هەیە بە سەیارە دەیگوازێتەوە، خەڵکێك هەیە ژیانی لەسەر عارەق فرۆشیە.. بەڵام ئەی گوناحەکەی بۆ قیامەت چەند گەورەیە؟! ئەی زەرەر و زیانەکەی ئەو هەموو ماڵەی پێ وێران دەبێت؟ بەڵام بزانن زیانەکەی زۆرترە لە چاکەکەی، لە سودەکەی، زیانەکەی زۆرترە لە سودەکەی، خەڵکێك بیریان کردەوەو وتیان:

هەرشتێك زەرەرەکەی زۆرتربێت لە قازانجەکەی حەرامە، دەبێت دایمە قازانج زۆرتربێت لەزەرەر، خەڵکێکیش هەبوو هەر تێنەدەگەیشت، هەر دەیخواردەوە، خودا هەر نافەرمووێت عارەق مەخۆنەوە، هەندێك خەڵکی دیکە بە تەدریجی وازیان لێ هێنا، وتیان هەر شتێك زەرەری زۆرتربێت لە قازانجی بە کەڵکمان نایەت..

قۆناغی دووەم:

ڕۆژێکیان (عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف) کەیەکێکە لەو دەکەسەی لە دونیادا مژدەی بەهەشتی پێدراوە.. بەهەشت!! (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێبێت) یەك كۆمەڵ صەحابەی پیاوی پیاوانەی دەعوەت کردووە، کوپەی شەراب دانراوە عارەق دەخۆنەوە.. وەلاّ تێریان خواردەوە.. وتیان: با جەماعەتی مەغریب بکەین.. یەکێکیان بوو بە ئیمام، سەرخۆش بوو، ئەها دین ئاوا بووە سەرەتا بە سەرخۆشی، لات و پات جەماعەتیان دەکرد.. خودا هەر نافەرموێت مەیکەن، نا هەر وەرە بۆ مزگەوت، گەنجێك هات دەمی بۆنی لێدەهات نابێت بیکەنە دەرەوە.. هێشتا وەرە، مادام هاتوویت بەرەو خێر دەری مەکە دەفەرمووێت ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾الكافرون. ئایەتەکە دوای ئەوە چیە؟

﴿لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢﴾ الكافرون. پێیان بڵێ ئەی جەماعەتی کافرەکان ئێوە داوامان لێ دەکەن ساڵێك ئێوە بێنە سەر دینی ئێمە و ساڵێك ئێمە بێینە سەر دینی ئێوە، نەخێر ﴿لا أَعْبُدُ﴾ من ئەوە ناپەرستم ﴿مَا تَعْبُدُونَ﴾ کە ئێوە دەیپەرستن.. چونکە قەت نابێت مسوڵمان ڕازی بێت بە بت پەرستی، ئەو ئیمامە خوێندیەوە وتی:

﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢﴾الكافرون.

من ڕازیم ئێوە چی دەپەرستن من ئەیپەرستم، (لا) یەکەی پەڕاند، بەسەر خۆشی، دوایی بە دوای بە ئاگا هاتەوەو یەکێکیان تۆزێك زیاتر ئاگای لە خۆی بوو، وتی: بێ قەزا بیت خۆ ئەوە کوفرە، تۆ ڕازی بوویت بە بت پەرستی.. وتی: نا شتی وانابێت.. وتی: وەلاّ وتت: ﴿۝١ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢﴾ (لا) یەکەت پەڕاند..

دەفەرمووێت: چونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ قسەی نەکرد. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئیمانداران، نافەرمووێت ئەی فاسیقان بەو

جەماعەتە عارەق خۆرە.. دەڵێت: ئەی ئیمانداران ﴿لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ﴾ هەر کاتێك سەرخۆش بوون، هەتا سەرخۆشیەکە بە تەواوەتی بەرتان نەدات نزیکی نوێژ مەکەون.. ﴿حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ ﴿٤٣﴾﴾النساء. هەتا بۆ ئەوەی یەقینتان هەبێت،چی دەڵێن، نافەرمووێت عارەق مەخۆنەوە، عارەق بخۆنەوە بەڵام نوێژ مەکەن، هەتا سەرخۆشیەکە بەرتان دەدات..

دوایی خەڵکێك هەبوو دەیگوت: جا ئەگەر ئێوارە عارەق بخۆمەوە، عیشاش هەر وادەبم، دوایی نوێژەکەم دەچێت، بەم هۆیەوە کۆمەڵێك خەڵك وازیان لە عارەق خواردنەوە هێنا..

**قۆناغی سێیەم:**

مەرحەلەیەکی دیکە دێتە پێشەوە: کۆمەڵێك صەحابە دەعوەتن لە ماڵێکدا، بە دەوری یەکتردا دانیشتوون، مەجلیسێکی خۆش، مسوڵمانانە حەیوانیان سور کردۆتەوە، ئەو حەیوانە عەرەب بەگەورەیی دایدەنێن، لەناو مەجلیسدا نازانم جەنابتان بینیبێتان، هەموویان داناوە، ناوەکەیان پڕ کردووە لەشت.. سەری حەیوانەکە بزن بێت یان مەڕ، لەبەر دەمی صەحابەیەك بوو، وەڵا سەر خۆش بووبوون.. عارەقیان خواردبوویەوە.. هەر هەڵیگرت و بە نێو چەوانی (سَعدی إبن أبي وَقّاس)ی کێشا!!

ئەم لاسەرەی هەمووی خوێنی پێدا هاتە خوارەوە.. ئەویش خەریکبوو شمشێر هەڵبکێشێت، دوایی ووتی: نەء بابچمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ..

دەفەرمووێت: کە چووم حەزرەتی (عومەر) ئەوەی بینی (سەعد) خزمیەتی و قورەیشیە و کابرایەکی خەڵکی مەدینە وای لێکردووە، خەریکبوو ئاژاوەیەك دروست بێت، ئەوە خزمی منە، ئەوە قەومی منە، ئەوە مەککەییە، چۆن دەبێت مەدینەییەك دەتوانێت سەرە حەیوانێك بکێشێت بەسەریدا؟ لە مەجلیسێکدا سەری بشکێنێت؟!

خەریكبوو عەصەبیەت و قەومایەتی لە تایفەیدا دەجولآیەوە.. لە مەیاندا حەزرەتی (عمر) هاواری كرد: خودایە بۆ خاتری گەورەیی خۆت ئەمجارە یەكجاری بۆمان ڕوون بكەرەوە ئەم عارەقە سەر ئەنجامی چی دەبێت؟ خودا ئەم جارە فەرمووی:

﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾﴾ المائدة.

لە نوێژتان دوور دەخاتەوە، خۆشەویستیتان لە نێواندا لادەبات، ڕق و قین دەخاتە دڵتانەوە، عەقڵتان بار دەكات، توشی خراپە دەكات ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ وەختی ئەوە نەهاتووە وازی لێبهێنن؟ وەختی ئەوە نەهاتووە خودای گەورە وای فەرموو..

دەفەرمووێت: ئەم دەنگ و باسە پێغەمبەر ﷺ بۆی خوێندینەوە، وتیان: بەرەوەلآ وەختی ئەوە هاتووە وازی لێبهێنین.. وتیان: (إنتهينا إنتهينا) كۆتای پێهات، هەرچی ئەم ئایەتەی پێدەگەشت كوپە شەرابەكەی دەهێناو دەیڕشت.. دەفەرمووێت كۆڵانەكانی شاری مەدینە وەكو ئەوەی عارەق لافاوی پێدا هەستا.. یەك پارچە هەموو خەڵك بەدەستی خۆی شكاندی (إنتهينا) كۆتایمان پێهێنا، لێی بێزار بووین..

قۆناغ بەندی بە قۆناغ بەندی، هەتا ئەم ئینسانە ڕزگاری بوو (سبحان الله) ئەها ئەم دینە چەند بە جوانی، چەند بە نەرمی دەكات بەم خەڵكە، ئێمەش ئەگەر بمانەوێت موشكیلەمان لەگەڵ كەسانی بێ دین، بەتایبەت لە ناو ماڵەكەی خۆتدا بتەوێت هیدایەتی یەكێك بدەیت.. پلە بەندی لەگەڵیدا وەرە خوارەوە، وەرە خوارەوە، وەرە خوارەوە، بە هێواشی.. بۆ خۆی دەڵێت: بەسە تەسلیم بووم.

ئومێدەوارم كە (إنشاء الله) لەم دەرسە سودمان وەرگرتبێت كارەكانمان بە حیكمەت و كار بەجێیەوە بدەین بە گوێی ئەو كەسانەدا كە بەرەو خودا دێن، خودا هیدایەتی هەموو لایەك بدات.. تا شەوێكی تر و بەرنامەیەكی تر لەم زنجیرە باسە بە خوداتان دەسپێرم .. (وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَركَاتُهُ) .

## وانەی شانزەیەم

## پاكم بكەرەوە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ

* قالَ اللهُ تَعالى : ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾﴾ الإسراء : ٣٢ .

* عَنْ إبْنِ مَسْعودٍ ، قالَ سأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ : أيُّ الذَّنْبِ أعْظَمُ ؟ قالَ : أنْ تَجعَلَ لِلّهِ نِدّاً وَ هُوَ خَلَقَكَ ، قالَ : قُلْتُ : ثُمَّ أيُّ ؟ قالَ : أنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مَخافَةَ أنْ يَطْعَمَ مَعَكَ ، قالَ قُلْتُ : ثُمَّ أيُّ ؟ قالَ : أنْ تَزْنِيَ بِحَليلَةِ جارِكَ). ـ متفق عليه ، بُخاري وَ مُسلم : (١٢٤) .

* جاءَ ماعِزُ بنُ مالِكٍ إلى النَبيِّ ﷺ فَقالَ لَهُ : يا رَسُولَ اللهِ ، طَهِّرْني ، فَقالَ وَيْحَكَ ، إرْجِعْ فاسْتَغفِرِ اللهَ ، وَتُبْ إلَيْهِ ، فَرجَعَ غَيْرَ بَعيدٍ ، ثُمَّ جاءَ فَقالَ : يا رَسُولَ اللهِ طَهِّرْني فَقالَ ، رَسُولُ اللهِ ﷺ وَيْحَكَ إرْجِعْ فاسْتَغفِرِ اللهَ وَتُبْ إلَيْهِ ، قالَ : فَرجَعَ غَيْرَ بَعيدٍ ثُمَّ جاءَ فَقالَ : يا رَسُولَ اللهِ طَهِّرني ، فَقالَ النَبِيُّ ﷺ مِثْلَ ذالِكَ ، حَتَّى إذا كانَتِ الرَّابِعَةُ ، قالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ فيمَ أُطَهِّرُكَ ؟ فَقالَ مِنَ الزِّنَى ، فَسأَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أبِهِ جُنُونٌ ، فَأُخْبِرَ أنَّهُ لَيْسَ بِمَجْنُونٍ ، فَقالَ : أشَرِبَ خَمْراً ؟! فَقامَ رَجُلٌ فَاسْتَنْكَهَهُ فَلَمْ يَجِدْ مِنْهُ ريح خَمْرٍ ، فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : أزَنَيْتَ ؟ فَقالَ نَعَمْ ، قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَعَلَّكَ قَبَّلْتَ أوْ غَمَزْتَ أوْ نَظَرْتَ ؟ ، قالَ لا يا رَسُولَ اللهِ ﷺ . قالَ : أنِكْتَها ؟ قالَ نَعَمْ ، فَعِنْدَ ذالِكَ أمَرَ بِرَجْمِهِ ، فَكانَ النَّاسُ فيهِ فِرْقَتَيْنِ ، قائِلٌ يَقُولُ : لَقَدْ هَلَكَ ، لَقَدْ أحاطَتْ بِهِ خَطيئَتُهُ ، وَ قائِلٌ يَقُولُ : ما تَوْبَةٌ أفْضَلُ مِنْ تَوْبَةِ ماعِزٍ ، أنَّهُ جاءَ إلى النَبيِّ ﷺ . فَوَضَعَ يَدَهُ في يَدِهِ ، ثُمَّ قالَ : أُقْتُلْني بالْحِجارَةِ ، قالَ :

فَلَبِثوا بِذالِكَ يَوْمَيْنِ أَوْ ثَلاثَةً ، ثُمَّ جاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ . وَهُمْ جُلُوسٌ ، فَسَلَّمَ ثُمَّ جَلَسَ ، فَقالَ اسْتَغْفِرُوا لِماعِزِ بْنِ مالِكٍ ، فَقالوا : غَفَرَ اللهُ لِماعِزِ بْنِ مالِكٍ ، فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : لَقَدْ تابَ تَوْبَةً لَوْ قُسِّمَتْ بَيْنَ أُمَّةٍ لَوَسِعَتْهُمْ) ـ رَواهُ البُخاري وَ مُسْلِم.

* وَفي حَديثِ أَبي هُرَيْرَةَ عِنْدَ النَّسائي : (لَقَدْ رَأَيْتُهُ بَيْنَ أَنْهارِ الجَنَّةِ يَنْغَمِسُ)

ـ فتح الباري ج١٢ ، ص١٥٩ .

* وَفي رِوايَةٍ: (لَمّا فَرَّ ماعِزٌ مِنْ مَسِّ الحِجارَةِ ، قالَ : هَلا تَرَكْتُمُوهُ؟!) . رَواهُ البُخاري وَ مُسْلِم. (وَ في صَحيحُ سُنَن أَبي داود لِلْأَلباني: (٤٤١٩) : (هَلا تَرَكْتُمُوهُ ، لَعَلَّهُ أَنْ يَتُوبَ ، فَيَتوب اللهُ عَلَيْهِ) .

* قالَ إِبْنُ قَدامَةَ . رَحِمَهُ اللهُ . (وَلَوْ وُجِدَ رَجُلٌ وَ امْرَأَةٌ يُقَبِّلُ كُلُّ واحِدٍ مِنْهُما صاحِبَهُ ، وَلَمْ يُعْلَمْ هَلْ وَطِئَها أَوْلا ، فَلا حَدَّ عَلَيْهِما) ـالمُغني ، ج١٢، ص ٣٥١.

## سەرچاوەكان :

١) فتح الباري شرح صَحيح البُخاري ، ابنُ حَجَرَ العَسْقَلاني ، ج١٢ ، ص١٦٥ . ط: ٣ ، ٢٠٠٠ ، دارُ الفَيْحاء ، دِمَشق .

٢) موسوعَة نَظْرَة النَّعيم ، مجموعَة مِنَ المُخْتَصِّينَ ، ج٧ ، ص٢٧٢٩ ، ط : ٨ ، ٢٠١٢ ، دارُ الوَسيلَة ، السعوديَّة .

٣) رَوْضَةُ المُتَنَزِّه ، شَرْح بِدايَة المُتَفَقِه ، أَيْمَنْ علي مُوسَى ، ج٣ ، ص ٣٨٥ . ط : ١ ، ٢٠١٠ ، دارُ ابنُ رَجَب .

٤) نِداءات الرَّسُول ﷺ لِأَصْحابِهِ ، محمد عبدالعاطي بحيري ، ج٢ ، ص٣٠ المكتَبة التوفيقيَّة .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی زۆر بەڕێز و خۆشەویست کە لە ماڵی خودای پەروەردگاردا ماونەتەوە، بۆ ئەوەی وانەیەکی تر، دەرسێکی تر لە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فێر ببین.. ئەمشەویش لەزنجیرە باسەکەماندا بەناوی ﴿ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشە و گرفتم هەیە﴾ دەچینەوە شاری مەدینە، پێم خۆشە لەسەر ناوی شاری مەدینە بوەستین، شاری مەدینە یەعنی شاری مەدەنیەت، ئەمڕۆ ئەم گەنجە بەڕێزانە شارەزان ڕەنگە هەندێکیان ئەندام بن لەو ڕێکخراوانەی کە پێیان دەڵێن: کۆمەڵەی مەدەنی، زۆر کەس بانگەشە دەکات بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی مەدەنی، یان پێیان دەڵێن:

(ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی) چالاك وانی بواری کۆمەڵگەی مەدەنی..

بەڵام ئەم کۆمەڵگە مەدەنیە "من بە تەحەداوە دەیڵێم" یەك جار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هەبووە، بە واقعی بووە، ئەویش دەوڵەتی مەدینەی پێغەمبەر ﷺ بوو، دەوڵەتی مەدەنی، کۆمەڵگەی مەدەنی: بریتیە لەو دەوڵەتەی ئازادی بیر و ڕای بۆ هەموو تاکێك تێدا بێت. ئازادی بیر و باوەڕی بۆ هەموو دین و بیر و باوەڕێك تێدا بێت.. مەدەنی بریتیە لەو کۆمەڵگایەی کە ئەندامەکانی ڕێزی یاسا بگرن..

کۆمەڵگەی مەدەنی: بریتیە لەو کۆمەڵگایەی کە بە ناوی کەسێکەوە نەبێت، هەتا تەنانەت بیر و باوەڕێکیش خۆی نەسەپێنێت بەسەریدا، سەیری بکە ناڵێت: دەوڵەتی پێغەمبەر ﷺ، یان دەڵێت دەوڵەتی مەدینەی پێغەمبەر ﷺ، نا.. (دەوڵەتی مەدینە) تەواو.. ئیتر ناوی ئیسلامیشی پێوە نیە، پێغەمبەر ﷺ ی پێوە نیە، ناوی کەسی پێوە نیە دەوڵەتی مەدینە، دەوڵەتی شارستانیە، دەوڵەتی هەموومان.. بۆیە لەوێدا لەم دەوڵەتی مەدینەدا دەستور هەیە، لە دەستوردا نوسراوە مسوڵمان مافی هەیە، جولەکە

مافی هەیە، گاور مافی هەیە، موشریك مافی هەیە، هەموو هاولاَتیەك مافی هەیە.. بە هەمووشمان دەبێت پێکهاتەی ئەم دەوڵەتە بپارێزین. کەس نابێت خیانەت لەم دەوڵەتە بکات.. بەڕێزان بە تایبەت ئەو کەسانەی خۆیان بە کەسی خوێندەوار و ڕۆشنبیر دەزانن، لە هەموو چوار چێوەی دەوڵەتی دونیادا هەر ئەمە ئاواتی نیە..

ئەوەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ (١٤٠٠) ئەوەندە ساڵ لەمەوپێش بە فیعلی چەسپاندی.. ئا لەم کۆمەڵگە مەدەنیەدا تاك فێری ئەوە دەبێت کە: خۆی لە هەڵە بپارێزێت، لە دەستوری ئیسلامدا لەچوار چێوەی شەریعەتی ئیسلامدا، کۆمەڵێك شت هێڵی سورە، نابێت تۆ هێڵە سورەکان بشکێنیت..

بەلاَم ئەمە ئینسانە ئەمە فریشتە نیە، ئەم دەوڵەتە، دەوڵەتی فریشتەیی نیە..کە کەس نابێت غەڵەت بکات. زۆر کەس وامەڵە حاڵی دەبێت لە زەمەنی پێغەمبەردا ﷺ هیچ شتێکی نەخوازراو ڕووی نەداوە.. بەلاَم بە پێچەوانەوە، من بۆیە حەزم کرد ئەم زنجیرە باسە لەگەڵ جەنابتاندا باسی ئەوە بکەم، بۆ ئەوەی خەڵك ئاشنا بێت بە مێژووی ڕاستەقینەی ئیسلام، ئێمە ئەم ئیسلامە دینێکمان نیە فریشتە بێت، دەوڵەتی فریشتەیی بێت، کەس گوناح نەکات، نابێت.. بە پێچەوانەوە ئیسلام دینی مرۆڤەکانە، دینی ئینسانەکانە، بەڕێزان مرۆڤەکانیش چی دەکەن؟

مرۆڤەکانیش تووشی هەڵە دەبن.. بەس گرنگ ئەوەیە هەڵەکە لەسەری سور نەبێت، گرنگ ئەوەیە ئەم هەڵەیە نەیکەیت بە پیشە، خەڵکی فێر نەکەیت..

با ئەمشەو بەیەکەوە بچینە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەو شارە نمونەیەدا، لە شاری دەوڵەتی مەدەنی، لە شاری دەوڵەتی مەدینە، لەگەڵ چونمان بۆ شاری مەدینە سلاَوات دەنێرین بۆ ڕۆحی پاکی پێغەمبەرﷺ :

(اللّهُمَّ صَلی عَلی سَیِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلی عَلی حَبیبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلی عَلی شَفیعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

## ماعیزی کوڕی مالیك تۆبەی لەزینا کرد !

کوڕێکی گەنج هەتا بڵێیت سیما جوان، بالآ بەرز، ڕیشێکی ڕەشی جوان، بەر سمێڵی کردووە.. پوخت دێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، لەو کاتەدا کە خۆشەویست لەو مزگەوتە پیرۆزەدا چۆتە دەرەوە، خەریکە بەرەو ماڵیان، یان بۆ شوێنێك بڕوات، کۆمەڵێك صەحابە وەکو کورەی هەنگ دەورەیان داوە..

لەو کاتەدا کەسێك بە ناوی (ماعزی إبن مالیك)ەوە گەنجێکی ناسراوی مەدینە، گەنجێکی ڕێك و پێك و بە موحتەرەم، سەیری ئەم مەشهەدە بکە لە صەحیحی (بوخاری) و (موسلیم)دا هاتووە، حەدیسێکی صەحیحە، دێت و دەڵێت: (یارسول الله ﷺ) "(یا) بۆ بانگ کردنە" ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بوەستە، ئیشم پێتە، دەبێت ئیشی چی بە پێغەمبەری خودا بێت ﷺ؟! (یارَسُول الله ﷺ طَهرني ) ..

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بوەستە پاکم بکەوە..(طَهرِني) پاکم بکەوە من پیس بووم، من لیخن بووم، من گلاو بووم، پاکم بکەوە ! !

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (وَیحك إرجَع فَستغفرالله وَ تُب إلیه) دەفەرمووێت بێ دەنگ بە، هاوار بۆ تۆ دەنگ بەرز مەکەوە، با خەڵکی تر گوێی لێ نەبێت، برۆ داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە، و تەوبە بکە، (سبحان الله) لەو پێغەمبەرە ئازیزە، ئەم گەنجە خۆی هاوار دەکات من خلیسکاوم، من قاچم ترازاوە، من لیخن بووم، من قوڕاوی ئەو گوناحەم پێوەیە وەرە پاکم بکەوە، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: بێ دەنگ بە، برۆ داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە، باکەس گوێی لێ نەبێت، تۆبە بکە، تۆبە.. دەفەرمووێت: (فَرجَع غَیرَ بَعید) ڕۆشت گەنجەکە، بەڵام زۆر دوور نەکەوتبوویەوە (ثُمّ جَاء)جارێکی دیکە هاتەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمجارەش هاواری کردەوە: (طَهرني) پاکم بکەوە..

خۆشەویست فەرمووی: (وَيحَك) هاوار بۆ تۆ (إرجعْ فَستغفرالله وَتُوب إِليه) بڕۆرەوە کوڕی گەنج، بڕۆ داوای لێخۆشبوون بکە لە بەینی خۆت و خودادا، بڵێ خودایە لێم خۆشبە، تەوبە بکە، تەوبەیەکی ڕاستەقینە..

(فَرجع غَيرَ بَعيد) نە قسەی کردوو نە پێغەمبەر ﷺ هیچی دیکەی لێپرسی، گەنجەکە ڕۆی وەکو ئەم دەرگای مزگەوتە، (غير بعيد) زۆر دوور نەکەوتبوویەوە (ثُمَّ جَاء)دیسان هاتەوە، هاتەوە ئەمجارە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ (طهرني) تو خودا پاکم بکەوە، پیسیم پێوەیە.

پێغەمبەر ﷺ ئەمجارەش فەرمووی: بڕۆ لە بەینی خۆت و خودادا داوای لێخۆشبوون بکە و تەوبە بکە، تەوبە، بڕۆ داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە، باسی هیچ مەکە.. دەفەرموێت: دیسان ڕۆشت چوارەم جار گەڕایەوە، ئەها سەیری بکە لێی نەپرسی پێغەمبەری خودا ﷺ لەچی پاکت بکەمەوە؟ بەس خۆی تێگەشتووە باسی چیە، ئەم گەنجە خێزانی نیە، ژنی نیە، ئیلا توشی چی بووە بەڕێزان؟!

حاڵەت زینا بووە.. بەلام پێغەمبەری خودا ﷺ نایەوێت ئەو وشەیە بە دەمیدا بێت. لێی ناپرسێت چی بوو؟ چی نەبوو.. وەرە بۆم باس بکە؟ ئەها کەسێك هات بۆ لای تۆ وتی توشی گوناحێکی گەورە بووم، زانیت ئەم گەنجە فعلا توشی ئەمە بووە، جا کچ بێت یان کوڕ، یان ژن بێت یان پیاو.. بە دەم و چاویدا دیاربوو ئەوە بوو، لێی مەکۆڵەوە، هەر ئەوەی پێغەمبەری پێی بڵێ: لە بەینی خۆت و خودا تەوبە بکە، (ويحك) بۆ کەسی باسمەکە، نەیدرکێنیت بۆ کەسی باس نەکەیت..

لە بەینی خۆت و خودا تەوبە بکە، ئیتر مەڵێ ئەمە کەی بوو؟ لەگەڵ چ ئافرەتێك بوو؟! بۆچی ئەمەت بەسەرهات؟ بۆ وات لێهات؟ چۆن شەیتان زەفەری پێبردیت؟ پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمانە ناڵێت، کۆمەڵگەی مەدەنی ئەوەیە:

ئەم هاواری بۆ هێناوی، ئەم کاتە کەس ئاگای لێ نیە جگە لە (الله)، ئەوە کۆمەڵگەی مەدەنیە، یاسا چاوی لێ نیە، پۆلیس موراقب نەبووە بەسەریەوە.. بەس خۆی هەست

دەکات گوناحێکی گەورەی کردووە، زوڵمی لە کۆمەڵگاکە کردووە، چونکە کۆمەڵگا زینای تێدا بڵاوبوویەوە، فێر بوو کەسەکە توشی ئایدز دەبێت، توشی نەخۆشیە سامناکەکان دەبێت.. کە ئێستا ئا ئەو ئەورووپایە بەدەستیەوە دەناڵێنێت.. پەنا بە خودای پەروەردگار دەگرین لە نەخۆشی ئایدز، ئینسان کە توشی ئایدز بوو یەك هەلأمەت بگرێت تازە تەحەمولی ناکات. ئەونەخۆشیەی لە دونیادا چارەسەری نیە.. هەتا ئەو ئینسانە هەموو لەشی کون کون دەبێت، بۆگەن دەبێت، لە ناو لەشی خۆیدا پەنا دەگرین بە خودای پەروەردگار، ئەم ستەمی کردووە، چونکە زینا کە پاشە ڕۆژی نەخۆشیە خراپەکانە، هەر بۆ خۆی نیە، جاری واهەیە هەر شەرت نیە زینا لەگەڵ ئافرەتێکدا بکەیت، دەچیت خوێن دەبەخشیت..

فەحسی خوێنیان بۆ کردووە دەرزیەکە بەحاڵ خوێنی ئەم پیسیەی پێوەیە، بەر کەسێکی دیکە کەوت، ئەویش توشی ئەو ئایدزە دەبێت.. ئەمجا خەڵك دەڵێن: بە خودا لەوانەیە زینای کردبێت، ئەم نایەوێت ئەم گوناحە لە خەڵك هەڵسوێت، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ وەرەپاکم بکەوە.. با پیسیەکەی منیش نەپرژێت بەسەر خەڵکدا..

پێغەمبەری خودا ﷺ لە جاری چوارەمدا دەفەرموێت: (فیما أُطَهِرُكْ) لەچی پاکت بکەمەوە؟ ئاخر پیسیەکەی تۆ چیە؟! دەبێت ئینسان خۆی ئیقرار بدات، پێغەمبەر ﷺ پێشی ناکەوێت و بڵێت نا بەخودا زینات کردووە، نا با خۆی بڵێت دەفەرموێت ئەی پێغەمبەری خودا من زینام کردووە لە زینا پاکم بکەوە، ئەم هەموو خەڵکەش سەیری دەکات..

وەڵاهی من پێم سەیرە کاتێك ئەم فەرموودانە دەخوێنمەوە، ئێستا یەکێك بێتە ئەم میحرابەوە بڵێت مامۆستا من زینام کردووە، ئێوەش هەمووتان گوێتان لێیبوو بێت، هەموومان لەوانەیە هەستین، وانیە؟ ئەمە دەوڵەتی مەدەنیە.. ئەم پیاوە ئەمە موشکیلەکەیەتی، خەڵك بەس بەزەیی پێدا دێتەوە، دوعای خێری بۆ دەکات، هیچ قسە ناکات، کەسیش دەنگی لێوە نایەت..

پێغەمبەر ﷺ لە جاری چوارەمدا دەفەرموێت: لەچی پاکت بکەمەوە؟ خۆی دەڵێت، (ئیعتیرافە)دان پیانانە لە (زینا)، ئەمجا پێغەمبەری خودا دەفەرمووێت: دەوەرن رایکێشن، ئاوەرە رەجمی بکەن، بیکوژن، ئەو میکرۆبە لەناوبەرن؟ نا.. هێشتا دەبێت تەحقیق بکات، پێغەمبەر ﷺ ڕوو لە صەحابەکان دەکات و دەفەرمووێت: (أفیه جنون) ئایە ئەم کوڕە گەنجە شێت بووە؟! من پێشتر نەمزانیوە شێت بووە، ئەقڵی لەدەست داوە، فێی لێ دێت! تێکچووە!!

دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ (فَأَنَهُ لَیسَ بِمَجْنُونْ) وەلاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە نەمان بینیوە ئەمە شێت بێت.. نەوەلا عەقڵی تەواوە، هیچ عەیبی نەبووە تا ئەم دەقیقەیە، عەیبی نەبووە..

پێغەمبەر ﷺ بەهانەیەکی تر دێنێتەوە بۆ ئەوەی ئەم کوڕە ڕزگاری بێت دەفەرمووێت (أشَرِبَ خَمراً)؟ تۆ بڵێیت عارەقی نەخواردبێتەوە؟! سەرخۆش بوو بێت، ئادەی فلان کەس وەرە بۆنی دەمی بکە، (فَقام رَجُلٌ) پیاوێك هاتە پێشەوە (فَسْتَنْكَهَهُ) بۆنی دەمی کرد، بۆنی هەناسەی کرد، (فَلم یَجد مِنهُ رِیحَ الخَمر) وتی وەلا ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ بۆنی عارەقی لێنایەت، نەوەلا عارەقی نەخواردۆتەوە، و شەرابیشی نەخواردۆتەوە، سەرخۆشیش نیە، عەقڵی لەسەر خۆیەتی کە قسە دەکات..

پێغەمبەر ﷺ دووبارەی کردەوە (أَزَنَیت) خۆ ئافرەتەکەت ماچ نەکردووە؟ ماچکردن بێت زینا نیە، نەوەلا ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، فەرمووی: لەوە دەچێت هەر لەباوەشت گرتبێت تۆ وابزانی ئەمە زینایە؟ نەوەلا ئەی پێغەمبەری خودا، هەر لە باوەش گرتن نەبوو، فەرمووی لەوە دەچێت لەگەڵیدا ڕاکشابیت، تەنها ڕاکشانێك ڕوویدا بێت؟ برا ئەمە زینا نیە.. ئەمە تاوانی ناگاتە زینا..

نەوەلا ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەی ژن و پیاو ئەنجامی دەدات.. من ئەنجامم داوە، من ژنیشم هەیە، من منداڵیشم هەیە، من (محصەنم) من لە قەلآدا بووم، بەلآم بەداخەوە لەگەڵ ئافرەتێکدا لە ئەنجامی چاو گۆڕینەوەیەکەوە، نەزەرێکەوە، تێکەوتم

لەگەڵیدا، زۆر بەلامەوە جوان بوو، سەرەتا یەك نەزەرمان کرد بەیەکەوە.. دواتر لە ڕێگادا مەرحەبای یەکترمان دەکرد، دواتر هات بۆ ماڵمان، دواتر من چووم بۆ ماڵیان، پەنا بەخودا مەوعیدێکمان داناو، لەلەحزەیەکدا قاچم خلیسکاو ئەوەندەی بەخۆم زانی توشی زینا بووم، بەڵام کامل زینام ئەنجام داوە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، بەس هەر لێبوومەوە بە ئاگا هاتمەوە، کە چ تاوانێکم ئەنجامداوە، تاوان بەرامبەر بەخۆم، تاوان بەرامبەر بە شەرەفی خەڵك، تاوان بەرامبەر بەژنێکی داوێن پاك لە ماڵەوە، کە وریای منداڵمە، تاوان بەرامبەر بە منداڵەکانم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، من لیخن بووم.. دەبێت پاك بکرێمەوە، خۆم دەزانم چەند تاوان بارم!

پێغەمبەر ﷺ ئەمجا دەفەرمووێت: (فَأَمَرَ بِرَجْمِهِ) ئەمە مادام ژنی هەیە، ئەگەر ژنی نەبوایە حاڵەتێکی تایبەتی تر بوو، حوکمەکەی سوکتربوو، بەڵام ئەمە دەبێت بخرێتە ژێر گڵەوە! بۆ؟ چونکە ئەگەر نەخرێتە ژێر گڵەوە، ژنەکەی ئامادە نیە لەگەڵ زینا کارێکدا دابنیشێت، منداڵەکانی سەر شۆڕ دەبن، دەڵێن باوکتان زینای کردووە، ئایا ئەو قەومە دێن دەیکوژن؟ ئەها خەڵکی دێن دەیکوژن! ژنەکەی خۆیان دەکوژن؟

نەخێر.. حاکم دێت دەیکوژێت، حاکم دێت لە چاڵێکدا بەردی پێدا دەدەن، بەردێکی نەزۆر گەورە، نە زۆر بچوك، ئینجا ئەوە کۆمەڵێك ئەحکامی هەیە ڕەجم کردن، هەروا گاڵتە نیە..

## مەرجەکانی ڕەجم کردن :

*نابێت سەرمایەکی بەشیدەت بێت، نابێت وەکو ئێستاش گەرما بێت.. دەبێت حوکمەکەی دوا بخرێت هەتا هەوایەکی ناوەندی بەهاری دێت..

*دەبێت جسمی ئینسانەکە بپشکنن بزانن نەخۆش نیە، نەوەکو جەڵتە لێی بدات، چونکە ئەوە نەخۆشە نابێت لێی بدرێت..

*نابێت ئەوەندە لاوازبێت پەراسوەکانی بەدەرەوە بێت.. لەگەڵ یەك بەردا پەراسوی بشکێت.. دەبێت جسمی سەلیمی هەبێت..

*نابێت هیچ خەلەلێکی عەقڵی هەبێت، ئەمانە هەمووی هاتنە جێ، یەك تەقریری توبی بنوسرێت ئینجا بەرد باران دەکرێت، هەتا لەژێر بەردەکاندا دەمرێت، ئەمە ئیعتیرافی کردووە بە زینا، ئەمجا ئەگەر هەڵهات لەژێر بەردەکاندا هێشتا وازی لێدەهێنرێت، نابێت خەڵك بەدوای بکەوێت..

دەفەرموویت: ئەگەر وازیهێنا، ئەگەر لەژێر بەردەکاندا کۆمەڵێك بەردیان پیادا، رایکرد، نابێت کەس بەدوای بکەوێت، وازی لێبهێنن، تازە لەوەدەچێت درۆی کردبێت، لەوە دەچێت بوختانی بەخۆی کردبێت، لەوەدەچێت پەشیمان بووبێتەوە.. تازە بەس تۆبەی بەسە، تازە بەشی خۆی بەرد باران کراوە.. مەچن بەدوای کەون، بڵێن بیگرنەوانێ و بیکوژن، ئەگەر رایکرد لەژێر بەردەکاندا ناکوژرێت وازی لێدەهێنرێت..

ئەها ئیسلام خەڵکێك وادەزانن ئەم ئیسلامە توند و تیژیە، یا خودا قاچت نەترازێت، سەرت دەپەرێنن! ئەها لە کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ؟ ئەوەیە کۆمەڵگای مەدەنی، ئەوە دەوڵەتی مەدینەییە، دەوڵەتی پێشکەوتووە..

کاتێك کە ئەو (ماعز)ە لەژێر ئەو بەردانەدایە، وەڵاهی غیرەتە، ئەها ئینسان، چاوی ئینسان، رۆحی ئینسان، زۆر شیرینە، ئەو جسمە راوەستاوە هەتا لەژێر ئەو بەردانەدا نوقمی دەکەن، دەمرێت.. ناجوڵێت هەڵنایەت.. هەتا دەمرێت..

دواتر خەڵك بوونە دوو تاقم دەفەرموویت: کۆمەڵێکیان وتیان: (لَقَد حاطَت بِهِ خَطيئَتُهُ) گوناحەکەی زۆر گەورە بوو، نوقم بوو لەناو گوناحدا، هەندێکیان وتیان: (ما تَوبَةُ أفضَلُ مِن تَوبةِ ماعز) بەڕاستی تەوبەکاری ڕاستی وەکو (ماعز) دەبێت، کەس وەکو ئەوتەوبەی نەکردووە..

پێغەمبەر ﷺ بەسەر ئەم موناقەشەیەدا هات (وَ هُمْ جُلوسٌ) ئەوان دانیشتبوون (فَسَلَّمَ عَلَيهم ثُمّ جَلَسَ) لە ناو صەحابەکاندا دانیشت فەرمووی: (إستَغفِرُوا لِماعز بن مالك)

یەکپارچە هەر هەمووتان بڵێن یارەبی لە (ماعیزی کوڕی مالك) خۆش بە.. فەرمووی هەموو ئەو صەحابانە وتیان: یارەبی لە (ماعیزی کوڕی مالك) خۆشبیت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئامین.. لێیخۆشبە..

ئەها پێغەمبەر ﷺ هێشتا نەفرەتی لێ ناکات، ئیتر تەواو، ئەمە دڵسۆزە، ئەمە تاکێکی پەروەردەکراوە، تەسلیم بووە، تەسلیم بە حکومی شەرعی بوو، داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن.. ئەمجا پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (غَفَرَ اللهُ لِماعِزِ بن مالك) یارەبی خودا لە (ماعیزی کوڕی مالك) خۆشبێت.. فەرمووی: (لَقَدْ تابَت تَوبة لَو قَسمَت بَين أُمَةٍ لَوسَعَتهم) ئەم کوڕە گەنجە یەك تەوبەی کردووە ئەگەر یەك ئومەتی گەورە، ملوێنێك خەڵك بهێنیت، هەموویان گوناحباربن، تۆبەکەی ئەم ئەوەندە گەورەیە بەسەر ئەماندا بیکەیت تۆبەی ئەم گەنجە، لە هەموویان خۆش دەبێت!!

(سبحان الله) خودا لەبەر خاتری ئەم گەنجە کە ئەوەندە بەڕاستی تۆبەی کرد، ئەوەندە بەڕاستەقینە پەشیمان بوویەوە، یەك ملوێن خەڵك بهێنیت، دوو ملوێن خەڵك بهێنیت، هەموویان جەهەنمی بن، تۆبەکەی ئەمیان بەسەردا بڕژێنیت، وەکو باران، خودا لە هەموویان خۆش دەبێت!!

## زینا کار هات بۆلات چی پێ دەڵێیت ؟

لەبەر ئەوە گەنج هەیە، حالیەن بەڕاستی توشی زینا بووە، ئەمە کۆمەڵگایە بەڕێزان: ئەمە بەشەریەتە، ئەوە لە زەمانی پێغەمبەر ﷺ صەحابە بووە لە پلەی صەحابە دانەبڕاوە، سزای خۆی وەرگرت، تەسلیم بە شەرع بوو، تەنانەت پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگەی ئەوەی نیشاندا ئەوەندە لەسەری نەڕوات، بۆیە لە ئەمڕۆدا کە دادگای شەرعی نیە بۆ تاوان باران، گوناحکارانی زینا، ئەگەر کەسێك خودا نەخواستە ئەمەی لێ قەوماو وەکو ئەمینداریێك هات بۆ لای تۆ، دەبێت تۆ:

یەکەم: لە بەینی خۆت و خودادا بێت، نەیدرکێنی..

دووەم: ئامۆژگاری بکەیت ئەو لە بەینی خۆی و خودادا بێت، لای کەس باسی نەکات.

سێهەم: دادگای ئیسلامی و شەریعەت جێبەجێ ناکرێت.. لە ولاتدا نیە، بەس ئەوەندە پێی بلێ لە بەینی خۆت و خودا تەوبە بکە، (إستغفرالله) بلێ خودایە لێم خۆشبە (وَتُوب اِلَيه)داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە..

(إنشاءالله) لە درێژەی ئەم باسە،کە ئایا لە ژنانیش کەس توشی ئەم حاڵەتە بووە؟ هەڵیدەگرم بۆ شەوی داهاتوو، بۆ دەرسی داهاتوو، تاشەوی داهاتوو بە خوداتان ئەسپێرم ..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ) .



# وانەی حەڤدەیەم



## بابەت

ئەی پێغەمبەری خودا،

زینام کردوە پاکم بکەوە..



## وانەی حەڤدەیەم

## ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ زینام کردووە پاکم بکەوە..

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى ، في سِياقِ الكَلامِ عَنْ فاحِشَةِ الزِّنى : ﴿وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَٰنِهَا مِنكُمْ فَـَٔاذُوهُمَا ۖ فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُوا۟ عَنْهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾ إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧﴾﴾ النِّساء .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ كَمَنْ لا ذَنْبَ لَهُ) ـ حَديثٌ حَسَن ، أَخْرَجَهُ إبْن ماجَّة : (٤٢٥٠) .

* جاءَتْ امْرَأَةٌ مِنْ غامِدٍ مِنَ الأَزْدِ ، فَقالَتْ : يا رَسُولَ اللهِ طَهِّرْني ، فَقالَ : وَيْحَك إرْجِعِي فاسْتَغْفِرِي اللهَ وَتُوبي إلَيْهِ ، فَقالَتْ : أَراكَ تُريدُ أَنْ تُرَدِّدَني كَما رَدَّدْتَ ماعِزَ بْنَ مالِكِ ، قالَ : وَما ذاكِ ؟ قالَتْ إنَّها حُبْلَى مِنَ الزِّنا فَقالَ : آنْتِ ؟ قالَتْ : نَعَمْ ، فَقالَ لَها : حَتَّى تَضَعِي ما في بَطْنِكِ ، قالَ : فَكَفَلَها رَجُلٌ مِنَ الأنْصارِ حَتَّى وَضَعَتْ ، فَأَتى النَّبِيَّ ﷺ فَقالَ : قَدْ وَضَعَتِ الغامِدِيَّةُ ، فَقالَ : إذاً لا نَرْجُمُها وَندَعَ وَلَدَها صَغيراً لَيْسَ لَهُ مَنْ يُرْضِعُهُ ، فَقامَ رَجُلٌ مِنَ الأنْصارِ ، فَقالَ : إلَيَّ رَضاعُهُ يا نَبِيَّ اللهِ ، فَرَجَمَها)... ـ رَواهُ البُخاري و مُسْلم .

* وَ في رِوايَةٍ : فَلَمَّا ولدتْ أَتَتْهُ بالصَّبِي في خرقة ، قالَتْ : هذا ولدتهُ ، قالَ : إذْهَبي فَأَرْضِعيهِ حَتَّى تفطميه ، فَلَمَّا فطمته ، أَتَتْهُ بالصَّبِي في يَدِهِ كَسْرَة خُبْزٍ ،

فَقالَتْ : هذا يا نَبِيَّ اللهِ قَدْ فطمته ، وَقَدْ أكَلَ الطَّعامَ ، فَدَفَعَ الصَّبِيُّ إلى رَجُلٍ مِنَ المُسْلِمِينَ ، ثُمَّ أمَرَ بِها ، فَحَفَرَ لَها إلى صَدْرِها ، وَ أمَرَ النّاس ، فَرَجَمُها ، فَأقبل خالدُ بن وَليد بِحَجَرٍ ، فَرَمَى رَأْسَها ، فَتَنَضَّحَ الدَّم عَلى وَجْهِهِ ، فَسَبَّها ، فَقالَ لَهُ النَبِيَّ ﷺ : (مَهْلاً يا خالِدْ ، فَوَ الَّذي نَفسي بِيَدِهِ ، لَقَدْ تابَتْ تَوْبَةً ، لَو تابَها صاحِبُ مكس لغفر لَهُ) .

* قالَ الأمام النَوَوي فِي شرح صَحيح مُسْلِم : (ج٦ ص ١٩٨ ط : دارُ الفَجر) :هذا دَليلٌ عَلى أنَّ الحَدَّ يكفر ذنب المعصيَةِ الَّتي حُدَّ لَها ، وَ قَدْ جاءَ ذالكَ صَريحاً فِي حَدِيْثِ عبادة بن صامت ، فِي قَوْلِهِ ﷺ (فَمَنْ فَعَلَ شَيْئاً مِنْ ذالكَ ، فعوقِبَ بِهِ فِي الدُّنيا ، فَهُوَ كَفّارَةٌ لَهُ) ـ رَواهُ البُخاري وَ مُسْلِم. وَ فيهِ دَليلٌ عَلى سقوط إثْم المعاصي الكَبائِر بالتَّوْبَةِ ، وَهِيَ بأجْماعِ المُسْلِمِينَ .

سەرچاوەكان :

١) نِداءات الرَّسُول ﷺ لِأصْحابِهِ ، محمد عبدالعاطي بحيري ، ج٢ ص٣١ .

٢) نَظْرَة النَّعيم ، ج٧ ، ص٢٧٣٠ ، ط : ٨ ، دارُ الوَسيلَة ، السعوديَّة .

٣) صَحيح فِقْهُ السُّنَة ، أبي مالِك كمال بن السَّيد سالم . ج٤ ، ص١١ ، ط : ١٢ ، المكتبَة التوفيقيَّة .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز: دانیشتنی ئەمشەویشمان بە فەزڵی خودای گەورە هەر لە مەجلیس و کۆڕی پێغەمبەری خودادا ﷺ دەبین، بە ناونیشانی ﴿ئەی پێغەمبەری خودا کێشە و گرفتم هەیە﴾ هاتوومەتە خزمەتت..

بابزانین ئەمشەو ئەو کەسەی کەوا موشکیلەیەکی گەورە ڕووی تێکردووە، ئەو کەسەی کە نازانێت پەنا بۆ کێ بەرێت غەیری خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ، بزانین ئەو کەسە کێیە؟ دانیشتنی ئەمشەومان باسی ئافرەتێکە، بەڵێ باسی ئافرەتێکە، ئافرەتێك کە ئافرەتی صەحابیە بووە، بە حورمەت و بەڕێز، بەڵام وەکو ئەوەی کەوا مرۆڤە، دوای ئەوەی کەوا هاوسەری ژیانی لە غەزایەکدا شەهید دەبێت و بە تەنها دەمێنێتەوە..

لە ئەنجامی تێکەڵ بووندا لە کۆمەڵگادا، پیاو و ژن هەمووی دەبینێت، لەگەڵ پیاوێکدا لە ئەنجامی تێڕوانین و نزیك بوونەوەدا، پەنا بەخودای گەورە توشی زینا دەبێت، جا زینا لە قورئاندا خودای گەورە قەت نەیفەرمووە زینا مەکەن، ئیلا دەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ...﴿٣٢﴾﴾ نزیکی مەکەوە، ئەگەر نزیکی کەوتی تازە مەحاڵە ڕزگار بوونی جا زینا بەریدی هەیە، موقەدیماتی هەیە، پێشەکی هەیە، وەکو لە شعرێکی عەرەبیدا زۆر جوان شاعیرێك ڕیزی کردووە و دەڵێت:

(نظرة ، فبتيسامة ، فسلام ، فكلام ، فموعد ، فلقاء)

یەکەمجار نەزرەیەکە، یەکەمجار ژن و پیاوێك تەماشای یەکتر دەکەن، کوڕ و کچێك تەماشای یەکتر دەکەن، نیگای چاوەکانیان تێکەڵ دەکەن، پاشان زەردەخەنە بەڕووی یەکتردا دەکەن، ئەمجا زیاتر ڕوویان دەکرێتەوە.. یەکەم جار ڕووی هات تەماشای بکات.

پاشان زەردەخەنەی بەڕوویدا دەکات، دواتر ئەو زەردەخەنەیە قسەی لێ پەیدا دەبێت، قسەیەك لەم قسەیەك لەو دەرگای گفتوگۆ لەنێوانیان دەکرێتەوە، ئالەو کاتەدا کە ژن و پیاوێك بە نامەحرەمی بەبێ کەسی سێهەم قسە بەیەکەوە دەکەن، شەیتان سێهەمیانە ! ! پاشان بەیەك گەشتن ڕوودەدات، ئەمجارە کە ئەوەندە قسەی لەگەڵدا دەکات دەڵێت با لە شوێنێك بتبینم، پاشان مەوعید و ئەمجا بەیەك گەشتن و زینا کردن ڕوودەدات..

## نزیکی زینا مەکەون..

چاوت لێیە لەپێنج قۆناغی یەکەمدا ئەمانە هەمووی بەریدە، ئەمانە هەمووی موقەدیمات و پێشەکین بۆ زینا، بۆیە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓ ﴿٣٢﴾﴾ نزیکی خراپەی زینا مەکەون.. نزیکی ئەو تاوانە گەورە نەکەون، یەکێکە لە گوناحە گەورەکان، بەڵێ ئەم ژنە لە ئەنجامی ئەم چاك و چۆنیەی لەگەڵ ئەم پیاوەدا، مەرحەبای بۆ دروست بوو، سەرەنجام بەیەك گەشتن و پاشان زینا ڕوودەدات..

کەس پێی نەزانیوە هیچ کەس ئەمەی نەزانیوە ئیلا (الله) نەبێت، بەڵام ئێمە دوێنێ شەو باسی کۆمەڵگەی مەدەنیمان کرد، لە کۆمەڵگەی مەدەنی دەوڵەتی مەدینەدا، ئەو کۆمەڵگایەی کاتێك تاك وایەروەردە کراوە بە پەروەردەی ئەم دینی ئیسلامە، هەڵەیەك دەکات، کاتێك قاچی دەخلیسکێت، بەبێ ئەوەی کەس موحاسەبەی بکات خۆی موحاسەبەی خۆی دەکات، کەئەمە لە هیچ شوێنێکی دونیادا نیە بەڕێزان..

ئەوەی کە ئەمڕۆ خەڵك باسی ئەم ئەوروپایەمان بۆ دەکات، وڵاتی ئەوروپا وایە و ئەمریکا وایە و فلاّن وڵاتە قانونیە، ئەوە بە زەبری هێزی کامێرای شاراوە قانونیە، ئەو کەسە کەقاچی بخلیسکێت بە حاڵ، حکومەت زەربەیەکی وای لێدەدات کە بە عومری خۆی جارێکی دیکە نەتوانێت کاری وا بکاتەوە، ئەها من زۆر جار گوێم لەو بەڕێزانە بووە کە دانیشتنم لەگەڵ کردوون، کە لێم پرسیون لەبارەی ئەورووپاوە وتویانە:

(یاخودا قاچت نەکەوێتە ناو قاڵبی ڕەشەوە) کاتێك لەو دەوڵەتەدا چەند جارێك موخالەفەت کرد، دزیەکت کرد، کرێی کەسێکت خوارد، ئیشت بۆ کەسێك کردووە فێڵت لێ کرد.. یەکەم جار ناوت دەچێتە لیستی ڕەشەوە، حکومەت سیقەت پێناکات، ئیتر هەرچیەك بکەیت تۆ لەژێر چاودێری حکومەت ڕزگارت نابێت..

دەڵێت فلان کەس ناوی چۆتە لیستی ڕەشەوە! بەڵام لە دەوڵەتی ئیسلامیدا لە ژێر سایەی پەروەدەی دەوڵەتەکەی مەدینەدا، تاك وا پەروەردە بوو بوو.. بەبێ ئەوەی موراقەبەی کامێرای شاراوەی کارەبا و پۆلیس و ئاسایشی لەسەر بێت، خۆی کە هەڵەی دەکرد دەچوویەوە بەردەم دادگا کە دەیوت: من هەڵەم کردووە، ئەم ئافرەتە کاتێك کە ئەم زینایە ڕوودەدات پەنا بە خودای پەروەردگار، یەکسەر پەشیمان بوویەوە.. ئەمجا زانی بەڕاستی خیانەتی کردووە، خیانەتی بە خۆی کردووە، بەدینەکەی کردووە، بە ئیمانەکەی کردووە، بە هاوسەرەکەی کردووە.. سنوری خودای شکاندووە..

## پاکم بکەوە ..

خودای گەورە دەفەرموێت: نزیکی زینا مەکەون. نزیکی کەوت و یەکسەر کەوتە ناویەوە، بۆیە هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: (یا رسول الله إني) ئەو ئافرەتە لەبەر چاوی ئەو هەموو صەحابەیە، ئافرەت زۆر کراوە بووە لە زەمانی پێغەمبەری خودا ﷺ، جیای نەکردەوە ئەی پێغەمبەری خودا ئیشی تایبەتم پێتە، لەبەر چاوی خەڵکدا بانگی دەکات ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ پاکم بکەوە..

پێغەمبەر یەکسەر فەرمووی: (ویحك إرجع فستغفر الله و تُب إليه) کچەکەم، خوشکەکەم هاوار بۆ تۆ دەنگت بەرز مەکەوە، بێ دەنگ بە، بڕۆ دوای لێخۆشبوون لە خودای پەروەردگار بکە، پەشیمان بەوە تۆبە بکە، هەر لێی ناپرسێت دوێنێ چۆن لە (ماعین)ی نەپرسی کەلەچی پاکت بکەمەوە، چیت کردووە؟!

لەسەری نەڕۆی، دەفەرمووێت برۆ لەبەینی خۆت و خودا تەوبە بکە و تەوبەیەکی ڕاست بکە ئافرەتەکە وتی: (أراكي تريد أن تردني كما ردت ماعز بن مالك) ئەو ئافرەتە بەڕێزە وتی وا دەزانم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ چۆن دوێنێ (ماعز)ت ڕەت کردەوە.. "چۆن لەوەو پێش کە دوێنێ شەو باسی (ماعز)مان کرد.." کە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕووت لێ وەرچەرخاند جوابت نەدایەوە دەتەوێت منیش ئاوا پاڵ پێوە بنێیت..

دەڵێیت برۆ! ئەم ئافرەتە ئاگای لێبووە دەنگ و باسی (ماعز)ی بیستووە، ئەوە پێغەمبەری خودا ﷺ سێ جار فەرمووی برۆ تۆبە بکە، برۆ تۆبە بکە لە بەینی خۆت و خودا داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگار بکە..

## سکەکەت دابنێ !

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من نامەوێت ئاوابم، من نامەوێت ڕەتم بکەیتەوە، دەمەوێت پاکم بکەیتەوە، من بووم من هەڵەیەکم پێدا هەڵپرژاوە.. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (وَ ما ذاك) لە چی پاکت بکەمەوە (قالت أنها حملة من زينا) وتی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من زینام کردووە.. سەرەڕای زیناکە حاملەشم بە زیناکە، منداڵەکە لە سکمدا دەجوڵێتەوە ! !

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (أنتِ) تۆ ئاوات لێ بەسەرهاتووە ؟ !

(قالت: نَعَم) ئەرەوەڵا پێغەمبەری خودا بۆیە دەڵێم پاکم بکەوە لە دونیا پێش ئەوەی بچمە قیامەت.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی دە مادام حاملە بوویت (حَتى تَظع ما فِي بَطنِك) هەتا ئەوەی لە سکتدایە تۆ ناتوانیت، تۆ لەبەر ئەوەی هاوسەرت هەبووە دەبێت ڕەجم بکرێیت، بەرد باران بکرێیت، هەتا لەژێر بەردەکاندا دەمریت.. لەبەر ئەوەی بە ئیعتیرافی خۆت زینات کردووە.. بەڵام ئێستا نابێت ئەم منداڵە کەلە سکتدا دەجوڵێتەوە بکوژرێت، لەبەر ڕێزی ئەم منداڵە برۆ هەتا ئەم منداڵەت لێدەبێتەوە بێرەدا مەیەرەوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ ڕەوانی کرد بۆ ئەوەی بڕوات، بەڵام وتی ئەی پێغەمبەری خودا من نە کەس و کارێکم هەیە، نە کەسێکم هەیە، تەنانەت لە ڕێگای ئەوەشەوە توش بووم، ئەم پیاوە ئیشی بۆ کردم بە حیساب یارمەتی دام.. لە ئەنجامدا توشی ئەوە بووم، فەرمووی بیبەنەوە ماڵیٚ هەتا منداڵەکەی دەبێت.

ئێستا لە وڵاتی ئێمەدا یەکێك بڵێت من زینام کردووە کەس هەیە بیباتە ماڵەوە؟! خۆ ئەگەر بیشیبات ئەم شار و شارۆچکەیە سەری دەگەڕێت، ئەو ژنە زینای کردووە، حامیلە بووە، قسەی هەموو مەجلیسێك دەبێتە ئەم هەواڵە، بەڵام لە دەوڵەتی مەدەنی پێغەمبەر ﷺ یەك کەس ئیلاقەی نەبوو، ئەوە دەوڵەتی مەدەنی و کۆمەڵگەی مەدەنیە..

ئەم باسە پەیوەندی نیە بە منەوە کە نەتوانم یارمەتی بدەم، بۆ چی باسی بکەم، خۆزگە ئێمە ئاوا لەو دینە بگەشتینایە، پیاوێك بە قەدر و حورمەتەوە ووتی:

کچی خۆم وەرە بابتبەمەوە ماڵەوە، وەك کچەکانی خۆم، بردی ژوورێکی دایە، جل و بەرگ و خۆراك خزمەتی کرد، ئافرەت بۆخۆی ئیسراحەت، مامانی بۆ پەیدا کرد هەتا منداڵەکەی لێبوویەوە.. هاتەوە ئەم نۆ مانگە ئەم ئافرەتە بیری نەچۆتەوە کە تاوانێکی لەسەرە پێویستی بە پاك بوونەوە هەیە.. بۆیە هاتەوە وتی:

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئائەوە کۆرپەکەمە، منداڵەکەی بە باوەشەوە بوو..

## دوو ساڵ شیر بدەرە منداڵەکەت ..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إذهَبى فأرضِعيهِ حتَّى تفطميه) برۆ ئەمجارەش ئێستا تۆ نابێت ڕەجم بکرێیت، نابێت ژیان لەدەست بدەیت، چونکە تۆ ئێستا دایکی منداڵی، برۆ شیر بدە بەم منداڵە هەتا دەبێتە دوو ساڵ، تا خۆراك دەخوات، ئیتر ئەو کاتە وەرەوە، بۆ ئەوەی ئەم ئافرەتە بڕوات و جارێکی دیکە نەیەتەوە..

ئەمجارەیان وتی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمجارەیان لە پەنای کێدابم، ئەم کابرایە ماڵی ئاوا بێت نۆ مانگە من لە ماڵی ئەودام، خزمەتی کردووم، خۆ ئێستاش ڕیگری ناکەم بەلاّم نامەوێت هیچی تر ئەرك بخەمە سەر ئەو..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەم جارە کێ ئەم ئافرەتە دەگرێتە خۆی بە منداڵێکی ساواوە؟ پیاوێك وتی: من لە خزمەتتدام ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، من دەیبەمەوە ماڵی خۆم لەگەڵ کچەکانی خۆم، لەگەڵ خوشکەکانی خۆم بەخێوی دەکەم، دوو دانە ساڵ ئەم منداڵەی لە باوەش گرت، شیری دایە جا..

دەفەرموویێت: هەموو شەوان ئەم ئافرەتە کە منداڵەکەی گاگۆڵکێی دەکرد و پێدەکەنی، دەفەرموویێت بە فرمێسك خودا حافیزی لە منداڵەکەی دەکرد، زۆر غەریبە!! دەیوت من و تۆ مەوعیدمان نزیك بۆتەوە بۆ جیابوونەوە کوڕی خۆم، منداڵەکەی کوڕبوو، دەبێت بەجێت بهێڵم لەبەر ئەوەی من نامەوێت بە ڕووی ڕەشەوە بچمەوە لیقای خودا، من سنوری خودام شکاند..خودا دەفەرموویێت: نزیکی زینا مەکەون.. یەك ئایەتی قورئانم شکاند یەك ئایەتی قورئان!! هی واهەیە ڕۆژی سەد ئایەتی قورئان دەشکێنێت بە خەیاڵیدا نایەت، لە تەسکەرەکەشی نوسراوە موسلیم، ئەم ژنە یەك ئایەتی قورئانی شکاند.. نایەوێت بەم تاوانەوە بچێتەوە دیوانی خودا، خۆی تەسلیم بەدادگای پێغەمبەری خودا ﷺ کردووە، دادگای پڕ لە عەدالەتی خودای گەورە، منداڵەکەی لە باوەش دەگرێت و بە فرمێسکی چاوی دەم و چاوی منداڵەکەی شت!!

ئەمجارە دەفەرموویێت: هێنایەوە ئەگەر نەشهاتایەتەوە پێغەمبەر ﷺ نەیدەنارد بەدوایدا، بەڵکو لەبیری بەرێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر تۆبە بکە لە بەینی خۆت و خودادا، بەلاّم دەڵێت نا، سزاکەم وەربگرم لەم دونیایەدا، من نامەوێت بچمەوە لیقای خودا بە تاوان باریەوە، دەبێت عقوبەی جەستەی وەربگرێت، هاتەوە و پارچە نانێك، کولێرەیەك بە دەستی منداڵەکەیەوە بوو..

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لە شیر براوەتەوە و ئەوەش ئەو کولێرەیە بە دەستیەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی کێ ئەم منداڵە دەباتەوە لای خۆی؟ پیاوێك وتی ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا من منداڵم نیە حەیف نیە کوڕیەیەکی جوانی ئاوا بۆ من نەبێت، من وەکو ئەولادی خۆم بەخێوی دەکەم..

سەیری بکە ئەگەر یەکێك لە ئێمە بێت، ئەم منداڵە کەس نەیدەویست، ئەیان وت ئەم منداڵە دایکی زینای کردووە (نَعوذُ بِالله) ئەمە منداڵی (زۆڵە)! کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵگایەکی مەدەنیە، ئەم منداڵە هیچ تاوانی نیە، بەڵکو دایکەکەشی قارەمانێکە هەڵەی کردووە کەس نەیزانیووە.. خۆ دەیتوانی منداڵەکە لەبار بەرێت، فڕێی بدات، بەڵام ئەم قەتڵەشی نەکرد..

من حەزدەکەم لێردا ئاماژە بە بابەتێکی فیقهی بکەم، دەڵێن: ئەگەر کۆمەڵگا وەکو کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ بەڕەحم و بەزەیی بوو، کەسێك هەبوو ئەم منداڵە بگرێتە ئەستۆ، کەس لەم تومەتە نەیدەگوت دایکت زینای کردووە، ئەی زۆڵی کوڕی زۆڵ!! ئاوای پێدەگوترا، کۆمەڵگاکە وەکو کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ پەروەردەکراوێکی ئیمانی بوو.. حەرامە ئافرەتێك کە حامیلە بووە بە زینا، منداڵەکەی لەباربەرێت، نابێت.. وەکو زینای کردووە قەتڵیش بکات. بەڵام کۆمەڵگاکە وەکو ئەمڕۆ کۆمەڵگەیەکی بێ بەزەی و ڕەحم بوایە، لەگەڵ ڕێزم بۆ جەنابتان، کۆمەڵگایەك بوو ئەم منداڵە هەتا دەمرد چاو شۆڕ دەبوو، هەموو ڕۆژێك بە چاویان دەدایەوە.. کەس نەبوو لە خۆی بگرێت، لەو حاڵەتانەدا ئەگەر خوانەکردە کچێك یان ژنێك توشی ئەو حاڵەتە بوو، بەبێ دەنگتعی لە سەرەتای حەملەکەوە دروستە لەناو ببرێت..

بۆ ئەوەی ئەمە پەردە پۆش بکرێت، بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵگا بێ ڕەحمە ئەم ژن و منداڵە نەچەوسێننەوە.. چونکە باش لەدین حاڵی نەبوون چونکە لە دینی پێغەمبەر ﷺ دا چەوساندنەوەی کەسی تێدا نەبوو، پیاوێك منداڵەکەی لە باوەش گرت و بردیەوە بۆ خێزانەکەی و ئافرەتەکە تەسلیم بە دادگای شەرعی بوو..

## تەوبەکەی زۆر گەورە بوو !!

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی چاڵێکی بۆ هەڵبکەنن.. وەکو بیرێك هەتا لای سنگی قوڵ بێت، بۆ ئەوەی ئافرەتەکە نەوەکو جل و بەرگەکەی لێببێتەوە، لە کاتی ڕەجم کردندا ژن لەگەڵ پیاودا فەرقی هەیە، چاڵەکەیان هەڵکەند و خستیانەناو چاڵەکەوە، ئیتر دەستکرا بە بەرد پیادانی، لەو کاتەدا بەردێك بەر سەی کەوت و فیچقەی خوێنی کرد و بەر (خالیدی کوڕی وەلید) کەوت.. (خالید) وتی: خودای گەورە نازانم چیت لێبکات ئەوەتانێ جلەکانیشمان لە نوێژ چوو بە هۆی تۆوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ توڕە بوو فەرمووی: (مهلا یا خالد) بێ دەنگ بە ئەی (خالید) بێ دەنگ بە، (فَوَ الَّذي نَفسي بِيَدِهِ) قەسەم بەو (الله)ی کە نەفسی (محمد) ی بەدەستە (لقد تابت توبة) ئەم ژنە یەك تەوبەی ڕاستەقینەی کردووە، ئەمە دوو دانەساڵە بە تاوانەوە دەتلێتەوە، دوو ساڵە یەك لەحزە خودای خۆی و قیامەتی لەبیر نەچووە.. سزای دۆزەخی لە بیر نەچووە، تەوبەیەکی ئەوەندە ڕاستەقینەی کردووە:

(لَو تابَها صاحِبٌ مكس لغفر لَهُ) ئەگەر یەکێك هەرچی گوناحی گەورە هەیە کردوویەتی تۆبەی ئەم ئافرەتەی بدەنێ، خودای گەورە لەویش خۆش دەبێت!!

خودا نەك لەم ئافرەتە، لە گوناحکارە گەورەکانیش خۆش دەبێت، بەبۆنەی ئەمەوە، ئەمجا دەفەرموویت لە ژێر بەردەکاندا دەری بهێنن.. پاك بیشۆن ڕایکێشا و نوێژی جەنازەی لەسەر کرد..

پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر بۆی پاڕایەوە، هەر کەسێك لە ژیانیدا بە ئیمانداری مردبێت و پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەنازەی بۆ بکات خودا لە تەواوی گوناحەکانی خۆش دەبێت. سزای قەبر نابینێت.. بەر شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت! پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەنازەی لەسەر ئەو ئافرەتە کرد..

ئەمڕۆ ئافرەت هەبووە بە ناڕەوا کەبە فیشەك کوژراوە خەڵکێك نەبووە بچێت نوێژی لەسەر بکات، وتویانە فڕێی بدەن با سەگ بیخوات، بەڵام ئەمە دیسان بیّ دینیەکە کە دینی پێغەمبەر ﷺ بەمە ڕازی نیە.. ئەوە مادام ئیمامی نەوەوی ڕەحمەتی خودای لێبێت دەفەرموویێت: هەر کەسێك لە دونیادا حەدی شەرعی لێبدرێت، لە زینا بێت، لەهەر شتێك بێت پاك دەبێتەوە..

ئەگەر بۆ ئەمڕۆی ئێمە ئەم وتارانە بڵاو دەبێتەوە، زۆر کەس دەیبیستێت خەڵك هەیە توشی زینا بووە، واقعەن توش بووە، ئەی ئەو کەسەی گوێت لەم وتارە دەبێت. لەبەینی خۆت و خودا ئەگەر لە هەر شوێنێکی دونیا بیت، ئەگەر زینات کرد بۆ کەسی باس مەکە، ئەم وتارەت بەس بێت.. قسەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە کە لێمان پرسی وەکو عولەمایەکی ئیسلام پێت دەڵێین: (استغفر الله وَ تُب إليه) ئەگەر ئافرەتی داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە، بڵێ خودایە لێم خۆشبە بۆ کەسی مەگێڕەوە، (إنشاء الله) خودا لێت خۆش دەبێت..

ئەگەر کوڕیشی هەر وەکو تەوبەکەی (ماعز) پێغەمبەری خودا ﷺ هەر ئەوەی نیشاندا، بڕۆ داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە و تەوبە بکە و لە ژیانتدا بۆ کەسی مەگێڕەوە، بەینی خۆت و خودا پەردە پۆشی بکە.. چونکە دادگای پێغەمبەر ﷺ نیە و بچیتە بەردەمی و حەدە شەرعیەکەت لێبدات، بەس تەوبەبکە، بەشەرتێك نەچیتەوە سەری خودا لە تەواوی ئەو گوناحەت خۆش دەبێت، زانیوتە تەوبەت کردووە، نایکەیت بە داوێن پیسی، نایکەیت بە لەش فرۆشی، نابیت بە فاحیشەکەر نایکەیت بە پیشە.. نا بێت خەڵك فێر بکەیت، بڵێیت خەڵکینە من وامکرد، خەڵکینە وەرن فێر ببن.. مادام هەست دەکەیت تاوان باریت، تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکە، خودا لە گوناحەکەت خۆش دەبێت.. یەك پەڕەی سپیت بۆ هەڵدەداتەوە..

ئەوە وەڵام بێت (إنشاء الله) بۆ ئەو کەسانەی کە قاچیان خلیسکاوە، بە تایبەت بەڕێزان ئەمڕۆ سەردەمی فیتنەیە، وەڵاهی شتی وا دەبیستیت بڕوابکەن ئینسان تەوەقوع

ناکات.. تۆ بڵێیت ئەم کۆمەڵگایە گەشتبێتە ئەم حەدە، ئێوە سەیری خۆتان مەکەن کە ئێوە ئەهلی جەماعەتن برایان ئەمە فەزڵی مزگەوتە، خوشکانی بەڕێز ئەوە بەرەکەتی مزگەوتە، (الحمد لله) ئێوە بە پاکی ماونەتەوە..

## ویستی خیانەت لەهاوەڵزاواکەی بکات !!

وەڵاهی ڕووداوێك لەم ڕەمەزانەدا ڕوویداوە من بۆ دەرس وەرگرتن بۆ جەنابتانی باس دەکەم، کاکە کەسێك پرسی وتی من حاڵێکی ئاوا ڕوویداوە:

کابرایەك لە شوێنێك دوور بووە. لە شارێکی تر بووە، ئاوەڵ زاواکەی پێی وتووە، ئاوەڵ زاوا یەعنی ژنەکانیان خوشکن، یەعنی ژن خوشکەکەت وەکو خوشکت وایە، وتوویەتی برا بۆ نایەیت خانووەکەت بفرۆشیت، وەرە لە پاڵ ماڵ ئێمە خانوویەك دەفرۆشن بۆنایەیت ئەم خانووە بکڕیت، ئێمە خێزانەکانمان خوشکن، تێکەڵاو دەبین بەیەکەوە، وریای منداڵی یەکتر دەبین، من لە دەوام دەبم تۆ لە ماڵ نابیت هەردوولامان بۆ خۆمان خۆشترە.. کابرا بە دڵ سافیەوە وتوویەتی:

جا وەڵا زۆر چاکە پێم خۆشە، خانووەکەی فرۆشتووە هێناویەتیە پاڵ ئەو، ئەم پیاوە وتی: دواتر خێزانەکەم دوو سێ جار پێی وتم هەرچەندە مێردی خوشکمە، بەس وەڵاهی بۆ ڕەفاقەت نابێت، تۆزێك خۆت دوورە پەرێز بگرە.. ئیتر جا وتوویەتی لەسەر چی؟ خۆ ئەو پیاوە هیچ عەیبی نیە، بەڕێزە یارمەتیمان دەدات، زۆرجار ئینجا مێردی خوشکەکەتە، ئیتر خێزانەکەی وەکو خوشکی من وایە کە ژن خوشکن.

دەڵێت: سێ چوار جار ژنەکەی پێی وتووە پیاوەکە خۆت لەم پیاوە بپارێزە..

وتوویەتی: ئاخر وەڵاهی ناچارم من دڵم کرمێ بوو لەم قسانەی تۆ.. وتی: سەیری ئەو موبایلە بکە، ئەم موبایلەی ئێمەش هەموو عایلەمان تێکەڵاوە..

پێی وتووە: بەهەر هۆکارێك بێت خۆت بە تەڵاق بدە، دواتر من مارەت دەکەم، من لەسەرەتاوە حەزم لە تۆ بوو، لە ماڵی باوکت نەك لە خوشکەکەت!!

سەیری ئەم غیرەتە، کابرا ژن خوشك عایلە تێکەڵاو بێت، بە موبایل نامە بنوسێت، جا ئەم موبایلە بۆتە بەلاَ بۆ زۆر ماڵ، ئێمە هەرچی سەیر دەکەیت پێنج شەش موبایلمان پێیە، نە کۆمپانیات هەیە نە شەریکەت هەیە، نە هیچ بەس هەر مەسرەفێکی بەلاش، یەعنی بەڕاستی خۆ ئەمە دڵ پیسی نیە، بەلاَم گورگێکی ئاوا لە عایلە پەیدا دەبێت!!

پێی وتووە خۆت بە تەلاَقدان بدە دوایی منیش ژنەکەم تەلاَق دەدەم و تۆ مارە دەکەم، مێردەکەشت ژنەکەی من با مارە بکاتەوە!! شەیتان بیر لەشتی وا ناکاتەوە..

دەڵێت: کابرایەکی شاعیر هەبوو وتی یەکەمجار کەدەمویست گوناحبار ببم و بێشەرعی بکەم و ڕوو لە بێ دینی بکەم، شەیتان مامۆستام بوو (فَلَما طالَ بي عُمرٌ صار إبليسُ مِن جُندي) بەلاَم ئێستا ئەوەندە چوومە ناخی گوناحەوە، ئەوەندەم بێ شەرعی کردووە من بوومەتە مامۆستای شەیتان، دەبێت شەیتان بێت من دەرسی پێ بڵێم، یەکەمجار شەیتان مامۆستام بوو، بەلاَم من ئێستە خەبیرم ئەوەندە گوناحم کردووە، شەیتان دەرسم لێوەردەگرێت..

لەبەر ئەوە دەبێت زۆر ئاگامان لە خۆمان بێت، کاتێك شەریعەتی خودای پەروەردگار شتێك قەدەغە دەکات، خەڵك نەڵێت ئەم ئیسلامە دینتان لە خەڵك قورس کردووە.. ئەها لە شەرعدا دەفەرموێت: ژن خوشك دەست نوێژی لێت دەشکێت.. چونکە یەك میکرۆبی ئاوا هەبێت لە کۆمەڵگادا، دەبێت دەرگای لێ دابخەیت، ڕاستە تۆ دڵت پاکە، ئەو دڵی پاکە، ئەو دڵی پاکە تۆ دەڵێیت ژن خوشکەکەم وەکو خوشکم وایە، دەستی بە دەستم بکەوێت وادەزانم خوشکمە، بەلاَم گورگی ئاوا هەبێت ئیسلام دەرگای لەسەر دادەخات.. با بەهۆی دڵپاکی ئەو جەمعەوە ئەم گورگە نەچێت دەست بخاتە دەستی ئەو ژن خوشکەیەوە، بە خودا دەستی بخاتە دەستیەوە پەلاماریشی دەدات، سەیری بکەن بەڕێزان ئەمە کۆمەڵگایە، ئیسلام چی فەرمووە، دەفەرموێت:

نەزەڕ مەکەن، مەعنای ئەوە نیە جوانیەکانی لە تۆ حەرام کردووە، تۆ حەلاَڵی خۆت هەیە بەلاَم نەزەڕ لەشەرەفی خەڵك مەکە.. دەفەرموێت:

هەر کەسێك تەوقە بکات یەك ئاسن بە پیکێك بەسەرتدا دابکوتن کە چەند ناڕەحەتە، سەرت لەت بکەن هێشتا ئەوە باشترە بۆ ئەو کەسەی دەستی دەخاتە ناو دەستی ئافرەتێکی نامەحرەم! جا نامەحرەم ژن خوشك نامەحرەمە، بەڕێزان براژن نامەحرەمە، ئامۆژن خالۆژن هەموویان نامەحرەمن، پوری ژنەکەت نامەحرەمە، خەڵك ئەم حەقیقەتانە زۆر باش نازانێت.. بەڕێزان ئەمانە هەمووی نامەحرەمن، ژنی براکەت نامەحرەمە، ژنی ژن براکەت نامەحرەمە بە تۆ، با توش نەبیت..

بەڵام کاتێکیش لە کۆمەڵگا کەسێك توش بوو بەشەرتێك گەڕایەوە بۆ بارەگای پەروەردگار، خودا بەڕەحمەتی خۆی لێی خۆش دەبێت، ئیسلام بەبەهانە نیە لەبەر ئەوەی هەر زمانی ترازا، وتی: زینام کردووە.. بڵێیت: تازە تەواو، لێت خۆش نابین.

## ئەی ئیمامی عەلی زینام کردوە !

ئیمامی (علی) کاتێك ئافرەتێك دێت بۆلای دەڵێت ئەی ئیمام زینام کردووە، ئیمامی (علی) فەرمووی: لەوە دەچێت لەگەڵ کەسێکدا خەوتبیت، یان ڕاکشابیت، تۆ لە کاتی خەوتندا ئەم کارەی لەگەڵتدا کردبێت، یان تۆ ئاگات لە خۆت نەبوو بێت..

دەڵێت: نەخێر، دەفەرموێت: لەوە دەچێت بە زۆر بوو بێت..

دەڵێت: نەخێر بە ئارەزووی خۆم بوو..

دەفەرموێت: (لعلك غضبتِ على نفسك) ئەی خوشکەکەم، کچی خۆم لەوە دەچێت ڕقت لە خۆت بێت، بوختان بۆ خۆت بکەیت، بۆ ئەوەی لە ناو بچیت..

دەڵێت: نەوەڵا ڕقیشم لە خۆم نیە، بەڵام حامیلەم، ئەوەتا سکەکەم!! من کچیشم شووم نەکردووە..

ئیمامی (علی) دەفەرموێت: لەبەر ئەوەی کچیت شووت نەکردووە دەبێت داری حەدت لێبدرێت، داری حەد ئەوەیە ئافرەتەکە لەسەر مێزێك ڕادەکێشن، دەبێت ئانیشکی ئەو حاکمە لەسەر و مێزەکەش بێت، پەردەیەکی بەسەردا دراوە، دەبێت دارەکە زۆر

ئەستور نەبێت و زۆریش باریك نەبێت، دارێك بێت ناوەندی بێت.. سەد جار دارەکە لەپشتی دەدات، ئەگەر لە ژێر ئەو دارەدا مرد ئەوە پاك بۆتەوە..

ئەگەر لەژێر ئەو دارەدا نەمرد چاك بوویەوە، عەیبی نەبوو، پاك بۆتەوە و کەسیش بۆی نیە بڵێت زینا کەریت، هەر کەسێك پێی بڵێت زینا کەریت عقوبە دەدرێت، ئیتر تەواو سزاکەی تەواو بوو.. زۆر کەمیش لە ژێر ئەو دارەدا دەمرن، بە هێزێك لێت نادرێت، ئاوا لێی دەدرێت ئەمە بۆ ئەوەی خەڵك فێری داوێن پیسی نەبێت، بۆ ئەوەی ئایدز لە ناو کۆمەڵگادا بڵاو نەبێتەوە..

یەك خاڵی گەورە هەیە هەر کەسێك لە دوێنێ شەو دەرسی ئەمشەودا ئەو فیکرەیەی بۆ چوو بێت کە خاڵێکی زۆر گرنگ هەیە لە (ماعز) و ئەم ئافرەتە غامیدیەدا کە پێغەمبەری خودا ﷺ لەوەی پەردە پۆشی کردووە ؟

بەڕێزان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ نە بە (ماعز) دەڵێت لەگەڵ کام ژنە زینات کردووە، نەبەم ئافرەتە دەڵێت لەگەڵ کام پیاوە زینات کردووە، لێیان ناپرسێت! ! مادام باسی نەکردووە با یەك کەس کەمتر بێتەوە، ناڵێت دە تو خودا فلانە کەسیشم بۆ بهێنە دەبزانم کێ وای لێکردیت، یان تۆ لەگەڵ کێ زینات کردووە..

نەخێر پێغەمبەر ﷺ بەدوای گوناحی خەڵکدا ناڕوات، خۆی دەنگ ناکات با ئەویش تێوە نەگلێت، بائەو بەڵکو بیبیستێتەوە و لەبەینی خۆی و خودا تەوبە بکات، با ئەم تەسلیم بەدادگای شەرعی نەبێت، ئەوە ئەو دەرسەیە خودا پێی خۆشە خەڵك تەسلیم بە دادگا نەبێت لەبەینی خۆی و خودادا تەوبە بکات.. ئومێدەوارم کە (إنشاء الله) خوای پەروەردگار لە گوناحی هەموو لایەکمان خۆش بێت.. بە لوتفی خۆی لێمان خۆش بێت..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ) .






بابەت

ئافرەت ئازادە

لە هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانی..



## وانەی هەژدەیەم

## ئافرەت ئازادە لە هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانی

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْاْ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ ۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾﴾ البقرة .

* هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە :

یەکێك لە هاوەڵان خوشکەکەی دابوو بە ئیمانداریێك ، دوای ماوەیەك تەڵاقی دا، دوای چەند مانگێك هاتەوە و خوازبێنی لێکردەوە ، برای ئافرەتەکە ووتی : بە خوا شتی وانابێت ، من پێشتر ڕیچزم لێگرتی و خوشکەکەم کردە هاوسەرت کەچی تەڵاقت دا ، ئێستاش هاتوویت دووبارە خوازبێنی دەکەیت ؟! برای ژنەکە دەڵێ بە مەرجێ کابرا کەسێکی خراپ نەبوو خوشکیشم حەزی دەکرد بگەڕێتەوە لای جا کە ئەو ئایەتە نازڵبوو ووتم : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێستا ئیتر قسەم نەماوە ، لێم مارە کردەوە ... ـ تەفسیری ڕۆشن ، ل٥٨ .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (الثَّيْبُ أَحَقُّ بِنَفْسِها مِنْ وَلِيِّها ، والبِكْرُ تستأمر ، وَ إِذْنُها سكوتُها) ـ رَواهُ مُسْلِم .

* (عَنْ خَنْساءَ بِنْتِ خِدَّامٍ الأَنْصارِيَّة ، أَنَّ أَباها زَوَّجَها وَ هِيَ ثَيِّبٌ فَكَرِهَتْ ذالِكَ ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ . فَرَدَّ نِكاحَهُ) ـ رَواهُ البُخارِيُّ : (٥١٣٨) .

* (وَ جاءَتْ جارِيَةٌ بِكْرٌ إِلى النَبِيِّ ﷺ فَذَكَرَتْ أَنَّ أَباها زَوَّجَها وَ هِيَ كارِهَةٌ ، فَخَيَّرَها النَبِيُّ ﷺ) ـ رَواهُ إِبْنُ ماجَّة : (١٨٧٥) ، وَ صَحَّحَهُ الألْباني في (صَحيح ابنُ ماجَّة : (١٥٢٠) .

## سەرچاوەکان :

١) تەفسیری ڕۆشن ، نوسینی : بورهان محمد أمین ، پێداچوونەوەی : سید أحمد عبدالوهاب ، چاپی دووەم ، ٢٠١٢ ، کتێبخانەی سارا .
٢) الزَّواج في القُرآنِ وَ السُّنَةِ الصَّحيحة ، محمد ملا فائق الشهرزوري ، ص١١ ،ط : ١ ، ٢٠١١ .
٣) التّاج الجامِع لِلأُصُول ، منصور علي ناصِف ، و : نوری فارس ، ب٢ ، ل٤٨٣ ، چاپی چوارەم ، ٢٠٠٨ ، بیروت ، لبنان .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

برایانی مسوڵمان خوشکانی بەڕێز: هەر کەسێك کە گوێ بیستی ئەم وتارە دەبێت یان دوایی دەیبینێت، با بە هەموومان لە خزمەت پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ بە دڵ و بە گیان، دیاری بنێرین بۆ ڕۆحی ئەو سەروەرەمان و بڵێین:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

ئیماندارانی بەڕێز: دانیشتنی ئەمشەویشمان لە زنجیرە باسی ﴿ئەی پێغەمبەری خۆشەویست و سەردار و سەروەر کێشە و گرفتێکم هەیە﴾ بابچینەوە شارە پیرۆزەکەی مەدینە، خودای گەورە بە نسیبمان بکات (إنشاء الله) خودا بە نسیبمان بکات ڕۆژێك نوێژ بکەین لەو شوێنەدا، کە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی:

(ما بَينَ بَيتي وَ منبَري رَوضَةٌ مِن رياضِ الجَنَّة) لەبەینی ئەو میمبەرەی وتاری لەسەر دەخوێنێتەوە، حالیەن ئێستا ئەو میمبەرە لە شوێنی میمبەرەکەی پێغەمبەرە ﷺ لەگەڵ ئەو ژوورەی کە پێغەمبەری خودای تێدا نێژراوە لەو بەینەدا ئەوە باخێکە لە باخەکانی بەهەشتە، هەر کەسێك بچێتە ئەو شوێنە وابزانێت ڕێك لەناو بەهەشتدا دانیشتووە، خودای گەورە بە نسیبمان بکات..

## بەزۆر بەشوودان مارەیی نایەت... سێ نمونە:

## ١- ئەی پێغەمبەرﷺ بەزۆر بەشوو دراوم ..

ئا لەو شوێنەدا پێغەمبەری خودا ﷺ دانیشتووە، ئافرەتێك ئەم ئافرەتە کچێکە، کچێك تەمەنی تەقریبەن هەژدە ساڵ، بیست ساڵ، ئافرەتێکی بە حەیا و حورمەت دێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەمشەو ئەم خوشکە موشکیلەی هەیە، هاتووە دڵ ناڕەحەتە و غەمباری بە سیمای ڕێك و پێك و جوانیەوە دیارە، دێت و دەڵێت:

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من موشکیلە و گرفتێکم هەیە، هاتوومەتە خزمەتت بەڵکو بەهانامەوە بێیت، بەڵکو ڕزگارم بکەیت..

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت بڵێ کچەکەم، بڵێ چ موشکیلەیەکت هەیە؟

دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا گرفتەکەی من ئەوەیە، من باوکم هەیە، زۆر ڕێزی باوکم دەگرم، زۆر باوکم خۆشدەوێت.. بەڵام ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ وەڵاهی باوکم بەبێ ئەوەی پرسم پێ بکات، بەبێ ئەوەی کەوا پرسیار و ڕاوێژی من وەربگرێت، بەبێ ئەوەی بزانێت من حەزم پێیەتی یان نا.. هەر لە خۆیەوە کوڕی کابرایەکی برادەری دۆزیوەتەوە، وەختێك هات و منی لێ مارەکرد و کۆتایان بە هەموو شتێك هێنا و شەکراویان خواردەوە..

بەڵام ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، بەڕاستی من نامەوێت شوو بەو کوڕە بکەم.. بەڕاستی من پێشتر کوڕە مامێکم خوازبێنی کردبووم، کچەکە ئەمەش دەڵێت:

(من پێشتریش کوڕە مامێکم ئامۆزایەکم خوازبێنی کردبووم بەڵام وەختێکم زانی باوکم وتی من تۆم لەو کوڕە مارە کردووە) ئێستا من ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ چی بکەم؟ سەیری بکە ئەوەندە دەڵێت: (من کوڕە مامێکیشم داوای کردووم)

ناڵێت حەزم لێی بووە، بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تێدەگات، بزانین پێغەمبەری خودا ﷺ چی دەفەرموویت؟

ئەمە ئەم زەمەنە ئیسلام ئافرەتی ڕزگار کرد، چونکە ئالەوەو پێش ئەو کابرا هەرچەندە مسوڵمان بوو.. بەڵام وا ڕاهاتبوو، عورفی پێش ئیسلام وا ڕاهاتبوو، کچ پرسی

پێنەدەکرا لە شوو کردندا، دەیگوت پرسی چی؟! موهیم ئەوەیە باوك کوڕەکەی بە دڵ بێت، من خۆم پیاوی پیاوانە دەناسم، من خۆم دەزانم کچەکەم قابیلی کێیە؟ یەعنی ئەم باوکە هەرچەندە صەحابە بوو، هەر چەندە مسوڵمان بوو، لە خزمەت پێغەمبەردا بووﷺ، بەس عورفی کۆمەڵگا بەرێزان زۆر موشکیلەیە، ئەوەندەی باب و باپیرانی خواردوویەتیەوە خواردوویەتیەوە هاتووە لێی بۆتە دەستور، بۆتە دین، تەنانەت مسوڵمانیشە لە خزمەت پێغەمبەردایە ﷺ ئەم نەریتەی پێش زەمانی ئیسلامەتی بەرنەداوە، هەر پرسیشی بە کچەکەی نەکردووە، لەو کابرایەی مارە کردووە..

بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ ڕزگارکەری ئافرەتان، ئەوەی کە دەڵێت ئیسلام ئافرەتی چەوساندۆتەوە خۆزگە بێت ئاوا لە ئیسلام بگات، ئەوە ئیسلام ئافرەتی ئازاد کرد. فەرمووی: کچەکەم ڕازی ببە تازە قەدەری خودایە؟ قەزا و قەدەر بووە باوکت مارەی کردوویت! با موشکیلەی لێ پەیدا نەبێت، وازبهێنە!

نەخێر.. فەرمووی: (لا نكاح لَهُ) مارەیت لەو کوڕە نەهاتووە، کە تۆ پێی ڕازی نیت، مارەییت لەو کوڕە نەهاتووە (فَنكَحِ مِن شِئتِ) خۆت کچەکەم حەزت لە کێیە شوو بەوە بکە، شوو بە ئامۆزاکەت دەکەیت، بە بێگانەیەك دەکەیت، بەدڵی خۆت هاوسەری ژیانی خۆت هەڵبژێرە، ئیتر بانگی باوکی کچەکەی کرد و بانگی کوڕەکەشی کرد، لەوێدا پێیان تەڵاق دایەوە.. کچەکە ئازاد بوو، دواتر شووی بە کوڕە مامەکەی کرد.

ئەمە ئیسلام بوو ئەو نەریتەی شکاند، کەس مافی هاوسەری بۆ کەسی تر نیە، بەداخەوە ئێمەی ئومەتی ئیسلام دوای (١٤٠٠) ساڵ ئەو ڕووداوانە هێشتا لە مێژوودان، هەرچەندە ئێستا کەم بووەتەوە، بەڵام هێشتا ئاسەواری ئەو برینانە بەجەستەی کۆمەڵگای کوردیەوە دیارە، ئێستاش ژنی واهەیە دەڵێت: تا ئەم لەحزەیەش منداڵی هەیە، لەگەڵ مێردەکەیدا ڕێك و پێك نیە، چونکە کاتی خۆی بە دڵی خۆی شووی پێنەکردووە.. بە زۆر داویانەتێ، هەر پرسی پێنەکراوە..

ژن بە ژنی پێکراوە، لە خوێندا دراوە، سوڵحی پێکراوە.. کە ئەمانە لە دینی ئیسلامدا نین، جا ئەمە نابێت.

## ٢- باوکم بە زۆر بەشوویدام :

با گوێ بۆ ئەم فەرموودەیە بگرین بۆ (خنسای إبنَتُ خردامە) کە دەڵێت:

بۆ خۆی ئەم کچە دەگێڕێتەوە دەڵێت: کچ بووم و باوکم بە شووی دام و منیش پێم ناخۆشبوو، بۆیە چوومە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا بەڕاستی من ناڕازیم بەو فلان کەسە باوکم هەروەکو زەمانی عەرەبی جاهیلی منی مارەکردوو، مەجلیسی گرتەوە و ئیتر بەڕاستی من پێی ناڕازیم بەو مارەکردنە.. پێغەمبەری خودا ﷺ بانگی کچەکەی کرد بانگی باوکی (خەنسا)ی کرد و فەرمووی: (لاتنکحا وهي كارهة)، ئەگەرکچەکەت بە دڵی خۆی ڕازی نەبێت، ئەو ژن مارە بڕینەت دروست نیە، ئەوە بەتاڵە، هەڵوەشاوەتەوە..

## ٣- مارەییت لەو خزمەت نایەت ..

حەدیسی سێهەم: لە خزمەت فەرموودەیەکدا دەبین، ئافرەتێکی خەڵکی مەدینەی ئەنصاری ژنی پیاوێکی ئەنصاری بوو، مێردەکەی لە ڕۆژی (ئوحود)دا شەهید کرا.. ئەم ئافرەتە دوای عیدەی وەفاتی مێردەکەی چوار مانگ و دە ڕۆژ، هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتی:

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هاوسەری ژیانم لە خزمەت جەنابتان لە (ئوحود) شەهید بوو، ئێستا من یەك منداڵم هەیە، یەك منداڵی چاو گەشی جوانم هەیە، ساڵە وەختینە، مامی منداڵەکە هاتۆتە خوازبێنیم، بەڵام باوکم بەبێ ئەوەی پرسی من وەربگرێت مارەی کردووم لەو خزمەی خۆی، بەڵام ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر من شوو بەوە بکەم، دڵنیام کە منداڵەکەم لێ دەسێنێتەوە.. چونکە ئەو کابرایە ئامادە نیە منداڵەکەم بەخێو بکات..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەی تۆ دەڵێیت چی؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من حەزم دەکرد شوو بە شووی براکەم بکەمەوە، لەبەر خاتری ئەم منداڵە، هەر چۆنێك بێت مامی منداڵەکەمە، هەر چۆنێك بێت منداڵەکە لە باوەشی خۆمدا پەروەردە دەبوو لەژێر سایەی مامیدا، ڕەحمەتی باوکایەتی لێ نەدەبڕا، بەلام ئەم پیاوە خزمی ئەم مێردەم نیە، ئامادە نیە منداڵەکەم بەخێو بکات.. من جەرگ بڕاو دەبم و منداڵەکەشم سەرگەردان دەبێت..

ئەها سەیری ئەو ئافرەتە ژیر بوو، ئەو سەردەمە شوو کردنەوە عەیب نەبوو، بۆ ئافرەت داوای شەهید بوونی مێردەکەی عیدەی بەسەرچووە و خوازبێنی کەری هاتووە، ئافرەتەکەش زۆر ژیرانە خەڵك ناڵێت ئەمە حەیای هەڵگیراوە، بە خودا حەزی لە شووبراکەی کردووە، نەخێر ڕێزی قسەی ئەم ئافرەتە دەگیرێت.. پێغەمبەری خودا ﷺ یەکسەر بڕیار دەدات و دەفەرموویێت: مارەیت لەو خزمەی باوکت بەتاڵە، برۆ شوو بە مامی منداڵەکە بکە، بەتاڵە یەعنی: (مارەیی نایەت) .

## ژن بەژنی پیاوی پیر !!

بەداخەوەم لە کوردەواری ئێمەدا، چەند جار ئافرەت بە شوودراوە پرسی پێ نەکراوە، یەك ڕووداوی واقعی هەیە لە یەکێك لە ناوچەکانی ئەم کوردستانە ڕوویداوە.. هەرچەندە ناوی دێیەکەش دەزانم بەس حورمەتەن بۆ ئەهلی ئەو شوێنە، ڕەنگ بێت ناو هێنانی جوان نەبێت، ئەگەر لە شوێنێك ڕووداوی خۆشی تێدا ڕوویدات ناوی بڵێین خۆشە، بەس ئەگەر ڕووداوی ناشرین ڕوویدا ناوەکەی بشارینەوە لەبەر ئەهلی ئەو شوێنە..

لە یەکێك لەو شوێنانەدا دوو پیاو ژنەکانیان دەمرن، خاوەنی چەند کوڕ و کچ دەبن، کچی عازەب و کوڕی عازەب، ئەم پیاوانە لەگەڵ حورمەتم بۆ پیاوانی ڕیش سپی و بەتەمەن، کەڵکەڵەی ژن هێنان دەکەوێتە سەریانەوە..

دەڵێن: با ژن بهێنینەوە بەلاّم کێ ژن دەدات بە ئێمە؟ ئێمە پیر بووین، بە گۆچان دەڕۆین، کوڕەکانمان وەختی ژن هێنانیانە، کچەکانمان داوە بە شوو، ئەم دوانە فێڵێك دەکەن.. دەڵێت: وەرە من و تۆ ژن بە ژن دەکەین، بەلاّم بۆ ئەوەی کچەکانمان نەوەکو خۆیان بسوتێنن، ڕاکەن، خۆیان بە دار و بەردا بدەن، ڕازی نەبن.. کوڕەکانمانیان نیشان دەدەین.. من کوڕی خۆم نیشانی کچی تۆ دەدەم، تۆش کوڕی خۆت نیشانی کچی من بدە، بە حیساب شوو بەوان دەکەن!!

ئەوانیش دێن کوڕی گەنجن و ڕێك و پێکن، دەڵێن: وەلاّ ڕازین و فەقیرە کوڕەکانیش وادەزانن کچ لەوانە مارە دەکرێت.. وەختێك مامۆستایەك دێنن، جاری واهەیە مەلاکەش تاوان بارە، دەبێت نەیکات، دەبێت بڵێت لەم دێیە دەرم بکەن نایکەم، لەو پیاوە پیرانەیان مارە دەبڕن، بوك دەگوازرێتەوە، جلی بوکێنی لەبەر کراوە بە حیساب وادەزانێت ئەم کچە دراوە بەو کوڕە گەنجەی کە ئەم بینیویەتی، وەختێك کە دێتە ژوورەوە، سەیر دەکەن پیرە مێردێك لە ژوورەوەیە، ئیتر ئەوانە بە فیعلی مابوون، بە گۆچان دەلەرزین..

وتیان: ئەو ژنانە وەکو کچی ئەم پیاوانە وان ژنیانن، ئیتر ئافرەت چی بکات؟ تازە گواستراوەتەوە، تازە مارە کراوە، بەو فێڵە هەتا نەیان گواستەوە نەیان هێشت کچەکان بزانن، بەڕێزان ئەمە بەشەریعەتی خودای گەورە بەتاڵە، بەشەریعەتی خودا هەر کچێك بە زۆر مارە بکرێت دەستەو بە جێ بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ نیکاحەکەی بەتاڵە..

هەتا کابراش بڵێت: تەلاّقی نادەمەوە ئەو نیکاحە دانامەزرێت.. چونکە کەس نیە قسەی لەسەر قسەی پێغەمبەر ﷺ بێت، (انكح من شئت) کچی خۆم شوو بەهەرکەسێك بکە کە ئارەزووت لێیەتی، خۆت ئەوەی ئارەزووت لێیە کێیە، دایك و باوك مافیان لەسەر ئەولادە، بەلاّم کام ماف؟

مافی ئەوەی نیە بڵێت: من بۆت هەڵدەبژێرم، ئایا باوکێك هەیە بڵێ کچم دەبێت هەر ئەم قوماشانە لەبەر بکەیت، با لە ماکسیەکدا ئازاد بێت.. با لە جوتێك پێڵاودا ئازاد بێت.

ئەی چۆن لە هاوسەری ژیانیدا ئازاد نەبێت؟ بۆی هەبوو ئامۆژگاری بکات، بەڕێزان بۆی هەبوو ڕێنمای بکات.. بڵێت: کچی خۆم ڕەنگە ئەم کوڕە شیاو نەبێت، ڕەنگە کوڕی شیاوتر هەبێت، وە پاشان ئەگەر خۆت حەز دەکەیت ڕێنمایت دەکەم بەو شێوازە ڕەفتار بکە، بە ئومێدی ئەوەی بەختەوەر بن..

پاشان بە نیسبەت کوڕە وەلاهی وا هەبووە لەکۆمەڵگەی ئێمەدا، بە زۆر ژنیان بۆ هێناوە، باوکەکەی وتویەتی ئیلا و بیلا دەبێت کچی فلان کەس مارە بکەیت، دەبێت ئیلا ئەو ئامۆزایەی خۆت بێنیت و قبوڵم نیە بێگانە، هەر چۆنێك بێت برازای خۆمە دەبێتە بوکی خۆم، ئێستا حالیەن ئەوە هەیە، بەداخەوە باوکەکە دەڵێت من برادەرەکەی فلان کەسم، کچی فلان کەسی بۆ دێنم، ئەم کوڕە بەقسەم نەکات کچی فلان کەسی نەوێت، نابێت..

## دوای شەش منالّ .. هەر یەکتریان بە دلّ نەبوو !!

ئافرەتێکی بەڕێز جارێك باسی کرد وتی: تەقریبەن شەش منداڵم هەیە، کوڕی عازەب، کچی عازەب، کچ شوی کردووە، کوڕ ژنی هێناوە.. وتویەتی: تائێستا هاوسەرەکەی قسەی لەگەڵدا نەکردووە، ئامۆزاشیەتی، بۆ؟ وتویەتی: کاتی خۆی باوکی بەزۆر لێی مارە کردووە، بەزۆر هەرچی کوڕە کە وتویەتی نامەوێت، وتویەتیَ نامەوێت، چیە من پرس بەکوڕ ناکەم!!

کچی خۆمە و کوڕی خۆمە، بتەوێت و نەتەوێت هەر ئەوەیە، ئەو زەمەنە تۆزێك ئیحتیرام زیاتر بووە، خەڵك شەرمی کردووە.. بەڵام ئەم شەرمە بەزەرەر تەواو دەبێت.. ئەم حورمەتە خێزانێك هەڵدەوەشێنێت، هەتا مروری زەمەن ئەو پیاو و ژنە ڕویان لەیەك نیە، ژنەکە ڕوی لێیە پیاوەکە ڕوی تیّ نیە، بەڵام بەداخەوە ئێستا هی وا هەیە لەمپەر دەخاتە بەردەمی کچەکانمان، کچێك دەیەوێت شوو بە کوڕێك بکات کەبێگانەیە یەکسەر لەولاوە مامێکی، خاڵێکی، ڕاست دەبێتەوەو دەڵێت:

وەڵا نایەڵم چۆن دەهێڵم بۆ کوڕی خۆم داناوە، بۆ خوشکە زای خۆم دامناوە، بۆ پوورزای خۆم داناوە، ئەم بۆ دانانە هەڵەیە.. بەڕێزان ئەمە ئەم ئافرەتە کۆیلە نیە، ئەمە مەڕومالاَت نیە، ئەمە جل و بەرگ نیە، ئەمە زەوی و زار نیە، پێشکەشی بکەیت بە فلان کەس، تۆ برازاکەی خۆت سەیر بکە، ئەڵێت برازا، ئەگەر کچەکەشتی بدەیتێ هەر برازات نیە؟! لەوە نزیکتر نابێتەوە..

ئەڵێت: وەڵا برازامە بۆخۆم باشە، باشە کچەکەشتی بدەیە هەر برازاتە، خۆلەبرازا نزیکتر نابێتەوە!! برازا ئەگەر ڕێك و پێك بێت هەر برازاتە، ئەگەر کچیشی نەدەیتێ هەر کوڕتە، خۆ ئەگەر ڕێك و پێك نەبێت، کچەکەشی بدەیتێ ئەمجا زیاتر لێت دەبێت بە دوژمن، کچەکەشت بەدبەخت دەکات..

لەبەر ئەوە دەرس و پەند و ئامۆژگاری ئەمشەومان ئەوەیە: کە ئیسلام ئازادی دەدات بە ئافرەت، ئیسلام بوونی ئافرەتی ئازاد کرد، شەکوای حاڵی خۆی بکات لە کاتێکدا بە زۆر بە شوویان داوە.. ئومێدەوارم کە(إنشاء الله) کوڕ و کچەکانمان هیچ کەس دەست نەیەنێتە ڕێگایان، لە هەڵبژاردنی ژیانی خێزانی و هاوسەری خۆیاندا، یەك پرسیار هەیە بۆ دوای کوژاندنەوەی کامێراکە، کەسێك ئەگەر سەرنج بدات لەم فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ، ئەم ئافرەتە، ئەم کچانە، هاتوونەتە خزمەتی، یەعنی:

ئەم ئافرەتە ئەم ژنە شەهیدە هاتووە شەکوای حاڵی خۆی کردووە.. کە باوکی داویەتی بە خزمێکی خۆی، کە ئەم بە تەمابووە شوو بکات بە کوڕە مامەکەی خۆی، یەك خاڵی سەرنج ڕاکێش هەیە هەر کەسێك ویستی پێمان بڵێت، لە دوای کوژاندنەوەی کامێراکان و تەواو بوونی بەرنامەکە، (انشاء الله) بە ئیزنی خودای پەروەردگار ئێمە خەلاَتی ئەمشەوی دەدەینێ..

تا بەرنامەیەکی تر تا شەوێکی تر هەموو لایەکتان بە خودای گەورە دەسپێرم..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ) .

# وانەی نۆزدەیەم

## نەفرین کردن (اللّعان)

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ۝٦ وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ۝٧ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ۝٨ وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ۝٩﴾ النور .

* عَنْ إبْنِ عَبّاسٍ ، قالَ : (أنَّ هِلالَ بنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ إمْرَأتَهُ عِنْدَ النَبِيِّ ﷺ بشريك بنِ سَحماءَ ، فَقالَ النَبِيُّ ﷺ : البَيِّنَةُ أوْحَدٌّ في ظَهْرِكَ ، فَقالَ : يا رَسُولَ اللهِ ، إذا رَأى أحَدُنا على إمْرَأتِهِ رَجُلاً ينطلِقُ يَلْتَمِسُ البَيِّنَةَ ؟! فَجَعَلَ النَبِيُّ ﷺ يَقُولُ : البَيِّنَةُ وَ إلاّ حَدٌّ في ظَهْرِكَ ، فَقالَ هِلالُ : وَالَّذي بَعَثَكَ بالْحَقِّ إنّي لَصادِقٌ ، فَلْيَنْزِلَنَّ اللهُ ما يُبَرِئِ ظَهْري مِنَ الحَدِّ ، فَنَزَلَ جِبريلُ وَ أنْزَلَ عَلَيْهِ (وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ) فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ : (إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ) . فانْصَرَفَ النَبِيُّ ﷺ ، فَأرْسَلَ إلَيْها ، فَجاءَ هِلالٌ فَشَهِدَ ، وَالنَبِيُّ يَقُولُ : إنَّ اللهَ يَعْلَمُ أنَّ أحَدَكُما كاذِبٌ ، فَهَلْ مِنْكُما تائِبٌ ؟! ثُمَّ قامَتْ فَشَهِدَتْ فَلَما كانَتْ عِنْدَ الخامِسَةِ ، وَ قَفُّوها وَ قالُوا : إنَّها مُوجِبَةٌ ، قالَ إبْنُ عبّاس : فَتَلَكَّأَتْ وَ نَكَصَتْ حَتَّى ظَنَنَّا أنَّها تَرْجِعُ ، ثُمَّ قالَتْ : لا أفْضَعُ قَومي

سائِرَ اليَوْمِ ، فَمَضَتْ ، فَقالَ النَبِيُّ ﷺ : أَبْصِرُوها ، فَإِنْ جاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ العَيْنَيْنِ ، سابِغَ الأَلْيَتَيْنِ ، خَدَلَّجَ السّاقَيْنِ ، فَهُوَ لِشَرِيكِ بْنِ سَحماءَ ، فَجاءَتْ بِهِ كَذالِكَ ، فَقالَ النَبِيُّ ﷺ لَوْ لا مَضَى مِنْ كِتابِ اللهِ ، لَكانَ لي وَ لَها شَأْنٌ)

ـ رَواهُ البُخارِيُّ : (٤٧٤٧) .

* الأَحْكام الشَّرْعِيَّة :

١) إذا رَمَى زَوْجَتَهُ بالزِّنَى فَعَلَيْهِ واحِدَةٌ مِنْ أَرْبَعٍ :

ا) ـ البَيِّنَةُ .

ب) ـ اللِّعانُ .

ج) ـ التَّعْزِيرُ : (إذا كانَتِ الزَّوْجَةُ غَيْرَ مُحْصَنَةٍ ، أَي : غَيْرَ عَفيفَةٍ وَاشْتُهِرَتْ بِهذا بَيْنَ النّاسِ ، وَلَمْ يَأْتِ الزَّوْجُ بِبَيِّنَةٍ ، وَنَكَلَ عَنِ اليَمِينِ ، فَفي هذهِ الحالَةِ لا يُلاعِنُها لِكَوْنِها غَير عَفيفَةٍ ، وَ لا يُقامُ الحَدُّ عَلى الزَّوْجِ لِدَرْئِهِ بالشُّبْهَةِ ، لكِنَّهُ يُعَزَّرُ مِنْ قِبَلِ الحاكِمِ حَتَّى لا يَعُودَ إلى ذالِكَ) ....

د) ـ حَدُّ القَذْفِ : قالَ إبْنُ قُدامَةَ : (إذا قَذَفَ زَوْجَتَهُ المُحْصَنَةَ وَجَبَ عَلَيْهِ الحَدُّ وَ حُكِمَ بِفِسْقِهِ ، وَ رُدَّتْ شَهادَتُهُ إلاّ أَنْ يَأْتِيَ بِبَيِّنَةٍ أَوْ يُلاعِنَ فَإِنْ لَمْ يَأْتِ بِأَرْبَعَةِ شُهَداءَ أَوْ امْتَنَعَ مِنَ اللِّعانِ لَزِمَهُ ذالِكَ كُلُّهُ ، وَبِهذا قالَ مالِكٌ وَالشّافِعِيُّ) ـ المُغْني ، ج١١ ، ص١٣٦ .

٢) شُرُوطُ اللِّعانِ ثَلاثَةٌ :

ا ـ كونُهُ بَيْنَ زَوْجَيْنِ مُكَلَّفَيْنِ .

ب ـ أَنْ يَقْذِفَها بالزِّنى .

ج ـ أَنْ تُكَذِّبَهُ ..

٢) آثارُ اللّعانِ اَرْبَعَةٌ :

ا) ـ سُقوطُ الحَدِّ أَوِ التَّعزيرِ .

ب) ـ التَفريقُ بَيْنَهُما .

ج) ـ التَّحريمُ المُؤَبَّدُ .

ء) ـ انْتِفاءُ الوَلَدِ .

* (قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : الوَلَدُ لِلْفِراشِ وَ لِلْعاهِرِ الحَجَرُ) ـ متفق عَلَيْهِ : (بُخاري : ٢٠٥٣) وَ مُسْلِم : ١٤٥٧ .



## سەرچاوەکان :

١) رَوْضَةُ المُتَنَزِّهِ ، شَرْحُ بِدايَةِ المُتَفَقِّهِ ، أَيْمَن بن علي موسَى ، ج٣ ص٢١٩ ط : ١ ، ٢٠١٠ ، دارُ إِبْنُ رَجَب .

٢) فِقْهُ السُّنَّة ـ به کوردی . السَّيد سابق ، و : حەمە أحمد بەرزنجی ، ب٢ ، ل٦٢١ ، چاپی یەکەم : ٢٠٠٧ کتێبخانەی ڕۆشنبیری ـ سلێمانی .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز دانیشتنی ئەمشەویشمان لە زنجیرە باسەکەماندا بە ناوی ﴿ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشە و گرفتم هەیە﴾ هاتوومەتە خزمەتت.. دەچینەوە خزمەت خۆشەویستمان و لە کۆڕ و دانیشتنی پێغەمبەر ﷺ جارێکی تر بەشدار دەبین، دانیشتنەکەمان بە سەلاواتدان لەسەر ئەو سەردارە دەست پێدەکەین و دەڵێین:

(اللّهُمَّ صَلی عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلی عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلی عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)

## ئەی پێغەمبەرﷺ ژنەکەمم بینی زینای دەکرد..!

ئیمامی (بوخاری) (ڕەزا و ڕەحمەتی خودای لێبێت) لە (عبد الله إبن عباس)ەوە بۆمان دەگێڕێتەوە، کە: (عبد الله) لە خزمەت پێغەمبەری خودا دا بووە، ئەم ڕووداوەی بە چاوی خۆی بینیوە کە بوخاری لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتیەوە..

دەفەرمووێت: صەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ لە خزمەت خۆشەویستدا دانیشتبوون، ئەڵقەیان لێدابوو، دەورەیان گرتبوو، ئا لەو کاتەدا کەسێك بە هەڵە داوان، بە هەناسە برکێ، بە دەم و چاوێکی ترشاوەوە، بە دەستێکی لەرزۆکەوە، ئەلەرزی.. هاتە پێشەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ چارەسەرم بکە، ئەو کەسەی کە ئێمە ئەمشەو باسی دەکەین ئەم پیاوەیە، کە موشکیلەیەکی هەرە گەورەی هەیە..

با بزانین موشکیلەی ئەم پیاوە چیە؟! پێغەمبەری خودا ﷺ، دەفەرمووێت: وەرە پێشەوە بزانین بۆ وادەکەیت؟! بەم نوێژی نیوەڕۆیە وانزیکی عەسرە ئیتر بۆچی وا

دەلەرزیت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من ناچارم دەبێت حاڵی خۆم بۆ لای تۆ بەیان بکەم، بزانم چ ڕێنماییەکم دەکەیت، بۆ ئەوەی توشی هەڵەی گەورەی تر نەبم، ئەوەی کە بە چاوم بینیومە خەریکە بڕوا نەکەم!!

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: چیت بینیوە؟

دەڵێت: وەڵاهی لە ئیش گەڕامەوە هاتمەوە بۆماڵەوە چایەك بخۆم و ئیسراحەتێك بکەم و پشوویەك بدەم، ئەم پیاوە کە ناوی (هیلالی إبن ئومَیّە) بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەو کاتەدا کە چوومە ماڵەوە، من ماڵی خۆمە دەرگام کردەوە زۆر بە ئاسانی دەرگاکە کرایەوە.. هەر پێوە درابوو.. لەو کاتەدا تەماشا دەکەم پیاوێك بە ناوی (شُرَیکی إبن سَماحە) ئاوا لەگەڵ خێزانەکەمدا خەریکی زینا کردنە!

پەنا بە خودای پەروەردگار، لە شاری پێغەمبەردا ﷺ لە پەنای ڕەوزەی پێغەمبەردا ﷺ ئەم کارە ڕوویدات!!

وتی: کاتێك دەرگام کردەوە وەڵاهی بەو چاوانەی خۆم بینیم ئەو کابرایە کە ناوی (شورەیکی کوڕی سەماحە)یە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، بەڕووتی لەگەڵ خێزانمدا جیماعیان دەکرد.. بەڵام من بۆ ئەوەی قیامەتم وێران نەبێت، نەچووم بیان کوژم و خوێنیان بڕێژم. هاتم پرسم بە پێغەمبەری خودا ﷺ کردووە..

بزانین پێغەمبەری خودا چی دەفەرمووێت؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی:

شاهیدت هەیە؟ چوار شاهیدت هەیە شاهیدیت بۆ بدەن؟ کە ئەم پیاوە لەگەڵ ئەم خێزانەی تۆ زینایان کردووە؟!

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من بچومایە چوار پیاوم بهێنایە ئەم دیمەنەیان ببینیایە؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ناتوانم هیچ بڵێم (البَیِّنَةُ وَإِلَّا حَدٌّ فِي ظَهرِكَ) یان دەبێت چوار پیاو شاهیدیت بۆ بدەن کە ئەو پیاوە لەگەڵ خێزانەکەتدا زینای کردووە، چوار پیاو بە چاوی خۆیان بیبینن، یان دەبێت پشتت ڕووت بکەیتەوە هەشتا داری حەددت لێبدرێت.. چونکە لەوانەیە تۆ بوختان بۆ خێزانەکەت بکەیت..

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا بەو خودایەی کە تۆی بەحەق و ڕاستی ناردووە بەو خودا بێ شەریکەی کە تۆی بە حەق و ڕاستی ڕەوانە کردووە بە پێغەمبەری حەق و ڕەوان، وەلاهی من ڕاست دەکەم، وەلاهی من دڵنیام ئەم پشتەی من بێتاوانە و بوختان ناکەم، ئێستا خودای پەروەردگار ئایەت دەنێرێتە خوارەوە ئەم قسەی من ڕاست دەکاتەوە..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر ئەوەیە یان دەبێت چوار شاهید بهێنیت، یان دەبێت هەشتا داری حەددت لێبدرێت.. چونکە تۆ بوختانت بەو پیاوە و بە خێزانەکەت کردووە، کەس مافی ئەوەی نیە بوختان بە خێزانەکەی و بە پیاوێك بکات..

دەڵێت: لەو کاتەدابوون حەزرەتی (جِبْرِيل) هاتە خوارەوە، جا لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خودا ﷺ وەحی بۆ دەهات ئەگەر چلەی زستان بوایە، بەستەڵەك بوایە، عارەق دڵۆپ دڵۆپ بە نێو چەوانی دەهاتە خوارەوە، لەبەر قورسی وەحیەکە، هەموو ئەوانەی لە دەوروبەری بوون دەیان زانی پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ دێت..

هەموو بێدەنگ دەبوون، پێغەمبەر ﷺ عارەقی نێو چەوانی دەکردەوانێ و ئاوا لەرزی لێدەهات، لەبەر قورسایی ئەو وەحیە ئاسمانیە کە بۆی دەهاتە خوارەوە..

دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ماوەیەك بێدەنگ بوو.. فەرمووی: خودای گەورە ئەم ئایەتانەی سورەتی (نور) ئایەتی(٦بۆ٩)ی ناردە خوارەوە.. خودا دەفەرمووێت:

﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ ۞﴾النور.

ئەها دەفەرمووێت: (يَرۡمُونَ) ڕەمی کردن، وەکو ئەوە وایە بە فیشەك دایگریتەوە، هەر کەسێك خێزانی خۆی تۆمەتبار بکات بە زینا، بەبێ ئەوەی چوار شاهیدی هەبێت.. نەتوانێت چوار شاهید پەیدا بکات ئیلا نەفسی خۆی نەبێت، خۆی شاهید بێت..

ئەو دەڵێت بە چاوی خۆم بینیومە ئەم چوار پیاوە لە کوێ ئامادە بکەم بۆ ئەمە، ئەم پیاوە واجبی ئەوەیە ﴿فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ

ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ دەبێت چوار جار ئەم پیاوە لەسەر یەك، لەبەردەم کۆمەڵێك شاهیددا بڵێت: بەو خودایەی تاك و تەنها و بێ شەریکە، من درۆ ناکەم ئەو ژنەی خۆم بینی بە چاوی خۆم لەگەڵ فلاتەکەس زینای دەکرد، چوار جار لەسەر یەك بڵێت سوێند بێت بە خودای تاك و تەنها، من درۆ ناکەم من ڕاستگۆم لەوەدا، من خێزانی خۆمم بینیوە..

﴿وَٱلْخَـٰمِسَةُ ﴾ دەبێت لە جاری پێنجەمدا بڵێت: ﴿أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ﴾ ئەم پیاوە دەڵێت ژنەکەم وای کردووە "پەنا بە خودا" لە جاری پێنجەمدا بڵێت: لەعنەتی خودام لێبێت، خودا بەنەفرەتم بکات غەزەبی خودام لەسەر بێت، ئەگەر درۆ بکەم.. دەبێت ئەمەش بڵێت، ئەمجا ئەگەر پیاوەکە ئەمەی گوت واجبە ژنەکە ڕەجم بکرێت چونکە ئەم پیاوە دەیگوت ئەم ژنە بە چی ڕزگاری دەبێت﴿وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ﴾ ئەم ژنە ئەمجا موستەحەقی عەزاب دەبێت دەبێت ڕەجم بکرێت، بە چی ڕزگاری دەبێت؟ بەوەی ژنەکەش بەرگری لە خۆی بکات..

﴿أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَـٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ۝٨﴾ ئەم ژنەش بڵێت: قەسەم بەو خودایەی تاك و تەنها و بێ شەریکە، ئەو پیاوە درۆ دەکات، ژنەکە چوار جار لەسەر یەك بڵێت قەسەم بەو خودایەی تاك و تەنها و بێ شەریکە، ئەم پیاوە درۆ دەکات و بوختانم پێدەکات..

لە جاری پێنجەمدا: ﴿وَٱلْخَـٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ۝٩﴾

لە جاری پێنجەمدا ژنەکە بڵێت: غەزەبی خودام لێبێت، لەعنەتی خودام لێبێت، غەزەبم لێبگرێت، ئەگەر ئەو پیاوە ڕاست بکات، ئەگەر ئەو پیاوە لەو حاڵەتەدا منی بینیبێت یارەبی خودا غەزەبم لێبگرێت.. ئەگەر ژنەکەش ئەمەی گوت چ دەکرێت بەرێزان؟ ئەوە ئەو پیاوە قسەی خۆی کردووە، ژنەکەش قسەی خۆی کردووە، یەکسەر

شەرع لەیەکیان جیا دەکاتەوە، یەکسەر بەبێ تەلاق ئەم ژن و پیاوە کۆتای بە ژیانی هاوسەریان هات.. ئەو بۆ ماڵی خۆی، ئەویش بۆ ماڵی خۆی، هەر یەکەیان تەفرەقەی لێدەکرێت هیچ کەس دوای ئەمە بۆی نیە ئەم ژنە بکوژێت!

## دەرسەکانی ئەم بەسەرهاتە:

### یەکەم: ملکەچی یاسای خودا بین..

(سبحان الله) ئەم بەسەرهاتە ڕەنگە غەریب بێت لای ئێوە، بەس ئەمە کۆمەڵگەی مەدەنیە، لە کۆمەڵگەی مەدەنیدا واریدە ئەم شتانە ڕوویدات، بەڵام سەیری بکە، سەیر بکە ئەو دەرسانەی ئێمە وەریدەگرین ئەوەیە:

دەڵێت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی. ئینجا ئەم ژنەش حامیلە بوو، ئەمجا لەدوایی ئەم ژنە چەند مانگێکی پێچوو، حەملی تری لێدەکەوت.. دوای ئەوە ئەو چوو بەلایەکدا، ئەو بۆ ماڵی خۆی و ئەمیش بۆ ماڵی خۆی، ئەم چوو بۆ ماڵی باوکی، ئەمیش چوو بۆ ماڵی باوکی، ماڵ وێرن بوون، لێك هەڵوەشان، ژنەکەش حەملی لێ پەیدا بوو! !

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆن کە منداڵەکەی لێ بویەوە، جا پێغەمبەر ﷺ زۆر قیافە ناس بووە، ئەگەر ئەو منداڵە چاو ڕەشێکی سمت شۆڕی قاچ ئەستور بوو..

وەڵاهی ئەوە لە (شُرَیکی إبن سَماحە)، لەو کابرایە کە پیاوەکە وتی لەگەڵ خێزانمدا بینیومە، کە منداڵکە لە دایك بوو کوت و موت وابوو، منداڵێکی چاو ڕەشی سمت شۆڕی پێ ئەستور بوو..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەبەر ئەوە نەبوایە کە خودا شتێکی فەرمووە کەس قسەی بۆ نیە، ئەینا من لەگەڵ ئەو ژن و پیاوەدا قسەیەکی ترم دەبوو، چونکە ئەم منداڵە ڕەنگە هی ئەو پیاوە بێت. بەس کە کەلامی خودا بڕیەوە کۆتایی پێهات..

واتە: كەس نابێت بەرامبەر بە كەلامی خودا نابێت بڵێت من عورفیم و عەشایەرم، پێم قبوڵ ناكرێت.. ئەها پێغەمبەری خودا ﷺ بەتەواوی ئەم زینایە ڕوویدابوو، بەڵام مادام ئەم ژنە بانگ كرا، پێی گوترا، پێغەمبەر ﷺ زۆر ترساندی.. فەرمووی: هەر كەسێك نەسەبێك هی غەیری ئەم پیاوە بهێنێتە بنەماڵەوە، نەفرەتی خودای لێبێت، بەهەشتی خودای لەسەر حەرام دەبێت، ئەگەر ئەم پیاوە ڕاست دەكات تۆ زینات كردووە.. داوای لێخۆشبوون لە خودا بكە، عەزابی ئەم دونیایە باشترە لەعەزابی خودا، بڵێ خودایە لێم ببورە.. داوای لێبوردن لە مێردەكەت بكە كە خیانەتت لێكردووە، با حەدی شەرعیت لێبدرێت و نەجاتت دەبێت..

دەڵێت: ئەو ژنە چوار جار لەسەر یەك جا ئەم پیاوە (هیلال) هات، چوار جار لەسەر یەك لەبەردەمی پێغەمبەری خودا ﷺ و صەحابەكاندا، وتی: سوێند دەخۆم بە خودای تاك و تەنها و بێ شەریك من ڕاست دەكەم.. لە پێنجەم جاردا وتی: لەعنەتی خودام لێبێت ئەگەر درۆبكەم..

ژنەكەیان بانگ كرد، وتی: قەسەم بە خودایەی تاك و تەنها و بێ شەریكە ئەم مێردەی من كە (هیلال)ە درۆ دەكات.. جاری پێنجەم خەریكبوو بڵێت: لەعنەتی خودام لێبێت غەزەبی خودام لێبێت، ڕاوەستا ڕاما، لەرزی.. ئینجا وتی: سەری بنەماڵەكەم شۆڕ ناكەم، هەتا هەتایە، جا جاری پێنجەم وتی: غەزەبی خودام لێبێت ئەگەر ئەم پیاوە ڕاست بكات.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەركەسەتان بۆ ماڵی خۆی، ئینجا ڕۆشتن و ئەم خێزانە كۆتایی پێهات..

ئەمە پابەند بوونە بە یاسا، ئەمە دەوڵەتێكی مەدەنیە، كەلە كۆمەڵگەی پێغەمبەری خودادا ﷺ شتی وا ڕوویداوە، ئەمە واریدە تا قیامەت پەنا بەخودا ئەم حاڵەتانە ڕوودەدات.. بەڵام ئەوەی كە دەرسە ئەوەیە: ئەو ژن و مێردە كە لیعان دەكەن، ئەمە پێی دەوترێت (لیعان) واتە: نەفرەت لێكردن.. هەردووكیان نەفرەت دەكەن، دوای ئەم لیعانە ئەم ژن و مێردە هەتا هەتایە لەیەك حەرام دەبن..

ئەگەر یەکێك ژنەکەی تەڵاق بدات، دوای ئەوە یەکێك خواستی بەڕەزامەندی خۆی، تەڵاقی دایەوە، بۆ مێردی یەکەمی حەڵاڵ دەبێتەوە.. (حتى تَنْكِحَ زَوجاً غَيْرَهُ) کەسێك تەڵاقی سێ بە سێی بکەوێت، دوای ئەوەی پیاوێك ژنەکەی مارە کرد، دوای ئەو تەڵاقی دایەوە، مێردی یەکەمی بۆی هەیە مارەی بکاتەوە بەشەرعی خودا بەڵام ئەو کەسەی بەنەفرەت لێکردن لێك جیا ببنەوە.. بەعومری خۆی سەد مێردی کەش بکاتەوە، ناتوانێ بە مێردی یەکەمی خۆی بکاتەوە، هەتا هەتایە لەیەك دابڕان.. هەتا هەتایە تازە ئەو دووانە لەیەك دابڕان.

## دووەم: باسی زیناکارەکان نەکرێت

هەرکەسێك تۆمەتی زینا بداتە پاڵ ئەم ژنە، دوای ئەوەی ژنەکە چوارجار سوێندی خوارد کە پیاوەکەی درۆ دەکات، لەجاری پێنجەمدا وتی خودا غەزەبم لێ بگرێ ئەگەر ئەو پیاوە ڕاست بکات.. لەدوای ئەمە، هەرکەسێك بڵێت مێردەکەت بینیوی بەچاوی خۆی زینات کردووە، ئەی مێردەکەت وای نەگوت، هەر کەسێك ئەم قسەیە بکات هەشتا داری لێدەدرێت..

پەنا بەخودا، تازە کەس مافی ئەوەی نیە بوختان بەم ژنە بکات، ئەم قسەی خۆی وتوە، تازە ئەوە هەڵدەگرێت بۆ قیامەت، ئەمە دادگای دونیا مەلەفەکەی داخست.. کەس مافی ئەوەی نیە دەم لە ناموسی خەڵکەوە بدات.. ئەم مەلەفە داخرا، هەواڵەی خودا کرا.

تەبعەن ئەم ژن و مێردە یەکێکیان ڕاست دەکەن وا نیە؟ بەبێگومان پیاوەکە ڕاست دەکات، یان ژنەکە ڕاست دەکات، یەکێکیان تاوان بارەو لەعنەت و غەزەبی خودای لێیە، یەکێکیان جێگای مەصیری جەهەنەمە، بەڵام ئەمە کوێ دیاری دەکات؟! قیامەت، ئەوە بۆیە دەبێت دادگای قیامەت هەبێت، هەر کەسێك لەمەودوا بڵێت کورە مێردەکەت نەیبینی بەچاوی خۆی زینات کرد؟! تۆ هەر ئەو زینا کارە نیت؟ (٨٠) داری حەدی لێ دەدرێت!!

ئەم منداڵە کەلە دایك دەبێت، هەر کەسێك بڵێت ڕۆژێك دایکت بەنەفرەت کردن جیانەبوویەوە وە کورە تۆش کچی یان کوڕی ئەو ئافرەتە زینا کارەی، باوکی بۆخۆی بوختانی بۆ دایکی کرد.. هەر کەسێك (نَعُوذُ بِالله) ئەم قسەیە بڵێت، دەبێت هەشتا داری حەدی لێبدرێت، کەس مافی ئەوەی نیە، منداڵەکە دەدرێتە دەستی کێ؟ منداڵەکە دەدرێت بە دایك چونکە: (الولد لِلفراش) منداڵ بۆ ئەو کەسەیە سەر جێگای کردووە.. واتە منداڵەکە دەدرێتە بە دایکی و میراتی لە دایکی دەبێت، لە باوکی نابێت.. منداڵەکە دەدرێت بە دایکی و کەس مافی نیە تۆمەت بداتە پاڵ ئەم منداڵە، یان بیداتە دایکی منداڵەکە، ئەمە دەبێت ئەم مەلەفە لە کۆمەڵگە کۆتایی پێ بێت، هیچ کەس لەژیانیدا بۆی نیە قسە لەسەر ئەم مەسەلە بکات، ئەوە لەم زەمانەدا پەنا بە خودا دوازدە ساڵ دوای ئەوە مەجلیسی پێ گەرم دەکرێتەوە، لە زستاندا لەبەر زۆپا، ئەها ساڵەکەی فلان کەس وای گوت، ئەمە تەواو بوو..

کۆمەڵگەی مەدەنی پێغەمبەر ﷺ ئەم کۆمەڵگایەی ئیسلام بەرهەمی دەهێنێت، مافی تۆ نیە، لێی بگەڕێ، ئەوە بۆ قیامەتی خۆی، تازە بیسپێرە بە خودا، یەکێکیان ڕاستی کردووە یان درۆ، ئەوە پەروەردگار لە قیامەتدا ڕاستی دەکاتەوە، ئەمان لێرە کاری خۆیان کردووە بەڕێزان..

## سێیەم: دوای زینا، مافی مناڵ وژن بپارێزرێت ..

منداڵەکە تەسکەرەی بەناوی باوکیەوە بۆ دەر دەکرێت، ئەگەر باوکی ئەم منداڵە بکوژێت، ناکوژرێتەوە، لە قیامەدا تۆڵەی لێدەکرێتەوە، وەکو قەتڵی تر نیە، تەسکەرەی بەناوی باوکیەوە بۆ دەردەکرێت، بەس ئەوەندەیە میراتی لە دایکی وەردەگرێت، لە باوکیەوە وەری ناگرێت ئەمە منداڵەکە لە دایك دەبێت لە دواتردا لەگەڵ خوشك و براکانی پێشتریدا دەست نوێژیان لەیەك ناشکێت، هەر خوشك و برای یەکن.. یەعنی کۆمەڵێك ئەحکامی تری بەسەردا ئەچەسپێت، کەس بۆی نیە بڵێت کوڕی فلان کەس نیە..

ئەوەی کە وانەیەکی گەورەیە و عەزیمە لەم دەرسەدا وەریبگرین ئەوەیە: هیچ پیاوێك مافی کوشتنی ژنێکی نیە، یەعنی هەتا پەنا بەخودای پەروەردگار ئەم کارەی بە چاوی خۆی بینی، نابێت بچێت لەو دیو، حەفتاو پێنجیەکەی بهێنێت بڵێت یەك حەفتاو پێنج فیشەکیان پێوە دەنێم، لەشەرعی خودا دەکوژرێتەوە، دەبێت ئەگەر دادگای ئیسلامی هەبوو بێت ئاوا لیعانیان پێبکات..

ئەها ئەم شەریعەتە چەند زەرورە هەبێت، دەبێت لەبەردەمی دادوەردا، ئەویش مافی ئەوەی نیە، ، لەبەردەمی چوارکەسدا دەبێت، حاکم لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ، پێغەمبەر خۆی حاکم بووە.. لەدوای ئەو حاکمی ئیسلام ئەم لیعانە بکات.. بڵێت: ئەو چوار جارە سوێند و پێنجەم جار لەعنەتم لێبێت، بە ژنەکەش بڵێت وەلاهی سوێند بە خودای تاك و تەنها ئەو پیاوە درۆزنە لە جاری پێنجەمدا بڵێت غەزەب و لەعنەتی خودام لێبێت ئەگەر پیاوەکە ڕاست بکات.. ئەگەر ئەوەیان کرد لێك جیادەکرێنەوە..

## ئەگەر شاهید نەبوو چی بکرێت؟

ئەگەر پەنا بە خودا دادگای ئیسلامی نەبوو، وەکو ئەمڕۆ ئەم پیاوە بەس یەك مافی هەیە، مادام چوار شاهید شاهیدی بۆ نادەن، ئەگەر چوار شاهیدی پەیدا نەکرد دەبێتە بوختانچی، کە چوار شاهیدیش بە حەیاتی پەیدا ناکرێت.. هەتا ڕادەکات لە ماڵان چوار شاهید دێنێت، ئەم ژن و پیاوە هەڵدێن..

کەواتە: شەرع ئەمەی داناوە، کەواتە بە حەیاتی نابینرێت ئەم پیاوە پەنا بە خودا، هەر کەسێك ئەمەی بینی، یەك مافی هەیە: بڵێت کاکە گیان من ژنی خۆم تەڵاق دەدەم، هەرچی عالەم وتی بۆچی؟! نابێت.. بڵێ: بۆ من شتی وام بینیوە بەڵکو دەبێ بڵێ: وەڵاهی من لەگەڵ ئەم ژنەدا ناگونجێم، کۆتایی بە ژیانی هاوسەریمان دێنم، هەموو دنیا تەکلیفم لێبکات نایەڵم ئەم ژنە خێزانم بێت.. ئەگەر قبوڵی بێت، دوای ئەوە ژنەکەی دەیویست، ئەوە لەعنەتی خودا لەو کەسە بێت کە بزانێت خێزانی داوێن پیسە و قبوڵی

بێت، نابێت قبوڵی بێت، دەبێت سێ بەسێ تەڵاقی بدات و مافی و حەقی خۆی پێبدات، ئەمە پەردە پۆش بکرێت..

لێرەدا ناوی یەك کەس ون دەبێت، کێ دەزانێت بەڕێزان کێیە؟ کەس باسی ناکات، ئەو کەسەی کە زینای کردووە، ئەو کەسە کێ دەڵێت ئەم پیاوە بوختان بۆ ژنەکەی ناکات و نایەوێت فلانە کەسیش تۆمەتبار بکات؟ کەس مافی نیە فلان کەس بانگ بکات، وەلا لەم عەشیرەت گەریەی خۆمان بێت، جاری لە پێشدا ئەو دەکوژێت.. هەزار جار بڵێت سوێند بخورێت، تەلاق بخورێت، ئەو نە سوێند دەدرێت، نە بانگ دەکرێت ئەم پیاوە خەتاکە لەخۆیەوە بووە، چۆن مەجالی دا فلان کەس بێتە ماڵیەوە..

چۆن ئەگەر لە خێزانی خۆی ئەمین نەبوو چۆن بەجێی هێشت، پاشان ئەگەر خودا نەخواستە ئەم حاڵەتە ڕوویداوە تەنها مافی ئەوەی هەیە سێ بەسێ ژنەکەی تەلاق بدات، دەبێت خوێن نەڕژێت، بە هیچ شێوەیەك ئیسلام نایەڵێت لە مەسەلەی ناموسدا قەترەیەك خوێن بڕژێت، لێی جیا دەبێتەوانێ و دەڵێت خودای پەروەردگار ئەمەم بەچاوی خۆم بینیوە..

بەڵام چونکە دادگایەکی شەرعی نیە، خودایە دەینێرم بۆ دادگای (الله)، لە قیامەتدا، لەوێدا ئەگەر ئەو پیاوە خودا نەخواستە ئەو زینایەی کردبێت، ئەو خیانەتە ناموسیەی کردبێت، ئەو ژنە ئەو خیانەتەی کردبێت، ئەوە جەهەنم هەیە، کە دادگا و سزای خودا هەر لەچاویدا هیچ نیە، ئەها بۆیە قیامەت چەند گەورەیە، بۆیە زۆر جار ڕەخنە دەگیرێت لە مزگەوتەکان، ئەوە زانایانی ئاینیش، ئەوە کلتوری ئیسلامیە خەڵك فێری ژن کوشتن دەکات!! بەڵام وەرن بەڕێزان لەم مەسەلەیەدا ژن کوشتن هەیە؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر غیرەتت هەبێت ژنەکەت دەکوژیت؟! کەس نەیوێرا کابرا بانگ بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەمری بەوە نەکرد، دوور نیە ئەگەر ئەم حوکمە جوانە نەبوایە، دوور نەبوو بەڕێزان پیاوی واهەبوو بوختان بە ژنەکەی نەکات، لە ژنەکەی

بێزار بێت و بچێت بوختانی پێ بکات، ڕقی لە فلان کەسە بوختان بۆ ژنەکەی خۆی بکات و فلان کەسیش بە کوشتن بدات، نابێت، ئەمە لەدادگای ئیسلامیدا نابێت..

ئەم زینایە ئەمەندە شتێکی قیزەونە، پەردەی لەسەر هەڵبماڵدرێت، مافی ئەوەی هەیە (لیعان)بەنەفرەت کردن بکات، ئەگەر دادگا هەبوو، ئەگەر دادگا نەبوو بە شەریعەتی خودا سێ بەسێ ژنەکەی تەڵاق دەدات و هەریەکەیان بۆی دەڕۆن و پیاوەکەش بانگ ناکرێت، ئەویش پەردە پۆش دەکرێت، چونکە چوار شاهید بە چاوی خۆیان شاهیدیان نەداوە فلانە کەسیان لە زینا کردندا بینیوە، نابێت کەس تۆمەتبار بکرێت، چونکە ئەمە گاڵتە نیە پەنا بە خودا، ﴿يَرْمُونَ﴾ واتە کەسێك بە فیشەك لێی بدەیت بەقەدەر ئەوە قورس نیە بوختانی پێ بکەیت، بوختان لە فیشەك پێوەنان قورسترە، بوختانی شەرەف و ناموس، بۆیە ئەم دینەی ئێمە ئەمەی فێرکردین کە بە هیچ شێوەیەك لە ئیسلامدا ژن کوشتن نیە، ئەو کاتەش خەڵك ئاسودە و ئیسراحەت دەبن کە نەصی ئەو ئایەتە قورئانیانە بە دادگایەکی وەکو پێغەمبەر ﷺ شەریعەت حکوم بەسەر خەڵکدا بکات..

ئەمە دەرسی ئەم شەومان بوو، خودای گەورە حەیا و حورمەتی هەموو لایەکمان پارێزراو بکەیت، ئەم بەسەرهاتە لەکاتێکدایە کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە مانگی (شعبان)ی ساڵی نۆی کۆچیدا بوو، هەندێکیش دەڵێن ئەو ساڵە بوو کە پێغەمبەری خودا ﷺ وەفاتی تێدا کرد، ئەم هەموو ساڵە قورئان هاتۆتە خوارەوە.. شاری مەدینەیە، کە پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو هەموو پەند و مەوعیزە و ئامۆژگاری کردووە، بەس ئەم شەیتانە هێندە زاڵمە، ئەگەر نەفسی ئینسان بەرەڵا بکەیت، کارەساتی ئاوا ڕوودەدات، بۆیە دەبێت ئینسان هەرچەند دیندار بێت، هەر چەند خوداناس بێت، هێشتا لەمەسەلەی تێکەڵ بوونی ژن و پیاودا زۆر وریا بێت..

خودای گەورە هەموولایەکمان بپارێزێت هەمو لایەکتان بە خودای گەورە دەسپێرم

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ) .



# وانەی بیستەم



## بابەت

## جیاوازی مەکە

## لەنێوان مناڵەکانتدا



# وانەی بیستەم

## جیاوازی مەکە لە نێوان منداڵەکانتدا

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى : ﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ . الكهف : ٤٦ .

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾﴾ . الفرقان : ٧٤ .

* عَنْ النُّعْمانَ بنِ بَشير ، أَنَّ عَمْرَةَ بنت رواحة ، سَأَلَتْ أَباهُ بَعْضَ الموهُوبَةِ مِنْ مالِ لإِبْنِها ، فالتوى بِها سَنَةً ، ثُمَّ بَدا لَهُ ... فَقالَتْ : لا أَرْضَى ، حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللهِ ﷺ على ما وَهَبْتَ لإِبْني ، فَأَخَذَ أَبي بِيَدي ، وأَنا يَوْمَئِذٍ غُلامٌ ، فَأَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقالَ : يا رَسُولَ اللهِ ، إِنَّ أُمَّ هذا ، بِنْتَ رَواحةَ ، أَعْجَبَها أَنْ أُشْهِدَكَ على الَّذي وَهَبْتُ لإِبْنِها ، فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (يا بَشيرُ ، أَلَكَ وَلَدٌ سِوى هذا ؟) قالَ : نَعَمْ ، فَقالَ : أَكُلُّهُمْ وَهَبْتَ لَهُ مِثْلَ هذا ؟ ، قالَ : لا ، فَقالَ فَلا تُشْهِدْني إِذاً ، فَإِنِّي لا أَشْهَدُ عَلى جَوْرٍ) - رَواهُ البُخاري (٢٥٨٦) وَ مُسْلِم : (١٦٢٣) وَ أَحْمَد في مُسْنَدِهِ (١٨٢٧٩) .

* وَ في رِوايَةٍ : (أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَ مِثْلَهُ ؟ قالَ : لا ، قالَ : فارْجِعْهُ) - رَواهُ البُخاري : (٢٥٨٦) .

* وَفي رِوايَةٍ : (أَعْطَيْتَ سائِرَ وَلَدِكَ مِثْلَ هذا ؟ قالَ : لا قالَ : فاتَّقُوا اللهَ وَ اَعْدِلُوا بَيْنَ أَولادِكُمْ ، قالَ : فَرَجَعَ فَرَدَّ عَطِيَّتَهُ) - رَواهُ البُخاريُّ : (٢٥٨٧) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (إعْدلُوا بَيْنَ أَوْلادِكُم في النحَلِ ، كَما تُحِبُّونَ أَنْ يَعْدلوا بَيْنَكُم في البِرِّ وَ اللُّطْفِ) ـ صَحيحٌ ، رواهُ الطَّبَرانِيُّ ، وَ صَحَّحَهُ الألْباني في صَحيح الجامع : (١٠٤٦) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (إنَّ لَهُمْ عَلَيْكَ مِنَ الحَقِّ أنْ تَعْدِلَ بَيْنَهُمْ ، كَما أَنَّ لَكَ عَلَيْهِمْ مِنَ الحَقِّ أَنْ يبرُّوكَ) ـ رَواهُ أَبوداود .

* قالَ الإمام البُخاري : وَ إذا أَعْطى بَعْضَ وَلَدِهِ شَيْئاً ، لَمْ يَجُزْ حَتَّى يَعْدِلَ بَيْنَهُمْ وَ يُعْطى الآخَرُ مِثْلَهُ ، وَلا يُشْهَدُ عَلَيْهِ ، وَقالَ النَبِيُّ ﷺ اعْدِلُوا بَيْنَ أَولادِكُمْ في العَطِيَّةِ) ـ فتح الباري .

* قالَ الحَسَن بن عَلي : بَيْنَما رَسُولُ اللهِ ﷺ يحدث أَصْحابَهُ ، إذْ جاءَ صَبِيٌّ حَتَّى إنْتَهى إلى أَبيهِ ، في ناحِيَةِ القَوْمِ ، فَمَسَحَ رَأْسَهُ وَ أَقْعَدَهُ عَلى فخذهِ اليُمْنَى ، قالَ فَلَبِثَ قَليلاً ، فَجاءَتْ إبْنَة لَهُ ، حَتَّى انْتَهَتْ إلَيْهِ فَمَسَحَ رَأْسَها وَ أَقعَدَها في الأَرْضِ ، فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : فَهَلّا عَلى فخذكَ الأُخْرى ؟! فَحَمَلَها عَلى فخذهِ الأُخرى ، فَقالَ الآنَ عدلْتَ) ـ رَواهُ البَيْهَقي في شعب الإيمان : (٨٧٠٠) .

* وروي أَنَسْ : أَنَّ رَجُلاً كانَ عِنْدَ النَبِيِّ ﷺ ، فَجاءَ إبْنٌ لَهُ ، فَقَبَّلَهُ وَ أَجْلَسَهُ عَلى فَخِذِهِ ، وَ جاءَتْ إبْنَة لَهُ ، فَأَجْلَسَها بَيْنَ يَدَيْهِ ، فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الا سَوَيْتَ بَيْنَهُما ؟!) ـ رَواهُ البَزّار وض رجالُهُ ثقات .

* زانایەك دەڵێ : ( ئەوەی كەزۆر گرنگە بۆ دایك و باوكەكان ، جیاوازی نەكردنە لە بەخێوكردنی منداڵەكانیاندا ، وێنەی دایك و باوك لە بەخێوكردن و پەروەردەكردنی

منداڵەکانیاندا بە وێنەی ڕووبارێکی ڕوونە، کە دێتە نێو باخی باخەوانێکەوە ، ئەگەر باخەوان جیاوازی بکات لە ئاودانی دارەکانیدا ، هەندێك کەم و هەندێك زۆر ئاو بدات ، ئەوا زەرەر لە هەردووکیان دەدات ئەو دارەی کەم ئاو بدرێت لاواز دەبێت ، یان بەرهەمی کەم دەبێت ئەوەی زیاتر لە پێویستی خۆی ئاو بدرێت خاکەکەی لاواز دەبێت و بەرهەمی دارەکە دەفەوتێت جوانترینی کردەوەکان ناوەند گرتنە ، پێدانی مافە بە هەموو خاوەن مافەکان) ـ کتێبی سپی ، ل١٩ .

## سەرچاوەکان :


١) فتحُ الباري ، شرح صَحيح البُخاري ، أحمد بنِ علي بن حَجر العَسْقَلاني ، ج٥ ، ص ٢٦٠ ـ ٢٦٣ ط : ٣ ، ٢٠٠٠ ، دارُ الفَيْحاء ـ دمشق .

٢) نِداءات الرَّسول ـ ﷺ لِأصْحابِه ، محمد عبدالعاطي بحيري ، ج٢ ص٩٩ . المكتَبة التوفيقيَّة .

٣) الوصايا المِنْبَريَّة ، محمد عبدالعاطي بحيري ، المجموعَة الثانيَة . ج ١ ، ص٥٠٣ ، المكتَبة التوفيقيَّة .

٤) ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر ، محمود مهدی اسلامبولی ، و : نەوا محمد سعید ، ل ١٩٧ ، چاپی دووەم ، ١٩٩٧ نوسینگەی تەفسیر .

٥) کتێبی سپی ، بەهزاد ڕەزایی ، ل١٩ .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز دانیشتنیشمان لەم زنجیرە باسەدا لەم شەوە پیرۆزەدا لەخزمەت پێغەمبەری سەروەر و پێشەوامانداﷺ بە سڵاوات لێدان لە دیداری ئەو خۆشەویستە دەست پێدەکەین:

(اللّهُمَّ صَلی عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلی عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلی عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

## باخەکەم بەس بۆ ئەو کوڕەم..

ئیماندارانی بەڕێز: ئەمشەو ئەو کەسەی موشکیلە و گرفتی هەیە هاتۆتە خزمەت پێغەمبەری پێشەوا بۆ ئەوەی چارەسەری گرفتەکەی بکات، پیاوێکی بەڕێزە، دەستی منداڵێکی گرتووە، مێرد منداڵێك تەمەنی دە بۆ یازدە ساڵێکە، هاتووە بۆ خزمەت پێشەوامان، بزانین موشکیلەی ئەم پیاوە چیە؟

(نەعمانی کوڕی بەشیر) گەنجێکە و بۆمان دەگێڕێتەوە، ئەم فەرموودەیە لەصەحیحی بوخاری و لە صەحیحی (موسلم)دا هاتووە.. (نعمانی کوڕی بەشیر) دەفەرمووێت: من منداڵبووم، مێرد منداڵێك بووم، بەتەواوەتی هەموو شتێکم فەهم دەکردەوە، ڕۆژێکیان دانیشتبووین لە ماڵەوە، باوکم وتی بە دایکم، ئافرەت حەز دەکەم ئەو حەدیقەیە، ئەو پارچە موڵکە بدەم بەم کوڕەم، ئەم کوڕە بچکۆلەیەم زۆر بچکۆلەیە و لەدوای هەموویان لەدایك بووە پێی دەڵێن دوا منداڵ و خۆشەویستە و حەز دەکەم تا بۆ خۆم لە ژیاندام ئەم حەدیقەیە بکەم بەناوی ئەم منداڵەمەوە..

باخێکیان هەبوو، پڕبوو لە دار خورما، کۆمەڵێك میوە جاتی جوان و ئەوانە، هەتا بۆخۆم لە ژیاندام حەز دەکەم ئەم باخچەیەم، ئەم حەدیقەیەم بۆ ئەو کوڕەم بێت.. دەفەرمووێت: دایکم وتی شتی وا نابێت، هەتا نەچیتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ..

(سبحان الله) لە ئافرەتی ژیر! ئەو ئافرەتە ئیمانداره وتی: پیاوەکە لە خۆتەوە بڕیار مەدە، جارێ بڕۆرە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، پرسێکی پێبکە، بزانە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت چی، ئەمە باشە تۆ ئەم کارە دەکەیت، یان نا، ئەها ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ وەفاتی کردووە پرس بە شەریعەتەکەی بکە..

دەفەرمووێت: باوکم دەستی گرتم و بردمی بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، پێغەمبەری خودا ﷺ لە ناو صەحابەکاندا دانیشتبوو، (فأخذ أبي بيده) باوکم دەستمی توند گرت، و لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ خزمەتی خۆشەویست.. (فقال يارسول الله ﷺ) ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ باوکم بە پێغەمبەری خودای ﷺ وت:

ئەی پێغەمبەری خودا ( إنَّ أُمَّ هذا بِنتَ رواحة، أعجَبَها أنْ أُشهِدَكَ له على الذي وَهَبْتُ لإبْنِها) دایکی ئەم کوڕە، کەکچی (ڕەواحە)یە ناوی (عەمرە) بووە (عمره ى إبنتُ رَواحه) دایکی (نعمانی إبن بشیر) بووە، ئەم خێزانەم کە کچی (ڕەواحە)یە و ناوی (عەمرە)یە، باسێکمان کرد لە ماڵەوە، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمە کوڕە بچکۆلەکەمە، زۆر زۆرم خۆشدەوێت. حەزم کرد ئەم حەدیقە و باخچەیەی پێشکەش بکەم، بەلام دایکی ناڕازی بوو.. وتی: دەبێت پێغەمبەری خودا ﷺ ئاگای لەم مەسەلەیە بێت..

هەتا پێغەمبەر ﷺ ئاگای لێنەبێت من ڕازی نیم، ئەم کارە بکەیت، وا منیش هاتووم جەنابت بە شاهید دەگرم کە ئاگادار بە من ئەم باخچەیەم لە ناو هەموو ئەولادەکانمدا بەخشی بەم کوڕەم، ئەوا لەسەرم تاپۆ کرد و تۆش شاهید بە..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (يا بشيرُ ألَكَ وَلَدٌ سِوى هذا؟ ) ئایە جگەلەم ئەم کوڕە هیچ منداڵی ترت هەیە؟ کوڕی ترت هەیە؟ کچی ترت هەیە؟ (قال نعم) وتی: بەڵێ ئەی

پێغەمبەری خودا ﷺ ئەرەوەڵا زۆر منداڵیکەم هەن، کوڕم هەیە، کچم هەیە، کچی بەشوو دراوم هەیە، کوڕم هەیە، ژنم بۆ هێناوە ئەولادیکەم لەسەر ماڵن بەس ئەم چونکە لەدوای هەموویان بووە زۆرم خۆشدەوێت حەز دەکەم ئەم چاکەیەی لەگەڵدا بکەم هەر لە ژیانی خۆمدا ئەمەی پێشکەش بکەم..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( أَكُلَّهُمْ وَهَبْتَ لَهُ مِثْلَ هذا؟ ) یەك یەکی ئەولادەکانت ئاوا پارچە حەدیقەیەکت بە ناوەوە کردوون، ئاوا پێشکەشت کردوون؟! یەك یەکیان، (قال: لا) وتی نەوەڵا ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، نەوەڵا بەس ئەمەیانم هەڵبژاردووە لە ناو هەموویاندا..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( فَلا تُشْهِدني إِذاً ) دەی کەواتە من مەکە بە شاهیدی ئەم مەسەلەیە، من مەکەرە ناو ئەم باسەوە، ( فَإِنِّي لا أَشْهَدُ على جَوْرٍ) چونکە من قەت شاهیدی لەسەر ستەم نادەم، شاهیدی زوڵم نیم، من مەخە ئەو باسەوە، من مەکە بە شاهیدی ئەم زوڵمە کە بۆ خۆت دەیکەیت، پێغەمبەر ﷺ توڕە بوو لێی، فەرمووی ناوی من مەخەرە ئەم مەسەلەیەوە، من مەکە بە شاهید لەم زوڵمەدا، چونکە تۆ ئەولادی ترت هەیە، چۆن لە ناو هەموویاندا هاتیت ئەمت هەڵبژارد..

ئەمە دەرسی ئەمشەومانە، کابرا پەشیمان بوویەوە و ڕۆشتەوە و، بە پێغەمبەری خودای گوت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ چی بکەم؟! فەرمووی برا تۆ مسوڵمانیت، وەسیەت بنوسە بڵێ هەر کاتێك کە من مردم، ئەولادەکانم لەسەر ماڵی دونیا برایەتیتان تێك مەدەن، بە شەریعەتی خودای پەروەردگار چی بۆ بڕیار داون ئەوەی لەدوای من بەجێما، چونکە هەر خودا دەزانێت کێ لە دوای کێ دەمرێت، جاری واهەیە باوك وادەزانێت کوڕەکەی لە دوای خۆی دەمێنێت.. هەر ئەوەندە دەزانێت کوڕەکە بیست ساڵ پێش باوکی دەمرێت..

کوڕەکە بە گەنجی دەمرێت باوکەکە هەر بە پیری ماوەتەوە، هەر خودا دەزانێت کێ پێش کێ دەمرێت، ئەگەر من مردم بەو شەریعەتەی خودای پەروەردگارەی کە بۆ

پێغەمبەری خودای ﷺ ناردووە میراتم لە دوا بەجێ ما، بەشی بکەن و مەکەن و هەر کەسێك حەقی خۆی بدەنێ لە کوڕ و لە کچ، کەس مەغدور نابێت، کابرا ڕازی بوو، موشکیلەکەی ماڵی کابرا کۆتای پێهات.. (نەعمان) ئەمەی لە یاد بوو گەورە بوو، ئەمە دەگێڕێتەوە لە صەحیحی (بوخاری) و (موسلم)دا تۆمارکراوە..

ئەمە دەرسی ئەمشەومانە، خۆشەویستان: کە ئینسان لە ژیانیدا خودا منداڵی دایە، ئەم باوکە یان ئەم دایکە دەبێت، ڕووبار بێت دەبێت ئاوێکی سازگار بێت، زانایەك نمونەیەکی جوان دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت:

"باوك و دایك بۆ ئەولادەکانیان وەکو ئەو کانیە ئاوە وان کە ئاوی لێ دێتە دەرەوە"

هەموومان بینیومانە باخچەی وا هەیە کانی تێدایە، کارێزێکی تێدایە، ئاوەکە لەسەرەوە دێتە خوارەوە، کابرای باخەوان ناو باخەکەی هەمووی کردووە بە نەمام و گوڵ و گوڵزار، هەمووی یەك سەرچاوە ئاوی دەدات، کە ئەو ئاوەیە کە لەو کانی و کارێزەوە دێتە دەرەوە، ئەگەر باخەوانەکە بڵێت: وەڵاهی من ئەم دارەیانم زۆر خۆشدەوێت ئەمەیانم زۆر خۆشدەوێت و گوڵ بژێریان بکات.. بێنێت ئاوەکە هەمووی ژێر ئەوەیانی بکات، توشی دوو ستەم دەبێت:

یەکەم: ئەو ئاوە کە دەیخاتە سەر دارەکە دارەکە دەرزێت، ئاوی لەحەدی خۆی زیاتر درابێت، لە موقابیلدا دارەکانی تر چیان لێدێت؟ دارەکانی تر وشك دەبێت، کەواتە زەرەی لە هەردووکیان دا، هەندێکیانی وشك کرد.. هەندێکیانی لە ئاودا ڕزاند، باوك و دایك ئەو ئاوەن، ئەگەر بەیەکسانی دابەشی بکات بەسەریاندا، ئەی ئەگەر بەیەکسانی دابەشی بکات و هەر کەسە و بەشی خۆی وەربگرێت هەموویان گەش و جوان دەبن، هەموو باخچەکە ڕازاوە دەبێت، هیچیان نارزێن، هیچیشیان وشك نابێت..

ئەها چەند نمونەیەکی جوانە، بۆ ئەولادەکانمان ئەو ڕووبارەین، با هەندێکیان نەرزێنین، با هەندێکیشیان وشك نەکەین، دوایی باخچەکە تێکدەچێت، باخچەکە

ماڵەکەتە، ئەی ئەو کوڕە عاجز دەبێت، ئەو کچە عاجز دەبێت، ئەو برایە ڕقی لەو برایە دەبێت، ئەمە ڕوودەدات، ئایە برا ڕقی لە برا دەبێت لەسەر ماڵی دونیا؟

بەڵێ، نەك هەر لەسەر ماڵی دونیا، بەڵێ نەك هەر لەسەر ماڵی دونیا، هەر لەسەر مەیلێك، لەسەر پێکەنینێك، لەسەر ڕویەکی خۆش کەدەیدەیت بەیەکێکیان و ئەوەی تریان لێی مەحرومە، ئەی قورئان ناخوێنینەوە؟!

## خۆشویستنی زۆر.. یوسفی دەر بەدەر کرد..

بەڕێزان: سورەتی (یوسف) تان خوێندۆتەوە، بە فلیمیش بینیومانە، کاتێك کۆمەڵە براکە، ئەوان ژن و منداڵیان هەبوو، خۆ منداڵیش نەبوون، گەورە بوون، گەورە تەمەنیان لە حەڤدە، هەژدە، بیست ساڵی دا بوو.. (یوسف و بنیامین) لە دایکێك بوون، دایکیان مردبوو، باوکیان هێندە ئالودەیان بوو بوو، (یعقوب) پێغەمبەر، کە پێغەمبەران مەعصومن، کەچی مەیلێکی قەلبی زیاتر دەدات بە (یوسف و بنیامین)، ئەو برایانە هەستیان پێکرد، ئەوەندەی ئەو باوکە دڵی لەگەڵ ئەو کوڕانەدا خۆشە، خۆ ئێمەش کوڕی ئەو باوکەین، بۆیە وتیان:

﴿لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ۝٨﴾

یوسف. (یوسف) و براکەی (بنیامین) خۆشەویسترن لەلای باوکمان لە ئێمە، ئەها (أَحَبّ) خۆ نەیفەرمووە: (یعقوب) موڵکی دا بە ئەمیان و نەیدا بەمیان، هیچی نەدابوونێ، لەسەر یەك سفرە نانیان دەخوارد.. ئێستا سەیری ورد بینی قورئان بکەن، ئەم بوغز و ڕقەی ئەم برایانە لە (یوسف و بنیامین) لەسەر موڵك و ماڵ نەبوو، بەس لەسەر خۆشەویستیەك بوو کە بۆ ئەمی دەردەبڕی و بۆ ئەوی دەرنەدەبڕی.. شەیتان چووە بن گلێنەیانەوە وتیان:

﴿ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ ﴿٩﴾﴾ يوسف. پەنا بەخودا وتيان: ﴿إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٨﴾﴾ يوسف. ئەم باوكەی ئێمە خەڵەفاوە، بەو باوكە پێغەمبەرەيان دەگوت خەڵەفاوە، وتيان ئەو باوكەی ئێمە خەڵەفاوە، ئەو باوكەی ئێمە سەری لێ تێكچووە، ئێمە كۆمەڵێك گەنجی بە توانای كاسب كار، كەچی ئەو دوو منداڵە سەيری بكە دايكی ئەوانی خۆشويستووە ڕوويان دەداتێ كەچی ڕووناداتە بە ئێمە (ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ) بۆ ئەوەی ئەم شتە كۆتايی پێبهێنن (يوسف) بكوژن، پەنا بە خودا، پەنا بۆ كوشتن دەبەن، بيكوژن..

﴿أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا ﴿٩﴾﴾ نەفی بكەن، بيكەنە بيرێكەوە، لە دەشت و سەحرايەكدا با گورگ بيخوات ﴿أَرۡضٗا يَخۡلُ لَكُمۡ وَجۡهُ أَبِيكُمۡ ﴿٩﴾﴾ لەبەرچاوی باوكم لای بەرن، ئەم دركە لە ژێر پێيدا دەربهێنن، ئەها سەيری بكە بەس بە مەيلێك، جا ئەگەر ماڵ كەوتە بەينيانەوە، ئەو كاتە ڕقەكە زياتر دەبێت..

ئەمە قورئان بە خۆڕايی تۆماری نەكردووە.. بەڕاستی كارەكەش كرا، ئەو كارەساتەی لێ قەوما، چل دانە ساڵ (يەعقوب) فرمێسكی وشك نەكردەوە.. لە چاری (يوسف و بنيامين) دا ئەو ماڵە لەيەك هەڵوەشا.. تەنها لەسەر مەيلێكی باوك كە ڕووی خۆشی دەدا بەو دوو كوڕەيان و ڕووی خۆشی نەدەدا بەوانی تر.. قورئان تۆماری كرد، بۆيە پێغەمبەری ئێمە ﷺ زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی نەهێڵێت باوك يان دايك مەيل زياتر بدات بە يەكێكيان .

## گرنگی دا بەكوڕەكەی.. كچەكەی وەلانا !

(ئەنەسی كوڕی مالك) بۆمان دەگێڕێتەوە، لە زەمانی خۆشەويستدا ( أَنَّ رَجُلاً كان عند النبي ﷺ) پياوێك لە خزمەت پێغەمبەری خودا بوو ﷺ، ( فَجاء إبن لَه، فَقَبَّلَهُ وَأجْلَسَهُ على فَخذه)

دەفەرمووێت: کوڕەکەی هات بۆلای، پیاوێك دوو منداڵی هەبوو، کوڕەکەی هات بۆلای یەکسەر باوەشی بە کوڕەکەدا کرد و ماچی کرد و لەسەر ڕانی ڕاستی خۆی دانا..

دەفەرمووێت: ( وجاءت إبنة له) کچەکەشی هات، دوای ئەوە منداڵێك بوو بەستەزمانە هەردووکیان منداڵ بوون، چوار بۆ پێنج ساڵ دەبوون، ڕایان دەکرد بەدوای یەکدا، کچەکە هات ( فَأجلَسَها بَينَ يده ) دەستی لەسەر شانی کچەکەی دانا، لەسەر ڕانی داینەنیشاند، باوەشی پێدا نەکرد و ماچی نەکرد و نەیخستە سەر ڕانی، لەبەر دەمی خۆیەوە داینیشاند.. پێغەمبەری خودا ﷺ توڕە بوو فەرمووی:

( ألا سَوَيت بَينَهُما؟ ) ئەوە بۆ وا دەکەیت، ئەوە بۆ بە عەدالەت مامەڵەت لەگەڵ نەکردن، باشە ئەویشیان هەر ئەولادت نیە، ئەویانت لەسەر ڕانی خۆت دانا و ماچت کرد و باوەشت پێدا کرد، ئەی بۆ ئەوەیان دەستت لەسەر سەری دانا و لەبەر دەمی خۆت داتنا، دەزانیت ئەو منداڵە چەند دڵی بە خۆی دەمێنێتەوە.. وا دەزانیت نازانێت، بەڵام تا مردن بیری ناچێتەوە.. دەفەرمووێت: ئینجا کابرا خێرا کچەکەی هێنا ماچی کرد و دەستی لەمل کرد و لەسەر ڕانی خۆی دانا..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( الآن عدلت ) ئێستا چاکت کرد، ئێستا باشت کرد، جارێکی دیکە ئەو هەڵەیە دووبارە نەکەیتەوە.. ئەها لە ماچێکدا، ئینجا ئینسان هەیە، باوکی وا هەیە، بە هەوەسی خۆی تەخشان و پەخشان بەو ماڵ و حاڵەوە دەکات، ئەو موڵکە بۆ ئەو کوڕەم، ئەوە بۆ ئەو کچەم، ئەوە بۆ ئەو، بەڵام ئەویشیان هیچ، لەئەنجامدا ئەم خێزانە، هەڵدەوەشێت، ئەم خێزانە ئەم برایانە، ئەم خوشکانە هەموویان لێك هەڵدەوەشێن، لەیەکتر دەبنە دوژمن.

باوکی واهەیە، باپیری واهەیە، منداڵی ئەم کوڕەیان، منداڵی ئەم کچەیان، لە باوەش دەگرێت، بەسنگیانەوە دەگوشێت، پارەیان دەداتێ، بەڵام منداڵەکەی کچەکەی تری، کوڕەکەی تری، هەر ئاوا بەحاڵ دەست دەهێنێت بەسەریدا و لەبەردەمی خۆی دایدەنێت.. دەزانیت دوایی ئەم کوڕ و کچە هەست دەکەن، باشە تۆ باوکی ئەوان نیت؟

باشە تۆ باپیرەی ئەوان نیت؟! تۆش دایە گەورەی ئەوان نیت؟! بۆ بۆ ئەوان وادەکەیت؟ خۆ ئەویش ئەولادتە. ئەمە رقێك دروست دەکات..

ئەمە وەکو ماڵی (یعقوب)ی وێران کردووە (یعقوب) پێغەمبەر سەلامی خودای لێبێت (یوسف)یان بەو دەردە برد، بردیان فرۆشتیان، کڕدرا، کردیان بە کۆیلە، دیارە کاری خودا پڕ لە حیکمەتە، بەڵام سەرئەنجامی دەرسێکی گەورەی بۆ ئێمە جێهێشت، کە ئەمە کارێکی زاڵمانەیە.. ( فإني لا أشهدُ على جَور ) ئەها پێغەمبەر ﷺ فەرمووی من مەکەن بە شاهیدی ستەم، ئەها ئەمە ستەمە ئەمە زوڵمە.

## ئامۆژگاری (سەعیدی کوڕی موسەیب) بۆ دایکان :

خوشکەکانم ئەگەر لەسەر تەندور بوون، کولێرە ئەها دەکەوێتە تەندورەوە، ئەوسا زیاتر نانی تەندور بوو، ئەها سوتا لەسەر پشکۆکان دەرت هێناوە بە حاڵی مابوو، ئەوەی تری هەمووی سوتا بوو، ئەگەر دات بە منداڵێکیان، سوتاوەکەش بدە بە منداڵەکەی تریشیان، خۆ سوتاو خواردنی زەرەرە، ئەگەر زەرەرت دا بە یەکێکیان، بیدە بەوەی تریشیان، ئەو منداڵەیان چاوی لەو سوتوی نانە و تاڵە و ناخورێت.. دەڵێت: بۆ دایکم دای بەویان، بۆ نەیدا بە من..

ئەمە دەرسێکی گەورە و دەرسێکی عەمەلیە کە ئیسلام فێرمان دەکات دەبێت منداڵەکان بە چاوی یەکسان سەیر بکرێت. ئەمە دەرسێکی گەورە فێری حکومەت دەکات، ئەی حکومەت باوکی میلەت نیە؟ باشە بۆ بۆ کوڕی ئەو هەموو شتێك هەیە، بۆ بۆ کوڕی ئەو فەقیرە هەموو شتێك نیە، تۆ باوکی، تۆ سەرکردەی وڵاتیت، تۆ وەزیریت، تۆ کاربەدەستیت، تۆ فەرمان بەریت.. ئەو حکومەتە باوکی ئەو میلەتەیە کاتێك کە ئەو میللەتە سەیر دەکات..

تۆ دەچیتە دائیرەیەکەوە رێزت لێناگیرێت، فلان کەسیش فەرموو فەرموو، قوربان وەرە ژوورەوە و چای بۆ بانگ دەکرێت.. تۆ یەکسەر ئەو حکومەتەت لەبەر چاو

دەکەوێت. بڕواناکەم هیچ هاوڵاتیەکی ساڵح هەبێت ڕقی لە حکومەت بێت. هیچ کەسێك ڕقی لە نیشتیمانی خۆی نیە، بەس ئەمە وادەکات تۆ دەچیت تۆ هاوڵاتیت، دەڵێیت ئەم حکومەتە باوکمە، ئەو سەرکردەیە من هەڵمبژاردووە، دەبێت وەکو باوکێکی دادگەر سەیرم بکات..

کاتێك بە عەدالەت سەیری هاوڵاتیەکانی نەکرد، ئەو فەرموو فەرمووی لێدەکرا، تۆش لە پەنجەرەکەوە کیتابێکت بۆ ئیمزا نەدەکرا، تۆ خوا خواتە بڕوخێت، دەڵێت با خۆشم لەناو بچم بەلأم با ئەم کاربەدەستەم لەبەرچاو لا بچێت.. ئەوە سەرەنجام ئەو وڵاتە دەشێوێت، سەرەنجام دەستی دەرەکی دێتە ناویەوە.. سەرەنجام تەجەسوسات ڕوودەدات.. کابرا تا ئامادەیە بێتە موخەبەراتی وڵاتانی دیکە، بەس ئەگەر حکومەت عەداڵەت بوو، بەیەکسانی سەیری هاوڵاتیانی دەکرد.. هەموو هاوڵاتیەك ئەو حکومەتە بە هی خۆی دەزانێت، حەزدەکات بمێنێتەوە..

ئەم فەرموودانەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەرس و عیبرەتێکە بۆ هەمووان ئومێدەوارم کە (انشاء الله) ئێمەش دەرسمان لێوەرگرتبێت، بە چاوی یەکسانی سەیری ئەولادەکانمان بکەین و خودا ئەولادەکانمان ساڵح بکات.. خودا ئێوەش بکات بە دایك و باوکێکی تێگەشتوو، پەروەردەکارێکی باش بۆ منداڵەکانمان، هەموومان لە خزمەت دینی پیرۆزی ئیسلامدا بین.. تا شەوێکی تر و بەرنامەیەکی تر بە خوداتان دەسپێرم..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ) .

# وانەی بیست و یەکەم

## ئاگاداری هاوسەری ژیانت ببە و تەلاقی مەدە

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تعالى :﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ﴾البقرة : ٢٢٩ .

* عَنْ إبْنِ عَبّاس ، قالَ : كانَ الرَّجُلُ إذا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ فَهُوَ أحَقُّ بِرَجْعَتِها وَ إنْ طَلَّقَها ثَلاثاً ، فَنُسِخَ ذالِكَ بِقَوْلِهِ تَعالى (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ)البقرة : ٢٢٩. ـ رَواهُ أصْحابُ السُّنَن ، بِسَنَدْ صَحيحٍ .

* عَنْ إبْنِ عَبّاسٍ ، ، قالَ : كانَ الطَّلاقُ عَلى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَ أَبي بَكْرٍ وَ سَنَتَيْنِ مِنْ خِلافَةِ عُمَرَ ، طَلاقَ الثَّلاثِ واحِدَةً ، فَقالَ عُمَرُ ابْنُ الخَطّابِ : إنَّ النّاسَ قَدِ اسْتَعْجَلوُا في أَمْرٍ قَدْ كانَتْ لَهُمْ فيهِ اناةٌ ، فَلَو أمْضَيْناهُ عَلَيْهِمْ ، فَأَمْضاهُ عَلَيهِمْ)

ـ صَحيحٌ . رَواهُ مُسْلِم : (١٤٧٢) .

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَتَعالى :﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ﴾البقرة : ٢٣٠ .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إذا طَلَّقَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ تَطليقَتَيْنِ ، فَلْيَتَقِ اللهَ في الثالِثَةِ ، فَإمّا أنْ يمسكها فيحسن صُحْبَتَها ، أَوْ يسرحَها فَلا يَظْلِمْها مِنْ حَقِّها شَيْئاً) .

ـ أخرجَهُ الطَّبَري بِسَنَدٍ صَحيح ـ فتح الباري ج٩ ، ص٤٥٤ .

* عَنْ عائِشَةَ ، قالَتْ : أَنَّ إِمْرَأَةَ رِفاعَةَ القُرَظِيِّ ، جاءَتْ إِلى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقالَتْ : يا رَسُولَ اللهِ : إِنَّ رِفاعَةَ طَلَّقَني ، فَبَتَّ طَلاقي ، وَ إِنِّي نَكَحْتُ بَعْدَهُ عَبْدَالرَّحمان بنَ الزُّبيرِ القُرَظي ، وَ إِنَّما مَعَهُ مِثْلُ الهُدْبَةِ ، قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَعَلَّكِ تُريدينَ أَنْ تَرجِعِي إِلى رِفاعَةَ ، لا ، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ وَ تَذوقِي عُسَيْلَتَهُ) ـ رَواهُ البُخاري : (٥٢٦٠) .

* وَ جاءَتِ الغُمَيْصاءَ ، أَوِ الرُّمَيْصاءَ ، إِلى النَبِيِّ ﷺ تَشْتَكِي زَوْجَها ، أَنَّهُ لا يَصِلُ إِلَيْها ، فَلَم يَلْبَثْ أَنْ جاءَ زَوْجُها ، فَقالَ : يا رَسُولَ اللهِ هِيَ كاذِبَةٌ وَ هُوَ يَصِلُ إِلَيْها ، (وَ فِي رِوايَةٍ : أَنَّهُ يَنْفِضُها نفضَ الأديم) ، وَ لكِنَّها تُريدُ أَنْ تَرْجِعَ إِلى زَوْجِها الأَوَّلِ ، فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيْسَ ذالِكَ لَكِ ، حَتَّى تَذُوقي عُسَيْلَتَهُ)

ـ رَواهُ النَّسائِيُّ .

## سەرچاوەکان :


١) فتح الباري شَرْح صَحيح البُخاري ، إِبْنُ حَجَر العَسْقَلاني ، ج٩ ، ص٤٤٨ . ط : ٣ ، ٢٠٠٠ ، دارُ الفَيْحاء ، دمشق .

٢) التّاج الجامِع للأُصُول في أحاديْثِ الرَّسُول ، الشيخ منصور علي ناصِف ، وەرگێرانی : نوری فارس حمه خان ، ب٢ ، ل٥٦٠ ، ل٥٦٦ ، چاپی چوارەم ، ٢٠٠٨ ، دار المعرفة ، بيروت ، لبنان .

٣) رَوضَةُ المُتَنَزِّه ، شَرَحُ بِدايَةِ المُتَفَقِّه ، أَيْمَن بن علي مُوسى ، ج٣ ، ص١٧٠ . ط : ١ ، ٢٠١٠ ، دار إِبْنُ رَجَب .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز: لە شەوی پیرۆزی جومعەدا لە لە ماڵی خودای پەروەردگاردا، ئەمە فەزڵی خودایە کە کۆبووینەتەوە، هەر شەوێك لە خزمەت پێغەمبەری ئازیزدا ﷺ ئینسان دادەنیشێت و بەسەرهاتێك، موشکیلە و گرفتی کەسێك، کە هەزار و چوارسەد و سی وسێ ساڵ زیاتر لەمەوپێش، هاتۆتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، گرفتەکەی خۆی باسکردووە، ئەمڕۆ مسوڵمانان هەمان گرفتیان بۆ دروست دەبێت، ئەوە سوپاسی خودای دەوێت کە ئێمە لە مەجلیسی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتووین.. خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لەژێر ئاڵای ئەو خۆشەویستەدا کۆمان بکاتەوە.. هەر وەکو ئێستا لە ماڵێك لە ماڵەکانی خۆیدا لەسەر سفرەی قورئان و سونەتی پێغەمبەر ﷺ کۆی کردووینەتەوە، خودایە لێمان قبوڵ بکەیت، هیدایەتمان بدەیت، دامەزرا و ڕاوەستاومان بکەیت..

لەم شەوە پیرۆزەدا هەروەکو جارانی پێشو عەرزم دەکردن، بیکەین بە واجبێك لەسەر شانی خۆمان، بەڕاستی بەتایبەت لە ڕۆژانی جومعەدا، ئاگاداربین سڵاواتەکان لە دیداری خۆشەویست لە کیسمان نەچن، لانی کەم سەد سڵاوات لێبدەین، هەر زۆر ئاسانە، لەدوای نوێژی بەیانی چوویتەوە، حەق وایە ئینسان نەخەوێتەوە، هەتا سەد سڵاوات لێدەدات.. نەوەك لە ڕۆژدا مەشغوڵ بیت. ئەگەر ئیشێکت بۆ هاتە پێش ئەو مەسافەی لێرە پێش نوێژی جومعە دادەنیشیت، سەد سڵاواتەکە لێبدە..

هەر کەسێك سڵاوات زۆر لە دیداری پێغەمبەر ﷺ لێبدات، خودای گەورە گوناحەکانی ڕەش دەکاتەوە، خودا بەرەکەت دەخاتە ماڵیەوە، خودا بەرەکەت دەخاتە قسەیەوە، خودای گەورە دوعاکانی گیرا دەکات.. هەر دوعایەك بکەیت هەتا حەمد و سەنای خودا

(الحمد لله) نەکەیت و سلاوات لە دیداری پێغەمبەر ﷺ لێنەدەیت ئەو دوعایە بەرەو ئاسمان بەرز نابێتەوە..

## گەنجێك بەصەڵاوات بۆنی خۆش بوو !!

گەنجێکی خودا پەرست و خوداناس هەبووە، لە کتێبەکاندا لە کتێبی حەدیسدا تۆمارکراوە.. دەفەرمووێت: ئەو گەنجە بەیانیەکیان کە لەخەو هەڵدەستێت، چوو بۆ مزگەوت هەموو خەڵکی مزگەوتەکە سەریان سوڕما بوو، خودایە ئەم بۆن عەترە خۆشە چیە؟! ئێستا یەکێك بێت لەناو ئێمەدا عەترێکی زۆر نایابی پێوە بێت، هەر یەکێك لە ئاستی خۆیەوە هەست دەکات بۆنی عەترێك هاتە ژوورەوە، هەموو خەڵکەکە ئەهلی جەماعەتەکە، سەریان سوڕما بوو!

خودایە ئەم بۆنە خۆشە چی بوو بلاو بوویەوە؟! ئەو لەوی پرسی ئەو بۆنە ئێستا پەیدا بوو، ئەو لەوی پرسی: دوایی مەعلوم بوو ئەمە گەنجێك هاتە مزگەوتەکەوە، هاتە صەفی جەماعەتەوە.. هەموو صەفی ئەو مزگەوتە پڕبوو لەبۆن، وەلا وتیان کاکە ئەمە چ عەترێکە؟ لە کوێت کڕیوە؟ بەم بەیانیە زووە لە خۆت داوە..

وتی: بڕواتان بێت هیچ عەترێکم بە خۆمەوە نەکردووە و لە ماڵەوە عەترم نیە، وەلا خەڵکەکە وازیان لێهێنا و چووە ماڵەوە، لە ماڵەوە دایك و باوك و خوشك و برا هەمووی هەستان.. باشە ئەم عەترە چیە؟! ئەمە لە مزگەوت ئەم عەترەیان پێوە کردوویت؟

وتی: هەستن بۆ نوێژ من لە مزگەوت گەڕامەوە.. وتی نەوەلا لە مزگەوتیش کەس عەتری بە خۆیەوە نەکردووە.. وتیان: بابە وەلاهی بۆنی عەترێکی زۆر عەجیب دێت.. ئەمجا ئەو میوانە دەهات، ئەو دەهات، ئەو لێی نزیك دەبوویەوە.. باشە ئەم عەترەت لە کوێ کڕی؟! خۆزگە ئێمەش دەستمان دەکەوت، بۆنی واهەر زۆر سەرنج ڕاکێش وخۆشە..

دەفەرمووێت: ئەم کابرایە وتی وەلاهی ناچار بووم، ئەوەندەم پرسیار لێدەکەن دەترسم توشی درۆ کردن بم، خۆ من ڕاستە هیچ کەس عەتری پێوە نەکردووم.. بەلام

وەڵاهی واقعەکەی ئەمە بوو من زۆر سڵاوات لە پێغەمبەری خودا ﷺ لێدەدەم، ئەوەش لەبەینی خۆم و خودادا کەس ئاگای لێنەبووە و لای کەس باسم نەکردووە.. ئەو شەوە کە بەیانیەکەی چووم بۆ مزگەوت لە خەومدا بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشتم..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بێنە ناو دەمت ماچ بکەم، چونکە تۆ زۆر منت خۆش دەوێت، بەو دەمە زۆر سڵاوات لەمن دەدەیت..

دەفەرمووێت: وتی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من دەستی تۆ ماچ دەکەم، حەدی ئەوەم نیە، من شایەنی ئەوە نیم دەمی پیرۆزتی پێوە بکەوێت، شەرمم کرد، عارەقی خەجاڵەتیم کرد لە خزمەتی خۆشەویستی خودا، من پەلامارمدا دەستی پێغەمبەری خودا ﷺ ماچ بکەم، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ کەزانی من شەرم دەکەم و دەلەرزم لە خزمەتیدا، ئیتر دەمی موبارەکی بە ڕوومەتمەوە ناو، ڕوومەتی ماچ کردم.. ئەو بۆنە هی ئەو ڕوومەتەمە دێت..

دەفەرمووێت: لە دوای ئەوەوە چل دانە ڕۆژ من بۆنی عەتر و میسکی بەهەشتم لێدەهات، ئیتر بە هەر شوێنێکدا دەڕۆشتم، لە بازاڕدا، لە ناو میواندا، لە ماڵی خۆمان، لە مزگەوتدا، ئەمجارەکانێ خەڵك بەڕاستی بۆیان مەعلوم بوو کە بەڕاستی بەرەکەتی سڵاوات چ بەرەکەتێکی گەورەیە، بە تایبەت لە ڕۆژانی جومعەدا، پێغەمبەری خودا ﷺ بە گوێی خۆی گوێی لە سڵاواتەکانی تۆیە، ئەوە حەدیسی صەحیحی لەسەرە دەفەرمووێت:

خودای گەورە یەکێك لەو فەزڵانەی کە لەگەڵ ﴿محمد المصطفى﴾ دا کردوویەتی ئەوەیە: لە ئومەتەکەی دابڕاو نیە، هەر کەسێك لە ڕۆژی جومعەدا سڵاواتی لێبدات، پێغەمبەری خودا ﷺ بە گوێی خۆی دەیبیستێت، یەکسەر دەنگەکە دەگاتە گوێی پێغەمبەر خودا ﷺ، هیچ کارێکیش بۆ خودا ئەستەم نیە.

بەڵێ خۆشەویستان لە خزمەت پێغەمبەری خوادادا ﷺ سڵاوات لێدەدەین و دەڵێین: (اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَسَلَّم)

(اللّهُمَّ صَلی عَلی حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سلِّم)
(اللّهُمَّ صَلی عَلی شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ وَ سلِّم)

## چەند جار تەڵاقی داوم و بۆیشم خراپە..

لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ، لەو مزگەوتە پیرۆزەی کە پێی دەڵێن مزگەوتی نەبەوی، کە یەك نوێژ تێیدا بە هەزار نوێژ حیسابە، خودا بە نسیبمانی بکات نوێژی تێدا بکەین، خۆشەویست لەلای مێمبەرەکەیەوە دانیشتووە، لەو کاتەدا ئافرەتێك هات.. ئافرەتێکی بەڕێز، ئافرەتێکی داپۆشراو، بە حەیا و حورمەت. بەڵام قوڵپی گریان لە دڵیدا بوو، بەڵام زۆر مەغدور و زۆر غەدر لێکراو هات بە گریانەوە..

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من بەڕاستی نازانم چی بکەم؟

دەفەرمووێت: دەی بڵێ کچم، خوشکم، چیت لێ قەوماوە بیڵێ، لەبەر گریان قسەکەی بۆ نەکرا..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆرە ماڵەکەمانەوە، بڕۆ بۆ ژوورەکەی (عائیشە).

ژوورەکەی حەزرەتی (عائیشە) وەکو حوجرەیەك بوو بەسەریەوە، پێغەمبەر ﷺ ئێستا لەو شوێنەدا نێژراوە، لەو ژوورەدا، دەفەرمووێت: ئافرەتەکە بە گریانەوە قسەکەی بۆ نەکرا لای پێغەمبەر ﷺ، چوو بۆ ژوورەوە، دواتر (عائیشە) هات وتی:

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من تۆزێك ئاوم دایە و هێواشم کردەوە و وتم موشکیلەکەت چیە؟ وتی: وەڵاهی من گیرۆدەم بە دەست پیاوێکی خراپەوە، پیاوێکم هەیە بەڕاستی وەکو ئینسانێك سەیرم ناکات، نە ئەوەیە کە بژیم نە ئەوەیە کە بمرم، پێم خۆشە بمکوژێت و نەجاتم بێت، بەڵام ڕزگارم نابێت لە دەستی، دەڵێت بە زەلیلی دەتهێڵمەوە، نە ئەوەیە تەڵاقت بدەم و لێم جیاببیتەوە، نە ئەوەیە حەڵاڵم بیت..

ئەمە دەستوری پێش ئیسلام بوو، کابرا ژنەکەی سێ بە سێ تەڵاق دەدا، دواتر سێ عوزری پێنەچوایە لە مەسافەی ئەو سێ عوزەدا دەیوت: من تۆم گێڕایەوە ژێر نیکاحی

خۆم و کردمیەوە بە خێزانی خۆم، دەیکردەوە بە خێزانی خۆی، وتی: من تۆ بەو دەردە دەبەم هەموو جارێك سێ بە سێ تەڵاقت دەدەم، نایەڵم عیدەت بەسەر بچێت دەتگێڕمەوە، نایەمەلات دیسان سێ بە سێ تەڵاقت دەدەمەوە.. جارێکی دیکەش دەتگێڕمەوە.. هەزار جار کابرا ئاوا تەڵاقی بخواردایە ئەم ژنە ڕزگاری نەدەبوو..

وتی: ئەو پیاوە پێم دەڵێت بەو دەردەوە دەتلێنمەوە، نە ئەوەیە مێردت هەبێت، نە ئەوەیە تەڵاق دراو بیت بۆ خۆی جارێکی تر شوویەکی هەبێت، ژیانێکی سەربەستی هەبێت.. لە ماڵیشەوە زۆرم بۆ خراپە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، هانای هێناوە، بزانین خودای گەورە چ ڕێگە چارەیەك بۆ ئەم ئافرەتە زەلیل و داماوە کە ڕزگاری بێت لە دەستی، کە ئەم سەد جار زیاتر تەڵاقی داوە، هەر تەڵاق دەخوات دواتر لە ڕجعەتدا دەیگێڕێتەوە لە سێ عیدەی بێ نوێژیدا، پاشان دیسان تەڵاقی دەداتەوە، ئەم ئافرەتە بەردەوام لەم ئازارە دەتلێتەوە..

## تەڵاق دوو جارە

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: نازانم چی پێ بڵێین، ئیتر هەمووی خەڵك ئەوە باری پێوە گرتووە.. لە پێش ئیسلامەوە ماوەتەوە.. یەکسەر خودای پەروەردگار حەزرەتی (جیبریل)ی ناردە خوارەوە یەکسەر بە هانای ئەو ئافرەتە و هەموو ئافرەتەکانی ترەوە هات خودای گەورە فەرمووی: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ ﴿٢٢٩﴾﴾ تەڵاق خواردن هەر دووجار سەرفی نەزەر لەسەر پیاو دەکرێت.. لە جاری سێیەمدا: ﴿فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ﴾

جاری یەکەم: پیاوەکە تەڵاقی خوارد بۆی هەیە ژنەکەی بگێڕێتەوە..

جاری دووەم: بۆی هەیە بیگێڕێتەوە..

جاری سێیەم: تەڵاقی خوارد مەجالی نامێنێت..

لە جاری یەکەم و دووەمدا مەجالی هەیە، لە جاری سێیەمدا کۆتایی پێ دێت، لە دوای دوو جارەکە، سێیەم: (فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ) دەبێت ببێتە پیاوێکی ڕێك و پێك و ژنەکەشی

تۆزێك بە خۆیدا بچێتەوە.. ژیانێكی پڕ بەختەوەری بەسەر بەرن، (أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) یان جاری سێهەم كە تەڵاقی خوارد بۆ دواجار ئەم ژن و پیاوە لەیەك دەترازێن، ئیتر پێغەمبەر ﷺ بەم ئافرەتەی فەرموو ئەمجارە لەگەڵ جارێكی تر مافی ئەوەی هەیە ئەم كارە بكات.. جاری سێهەم لێی جیا دەبێتەوە، ئەگەر بڵێت تۆ مەجالت نەماوە تۆ ڕزگارت دەبێت لەم پیاوە، ئەمجا خودای پەروەردگار ئەمەی دیاری كرد.

ئەمە باسەكەی ئەمشەومانە، تەلاق سێ جارە، جاری یەكەم و جاری دووەم، لە جاری سێهەمدا پیاوەكە لێی قبوڵ ناكرێت.. لە جاری سێهەمدا تەڵاق خواردن نەماوە دەبێت ڕێك و پێك ژنەكەی ڕابگرێت، دوو ئینزاری سووری وەرگرتووە، جاری سێهەم لەیەك جیا دەبنەوە.. بەڵام ئەگەر بوو بە ئینسانێكی مەرد و ڕێك و پێك یەك تەڵاقی بۆ دەمێنێت، ئەو تەڵاقەش كافیە بۆ ئەوەی ژیانی ئەو ژن و مێردە نەفەوتێت..

### تەڵاقی سێ بەسێ

لەسەر ئەم ئایەتە قورئانیە لە زەمانی پێغەمبەر ﷺ دا كابرایەك ئەگەر سێ بە سێ تەڵاقی بخواردایە، بیوتایە یەك و دوو سێ بە سێ تەلاقم كەوتبێ، پێغەمبەر ﷺ هەر بە یەك تەڵاق دایدەنا، مادام لەیەك مەجلیسدا تەلاقی خواردووە یەك جاری خواردووە، هەتا چەند جاری بخواردایە چونكە هەر یەك ڕووداو بووە، هەر یەك تەڵاق بووە لە زەمانی ئیمامی (أبو بكر) یشدا هەر وابوو.. لە زەمانی حەزرەتی (عمر)دا، كابرا هەبوو سێ بە سێ تەلاقی دەخوارد، جاری دووەمیش سێ بە سێ تەلاقی دەخوارد، ئەمە دەبوو بە خوی عالەم، حەزرەتی (عمر) فەرمووی:

لەكەسی قبوڵ ناكەم ئەم سوكایەتیە بە ئافرەتان بكات. هەر كەسێك بڵێت سێ بە سێ تەلاقم بكەوێت، یان هەرسێ تەلاقم بكەوێت، یەكسەر هەرسێ تەلاقەكەی دەخەین.. ئەوە لە زەمانی ئیمامی (عمر)دا، تەلاقی سێ بە سێ بڕیاردرا بەیەك جار بكەوێت، بۆیە ئیمامی شافیعی دەفەرمووێت قەولی خەلیفەكانی ڕاشیدین وەكو قەولی پێغەمبەر ﷺ

ئیعتیباری پێدەکرێت، مادام ئیمامی (عمر) ئەم قەولەی داهێنا، هەر کەسێك لای مەزهەبی شافیعی یەك جار و دوو جاری نیە، دەتوانێت بە یەك تەڵاق هەرسێکی بکەوێت، ژنەکەی تەڵاق دەدات..

بەڵام لای عولەمایانی تر دەفەرموون: ئەگەر کابرا سێ بە سێ تەڵاق بخوات، ئەگەر پەشیمان بوویەوە، خەجاڵەتی دەربڕی، بە خۆیدا چوویەوە، هەر تەڵاقێکی دەکەوێت. جاری دووەم خودا نەخواستە سێ بە سێ تەڵاق بخوات لەیەك مەجلیس و لەیەك حادیسەدا، هەر یەك تەڵاقی دەکەوێت.. لە جاری سێهەمدا کۆتای دێت..

لە جاری سێهەمدا ئەم ژن و پیاوە کۆتای دێن.. ئەی کەی بۆی حەڵاڵ دەبێتەوە؟

بە هیچ شێوەیەك بۆی حەڵاڵ نابێتەوە، لە دوای ئەوەی سێهەم جار تەڵاقی خوارد ﴿فَإِن طَلَّقَهَا ۞﴾ تەڵاقی سێهەمی ژنەکەی دا ﴿فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ﴾ جارێکی دیکە نابێت دەستی بەم پیاوەی خۆی بکەوێتەوە بە ژن و مێردایەتی، ﴿حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥ﴾ هەتا مێردێکی دیکە دەکات. هەتا دەبێت پیاوێکی دیکە بچێتە لای..

﴿فَإِن طَلَّقَهَا﴾ ئەگەر مێردە دووەمەکەش تەڵاقی دا، ئەم ئافرەتە لە مێردەکەی یەکەمی ئەگەر حامیلە بوو، دەبێت حەملەکەی دانێت.. ئەگەر حامیلە نەبوو، سێ جار بکەوێتە بێ نوێژیەوەو پاك بێتەوە.. ئەگەر بێ نوێژی نەدەشت و عوزر تەواو بوو، ئەوا سێ مانگ دابنیشێت، لەمانگی چوارەمدا شوو بکاتەوە، ئەویش لەگەڵیدا نەگونجا، ئەویش بەیەکەوە ناکۆك بوون، تەڵاقی دایەوە، لەویش عیدەی بەسەر بچێت ئەمجا ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ﴾ ئەم ژن و پیاوە ئەگەر بۆیەك پەشیمان بوونەوە، ژنەکە بۆی هەیە شوو بکاتەوە بە پیاوی یەکەمی.

ئەمە قورئانە ﴿إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۞﴾ئەگەر زانیان بە خۆیاندا چوونەوە، ئەمجا سوکایەتی بەیەك ناکەن و ئەمە دوا جاریان دەبێت، لێیان بۆتە

دەرس و عیبرەت.. دوای ئەوەی ژنەکەی شووی بە پیاوێك کردەوە پیاوەکە چووە لای، بۆمێردی یەکەمی حەلاڵ دەبێتەوە.. بەلاّم ئەمە (مارە بە جاش بێت) دوور لە ڕووی جەنابتان، ووشەکە جوانیش نیە، بەس لە کوردەواریدا باوە.. یەعنی کابرایەك سیّ بە سیّ تەلاّقی دابێت، بە یەکێك بڵێت وەرە ئەمشەو لێت مارە دەکەین و زوو تەلاّقی بدەوە.. بەڕێزان: ئەوە هەر لە ئەساسدا بەتاڵە، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ (لَعنَ اللهُ المُحَلِلَ وَ المُحَلَلَّ لَهُ) نەعلەت و نەفرەتی خودا لەو کەسە بێت کە خێزانەکەی بەو حاڵەتە چاك دەکاتەوە لەعنەتی خوداش لەو کەسە بێت کە ئەو کارە بەرامبەر ژنی خەڵك دەکات. نەعلەتی خودای لێبێت.. دوور بێت لە ڕەحمەتی خودا، بۆ؟ چونکە ئەمە هێشتا عیدەی بەسەر نەچووە، لە پیاوێکی دیکەی مارە دەکەنەوە..

## سیّ مەرج بۆ شووکرنەوەی ئافرەتی تەڵاق دراو:

یەکەم: لە نیکاحدا نابێت مەرج هەبێت، نابێت هیچ مەرجێك هەبێت نابێت بڵێت: دەبێت تەلاّقی بدەیتەوە، ئەگەر کوڕێك بچێتە خوازبێنی کچێك، بابی کچەکە بڵێت: ئەوە ئینکاح و تەزویجم کرد، ئەو کچەی خۆم لە تۆ مارەکرد و هەتا دەمریت، خۆ مرد لەیەك جیادەبنەوە، هەتا مردن ژن و مێردن.. چونکە وشەی تا دەمرنی تێدایە، ئەو نیکاحە بەتاڵە، نەخێر دەبێت نیکاح تا قیامەت بێت.. هەتا هەتایە لە تۆم مارەکرد. نابێت بڵێت: تا دەمریت ئەگەر هەتایەکی تێدا بوو، ئەو نیکاحە بەتاڵە، ئەم دەڵێت لێت مارە دەکەین و سبەی تەلاّقی بدە.. ئەوە ئەو تەلاّقە دانامەزرێت.

دووەم: ئەگەر تەلاّقی بداتەوە هاتوون لە مێردی یەکەمیان مارە کردۆتەوە، هەر ئەو شەوە بەیانیەکەی، ئەی کوا عیدەی لە مێردی دووەمی؟ ئەمجا ئەمە دەبێت بەم شێوەیە ژنەکەی تەلاّق بدرێت.. دوای ئەوەی نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك شوو بە پیاوێکی دیکە بکاتەوە، قەدەری خودای وایە ئەم ژنە لای ئەم پیاوەش ناحەوێتەوە، بەیەکەوە

ناگونجێن، ژنەکە ئەوی بەدڵ نیە، یان پیاوەکە بە دڵی نیە، کە لەویش جیابوویەوە بە ڕەزامەندی خۆیان عیدەی بەسەرچوو ئەگەر زانیان..

خودای گەورە دەفەرموێت: ئەگەر زانیان ئەم ژن و مێردە بەیەکەوە دەگونجێن، ئەگەر ئەم ژن و مێردە بۆیەك پەشیمان بوونەوە، لە شەریعەتی خودادا بۆیان هەیە جارێکی دیکە نیکاح تازە دەست پێبکەنەوە.. کەواتە کەسێك سێ بە سێ تەڵاقی کەوت، هەتا ئەم ئافرەتە شوویەکی تری نەکردەوە، بە دڵنیاییەوە حەڵاڵ نابێت بۆ پیاوەکەی خۆی.

سێیەم: مەرجیش ئەوەیە: ئەم مێردی دووەمەی دەبێت جیماعی شەرعی لەگەڵ کردبێت.. ئەمە لە شەرعدا باسکراوە، لە ڕووی جەنابتان خودا نەخواستە وشەیەکی ناشرین نەبێت باسی دەکەم، دەبێت جیماعی شەرعی ئەم پیاوی دووەمە لەگەڵ ئەم ژنە کردبێت.. ئەگەر پیاوەکە (عەنین) بوو لە ڕووی شەرعەوە جیماعی پێنەدەکرا، مێردی دووەم نەیدەتوانی جیماع بکات، ئەوە هەر دروست نیە، ئەوە دەبێت شوو بە پیاوێکی دیکە بکات، ئەم مێردەیانی حیساب نەبووە.. مادام نەیتوانیوە جیماعی لەگەڵدا بکات.. خودی مارەکردنەکە حیساب نیە، دەبێت ئیلا جیماعی شەرعی لەگەڵ کردبێت..

ئەمە لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ ڕوویداوە، بەڵێ ئەو زەمەنی ئازادیە کە خەڵك بە ئەوپەڕی ئازادییەوە قسەی کردوە، ئێستا ئێمە هەتا زۆر وشە دەڵێین ڕەنگە لەلاتان نامۆبێت. ئێمە بە ئەدەبێکەوە دەیڵێین، بەڵام لە زەمانی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ ئەم شتانەی زۆر بە ئاسایی وەردەگرت.. چونکە مافی کەسێکە.

## هەتا هەنگوینە بچکۆلەی یەکتر نەخۆن.. ناگەڕێیتەوە..

دەفەرموێت ژنێك هەبوو، ژنی (روفاعە ی قوریزی) بوو، ئەو کابرایە ناوی (روفاعە) بوو، لە هۆزی (قوریزی) بوو، هات وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، ژنەکە لەبەر چاوی ئەو هەموو صەحابەیەدا، لەوانەیە هەزار کەسی لێ بوو بێت..

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ مێردەکەم سێ بە سێ تەلاقی دام، ئێستا شووم کردووە بە (عبدالرحمانی إبن زوبَّی) کە سێ عیدەم بەسەر چوو چوومە ماڵی باوکم دانیشتم، (عبدالرحمانی إبن زَبّی) هاتۆتە خوازبێنیم، شووم پێکردۆتەوە.. بەلاّم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ وەلاّهی عەورەتی ئەو (عبدالرحمان)ە دۆخینی شەرواڵ چۆنە، ئاوا شلە، هەر رێك بەو لەفزە، ئێستا ئافرەتێك لەبەر چاوی ئەم کۆمەڵە وابڵێت، دەڵێن وەلاّهی حەیای هەڵگیراوە.. بەلاّم لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ ئەمە ماف بوو.. وتی: جا قوربان من ئەم پیاوەم بۆ چیە؟ بەو خودایە ئەو چوك و عەورەتەی وەکو دۆخین شلە، هیچی پێناکرێت..

دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ بانگی ئەم پیاوەی کرد، فەرمووی: ئەمە وایە ئەم ژنە وادەڵێت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە بۆ مێردی یەکەمی پەشیمانە، ئەی نا بەو خودایە هی من وەکو گاسنی جوت وایە، ئەمە بوختانم پێدەکات، من چۆن با شایەت حاڵم هەبێت بزانە وایە..

پێغەمبەر ﷺ (فتبسم رسول الله ﷺ) بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، لەم حاڵەتانەشدا تورە نەبوو، زەردەخەنەیەکی گرت.. فەرمووی: بە ژنەکە: وابزانم ئەم پیاوە ڕاست دەکات، تۆ دەتەوێت بەبێ ئەوەی دەستی کەست پێبکەوێت بۆ مێردە کۆنەکەت پەشیمان بوویەوە، دەتەوێت بچیەوە بۆلای، بەلاّم تازە سێ بە سێ تەلاقی داوی ناکرێت..

(أتردين أن ترجع إلى رفاعه) دەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆلای (ڕوفاعە)ی مێردی پێشووت، (لا) بە خودا شتی وانابێت (حتى تذوق عسيلته و ان تذوق عسيلتكِ) وەلاّ هەتا هەنگوینە بچکۆلەکەت نەخوات و هەنگوینە بچکۆلەی لێ نەخۆیت نابێت بڕۆیتەوە بۆلای. هەنگوینە بچکۆلە مەبەستی لە جیماعی شەرعیە، فەرمووی: هەتا هەنگوینت لێ نەخوات، و هەنگوینی لێ نەخۆیت، نابێت بگەڕێیتەوە بۆلای مێردەکەت. ئەها ئەوە بەس بەو مارە

کردنە کە مارەی کردووە، لە پیاوێکی مارە بکەن، هیچ جیماعی پێنەکەن، بڵێت وەڵاهی تازە مارەکراوە، نەخێر.. ئیلا ئەویش جیماعی لەگەڵ کردبێت، بۆ ئەمە بۆ؟

بۆ ئەوەی کەس جورئەتی ئەوە نەکات کە ژن تەڵاق بدات.. چونکە ئەمەکارێکی زۆر ناڕەحەتە، ئەم ژنە بچێتە لای پیاوێکی دیکە و پیاوەکە ئەوی قبوڵ بێتەوە، دەبێت بیر لەوە بکەیتەوە ئەگەر سێ بە سێ تەڵاقی بدات. هەتا ئەمە نەبینیت بۆت حەڵاڵ نابێتەوە، لەبەر ئەوە ئەی پیاو وریابە وریابە، زۆر وریای خۆت بە، جاری یەکەم سەرفی نەزەرت لێکرا، جاری دووەم سەرفی نەزەرت لێکرا، لە جاری سێهەمدا کۆتایی پێدێت، هەتا شوو بە پیاوێکی دیکە دەکاتەوە.. هەتا ئەویش هەنگوینە بچکۆلەی لێ نەخوات پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دروست نیە بگەڕێتەوە بۆلای مێردی یەکەمی، ئەمە باسی تەڵاقە ڕەنگە پێویستی بەشی کردنەوەی زیاتر بێت.. بەڵام کاتی بەرنامەی شەوەکەمان تەواو بووە.. هەموو لایەکتان تا دەرسێکی تر و شەوێکی تر بە خودا دەسپێرم.

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ) .

# وانەی بیست و دووەم

## هاوسەری ژیانت لەدەست مەدە

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى: ﴿وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا﴾النّساء : ٢١ .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إذا تَزَوَّجَ العَبْدُ فَقَدْ اسْتَكْمَلَ نِصْفَ الدِّينِ ، فَلْيَتَّقِ اللهَ في النِّصْفِ الباقي) ـ رَواهُ الحاكم ، وَحَسَّنَهُ الألباني في الصَّحيحة : (٦٢٥) وَفي صَحيح الجامع : (٤٣٠) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (أَبْغَضُ الحَلالِ إلى اللهِ الطَّلاق) . رَواهُ أَبُو داود : (٢١٧٧) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (لَيْسَ مِنّا مَنْ خَبَّبَ إمْرَأَةً على زَوْجِها) ـ صَحيحٌ ، رَواهُ أبو داود : (٢١٧٥) . الصَّحيحة : (٣٢٤) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (أَيُّما إمْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَها طَلاقاً في غَيرِ ما بَأْسٍ فَحَرامٌ عَلَيْها رائِحَةُ الجَنَّةِ) ـ رَواهُ أبو داود : (٢٢٢٦) . وَ صَحَّحَهُ الألباني في صَحيح سُنَن الترمذي : (١١٨٧) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (لا تَسْأَلِ المَرْأَةُ طَلاقَ أُخْتِها لِتَسْتَفْرِغَ صَحْفَتَها وَ لِتَنْكِحَ فَإنَّما لَها ما قُدِّرَ لَها) ـ رَواهُ البُخاريُّ : (٦٦٠١) وَ مسلم : (١٤٠٨) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (إذا دَعا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إلى فِراشِهِ فَأَبَتْ أَنْ تَجِئَ فَباتَ غَضْبانَ ، لَعَنَتْها المَلائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ) ـ متفق عليه : بُخاري : (٥١٩٣) وَ مسلم : (١٧٣٦) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إذا دَعا الرَّجُلُ زَوْجَتَهُ لِحاجَتِهِ فَلْتَأْتِهِ ، وَ إنْ كانَتْ عَلى التَّنُّورِ) ـ رَواهُ الترمذي : (١١٦٠) وَ صَحَّحَهُ الألباني في الصَّحيحَة : (١٢٠٢) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إنَّ سُوءَ الخُلُقِ يفسِدُ العَمَل ، كَما يُفْسِدُ الخَلُّ العَسَلَ) .

ـ صَحيح الجامع ، للألباني : (١٧٦) .

* قالَ عُمَر ابن الخَطّاب ، لِرَجُلٍهَمَّ بِطَلاقِ امْرَأَتِهِ : لِمَ تَطْلِقْها ؟! قالَ : لا أُحِبُّها ، فَقالَ عُمَر : أوَ كُلَّ البيُوتِ بُنِيَتْ عَلى الحُبِّ ؟ فَأيْنَ الرِّعايَة وَ التذمُمْ ! ـ البَيان وَ التَّبين ، ج٢ ، ص١٠١ .

## سەرچاوەکان :

١) التّاج الجامِع لِلْأُصُول في أحاديث الرَّسُول ، منصور علي ناصف ، و : نوری فارس حمه خان ، ب٢ ، ل٥٥٧ ، چاپی چوارەم ، ٢٠٠٨ ، دارُ المعرفة ، بيروت ، لبنان.

٢) رَوْضَةُ المُتَنَزِّه ، شَرْح بدايَة المُتَفَقِّه ، أيْمَنْ علي موسى ، ج٣ ، ص ١٢٤ ، ص١٥٢ ، ط : ١ ، ٢٠١٠ ، دارُ ابنُ رَجَب .

٣) الزَّواج في القُرآن وَ السُّنَة الصَّحيحَة ، محمد ملا فائق الشهرزوري ، ص٢١ ، ص١٥٢ ، ط : ١ ، ٢٠١١ ، مطبَعَة : رۆژ نوێ . السليمانيَّة .

٤) سيَرة عُمَر ابن الخَطّاب ، د . على محمد الصَّلابي ، ص ١٣٢ . ط : ٤ ، ٢٠١٢ ، دار ابنُ الجوزي ، القاهِرَة .

٥) بەسەرهاتی پیاو باشەکە و بارکردنی شێرەکە لە چیلکە و دار ، لە (كتاب الكَبائِر ، لِلْذَّهبي ، ص ١٧٩)دا هاتووە ، وە من لە کتێبی (لَيْلَةٌ في بَيْتِ النَّبيِّ ﷺ محمود المصري ، ص٥٧٩) وەرمگرتووە ، ط : ١ ، ٢٠١١ ، مَكْتَبَة الصَّفا ، القاهِرَة .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ لله رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی زۆر بەڕێز و میوانانی ماڵی خودای پەروەردگار سوپاس و ستایشی خودای پەروەردگار دەکەین، کە ئەمشەویش لە ماڵێك لە ماڵەکانی خودای پەروەردگاردا لە خزمەت پێغەمبەری پێشەوا و سەروەرماندا ﷺ، لە زنجیرە باسی ﴿ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشە و گرفتم هەیە﴾ هاتوومەتە خزمەتت.. لەگەڵ جەنابتاندا لە خزمەت پێغەمبەری پێشەوادا دەبین ﷺ، دانیشتنەکەمان بە سڵاوات لێدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەست پێدەکەین و دەڵێین:

(اللّهُمَّ صَلی عَلی سَیِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلی عَلی حَبیبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلی عَلی شَفیعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

ئیماندارانی بەڕێز: ئێمە دوێنێ شەو باسی ئەوەمان کرد کە ئەو ئافرەتەی گرفتاربوو بە دەست هاوسەرە خراپەکەیەوە کە هەڕەشەی لێدەکرد و دەیگوت: نە دەهێڵم خێزانم بیت و نەئەوەیە لێت جیادەبمەوە، کە بەداخەوە زۆر ئافرەت هەیە ئێستا حاڵەتی وای هەیە زۆر ئافرەت هەیە نە ئەوەیە هاوسەری هەبێت، نە ئەوەیە بێ مێرد بێت و بۆخۆی ئازاد بێت، کاتێك کە پیاو و ژنێك تەمەنێك لەسەر یەك سەرین نەخەوتن، لە یەك ژوور بەیەکەوە نەبوون، قسەیەکی خۆشیان بەیەکەوە نەکرد، ئەمانە ژن و مێرد نین،بەڵام لەژێر چەتری خانوویەکدا کۆبوونەتەوە..

بەڕاستی گرفتێکی زۆر گەورەیە، کە زۆر کەس هەیەتی، کە بەڕاستی دینداری و خوداناسی هەر ئەوە نیە کە ئێمە نوێژ بکەین یان ڕۆژوو بگرین، دەبێت ئەم دینداریە، ئەم

خوداناسیەی مزگەوتمان بەرێزان ڕەنگ دلنەوەی هەبێت.. بەرێزان ڕەنگ دانەوەی هەبێت لە ناو خێزانەکانماندا، لە ناو ژیانی هاوسەریماندا..

## پشت لە هاوسەرتان مەکەن بۆ سەرجێی ..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموویت: (إذا دَعى رَجُلٌ إمرأته إلى فراشه) ئەگەر هاتوو پیاو داوای سەر جێگای لە ژنەکەی کرد، ئەمە شەرع وا دەفەرموویت.. ئەمە حەدیسە، وتی: ئافرەت من و تۆ هاوسەری ژیانین، بۆیە خێزانی حەلاڵی خۆم هەیە بۆ ئەوەی توشی حەرام نەبم، پێویستم بەوەیە سەرجێگایم لەگەڵدا بکەیت و جوت بوونی شەرعیم لەگەڵدا ئەنجام بدەیت.. (فتبت) ژنەکە وتی: نابێت، وەلا دۆشەکی پێچایەوانێ و ڕایکردە ئەو دیو لەگەڵ منداڵەکاندا خەوت، کابرا بۆ خۆی بە تەنها مایەوە..

کە ئەوە زۆر حاڵەت هەیە ژن هەیە بە حیسابی خۆی زۆر دیندارە، لە تەلیلە و تەسبیحاتدا هیچی نەهێشتۆتەوە، کەچی کابرا نەئەوەیە ژنی هەبێت نە ئەوەیە بێ ژن، ئیتر لەو بەینەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت: (لعنت الملائكة حتى تصبح) خودای گەورە ئەمر بە فریشتەکان دەکات، ئەو فریشتانەی ئاسمان یان ئەوانەی لە دەوروبەری ئەو ماڵەن، هەتا ڕۆژ هەڵدێت دەڵێن: لەعنەتی خودا لەو ئافرەتە بێت.. یارەبی نەعلەتی خودات لێبێت.. دوور بیت لە ڕەحمەتی خودا.. پەنا بە خودا یەعنی ئەم ژنە هەستێت شەو نوێژ بکات، خودای گەورە لێی قبوڵ ناکات..

لە حەدیسێکی تردا دەفەرموویت: (حتى يرجع) هەتا ئەو کاتەی ئەو ژنە دەچێت دڵی مێردەکەی ئاشت دەکاتەوە، خۆ ئەگەر پەنا بە خودا ئەو پیاوە توشی هەر هەڵەیەك بوو، ئەو ژنە تێیدا تاوانبارە، چونکە نەیهێشت ئەم پیاوە کە هاوسەرایەتی شەرعی ئەنجام بدات..

ئەی ئەگەر بە پێچەوانەوە بڵێین: بە پێچەوانەوە پیاوێك هیچ ڕوویەکی خۆشی نەدەدا بە ژنەکەی، ئافرەت هەبووە یەعنی شەکوای حاڵی خۆی کردووە.. وتوویەتی: من جێگام

بۆ هاوسەری ژیانم چاك كردووە، بۆ باوكی منداڵەكان چاك كردووە، هاتۆتەوە لە ڕێگاوە پەرداخە ئاوم بۆ بردووە، چایم بۆ لێناوە.. لەو كاتەدا كە من پەرداخە ئاوەكە چایەكەم بۆ بردووە.. لەو لاوە بە كچەكەی دەڵێت كچم پەرداخێك ئاوم بۆ بهێنە، ئێ باشە من بۆم داناوی، چام بۆ لێناوی، ئەوەی ناخواتەوە ئەنجا لەگەڵیدا دەچێت لەژوورێكی تردا دەكەوێت، دەڵێت تۆ لە ژوورەوە بخەوە من لە سەریان دەخەوم، ئەمەش بە پێچەوانەوە دەبێت لەعنەتی خوداش لەو پیاوە بێت، چونكە حەقی ئەم ژنە نادات. كە بەڕاستی ئەوە ژیانی هاوسەرایەتی پێ ناوترێت..

ژن و مێرد كاتێك كە بوون بە هاوسەری ژیان عەقدێكی گەورە لە بەینیاندا هەیە، ئەو زەمەنەی ئینسان دەست دەخاتە دەستی خەزوریەوە، یان وەلی ئەمری ئافرەتەكەوە ئەها ئەوە دەڵێت: نیكاحم كرد، تەزویجم كرد، بڕیارم دا ئەم كچەم بكەم بەهاوژینی تۆ، ئەویش دەڵێت: قبوڵم كرد.. قبوڵم كرد گاڵتە نیە، ژن مارەكردن بەڕێزان دوو سێ كەلیمەیە، زۆر دوور و درێژ نیە، كابرا كە ژن مارە دەكات بە نیو سەعات لێ نابێتەوە ئەوە نیشانەی ئەوەیە كە ئەو مەلایە لەگەڵ ڕێزم نایزانێت.. ئەینا هەر سێ چوار كەلیمەیە، سێ چوار كەلیمەی بە نرخ، وشەی ئینكاح، وشەی تەزویج.

ئەمە لە قورئاندا هاتووە.. ئەوە ئەو دەستە دەڵێت قبوڵم كرد.. قبوڵی ئەو نیكاح و تەزویجەم كرد. ئیتر ئەمە خودا لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ۝٢١﴾ النساء) ئەوە عەهد و پەیمانێكە گەلێك گەورەیە، بۆیە لە ژن مارەكردندا پێشینانی ئێمە گەلێك عاقڵ بوون، كاتێك وتوویانە پەنجە نابێت بتەقێنیت و تەسبیحت بە دەستەوە نەبێت.. ئەمە هیچ مەسەلەیەكی تر لە گۆڕێ نیە، مەبەستیان لەوە بووە لەو وەختەدا عەهدێكی گەلێك گەورە دەبەسترێت، دەبێت ئینسانەكان بەئەدەبەوە دابنیشن. ئەوەی دانیشتوویت ئەوە مەجلیسەیە ڕێك و پێك بێت، پەنجەی نەتەقێنێت و تەسبیح ڕانەوەشێنێت، بۆ؟چونكە لەو كاتەدا عەهدێكی گەورە دەبەسترێت: ﴿مِّيثَٰقًا غَلِيظًا﴾.

کە خودا ئەوەی بۆ پێغەمبەران بەکارهێناوە، دەفەرموویت من ئەم کەلامی خودایەم دا بە پێغەمبەران بە پەیامێکی زۆر بەهێز، ئەو پەیمانە بەهێزەش لە بەینی ژن و مێردا هەیە، بۆ ئەو دوو شوێنە ﴿مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا﴾ بەکارهاتووە.. بەلأم بە داخەوە جاری واهەیە لە داوای زەمەنێك زۆری پێبچێت یان کەم، ژن و مێرد لەیەك جیادەبنەوە، ئا لەوێدا تەلأق دێتە ئاراوە، کە دوێنێ هەندێکمان لەوە باسکرد، تەلأق (أبغض الحلال إلى الله الطلاق) شتێك کە خودای گەورە حەلأڵی کردووە بۆ ناچاری..

## بەهاوسەرگیری نیوەی دینت تەواو بکە

وەکو چۆن ژن و مێرد بە حەلأڵی دەگەن بەیەکتر، خودای گەورە چەندی پێخۆشە، ئەو وەختەی کاتێك ژن و مێردێك، کچ و کوڕێك بە حەلأڵی بەیەك دەگەن نیوەی دینەکەیان تەواو دەبێت، نیوەی دینەکەیان!! ئازابە و نیوەکەی تری سەرفراز بکە، کە ئینسان ژنی هەبێت، چاو لەدەر نەبێت چاوی لە ماڵو ناموسی خەڵکەوە نەبێت.. بە حەیا و حورمەتدار بێت، نیوەی دینەکەی تەواو دەبێت.. کچیش هەر وایە، نیوەی دینەکەی تەواوبوو..

ئازا بە (فليتق الله في النِصف الثاني) کوڕە ئەوەکەی دیکەشی هەر زۆر ئاسانە، نوێژێکی پێنج فەرزەیە و حەجێکە و ڕۆژووی ڕەمەزانە، و وەلأهی دین ئاسانە، برا دین گرانی تێدا نیە، حەرام مەخۆ، ئەگەر مسوڵمانیش نەبیت عەیبە ماڵی خەڵك بخۆیت، دزی بکەیت، زینا بکات.. عەیبە بچێتە سەر ماڵأن، شەل و کوتی خەڵك بکات.. ئەمە نابێت ئەمە هەر لە بواری ئینسانیشەوە، دین ئەوەی کە حەرامی کردووە هەر ئینسان وازی لێدێنێت، کە حەلأڵی هاوسەریشت هەبوو لە بواری جنس و داوێنیشەوە.. ئەوە دڵنیابە کە پارێزراویت، نیوەی دینەکەت تەواو بووە..

## تەڵاق عەرشی خودا دەلەرزێنێ!

ئەگەر ژن ومێرد نەگونجان بەیەکەوە، خودا تەلاقی ڕێگە پێداوە..بەلاَم زۆری ڕق لە تەلاَقە، شتێك کە خودا ڕێگەشی پێداوە زۆری ڕق لێیە ئەویش تەلاَقە.

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: لەو کاتەدا کە ژن و پیاو لەیەك جیادەبنەوە وشەی تەلاَق بەکاردێت (اهتز لَهُ عرش الرحمان)عەرشی خودا دەلەرزێت.. پەنا بە خودا، لەو کاتەدا کە ئەو ژن و مێردە بۆ دواجار خودا حافیزی لەیەك دەکەن، ئەو نیکاحە هەڵدەوەشێتەوە.. بۆیە زۆربەی حاکمەکان لەرز دەیان گرێت، ئەوانە حاکمی بەڕێزن لەوکاتەدا هەڵدەستێتە سەرپێ، لەوکاتەدا عەرشی خودا دەلەرزێت. ئەو حاکمانەی لە دادگاکان زۆر جار من لە خزمەتیاندا بیستومە، کاتێك عەقدێکی زەواج ئیمزا دەکەین، ئەی کە پێمان خۆشە، کە کچ و کوڕێك دادەمەزرێنین. بەس لەو وەختەدا هەموو لەشمان دەلەرزێت کە وشەی تەلاَق دەبیستین، دەڵێت تەلاَقی دەدەم، چەند ناخۆشە.. عەرشی خودا لە ئاسمانەوە بۆ ئەم خێزانە دەلەرزێت.. چونکە منداڵ سەرگەردان دەبێت، ژنێك سەرگەردان دەبێت، پیاوێك هەست دەکات لەبەنجێك خاوبۆتەوە، ئەمجا دەزانێت نیوەی لەشی لێ جیابۆتەوە.. کارەساتێکی گەورەیە.

## تەڵاقی بێ هۆ.. بۆنی بەهەشتت لێ حەرام دەکات !!

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: (ایما امراة سألت زوجها طلاقا من غیر بأس، فحرام علیها رائحة الجنة) هەر ژنێك بە بێ ئەوەی مێردەکەی عەیبی هەبێت، لە خۆیەوە بڵێت وەرە تەلاَقم بدە، ئەها ژنی واهەیە ئەمە لە تەمسیل و شتی واوە فێر دەبن.. ئەم تەلە فزیۆنانەی ئێمە زۆر تەمسیل و بەرنامەکانیان دەڵێت تەلاَقم بدە، ژنیش زۆر لاسای دەکاتەوە، بە بێ ئەوەی کەوا مەسەلەی تەلاَق لەگۆڕێ بێت، مێردەکەی ناچار دەکات دەڵێت لێم جیاببەوە.. وەرە تەلاَقم بدە.

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: ژنێك بە بیٚ هۆکار داوای ئەم تەلاقە بکات، بۆنی بەهەشتی لیٚ حەرامە، نەك ناچێتە بەهەشت، بۆنی بەهەشتیش ناکات. ئەوە زۆر جار پیاوی واهەیە عەیبی نیە، هەرچی کەم و کوڕی بێت نیەتی، بەداخەوە زۆربەی ئافرەت بەس ماڵی دونیا دەبینێت.. یەعنی ئەمە توێژینەوەی بواری کۆمەڵایەتیە، هەموو خوشکان وانین، ئافرەتی مەبدەء ئیمان هەیە، هەیە بەڕاستی سیٚ چوار ماڵی کردووە، هەتا میوانێکی بەڕیٚ کردووە، نەی هێڵاوە پیاوەکەی شەرمەزار بێت، لەبەردەمی میوانەکانی، ئافرەتی وامان هەیە..

بەڵام ئافرەتی وامان هەیە هەتا مێردەکەی دەستی پڕ بێت، ئەوە عەیبیان نیە، یەك ڕۆژ گیرفانی خاڵی بێت لای هەموو کەسێك باسی دەکات، تەلەفون بۆ ماڵی بابی دەکات، دەڵێت پارەی نەداوینەتیٚ، ئەمڕۆ شتی نەهێناوەتەوە.. لەلای خوشکەکانی باسی دەکات، لەلای میوانەکەی باسی دەکات، موشکیلەیەکی بچکۆلەیان هەبێت دونیا تێدەگەیەنێت.. ئای ئەوە چەند خراپە! ئەوە ناچاری ئەو مێردە دەکات ژیانی ببێتە دۆزەخ، ئەوە بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرام دەبێت..

جا ژیانی خێزانیش بەڕێزان بە تایبەتی بۆ چینی گەنجان دەڵێم: جاری واهەیە مانگی هەنگوینی یەك مانگە، ئەمڕۆ لە جومعەدا باسم کرد هەر کەسێك دەیەوێت مانگێك بەختەوەر بێت، با ژن بهێنێت.. سەرەتای مانگەکە زۆر بەختەوەرن، ئەمجا ئەم ژن و مێردە وردە وردە هەست دەکەن، ئەمجا ئافرەت منداڵی دەکەوێتە سەر، لەوانەیە حامیلە بێت. کوڕ هەست دەکات باری گران بەسەرشانیوەیەتی، دەبێت کاسپی بکەیت..

جاران نیوەڕۆ لە خەو هەڵدەستایت.. ئێستا دەبێت سەعات حەوت بڕۆیت بۆ کاسپی، جاران هەر خۆت و خۆت بوویت، ئێستا کەسێکی ترت لە ملە.. جاران زۆر شتت لیٚ عەیب نەبوو.. ئێستا لێت عەیبە، ئەها هەست دەکەیت ئەمانەتێکت هاتۆتە سەر شان، ئێستا بە تەنها نیت، ئالەو حاڵەتانەدا شەرت نیە هەر حوب و خۆشەویستی هەبێت، دەبێت چاو پۆشی هەبێت..

## ژنەکەم تەڵاق دەدەم..ئیمامی عومەر

پیاوێك هاتە خزمەت حەزرەتی (عمر)، کابرا وتی: ئەی ئیمامی (عمر) دەمەوێت ژنەکەم تەلاق بدەم.. فەرمووی: کاکە ئاخر بۆ؟ وتی: قوربان وەلاهی هیچ خۆشەویستیم بۆ نەماوە.. حەزرەتی (عمر) فەرمووی: (ویحك الم بیوت الاعلی الحب فأین رعایة)؟! هاوار بۆ تۆ، باشە خێزان دەبێت هەر لەسەر بنەمای خۆشەویستی بێت؟ ئەی چاوپۆشی؟ ئەی چاودێری کردن؟ شەرت نیە هەموو دەقیقەیەك وابزانیت سەرەتای دەستگیران داریتە لە خۆشەویستیدا، جا دەبێت چاودێری یەکتر بکەیت، دەبێت چاوپۆشی لەیەکتر بکەیت.. چونکە زەمەنێکە تۆ بەیەکەوەیت، شەرت نیە برای بەڕێزم ئەو خۆشەویستیە هەر وەکو ئەوەڵی دەستگیرانیت وابێت، ئەی چاوپۆشی کردن، ئەی سەرفی نەزەر لە ژیانی یەکتر، ئەی لە هەڵە بوردن، ئەمە نابێت.. پاشان پیاوچاکانی بەڕێز قەت پەنایان بۆ تەلاق نەبردووە..

## پیاوێك بەشێر باری دەهێنا !!

پیاو باشێك هەبوو، ژنەکەی زۆر خراپ بوو، وەلاهی یەکێك بووە لەپیاو باشان، دەفەرمووێت پیاوێکی دیندار و خوداناس دۆستی بوو، دوو دێ بوون، دێیەکان دوور بوون لەیەك.. لەبەر خودا چوو بۆ سەردانی، کە چوو (سبحان الله) ئەم پیاوە بەشێرێکەوە لە دارستانەوە دەهاتەوە.. یەك بارە داری لەسەر پشتی شێرەکە بارکرد بوو، شێر و بارەدار! ! ئاخر دیمەنێکی غەریبە، وتی: ئەمە چیە؟! کابرا خەریکبوو ڕابکات..

وتی: کاکە ڕامەکە.. ئەم شێرە بەخودا زۆر بەستەزمانە، کوڕەوتی شێر زۆر سامناکە دەترسم تێکم بشکێنێت! ! بەس ئەم حاڵەی تۆ چیە؟!

وتی: وەلاهی من پیاوێکی فەقیری حەلاڵ خۆرم، وەلاهی ئەوەندە پارەی حەلاڵم بۆ کۆنەبۆتەوە گوێ درێژێك بکڕم." ئەو زەمەنە گوێ درێژ هەرزان بووە" وەلاهی ئەو پارە حەلاڵەی پەیدای دەکەم قوتی خۆم و خێزانم و منداڵەکانم پەیدا دەکەم، بەلاّم ژنێکی زۆر

خراپم هەیە، وەڵاهی بۆم زۆر خراپە، دایمە هانم دەدات بۆ حەرام خۆری، منیش بەقسەی ناکەم، نایەڵێت ئیسراحەت بکەم، کە دەڕۆم دەڵێم خودای گەورە من لەمماڵەدا وەکو ئەوە وایە لە دۆزەخدا بم.. ئەم ژنە نایەڵێت ئیسراحەت بکەم، خودایە ڕەحمم پێبکەیت.. وەڵاهی دارم بڕی ئەو شێرە لەو شاخەوە هاتووەتە خوارێ، دارەکە لە پشتی باردەکەم.. هەتا بنە بانی ماڵەکەمان فڕێی دەدەم، ئەم شێرە مویەك نابزێوێت!!

(سبحان الله)، ئەم پیاوە پیاوێکی زۆر باش بوو، زۆر بەڕێزبوو، وتی: برا جا ئەوە حاڵتە بۆ ژنەکەت تەلاق نادەیت..

وتی: بەو خودایە ئەو ژنە زۆر دەم هەراشە، زۆر ئابڕووبەری پیاوە، خەمی ئەوەمە من تەلاقی بدەم وبەتوشی یەکێکی ترەوە بێت، پیاوێکی مسوڵمان گیرۆدە بێت.. خەمی ئەوەمە ئەو کەسەی کە مارەی دەکاتەوە برای منە، برای مسوڵمانە، خەمی ئەوەمە ئەم ژنە توشی ببێت بە پیاوێکەوە ئەو پیاوەی تریش گرفتار بێت بە دەستیەوە، با ئەو گرفتاریە هەر بۆخۆم بێت.. با ئەو حەیایەی کە بۆخۆم زاڵم بەسەر خۆمدا دەترسم پیاوێکی دیکە ئاوا زاڵ نەبێت بەسەری دا و ئافرەتەکەش حەیای بچێت و بنەماڵەکەشی حەیای بچێت.. (سبحان الله)!! لە قابیلی ئەوەدا شێر بۆ ئەو پیاوە ڕامبووبوو، لە کێودا وەکو گوێ درێژ باری لێدەنا..

## صەبر لەگەڵ هاوسەری خراپ.. پاداشتی ئەیوبت دەداتێ !!

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: (أيما رجل صبر على سوء خلق زوجه)، هەر پیاوێك ئارام بگرێت لەسەر ڕەفتاری خراپی ژنەکەی، یەعنی بەڕاستی ژنەکە خراپ بوو، بەڵام ئەم سەبر دەگرێت دەڵێت لەبەر خاتری ماڵە خەزورانم، لەبەر خاتری منداڵەکانم، لەبەر حەیا و حورمەتی خۆمان، لەبەر ئەوەی ئەم ژنە سەرگەردان نەبێت، کێ دەڵێت دواتر شووی بۆ دەکرێتەوە، کێ دەڵێت پیاوێکی تر وەکو من لێی قبوڵ دەکات. ئەمانە هەمووی لێك دەداتەوە.. بۆ ئەوەی ئەو خێزانە لەیەك هەڵنەوەشێت..

(اعطاه الله مثلما اعطا أيوب على بلائهِ) خودای گەورە ئەو ئەجر و پاداشتەی داویەتی بە حەزرەتی (أيوب)، دەیبەخشێت بەم پیاوەش، (سبحان الله)!!

(أيوب) پێغەمبەر کە هەژدە ساڵ لەسەر جێگا بوو، خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لەڕیزی حەزرەتی (أيوب)دا حیسابی بۆ دەکات.. وە هەروەها دەفەرمووێت:

(وايما امراة صبرة على سوء خلق زوجها)، ئافرەتێکی بە حەیا و حورمەت و دیندار و بەڕێز و داوێن پاك، بە ئەخلاق و بە سەبر و بە عیفەت و بە قەناعەت، توشی بوو بە پیاوێکی خراپەوە، پیاوێکی خراپ، بەڵام سەیردەکات کۆشێك منداڵی لێی هەیە، لەبەر چاوی گەشی منداڵەکان، لەبەر خاتری ماڵە باوانی، لەبەر وشەی ئەوەی کە تەڵاقی بە شوێن نەکەوتبێت، لەبەر ئەوەی خەڵك پێی نەزانن، سەبر دەگرێت لەسەر ئەم پیاوە خراپە، دەفەرمووێت:

(اعطاه الله مثلما اعطا اسية زوجة فِرعون) خودای گەورە پلە و پایەیەکی پێدەبەخشێت، وەکو ئەو پلە و پایەیی کە بە ژنەکەی فیرعەونی بەخشی، بە (ئاسیا)ی ژنی فیرعەونی بەخشی، ئاسیا چۆن ئافرەتێك بوو، خودا لە قورئاندا باسی کردووە.. ژنی ئەو کافرە خودا نەناسە، زاڵمە، کە لەسەرەمەرگدا یەك داوای هەبوو، فەرمووی خودایە:

﴿..رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ ..﴿١١﴾﴾ التحريم. خانوویەکم لەپەنای خۆتەوە لە بەهەشتدا (عِندَكَ) لەپەنای خۆت لەنزیك بارەگای عەرشەوە بۆ دروست بکە.. خودا فەرمووی، لەسەرە مەرگدا بوو خانووەکەی نیشاندا.

ئەو ئافرەتانەی ئاوا سەبر دەگرن، حەیای خۆیان دەپارێزن، نایەڵن منداڵەکانیان بکەوێتە دەستی کەسانێك، دان بە خۆیاندا دەگرن، ئەوانە (إنشاء الله) پاداشتیان وەکو (ئاسیا)یە، لەبەر ئەوە برایانی بەڕێز، خوشکانی مسوڵمان، لەم دەرسەدا با ئەوە فێرببین.. سەبر و ئارام گرتن شتێکی زۆر گەورەیە کە ئینسان سەبر و ئارام بگرێت.. کاتەکەمان ڕەنگە تەواو بووبێت. (إنشاءالله) لەدەرسی داهاتوودا، لەوانەی داهاتوودا،

هەندێکی تر لەسەر ئەو مەسەلەیە بۆ جەنابتان دەدوێم..یاڕەبی خودایە هیدایەتمان بدەیت.. سەبر و ئارامیمان پێببەخشیت..

تا شەوێکی تر و دەرسێکی تر بە خوداتان دەسپێرم.

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ) .

## وانەی بیست و سێیەم

## چارەسەری کێشەی خێزانی

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ ۖ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾﴾ النساء .

* قالَ راغب الأصْفَهاني في ـ المُفْرَدات : وَعظ ، الوَعْظُ زَجْرٌ مُتْقَرِنٌ بِتَخْويفٍ ، قالَ الخَليل : هُوَ التَّذكير بالْخَيْرِ فيما يَرِقُّ لَهُ القَلْبُ ...

* عَنْ عائِشَةَ ، قالَتْ : (ما ضَرَبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِيَدِهِ إمْرَأَةً قَطُّ). ـ رَواهُ مُسْلِم : (٢٣٢٨).

* وَلَمْ يرد عَنِ النَبِيِّ ﷺ اَنَّهُ ضَرَبَ النّاشِزَ ، وَ هِيَ ابنَة الجُون الّتي تَزَوَّجَ بِها ، فَلَمّا دَنامِنْها قالَتْ : (أَعُوذُ باللهِ مِنْكَ) فَقالَ لَها النَبِيُّ ﷺ (لَقَدْ عُذْتِ بمعاذ ، الحِقي بِأهْلِكِ) ـ رَواهُ البُخاريُّ (٥٢٥٧) .

* قالَ أَبُو دَرداء لِزَوْجَتِهِ : (إذا رَأيتني غَضِبْتُ ، فَرَضِّني ، وَ إذا رَأَيْتُكِ غَضْبَىَ رَضَّيْتُكِ ، وَ إلاّ لَمْ نَصْطَحِبْ) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إنَّ إبلس يضع عرشه عَلى الماءِ ، ثُمَّ يَبْعَثُ سَرياهُ ، فَأَدْناهُمْ مِنْهُ مَنْزِلَةً ، اَعْظَمُهُمْ فِتْنَةً ، فيجئ اَحدهُمْ فيقول : فَعَلْتُ كَذا وَكَذا ،

فَيَقول : ما صَنَعْتَ شَيْئاً ، قالَ : ثُمَّ يجئ أَحَدُهُمْ فيقول : ما تَركته حَتَّى فَرَّقْتُ بَيْنَهُ وَ بَيْنَ إمْرَأَتِه ، قالَ : فَيُدْنِيه مِنْهُ وَ يَقول : نِعْمَ أَنْتَ) ـ رَواهُ مُسْلِمْ .

* قالَتْ عائِشَةُ : ألا أُحَدِّثُكُمْ عَنِّي وَ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ ؟ قُلْنا : بَلى . قالَتْ : لَمّا كانَتْ لَيْلَتِيَ الَّتي كانَ النَبِيُّ ﷺ فيها عِنْدي ، إنْقَلَبَ فَوَضَعَ رِداءَهُ ، وَ خَلَعَ نَعْلَيْهِ ، فَوَضَعَهُما عِنْدَ رِجْلَيْهِ ، وَبَسَطَ طَرَفَ إزارِهِ عَلى فِراشِهِ ، فاضطَجَعَ ، فَلَمْ يَلْبَثْ إلاّ رَيْثَما ظَنَّ أنْ قَدْ رَقَدْتُ ، فَأَخَذَ رِداءَهُ رُوَيْداً ، وَانْتَعَلَ رُوَيْداً ، وَفَتَحَ البابَ فَخَرَجَ ، ثُمَّ أجافَهُ رُوَيْداً ، فَجَعَلْتُ دِرْعي فِي رَأْسي ، وَاخْتَمَرْتُ ، وَتَقَنَّعْتُ إزاري ، ثُمَّ إنْطَلَقْتُ عَلى إثْرِهِ ، حَتَّى جاءَ البَقيعَ ، فَقامَ فَأَطالَ القِيامَ ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ ثَلاثَ مَرَّاتٍ ، ثُمَّ انْحَرَفَ ، فانْحَرَفْتُ ، فَأَسْرَعَ فَأَسْرَعْتُ ، فَهَرْوَلَ فَهَرْوَلْتُ ، فَأَحْضَرَ فَأَحْضَرْتُ ، فَسَبَقْتُهُ فَدَخَلْتُ ، فَلَيْسَ إلاّ أنْ اضْطَجَعْتُ فَدَخَلَ ، فَقالَ : مالَكِ يا عائِشُ حَشْيا رابِيَةً؟! قُلْتُ لا شَيئَ ، قالَ : لَتُخْبِرِيني أوْ لَيُخْبِرَنِّي اللَّطيفُ الخَبيرُ ؟ قُلْتُ : يارَسُولَ اللهِ ، بِأَبِي أنْتَ وَ أُمِّي ، فَأَخْبَرْتُهُ ، قالَ فَأَنْتِ السَّوادُ الَّذي رَأَيْتُ أَمامي ؟ قُلْتُ : نَعَمْ ، فَلَهَدَني فِي صَدْري لَهْدَةً أوْ جَعَتْني ، ثُمَّ قالَ : أظَنَنْتِ أنْ يَحيفَ اللهُ عَلَيْكِ وَرَسُولُهُ ؟ قالَتْ : مَهْما يَكْتُمِ النّاسُ يَعْلَمْهُ اللهُ ؟ قالَ نَعَمْ ، فَإِنَّ جِبْريلَ أتاني حينَ رَأَيْتِ، فَناداني ، فَأَخْفاهُ مِنْكِ ، فَأَجَبْتُهُ ، فَأَخْفَيْتُهُ مِنْكِ ، وَ لَمْ يَكُنْ يَدْخُلُ عَلَيْكِ وَقَدْ وَضَعْتِ ثِيابَكِ ، وَ ظَنَنْتُ أنْ قَدْ رَقَدْتِ ، فَكَرِهْتُ أنْ أُوقِظَكِ ، وَخَشيتُ أنْ تَسْتَوحِشي ، فَقالَ : إنَّ رَبَّكَ يَأْمُرُكَ أنْ تَأْتِيَ أهْلَ البَقيعِ فَتَسْتَغْفِرَ لَهُمْ ، ...) ـ رَواهُ مُسْلِم . كِتاب الجَنائِز .

## سەرچاوەکان :

١) پایزە برا ، مەلا ئەحمەدی شەریعە ، ل٥٠ . بەرگی یەکەم ، چاپی یەکەم ، ٢٠١١ ، چاپخانەی ڕێ نوێ ، سلێمانی .

٢) المُفْرَدات في غَريبِ القُرْآنِ ، أبي القاسم الحسين بن محمد المعروف بالرَّغِب الأصْفَهاني ، ص ٥٨٤ ، ط : ١ ، ٢٠١٢ ، دار ابن الجوزي ، القاهِرَة .

٣) الزَّواج الإمْلامي السَّعيد ، محمود المِصري ، ص٧٧٨ ، ط : ١ ، ٢٠٠٦ ، مكتَبَة الصَّفا.

٤) لَيْلَة في بَيْت النَبِيِّ ﷺ محمود المصري ، ص٥٧٥ ، ط : ١ ، ٢٠١١ ، مكتبَة الصَّفا ، القاهِرَة .

٥) صَحيح مُسْلِم بِشَرْح النَّوَوي ، ج (٧ ـ ٨) . ص ٤٦ ، ط : ١٩ ، ٢٠١٢ ، دارُ المعرفة ، بيروت لُبْنان .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز: ئێمە چەند شەوێك بوو لەسەر مەسەلەی ناو خێزان قسەمان دەکرد. کە بەڕاستی بە پێویستم زانی لەگەڵ جەنابتاندا لەگەڵ هەموو بیسەر و بینەرانی ئەم بەرنامانەدا، کە زیاتر لەسەر مەسەلەی خێزان قسە بکەین، چونکە بەڕاستی ژیانی دونیا ئەگەر خۆشی بێت و ناخۆشی بێت، پەیوەندی بەناو ماڵەکەی خۆتەوە هەیە، پەیوەندی بەناو ئەو خێزانەوە هەیە کە ژن و مێرد تێیدا دەژین.

ئینسان لە دونیادا دەتوانێت لەدەرەوە پەنا بە خودا دوژمنایەتی هەبێت، خەڵك دوژمنی بێت بەڵام ئیدارە بکات، دەتوانێت لەگەڵ براکەی خۆیدا چەند ساڵ قسەی نەبێت، هاتوچۆی نەبێت. چەند کەسمان بینیوە هەرچەندە ئەمە گوناحێکی گەورەیە لەگەڵ براکەی خۆیدا هاتوچۆی نیە، بەڵام ژیانی هەر دەڕوات، لەگەڵ خوشکەکەیدا بە هەمان شێوە، بەڵام ناڕەحەتی لەوەدایە پەنا بەخودا، ئینسان لە ناو ماڵی خۆیدا موشکیلەی هەبێت، و ئاژاوە لە ماڵەکەیدا هەبێت ئەوەیان زۆر ناڕەحەتە..

زۆر کەس بوون ئەوانەی چەند ساڵ دوژمنایەتی چەکداریان بوو، لەدەرەوەی ماڵی خۆیان، بەڵام چونکە لە ناو ماڵەکانی خۆیاندا پتەو بوون هەر مانەوە، زۆر کەسیش هەبوو لەدەرەوە زۆر حورمەتداربوو، بەڵام چونکە لە ناو ماڵەکەی خۆیدا ئاژاوەی هەبوو فەوتا، ئیتر ئابڕووی چوو.. سەرگەردان بوو.. منداڵی لێك ترازا..

لەبەرئەوە ئەو کەسانەی تازە هاوسەرایەتی پێکدەهێنن، بەڕێزان زۆر ئاگاداربن ژیانی هاوسەری خۆت قەت بە قوربانی کەس مەکە، هەرگیز گوێ ڕامەگرە بۆ قسەی ئەم و ئەو لە دەرەوە، چونکە هیچ ژنێك ئەگەر عاقڵ بێت و دڵنیا بێت لەوەی کەس بە قەدەر مێردەکەی خۆی دڵسۆزی نیە، کەس بەقەدەر هاوسەرەکەی خۆی مەحرەمی نیە، وە

هیچ پیاوێك بەڕێزان هەر کەسێك دڵسۆزی بێت بەقەدەر ژنەکەی خۆی دڵسۆز نیە، وە مەحرەمی نیە، من ئەو پرسیارە لە بەڕێزتان دەکەم کە شتێکی مەعلومە تو خودا ئەوەی کە ژن و مێرد لەلای یەکتر ئاشکراییان هەیە، ڕوویان دێت لەلای یەکتر شتێك بڵێن، شتێك نیشانی یەکتر بدەن؟ ئایا لای کەس دەیڵێن؟

پیاوی واهەیە ئەگەر دایکی بێت، باوکی بێت، خوشکی بێت، برای بێت، لەڕووی نایەت کۆمەڵە ئەندامێك کە نەخۆش بێت، شوێنێکی نیشانی کەسێکی تر بدات.. کەچی لەگەڵ هاوسەری ژیانیدا زۆر بە ئاسایی دەیڵێت.. ژن دایکی خۆی چەندە لێی نزیکە، تو خودا ڕووی دێت کۆمەڵە شتێك بۆ دایکی باس بکات؟ بێگومان نەخێر.. بەڵام زۆر بە ئاسایی لەگەڵ هاوسەری ژیانیدا باسی دەکات. ئەو شوێنانەی یەکتر دەبینن، کەواتە ئەمە نزیکترین خاڵی هاوبەشە، پەیوەندیە.

## براکەیشی کوشت.. لێك جیا نەبونەوە !!

بەڕاستی زۆر جار شت دەخوێنمەوە بەڕاستی ئینسان دەچێتە قاڵبی موستەحیلاتەوە، بەڵام ڕووداوی مێژووییە کەلەم کوردستانەدا ڕوویانداوە.. پیاوێکی بەڕێز بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە، مامۆستایەکیش خودای لێڕازی بێت لە کتێبەکەیدا تۆماری کردووە، دەڵێت: پیاوێك لەسەرەتای هەشتاکاندا، کۆتایی حەفتاکان بوو، ماڵی لەدەرەوەی شاری سلێمانی، لە دێیەك دەبێت، ئەو کاتانە کە هێشتا دێیەکانی سەر سنور تێك نەچوو بوون و تەرحیل نەکرابوون..

ئەم پیاوە دەڵێت: من خەریکی جووت بووم، جووتم دەکرد. لەبەر ئەوەی ئەو کاتە مەکینە کەم بوو، زەویەکەمان مەکینەشی بۆ نەدەچوو، بە گا جووتم دەکرد، دوو گاجووتم پێ بوو، بە گا جووتم دەکرد، تفەنگێکم لابوو، ساچمەسەنگێکم لا بوو.. خودا بۆخۆی ئاگای لێبوو، بە هیچ نیتێك لام نەبوو، هەر تەنها لەبەر ئەوەی کە وتم ئەگەر کەوێك بێت، سوێسکەیەك بێت، کەروێشکێك بێت، ڕاوێك بکەم..

لەو کاتەدا لە جووتم، لە بناری ئەو شاخەم، دەڵێت: خەریکی جووت بووم بە ماندوو بوونی خۆمەوە خەریکبووم، وەختێکم زانی ژن برایەکم پەیدا بوو، کوڕێکی گەنجی سەر شێت، هەر لە دوورەوە بە جوێندانەوە هات بۆلام، وتی: تۆ کچێشکمان هین دەکەیت و ئاوا دەکەیت و زۆر قسەی ناشرینی گوت، وتم: برام وەرە نزیك بەوە نزیك بوەوە و بەخێرهاتنم کرد.. ئەو هەر هەڕەشەی دەکرد و دەیگوت: تۆ دەکوژم، دیارە ناحەزانێك قسەیان بۆ کردوون، وتوویانە زاواکەتان وای پێگوتوون، منیش لەو قسانە بێ بەری بووم.

وتم: برا تۆبرای خێزانەکەمیت، خاڵی منداڵەکانمیت، برا گەورەی منیشیت، وەڵاهی وەرە سوێندت بۆ دەخۆم، دەچینە مزگەوت دەست بە قورئاندا دەدەم، خودا دەزانێت ئەو کەسانەی ئەم قسانەیان بۆتۆ کردووە درۆیە، جامن کە قسە بە تۆ دەڵێم بۆ دەپارێمەوە، قابیلە لە تۆ بترسم..

دەڵێت: ئەو دەمانچەیەکی پێبوو، لە پشتوێنەکەیدا، پێشتر فیشەکی تێکردبوو چەکوشەکەی هەڵدابوویەوە، ئامادەبوو من بکوژێت.. لەبەر ئەوە وتی: نامەرد هەر ئێستا لە ناو خەتی ئەم جوتانەدا ئەو نێژم، زۆر لەبەری پاڕامەوە، جووتەکەم بەرەڵاکردوو چوومە سەر کەڵەکێك، بەس بۆ ئەوەی وازم لێبهێنێت..

وتم: برا ئێمە خزمی یەکین، ئیتر تۆ برای خێزانەکەمیت، من چۆن دەستم بچێتە خوێنی تۆ، منیش لە تاواندا ساچمە زەنەکەم، بەرەوە رووی ئەو گرتبوو، بەڵام وازی لێنەهێنام و شوێنم کەوت، دەستی بردە بەر پشتوێنەکەی دەمانچەکەی دەرهێنا، دڵنیا بووم کە دەیتەقێنێت.. لەو کاتەدا شەیتان زەفەری پێ هێنام، هەر دەستم جوڵاند هینەکەی چووە بەر و دەستم لێکێشا، لەسەر دڵی دا، لەسەر دڵی داو یەکسەر ژن براکەم بەلادا هات.. پەلامارم داو ئەی شەیتان خۆزگە وانەبوایە، خۆزگە بریندار بوایە..

وتم: (انشاء الله) لە دەستی دەدات، ڕێك لەسەر دڵی دابوو، هەر دەمی بەیەکدا نەداو مرد. ساچمەزەنەکەم بە دەستەوە گرت و دەمانچەکەی ئەویشم هەڵگرت، هاتمەوە و گاجووتم لەوێ بەرەڵا کرد، بەهەڵەداوان ڕامکرد، نەمزانی چۆن بەسەر ئەو هەموو ڕەوەز و

بەردەدا گەیشتمە ماڵەوە، شپرزە، نە پشتوێن لە پشتە، نە جامانە لەسەرە، من لە ناو ئێشدا بووم، خێزانم هاواری کرد ئەی قوڕ بەسەرم ئەوە بۆ وادەکەیت؟! پیاوەکە، وتم: ئافرەت ماڵمان وێران بوو، وەڵاهی من و تۆ ژن و مێردێکی بەختەوەر بووین، بەداخەوە وەڵاهی هیچ مەبەستێکم نەبوو، وەڵاهی ئەو برایەی تۆ غەدری لێکردم، وەڵاهی بەدەستی من ئەو برایەت کوژرا.. لەبەر ئەوە گەردنم ئازاد بکە، ئێمە ژن و مێردێکی بەختەوەر بووین، بەڵام دیارە هەر ئەوەندەمان نسیب بەیەکەوەبوو، من سەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم بۆلای کەسێکی دەسەڵاتدار، و ئیتر تۆش منداڵەکانت بردن و یان بەرەڵایان بکەن، یان بیان کوژن، من دەبێت سەڵتە خێزان هەڵبێم..

دەڵێت: خێزانم وتی بەڕاستتە؟ وتی: وامزانی ئەویش تۆڵەم لێدەکاتەوە، یان چۆن شتی وات کردووە؟ وتی: وەڵاهی تۆ پیاوێکی بەڕێزیت، تۆ پیاوی ئەوە نیت پیاو بکوژیت، ئەو برایەی من کەلە شەق بوو، وەڵاهی بۆت هات لە ماڵەوە لەبەری پاڕامەوە، وتم با بێتەوە دوو قسەی لەگەڵدا بکە، وەڵاهی ئەم پیاوە زۆر حورمەتی ئێوە دەگرێت.. هەرچی سەرێکی بەمن بگات ڕێزم لێدەگرێت.. کوڕە باشەکەم، برا باشەکەم بە قسەی خەڵك مەکە، دڵنیا بووم کارەساتێك دەقەومێنێت، بەڵام ئەو بەکارەساتی خۆی گەشت و بە داخەوە ڕوویدا..

بەڵام ئەو عەقدە شەرعیەی کە من و تۆی حەرامی بەیەك حەڵاڵ کرد، بە کوشتنی براکەم هەڵناوەشێتەوە. من و تۆ لە ڕۆژگاری خۆشیدا بەیەکەوە بووین، بیشم کوژن من پشتی تۆ بەرنادەم، بۆ هەر شوێنێك بڕۆیت منیش دێم.. ئەگەر شەڕیش دەکەیت ماڵی باوکم بێن تفەنگێکیش بدە دەست من، من لەو پەنجەرەوە شەڕیان لەگەڵ دەکەم، هەتا تۆ ڕزگار دەکەم، ئەو عەقدە نابێت هەڵبوەشێتەوە بە کوشتنی براکەم!! سەیری ئافرەتی ژیر یەعنی بەڕاستی من سەرم سوڕماوە!!

دەڵێت: زمانی وشك بوو، ئەمە خەونە برای ژنەکەم جەنازەکەی لەوێ بکەوێت، ئامادەبێت هێشتا پشتی لە مێردەکەی نەکات و بەرگری لێبکات..

دەڵێت: وتم وەڵاهی پێویستە ئێمە خۆمان لابدەین.. هەرچەندە وتم تۆ مەیە..

وتی: نە بە خودا، وتم: تۆ بڕۆوە ماڵی باوکت بەقسەم بکە، وتی: نە بە خودا تۆ لەکوێ بیت منیش لەوێ دەبم. لەبەرئەوە هەر شەڕواڵێکی پیاوانەی لە پێکرد و، ئەویش بە شوێن مندا هات.. هەتا ئەوان پێیان زانین و چوون بۆ جەنازە، ئێمە لە دێیەکە دەرچووبووین و پەنامان بۆ پیاوێکی دەسەڵاتدار برد.. ماوەی چەند ساڵێك بە دەربەدەری ماینەوە لە پەنای ئەو پیاوە دەسەڵاتدارە، هەتا خودا ڕەحمی کرد و سوڵحمان کرد و هاتینەوە..

ئەو ژنە کەس و کارەکەی وتیان: ئێمە لە خۆت بێ بەری دەکەین، وتی: من ناتوانم دەست لە مێردەکەم هەڵبگرم، چونکە ئەو پیاوە هیچ غەڵەتێکی نەکردووە، ئەم پیاوە گوناحە، ئەم پیاوە پیاوێکی بەڕێزە، ئێوە غەدرتان لێکرد.. سەیری ئافرەتی ژیر، ئەمانە بەڕاستی نمونەن، ئەم پیاوەی خۆی هەڵسەنگاندووە، پیاوێکی بەڕێزە، بەهانەی پێ گیراوە پەلاماری دراوە، ئیتر لەناچاریدا دیفاع و نەفسی کردبێت و قەدەری خودای ئەو ژن برایەی بەدەستی ئەو کوژراوە..

جا لەبەرئەوە بەڕێزان ئەمە خێزانە، ئەمە ئەو خێزانانەن کە هیچ ڕوداوێکی دڵتەزێن ناتوانن لەیەکیان جیابکەنەوە، خۆزگە هەمووخێزانەکان ئاوا پتەو بونایە، نەك لەسەر شتی سادە، ژنی واهەیە، جاری واهەیە، ئافرەتێکی دوو زمان یەك قسەی بۆ دەگێڕێتەوە، ئەمیش یەکسەر بڕوا دەکات. پیاوێکی واهەیە کەسێکی ناحەز دووقسەی بۆ دەکات یەکسەر بڕوا دەکات.. یەکسەر پەلاماری ژن و منداڵەکەی خۆی دەدات، دەڵێت: فلانە کەس وای وتووە..

## چارەسەری قورئان بۆکێشەی ژن ومێرد:

جا قورئانی پیرۆز ئاماژەمان بۆ دەکات، ئامۆژگاریمان دەکات، ئێمە باسی گیر و گرفتمان کرد.. ئەم ڕەمەزانە هەر کەسێك گرفتی خێزانی هەیە با گوێ لە قورئان بگرێت. با ئەگەر دەپرسێت چارەسەرم چیە؟ خودا وەڵامی دەداتەوە:

﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ ﴾ ئەی ئەو پیاوانەی دەترسن خێزان و شیرازەی خێزانتان هەڵبوەشێت، ژنەکانتان لارە ملن، خێزانەکەت بێ گوێت دەکات، ئەم خێزانە خەریکە لە سککەی خۆی لادەدات، ئەم ئافرەتە ڕۆژ بە ڕۆژ خراپ تر دەبێت. خودا بەچەند قۆناغێك چارەسەری بۆداناوە.. وەك دەفەرمووێت:

## یەکەم: ﴿فَعِظُوهُنَّ﴾ئامۆژگاری کردن

یەکەم جار ئامۆژگاری بکە، مەوعیزەی بکە، جا وەعز لەگەڵ نەصیحەدا جیاوازی هەیە، خودا نافەرمووێت نەصیحەتیان بکەن.. دەفەرمووێت (فَعِظُوهُنَّ) وەعزیان بدەن. وەعز ئەوەیە لەکاتی ئامۆژگاریەکەدا غەیری ئەم ژن و پیاوە کەس ئاگای لێنەبێت، نابێت لەبەر چاوی دایك و باوك و کەس و کار و خوشك و برادا نەصیحەتی ژنەکەی بکات. دەفەرمووێت: ئەی پیاو وەرە لە شوێنێك دا، لەو کاتەدا کە جەو ئارامە، چونکە جەوی گفتوگۆ بەڕێزان دەبێت وەختی بێت..

ئێستا تۆ کاتێك تۆو دەچێنیت بۆئەوەی ئەم تۆوە بەرهەم بێت دەبێت زەویەکە گونجاو بێت، وانیە؟ ئەینا کام تۆو و گەنمەی جوانە و پاك و بژاردەیە، وەرە تۆ بەسەر ئەو شاخە ڕەقەدا بیرێژە بزانە دەڕوێت؟ نەخێر، ناڕوێت.. ئەگەر بیشڕوێت هەر دانەی لە شوێنێك دەڕوێت، دەبێت زەویەکە گونجاو بێت، دەبێت تۆوەکەش گونجاو بێت، زەویەکە کەشەکەیە، کە قسەی تێدا دەکەیت، ئایا ئەو ژنە لەو کاتەدا مێشکی لەسەر خۆیەتی؟ ژنەکە لە ئەوپەڕی توڕەیدایە پیاوەکە بچێت نەصیحەتی بکات بە گوێیدا ناچێت..

ئەو توڕەیە، لێی بگەڕێ با هێواش بێتەوە، لە کاتێکی ئارامیدا نانێك بەیەکەوە بخۆن، دەست و دیارییەك بەرە ماڵەوە، ڕووت خۆشبێت، دەفەرموو وەرە ژنەکە ئێمە جار جارێك گفتوگۆی ناخۆشمان هەبووە، وەرە با ئەمجارە ئامۆژگاری یەکتر بکەین، گوێ لەیەکتر بگرین.. بزانین بۆ لەگەڵ یەکتر خراپین؟ خودا نەخواستە کەسێك قسەی بۆکردوویت؟ یان من هەڵەیەکم هەیە؟ بە زمانێکی شیرین بۆی بچێت، دەبێت تۆوەکەش جوان بێت، ئێستا زەویەکە چەند لەبار بێت، کەشەکەشی هەبێت، تۆ ئێستا بچیت تۆو بروێنیت نابێت، وانیە؟ دەبێت بارانی پەڵەبێت.. وەختی تۆو چاندن بێت، وەختی خۆی بێت، ئەمجا بەرهەم دێت.. تۆوەکەش ئەو قسانەیە، دەبێت بژاردە بێت، تۆوێکی پاك بێت، نەك لە کاتی نەصیحەتدا جوێن بڵێیت، ئەمەش بۆخۆی نابێتە (وعظ) خودا دەفەرموێت: (فَعِظُوهُنَّ) بە نەرمی بە جوانی لەکەش و هەوای خۆیدا، لە کاتێکدا کە ئەم خێزانەت ئارامە بەنەرمی قسەی بۆ بکە..

خودای بە بیر بهێنەوە بڵێ دەبێت لە خودا بترسین، ئێمە هاوسەری یەکین، ئەی چەند ساڵ تۆ لەوانەیە ئاواتت بوبێت شوو بکەیت، من ئاواتم هەبووە خێزانم هەبێت، حەیف نیە ئێستا ئەم لانە و هاوسەریەی خۆمان لەیەك بشێوێنین؟! حەیف نیە ئەم منداڵانەمان سەرگەردان بکەین؟! مەوعیزە بەڕێزان ئەوەیە: (فَعِظُوهُنَّ) خودا دەفەرموێت بە نەرمی ئامۆژگاریان بکەن..

## دووەم: جیابونەوەلێی بۆسەرجێی

﴿وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ﴾ چەند جار ئەم ئامۆژگاریەت کرد. چەند مانگ لەگەڵی ڕۆشتی هیچ سوودی نەبوو، ژنە یەك قسەی بە گوێدا نەدەچوو، خودا دەفەرموێت ئەمجارە لە ناو جێگادا لەگەڵی ڕامەکشێ، ﴿وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ﴾ جا سەیری زۆر کەس هەبووە ئەم ئایەتانەی بە هەڵە تەفیسر کردووە، وتوویەتی: ژورەکەی بۆ

بەجێبهێڵە، نا.. بەڵام سەیری قورئان بکە (فی) حەرفی جەررە، لە زمانی عەرەبیدا بۆ زەرفیەتە، واتە لە ناو یەك جێگادا لەگەڵی بخەوە، بەڵام ئەمجارە باوەشی پێدا مەکە، پشتی تێ بکە، ئەم جارە جیماعی لەگەڵ مەکە، بۆ ئەوەی پێی بڵێت ئەی ژنەکە من تۆم بە جیماع و سێکس و جنسەوە ناوێت..

ئێمە پێش ئەوە هاوسەری ژیانی یەکترین، ئەگینا من پیاوێکم زۆر لەوە بەهێزترم، دەتوانم هیچ کارێکی جیماعیشم پێت نەبێت، مەسەلە ئەوە نیە مەجبوری کاتێك من ئامۆژگاریم کردوویت، ئەوەتا لە ناو جێگادا لەگەڵت دەخەوم و دەست نوێژم لێت ناشکێت.. ئەها ﴿فِي ٱلۡمَضَاجِعِ﴾ جێگاکە چۆڵ مەکە، مەیەڵە منداڵەکانت هەستت پێبکەن، کە ئەم ژن و پیاوە ناکۆکیان هەیە، ژوورەکە بە جێ مەهێڵە، جێگاکەش بە جێ مەهێڵە، بەڵام جیماعی لەگەڵدا مەکە، پشتی تێبکە..

ئەگەر ئەمە سودی هەبوو، ژنەکە بە ئاگا هاتەوە، ڕاچڵەکا، بڵێ ئەها ئەو پیاوە کە بە حەیاتی بەبێ من نەدەژیا، ئێستا ئەوەتا لە ناو جێگادا پشتم تێدەکات.. دیارە من زۆر هەڵە بووم، ئەگەر بە هۆش خۆی هاتەوە، داوای لێبوردنی نەکرد، هەر بەکردەوە داوای لێبوردنی کرد.. ئەویش ڕووی تێکردیەوە، تۆش ئەو لاپەڕە هەڵدەوە..

## سێیەم: ﴿وَٱضۡرِبُوهُنَّ﴾ لێدانی دڵسۆزانە

ئەگەر جیابونەوە لەجێگا سودی نەبوو، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱضۡرِبُوهُنَّ﴾ ڕایچڵەکێنە بە لێدان بەڵام لێدان، مەعنای دار کاری نیە، لە شەرعدا دەفەرموێت کابرا بە سیواکەکەی کە لە پشتوێنەکەی دایە بیکێشێت بە ڕوومەتی ئافرەتەکەیدا، بڵێ ئافرەت بە هۆش خۆت وەرەوە، بۆ خاتری خودا، ئەم (ضرب)ە خەڵك وادەزانێت بە گۆچانێکی ئەستور دار کاری بکات و لا سەری بێنێتە خوارەوە..

برا (ضرب)ی قورئانی وانیە، ئەم لێدانە ئەزانن وەکو چی وایە؟ ئەها کابرا لە هۆش خۆی دەچێت، چەند جارمان بینیوە پیاو کوڕ یان کچ بوراوەتەوە، خێرا توزێك ئاو بە دەم و چاویدا دەکەن و ئاوا بە هێواشی زلە لە بنا گوێی دەدەن.. وانیە؟

ئەو کەسەی جاری واهەیە دکتۆر وای لێدەکات، رایدەچڵەکێنن، ئاوا سنگی دەگرن بۆ ئەوەی بە ئاگابێتەوە، ئەو لێدانە ئایا لێدانی توڕەیی و ڕقە؟ نە خێر.. ئەو زلانەی لێی دەدرێن لێدانی بە ئاگا هێنانەوەیە، ئەو لێدانەی پیاویش بۆ ژن لێدانی بە ئاگا هێنانەوەیە.. دەڵێت: ئافرەت بۆ خاتری خودا بە ئاگا وەرەوە، من ئەو پیاوەم بە عومری خۆم دەستم لە تۆ بەرز نەکردۆتەوە، کەچی وا ناچارم دەکەیت. ناچارم دەکەیت بە ئاگات بهێنمەوە، من بە ئاگات دەهێنمەوە بۆ خاتری خودا با لێمان تێك نەچێت.. با لێمان نەشێوێت.. ﴿فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ﴾ جا هەندێك لە عولەما دەفەرموون کلاوەکەتی پێدا بکێشە، موهیم ئەوەیە ئەم بە ئاگا بهێنیتەوە.. دەستی لێ بەرز نەکردۆتەوە، ئەینا ئەوە لە دیندا قبولّ نیە..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پیاوی مسوڵمان هەرگیز لە ڕومەتی ژنەکەی نادات، نابێت زلەی لێبدات، نابێت شەقی لێبدات، نابێت لەبەرچاوی خەڵکدا بیشکێنێت، نابێت لە کۆڵاندا لێی بدات.. پیاوی وا هەبووە دوای ژنەکەی کەوتووە دوو گەڕەك ڕاویناوە، ئەوە لە دینی خودادا جێی نابێتەوە، (وَٱضۡرِبُوهُنَّ) دەبێت لە ناو ماڵدا بێت، دەبێت وەکو ئەو کەسەی دەبورێتەوە تۆ بەئاگای دەهێنیتەوە، ڕایچڵەکێنە، بڵێ تۆ ئافرەت لە خەوی غەفڵەتدایت، تۆ بێهۆش بوویت، تۆ بەنج بوویت.. تۆ قسەت بۆکراوە..

تکات لێدەکەم وەرەوە هۆش خۆت، ئەم هەموو قسەم بۆ کردی، ئەو هەموو ناو جێگایە تەرکم کردی ئەمجا نۆرەی ئەوەیە بە ئاگات بهێنمەوە، ڕاتچڵەکێنم، ئەها جاری واهەیە کابرا بوراوەتەوە دکتۆر ئەو کارەبایە لەسەر سنگی دەدات، ڕایدەچڵەکێنێت.. ئەها ئەم نمونانە بێنە بەرچاوتان، ئەو کەسە جاری واهەیە خەریکە دەمرێت، دڵی

دەوەستێت، کارەبای لێدەدات.. دکتۆر قیاسی سێ سم ئەو جسمە بەرز دەکاتەوە، دەڵێت ئەگەر یەك زەرە ڕۆحی تێدا مابێت، ئەو کارەبایە دەیهێنێتەوە هۆش خۆی..

ئەم لێدانەی پیاویش دەڵێت: یەك زەرە هۆشی مابێت ئەمە دواجارە، دوا فرسەتە، وەرەوە هۆش خۆت با خێزانمان لێهەڵنەوەشێت. ﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ﴾ ئەگەر ژنەکە بە ئاگاهاتەوە، وتی: وەڵاهی پیاوەکە ڕاست دەکەیت. وەڵاهی من خەتاباربووم، با دەست پێبکەینەوە بە ژیانێکی نوێ..

﴿فَلَا تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا﴾ خودا لە قورئاندا دەفەرمووێت: ئێوەش خراپەیان بەرامبەر مەکەن، تۆ ستەم مەکە، ئەمجا مەڵێ تازە قەت لێت خۆش نابم، تازە قسە کەوتە بەینمان، نانا، تۆش ئەو لاپەڕەیە هەڵدەوانێ و ژیانێکی سەر لەنوێ دەست پێبکەنەوە..

بەڕێزان: ئەمە بنەمای قورئانیە پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمەی بە کردەوە بەیان کردووە.. کۆتای مەوعیزەکەمان دەچینە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، سڵاواتەکانمان لێدەدەین و دەڵێین:

(اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلِّ عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلِّ عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّم)

## گومانی خراپی بە پێغەمبەر برد !!

پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم نەرمە لێدانەی بەکارهێناوە لە کاتێکدا کە خاتوو (عائیشە) کەلە فەرموودەی صەحیحدا دەفەرمووێت: شەوێکیان پێغەمبەری خودا ﷺ درەنگ لە مزگەوت گەڕایەوە، لەو کاتەدا هات من خۆم کرد بە خەوتوو، پێغەمبەر ﷺ بە هێواشی پێڵاوەکانی داکەند و پشتوێنەکەی کردەوە و مێزەرەکە و کڵاوەکەی دانا، لەو کاتەدا

خەریکبوو ڕاکشێ، پێغەمبەر ﷺ دیسان خۆی ئامادە کردەوە و وەکو یەکێك بانگی بکات، پێغەمبەری خودا ﷺ بەبێ چرپە، وام خۆ لە خەو خستبوو، وای دەزانی خەوتووم.. لەو کاتەدا پێڵاوەکانی بەدەستەوە گرت و بە هێواشی دەرگاکەی کردەوە، کە جیڕەی دەرگاکە نەیەت.. دەرگاکەشی بە هێواشی پێوەدایەوە و پێڵاوەکانی لە دەرەوە لە پێ کرد، ڕۆشت..

وتم: ئەمە پێغەمبەری خودا ﷺ مەبەستی ئەوەبوو بزانێت من خەوم لێکەوتووە یان نا، ئاخۆ بۆلای چ خێزانێکی تری بچێت، بە هێواشی شوێنی کەوتم، هەتا لە مزگەوت دوورکەوتەوە بەرەو گۆڕستانی (بقیع) ڕۆشت.. گۆڕستانی (بقیع) ئێستا لە تەنیشت مزگەوتی پێغەمبەرە ﷺ، پێوەی جوت بووە.. ئەو زەمەنە فەترەیەکی زۆر لە بەینیان هەبووە، مزگەوتەکە زۆر گەورە نەبووە، زۆر ڕۆشت هەتا چووە سەر گۆڕستانی (بقیع)،

دەفەرمووێت: بینیم لەوێ نوێژی کرد و دوعای کرد بۆ شەهیدانی (ئوحود) و، هەموو شەهیدانی ئیسلام، زۆر گریا.. دەیفەرموو: یاڕەبی خودالێتان خۆشبێت، ئەی ئەو کەسانەی ڕۆح و گیانی خۆتان بە ئیسلام بەخشی، یادی صەحابەکانی دەکردەوە، یەك یەك ناوی دەهێنان، دوعای خێری بۆ دەکردن..

دەفەرمووێت: لەو کاتەدا من وتم ئای لە چ حاڵێکدام و پێغەمبەری خودا ﷺ لە چ حاڵێکدایە، من چەند هەڵە بووم.. ئەمجا پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە..

دەفەرمووێت: منیش خێرا گەڕامەوە، پێغەمبەر ﷺ تۆزێك خێرا ڕۆشت، من خێراتر، پێغەمبەر ﷺ بە گورگە لۆقە دەڕۆشت، خێرا فریایماڵەوە بکەوێتەوە، من بەڕاکردن ڕۆشتم، خێرا دەرگاکەم کردەوە و خۆم کردە ناو جێگا و خۆم کرد بە خەوتوو.. بەڵام لەبەر ئەوەی ڕامکردبوو، ترسابووشم، وەکو کەسێك کە کەتنێکی کردووە، کارێکی نابەجێی کردووە، هەناسەم تەنگ ببوبوو، دڵم بە خێرای لێی دەدا لەسینەمدا..

پێغەمبەر ﷺ کە هات بە هێواشی دەرگاکەی کردەوە، بەڵام کاتێك سەیری منی کرد، ئەوە کەسێکی ئارام نیە، بۆ هەناسەت واتوند بووە؟! ئەوە بۆ وات لێهاتووە؟

وتم: هیچ نیە..

فەرمووی: پێم دەڵێیت یان خودای پەروەردگار خۆی ئاگادارم بکاتەوە؟.

وتم: وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ لە تۆ ناشاردرێتەوە، دڵنیام خودا ئاگادارت دەکاتەوە، حاڵ و مەسەلەیەکی وابوو، من گومانی خراپم بە تۆ برد..

دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی گومانی خراپ؟! بەوەڵاهی ئەوە (جبریل) بانگی کردم، بەڵام من وامزانی تۆ خەوتوویت، لەبەر خاتری تۆ کە خەوەکەت لێ تێك نەچێت و نەترسیت بە تەنها، ئەوەندە بە هێواشی دەرگاکەم کردەوە، تا تۆ خەوەکەت لێ تێك نەچێت.. ئەینا من چۆن خۆم دەدزمەوە..

دەفەرموێت: لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ مستێکی لەسەر سنگم دا.. فەرمووی: بەئاگاوەرەوە، ئەو گومانە خراپانە فڕێ بدە، چۆن پێغەمبەری خودا فێڵ لە خێزانی دەکات؟ ئەمە لە پێغەمبەری خودا ناوەشێتەوە.. ئەها ئەو زەربەیە، ئەو لێدانە، لێدانی ڕق نەبووە، لێدانی بەئاگاهێنانەوە بووە.. ئەو سینەت بەئاگابهێنەوە، ئەو ڕق و قینە فڕێ بدە.. ئەوە ئەو لێدانەیە بەئاگاهێنانەوەیە..

ئومێدەوارم کەخێزانی مسوڵمانان هەموومان بەختەوەربین. هەموومان لە ئاژاوەی خێزانی بە دووربین. ئەو خێزانانەی ناکۆکن خودای گەورە ڕەحم بەحاڵیان بکات. ئەو کوڕ و کچانەی تا ئێستا خێزانیان بەیەکەوە نەناوە، ژیانی هاوسەریان بۆ نەڕەخساوە، یاڕەبی خودایە بەدڵی خۆیان توشی هاوسەری حەڵاڵ و دینداری خۆیان بن.. خودای گەورە کارئاسانیان بۆبکات..

وە هەتا شەوێکی تر و بەرنامەیەکی تر لەخزمەت پێغەمبەری خودادا بە خوداتان دەسپێرم..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ) .



# وانەی بیست و چوارەم



## بابەت

## مەردبەو

## بتی ناو ناخی خۆت بشکێنە



# وانەی بیست و چوارەم

## مەردبە و بتی ناو ناخت بشكێنە

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾﴾ البَقَرة .

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:﴿فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾﴾ القَلَم.

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ... ﴿٢٧٩﴾﴾ البقرة.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (الرِّبا سَبْعُونَ حُوباً ، أيْسَرُها أنْ يَنْكِحَ الرَّجُلُ أُمَّهُ)

ـ صَحيحٌ ، رَواهُ إبْنُ ماجَة : (٢٢٧٤) وَ صَحَّحَهُ الألْباني في صَحيح الجامع : (٣٥٣٩) .

* وَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (دِرْهَمُ رِباً يَأْكُلُهُ الرَّجُلُ وَهُوَ يَعْلَمُ أشَدُّ مِنْ سِتٍّ وَ ثَلاثينَ زَنْيَةً) ـ صَحيحٌ ، رَواهُ أحمد ، (٢١٤٥٠) . وَصَحَّحَهُ الألْباني في صَحيح الترغيب وَ الترهيب : (١٨٥٥) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (لا تَكونُوا إمَّعَةً ، تقولونَ : إنْ أحْسَنَ النّاسُ أحْسَنَّا ، وَ إنْ ظَلَمُوا ظَلَمْنا ، وَ لكِنْ وَ لصنُوا أنْفُسَكُمْ ، إنْ أحْسَنَ النّاسُ أنْ تُحْسِنُوا وَ إنْ أساءُوا فَلا تَظْلِمُوا) ـ رَواهُ الترمِذي (٢٠٠٧) وَ قالَ محقق جامع الأصول: (١١ / ٦٩٨) حديثٌ حَسَن .

* عَنْ جابِر : (لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ آكِلَ الرِّبا ، وَ مُوكِلَهُ ، وَ كاتِبَهُ ، وَ شاهِدَيْهِ وَقالَ هُمْ سَواءٌ) - رَواهُ مُسْلِم : (١٥٩٨) .

* قالَ الإمام علي : (إنَّ هذهِ القُلوبَ أوْعِيَةٌ ، فَخَيْرُها أوْعاها لِلْخَيْرِ ، وَ النّاسُ ثَلاثَةٌ : فَعالِمٌ رَبّانِيٌّ ، وَ مُتَعَلِّمٌ عَلى سَبيلِ نَجاةٍ ، وَهَمَجٌ رِعاعٌ أتْباعُ كُلِّ ناعِقٍ ، لَمْ يَسْتَضيئُوا بِنُورِ العِلْمِ ، وَلَمْ يَلْجَأُوا إلى رُكْنٍ وَثيقٍ) - الإعتِصام ، لِلْشاطبي ، ج٢ ، ص٣٥٨ .

* عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ ، قالَ : قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِعَمِّهِ أبو طالِب : (قُلْ : لا إلهَ إلاّ اللهُ ، أشْهَدُ لَكَ بِها يَوْمَ القِيامَةِ) - رَواهُ مُسْلِم .

* قالَ أَبو طالب : (لَوْ لا أنْ تعيرني قريش ، يقولُونَ : إنَّما حمله عَلى ذالِكَ الجَزَع ، لأقررت بِها عَيْنَيْكَ ، فأنْزَلَ الله : ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ﴾ القصص : ٥٦ .

## سەرچاوەكان :

١) المَوْسوعَة المِنْبَرِيَّة في خُطَب الجُمُعَةِ وَالعيدَيْنِ ، محمد عبدالعاطي بحيري ، ج١ ، ص٢٩ ، ط : ١ ، ٢٠١٢ ، دارُ التوفيقيَّة ، القاهِرَة .

٢) موسوعَة نَظْرَة النَّعيم في مَكارِمِ أخْلاق الرَّسُول الكَريم ، مجموعَة مِنَ المُخْتَصِّينَ ، ج٩ ، ص٣٩٩٦ ، ط : ٨ ، ٢٠١٢ ، دارُ الوَسيلَة ، السعوديَّة .

٣) رَوْضَة المُتَنَزِّه ، شرح بِداية المُتَفَقِّه ، أيْمَنْ عَلي موسى ، ج٢ ، ص٢٠١ ، ط : ١ ، ٢٠١٠ ، دارُ ابْنُ رَجَب ، القاهِرَة .

٤) بەختەوەر بژی ، د . محمد عبدالرحمن العريفي ، و : هێمن محمد علي ، ل٣١٤- ٣١٩ . كتێبخانەی : (نارین) هەولێر .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیمانداران و خوداناسانی بەڕێز: ئەمشەویش لە خزمەت پێغەمبەری خودادا ﷺ قسە لەسەر بابەتێکی تر دەکەین، کە ڕەنگ بێت بۆ ئەمڕۆی ئێمە زۆر پێویست و زەرور بێت. لە کاتی چونمان بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ با دیاریەکانی خۆمان، سڵاواتەکانی خۆمان بنێرینە خزمەتی و بڵێین:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

پێغەمبەری خودا ﷺ لە شاری مەدینە بوو هۆزی (سەقیف) هۆزێك بوون، بنەماڵەیەکی گەورەبوون، قەوم و عەشیرەتێکی گەورەبوون.. هاتنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بەڕاستی ئێمە بۆمان دەرکەوتووە ئەم ڕێبازەی تۆ، ئەم ئاینەی تۆ پیرۆزە، کە ئاینی ئیسلامە، ئاینی سەرجەم پێغەمبەرانی پێشووە، بەڕاستی ئاینێکی حەق و ڕاستە، ئێمەش هاتووین لە خزمەت جەنابتان پەیامی خودای پەروەردگار وەربگرین و مسوڵمان ببین..

پێغەمبەری پێشەوامان بەڕاستی گەشایەوە، بەڕاستی دڵی خۆشبوو.. هۆزی (سقیف) دەیانەوێت بێنە ناو ئەم دینەوە، ئەی سوپاس بۆ تۆ خودایە، کە پێغەمبەری خودا ﷺ دڵتەنگی بەس بۆ ئەوەبوو خەڵك مسوڵمان نەبن..

﴿فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ٦﴾الكهف.

لە سورەتی (کهف)دا خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ئاگامان لێیە کە خەریکە سینەت شەق دەبێت لە داخان ئەی ﴿محمد﴾ﷺ کە دەبینیت ئەو خەڵکە ئیمان نایەنن،

پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێکیش زۆر شادومان دەبوو کاتێك کە دەیبینی خەڵکانێك بەرەو ڕەحمەتی ئیسلام دێن، لە ئاگری جەهەنم ڕزگاریان دەبێت..

## ڕیبا مەخۆن

زۆر شادومان بوو بەم هۆزە بەڵام فەرمووی وەرن ئاوا کوێرانە شوێن دین مەکەون، وەرن پرسیار بکەن.. تێبگەن.. بزانن دینەکە چیە؟

وتیان: وەڵاهی خۆ ئەمە شتێکی باشە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، لەبارەی سێ شتەوە پرسیارت لێدەکەین. ئێمە قەومێکن موبتەلا بووین ساڵانێکی زۆرە بەڕیبابازیەوە، کەسمان قەرز نادەین بە کەسمان ئیلا بە ڕیبا نەبێت، ڕیبا ئەوەیە کە تۆ دینارێك بدەیت بە کەسێك، (گەلایەك) سەد دۆلارێك، دەبێت لەوسەرەوە سەد و یەك دۆلاری لێبستێنیت، ئەو یەك دۆلارە ڕیبایە، وەکو ئەوە وایە شەڕت لەگەڵ خودا کردبێت.. پەنا بە خودا، وەکو ئەوە وایە ئینسان ئەگەر ڕیبا سی و شەش پلە بێت، لانی هەرە کەمەکەی وەکو زینا کردنە لەگەڵ دایکت.. پەنا بە خودا، زۆر گوناحێکی گەورەیە خودا بمان پارێزێت..

وتیان: ئێمە لەدێر زەمانەوە قەت پیاوەتیمان نەکردووە، پارەمان بەس بەڕیبا داوە، ئایە لە دینی ئیسلامدا چۆنە؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەتا هەتایە ڕیبا حەرامە، ئەو دەرگایە بە هیچ شێوەیەك کەس ناتوانێت بیانکاتەوە..

## زینامەکەن

وتیان: ئەی لەبارەی زیناوە؟ ئێمە بەڕاستی خەڵکێکی زۆرمان هەیە حەزی لە ژنهێنان و شوو کردن نیە حەزی لەوەیە منداڵی نەبێت و باری گرانی خێزان نەکەوێتە سەرشانی، هەر وا لایەلا بۆخۆی زینا دەکات..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: هەتا هەتایە لە ئیسلامدا داوێن پیسی کۆتایی پێ هاتووە، نەك هەر زینا،بەڵکو پێشەکیەکانی زینا حەرامە، ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَى﴾ فەرمووی: لە دینی ئێمەدا تەوقەکردن، نەزەری حەرام، بەیەکەوەبوونی ژن و پیاوێك بەتەنها، لە مەجلیسێکدا ئەگەر زیناش نەکەن، ئەوە پێشەکیەکانی زینان حەرامن.

وتیان: ئەی لەبارەی عارەقەوە؟ ئێمە زۆربەی خواردنەکانمان بە عارەقەوە دەخۆین. ئێمە قەومێکی عارەق خۆرین..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: عارەقیش (أُم الخَبائث) دایکی تاوانەکانە، ئینسان کە عەقڵی لە دەست دەدات، توشی زۆر گوناح دەبێت. لەبەرئەوە عارەقیش لە دینی ئێمەدا حەرامە، لەبەرئەوە ئەگەر ئێوە مسوڵمان بن ئەی هۆزی (سقيف) دەبێت:

ڕیبا نەخۆن.. دەبێت زینا نەکەن.. داوێن پیسی نەکەن.. داوێن پاك بن، عارەق نەخۆن.. ئەوە گوناحی گەورەیە.

وتیان: وەڵاهی ئەم سێ شتەی تۆ دەیڵێیت هەمووی لە مەصلەحەتی خۆمانە، لەبەر ئەوە بڕیار دەدەین، وەعد بێت ئەمانە ناکەین.. ئێمە کە مسوڵمان بووین دەتوانین زاڵ بین بەسەر خۆماندا، لەو سێ بەلایە، لەو سێ گوناحە خۆمان بە دوور دەگرین.

## بتەکانتان بشکێنن

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: دەی ئێستا موشکیلەتان چیە؟ ئەوەی ئەمشەو باسی دەکەین ﴿ئەی پێغەمبەری خودا موشکیلەم هەیە﴾ ئەمانەی هۆزی (سقيف) دەیڵێن: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە یەك موشکیلەی زۆر گەورەمان هەیە، لەو وەختەدا دەمانەوێت مسوڵمان بین ئەمە لە ناخماندایە، وەڵاهی ئێمە بتێکمان هەیە، ئەو بتە خودامانە، (نَعوذُ بِالله) شتێکی زۆر گەورەیە، عەزیمە، چەندین ساڵە خزمەتی دەکەین، هەموو ساڵێك خاوێنی دەکەینەوە، بە سمارتە ساف و لوسی دەکەین.. خواردنی بۆ دادەنێین.. بتی بەرد!

پێغەمبەری خودا فەرمووی: ئەوە خودا نیە، ئەوە بەردێکی بێ گیانە، ئەوە خۆ هیچ دەسەلاتی نیە، واجبە ئەو بتە بشکێنن.. کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بتەکە بشکێنن، هەر هەموویان لەرزین، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا بە خودا خواکەمان بزانێت بەهیلاکمان دەبات.. ئەوەندە بێ عەقڵبوون! ئەمە بیر و باوەڕە بەڕێزان، بیر و باوەڕە، عەقیدە زۆر موشکیلەیە، کە چووە ناو دڵی ئینسانەوە، ئەمانە هاتوون مسوڵمان بن، بەلام لەو وەختەوە بیر لەوە دەکەنەوە.. وتیان: کێ جورئەتی ئەوە دەکات ئەو بتە بشکێنێت..

ئیمامی (عمر) لەوێ بوو فەرمووی: هاوار بۆئێوە، ئەوە بەردێکە، ئێوە بەرد دەشکێنن دەیکەن بە خانوو، ئێ وەلاهی ئەو بتەش هەر وەك ئەو بەردەیە، ئەو بەردەی لەو شاخە تێك دەدەن دەیکەن بە خانوو، چ فەرقێکی هەیە؟

وتیان: ئێمە نەهاتووین بۆلای تۆ ئەی (عمر)، تۆ قسە مەکە، ئیمامی (عمر) قسەی نەکرد. ڕاستە ئەوان نەهاتوون بۆلای ئەو، ئەوان پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ دەکەن. تەداخولی شتێك مەکە کە پەیوەندی بە تۆوە نیە، پرسیارمان لە تۆ نەکردووە..

وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە مسوڵمان دەبین، بەلام بۆ ئەوەی بتەکە عاجز نەبێت، تا دوو ساڵی تر وازی لێبهێنە، با بتەکەش هەر بۆخۆی لەوێ بێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شتی وا هەر مەحاڵە، مسوڵمانی و بت پەرستی دوو شتن بەیەکەوە ناگونجێن، یەکتا پەرستی لەگەڵ بت پەرستی دوو شتن دژ بەیەکن، ناکرێت بەیەکەوە بن..

وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ یەك ساڵی تر واز لە بتەکەمان بهێنە..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ناکرێت شتی وانابێت.. وتیان: یەك مانگی تر، بەڵکو تووڕە نەبێت، یەك مانگی تر وازی لێبهێنە..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شتی وا مەحاڵە بڕۆن بیشکێنن، برا هیچتان لێ نایەت. ئەساسەن ئەمە هیچ نیە، ئەمە بتێکی بێ گیانە..

وتیان: دە بەو خودایە جورئەتی ئەوە ناکەین، ئەو کارە بکەین. دەبێت ئێوەی مسوڵمانان خۆتان بیشکێنن.. دەبێت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تۆ کەسێك بنێریت ئا لەوێدا گەورەیی صەحابەی پێغەمبەر ﷺ دەردەکەوێت.. ئەم بیر و باوەڕە چونکە دەمێکە چۆتە مێشکیانەوە، سام لەو بتە دەکات.. لەو بەردە دەترسێت..

مسوڵمانیش بووە، بۆتە موەحیدیش، ئیمانی بە پێغەمبەر هێناوە، هێشتا جورئەتی ئەوە ناکات ئەو بتە بشکێنێت.. صەحابەی پێغەمبەر ﷺ گەورەیەکەیان لەوەدایە، کە لەو ڕۆژەی ئیمانیان هێنا، بتەکانیان شکاند. بتەکانیان لە ناو برد.. نەسڵەمینەوە وازیان لەوە هێنا، بتەکەیان لە ناو دڵی خۆیاندا شکاند، پاشان بە دەستیش شکاندیان، لەبەرئەوە بت هەتا لە دڵدا نەشکێت، بەدەست ناشکێت..

حەزرەتی (ئیبراهیم) بە تەور شکاندنی بەس چونکە لە دڵی خەڵکدا نەشکابوون، چاوت لێیە هەر بت پەرستی کۆتای نەهات. ﴿محمد﴾ ﷺ سیازدە ساڵ بتی لەناو دڵی خەڵکدا شکاند. ئەها خەڵکێك دەڵێن بۆ سێسەد و شەست بت لە ناو مەککەدا بوو، سیازدە ساڵیش پێغەمبەری خودا ﷺ لەناو مەککەدا بوو، وانیە؟

چەندین کوڕی گەنجی وەکو ئێوە لە خزمەتیدا بوو، بیفەرمووایە بەشەو بچن بە تەور سەری ئەو بتانە ببڕن، سەد گەنج خۆی فیدا دەکرد، بەس نەء، سیازدە ساڵ لە مەککەدا یەك بتی نەشکاند، بت لە ناوەڕاستی شاری مەککەدا بوو، بەیەك سەعات دەیان توانی هەموویان بشکێنن، بە دزیەوە کەسیش نەیدەزانی.. بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: سودی نیە، ئێمە دەبێت بتەکان لە دڵی خەڵکدا بشکێنین، ئەمجا خەڵك دوایی بە چەکوش بیشکێنن.. ئەینا تۆ بیشی شکێنیت ئەو زیاتر دەیپەرستێت، دەبێت بتەکە لە ناو دڵی خەڵکدا هەڵبکەندرێت..

بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەمە ڕازین، خۆمان دێین و دەیشکێنین و هیچیش نابێت. ئەوە بەردێکی بێ گیانە چی نە سودی هەیە و نە زیان.

وتیان: وەڵاهی ئێمە ئەم مسوڵمانیەتیەمان قبوڵە، ئەگەر ئێوە خۆتان بتەکە بشکێنن بەس ئێمە بێ بەرین، ئێمە حەقمان نیە بەسەریەوە، دوایی توشی شت بوون، هێشتا هەر قەناعەتیان نەدەکرد..

بەس وەڵاهی یەك شتی تر ئەی ﴿محمد﴾، یەك شتی تریش موشکیلەیە، وەڵاهی ئێمە حەزمان لە نوێژ کردن نیە، ئێمە قەومێکی بەهێزین و خۆمان بە خاوەن غیرەت دەزانین، کورە وەڵاهی سەر نەوی کردن خۆش نیە، ڕۆژی پێنج جار! سەیری ئەم پێغەمبەرە ﷺ بە تەحەموله، فەرمووی: براینە ئێمە ئەوەمان لێ قبوڵ کردن بتەکە بە دەستی خۆتان نەشکێنن، بە دەستی خۆمان بیشکێنین بەس وەڵاهی خێر لە دینێکدا نیە کە نوێژی تێدا نەبێت. هەر مسوڵمانێك نوێژ نەکات خێری تێدانیە، بۆ ئیسلامەتی لەبەر ئەوە ئەمە شایەنی قسە لەسەر کردن نیە. وتیان: قەینا نوێژیش دەکەین و لەگەڵ نوێژیشدا قبوڵمانە قەومێکی دیندار دەبین: وەڵاهی ئیمان دێنین وتیان:

(أشهد أن لا اله إلا الله و أشهَدُ أن محمد رسول الله)

پێغەمبەری خودا ﷺ کۆمەڵێك صەحابەی لەگەڵدا ناردن بەسەرکردایەتی (خالدی إبن ولید)و(موغیرەی إبن شوعبە) لەو کاتەدا ڕۆشتن و گەشتنە ناو هۆزی (سقیف)، بەس چ بت؟ هەیکەلێك وایان لێکردبوو، خواردن لەبەردەمیدا، گوڵ لەبەردەمیداو ئاو لەبەردەمیدا بوو، ئیتر سەیر دەکەن ئەمە خودایە، لێی دەپاڕانەوە پێشتر..

وتیان: دەوەڵا ئێمە حەقمان نیە، دوایی توشی هەرچیەك بوون لەسەر خۆتانە، صەحابەکان پێکەنینان بەم شتانە دەهات. وەڵا (موغیرەی إبن شوعبە) فەرمووی: ئێستا دەبێت پێکەنینێکتان بۆ دروست بکەم بە صەحابەکانی فەرموو..

وتیان: چۆن؟! وتی: حەقتان نەبێت تەورێکی هێنا، وەڵا یەکەمجار لەسەری بتەکەی دا سەری پەڕی لێیدا سەری پەڕاند، یەکسەر خۆی بەپشتدا خست و تەورەکەی فڕێدا و دەستی کرد بەقەلە فرتێ و کەفی لەسەر دەمیەوە هەڵدەدا و، وتیان: بابە ئێمە پێمان

گوتن، وەڵاهی ئێستا هەر هەمووتان لەناو دەبات. ئەوەتا ئەو کەسەی دەستی بۆبرد لەناو چوو.. ئەها بتەکە چۆن دەستی لێوەشاند، ئێمە بۆیە دەترساین..

دەڵێت: لەو کاتەدا (موغیرەی إبن شوعبە) هەستایەوە دەستی کرد بەپێکەنین..

وتی: وەڵاهی ئەوە یاریەك بوو کردم، بۆ ئەوەی پێتان بسەلمێنم ئەوە هیچ دەسەڵاتێکی نیە، ئەوە بەقەستی وامکرد..

دەڵێت: ئەمجا پارچە پارچەیان کرد و هیچیان لێنەهات، تەبعەن ئەمجا قەومەکە سامیان شکا، ئەمجا خۆیان هاتن پارچەی تریان لێدەکردەوە، بت پەرستی لە ناو دڵیاندا کۆتایی پێهات.. لەبەر ئەوە ئەم دەرسەی ئێمە، زۆر کەس بتەکە لەناو دڵیایەتی و نایەوێت بیشکێنێت.. بۆ نمونە: خوشکی بەڕێزمان هەیە لەم ڕەمەزانەدا دێتە مزگەوت، لەچکیش بەسەریدا دەدات، لەمزگەوتدا بەسەریدا دەدات، کەچی بتێك لە ناو دڵیدایەتی وادەزانێت ئەگەر لەدەرەوە و لە بازاڕ و لەماڵیشەوە موحەجەبە بێت. ئەمە لەوانەیە پێی بڵێن کۆنە پەرست، لەوەدەچێت قسەیەکی بە دوو کەوێت، لەوانەیە بڵێن تۆ بۆ وایت؟!

ئەم بتە بشکێنە لە دڵتدا، غیرەتت هەبێت، جورئەت بدە بەخۆت بیشکێنە بەیەکجاری، لەناوی بەرە، ئیسلامەتیەکەت با تەواو بێت..

گەنجی بەڕێزی واهەیە لە ڕەمەزاندا هاتوچۆی مزگەوت دەکات، بەڵام سەیر دەکەیت ڕەنگە نەتوانێت عارەق تەرك بکات.. هەبووە وتوویەتی: بەڕۆژووم، بەڵام وەڵاهی بەپارشێواندا شتێك دەخۆمەوە!! سەیر دەکەیت ئەمە بتێکە لە ناو ناخیدا، نەخێر جورئەتت هەبێت بیشکێنە، تۆ جورئەتت هەبوو وەکو هۆزی (سقیف) بەرەو ئیسلامەتی هاتیت، دەی جورئەتی ئەوەش بکە ئەم بتە لە ناو ناختدا بیشکێنە، جورئەتی ئەوەت هەبێت واز لە زینا کردن، لە نەزەرکردن، لەتەوقەی حەرام کردن بهێنە..

ئەم ڕەمەزانە ئەوەمان پێدەڵێت: وەکو صەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ، جورئەتی ئەوەت هەبێت کە بە شانازیەوە بڵێی مسوڵمانم، ئەمڕۆ ڕۆژی مەبدەئە ئەو بتەی لە ناختدایە لەناوی بەرە..

## كۆمپانیایەكی بەریتانی: عارەق نەخویتەوە.. وەرت دەگرن !

دكتۆر (محمد عبدالرحمان عریفی) دەفەرمووێت: گەنجێك لەبەریتانیا دوای ئەوەی لە ڕۆژهەلاتەوە دەچێت بۆ ئەوێ، ڕیكلامێك دەخوێنێتەوە لەیەكێك لەڕۆژنامەكاندا، كە كۆمپانیایەك حەرەسی شەوی دەوێت، بۆ كۆمپانیاكە، بۆ كارگەكەی، كۆمەڵە خەڵكێك عەریزە تەقدیم دەكەن. (سی ڤی) خۆیان پێشكەش دەكەن، دەچنە پێشەوە، بەلام یەك پرسیاریان لێدەكەن.. تەنها یەك پرسیار: تۆ عارەق دەخۆیتەوە یان نا؟

بەئەوانەی كە دێنە دەرەوە، دەڵێن: پرسیارەكە چی بوو؟ هەموویان دەڵێن: وەلا یەك پرسیار: عارەق دەخۆیتەوە؟ چەند عارەق دەخۆیتەوە؟ كەی دەیخۆیتەوە؟ ئەم گەنجەش مسوڵمانێكی مولتەزیم، دەڵێت: خودایە گیان ئێستا بڵێم عارەق ناخۆم دەترسم وەرم نەگرن، دوایی بێكار دەبم لەم ولاتەدا، دەترسم بڵێم عارەق ناخۆمەوە، بڵێن مسوڵمانێكی توندڕەوە، بڵێم دەیخۆمەوە.. ئەی خودایە من چۆن شتێك ناخۆمەوە بوختان بۆخۆم بكەم؟! بەس وەلاهی خودایە گیان من دینەكەی تۆ بەهیچ ناگۆڕمەوە.. لێی دەپرسن تۆ عارەق دەخۆیتەوە؟

دەڵێت: نەخێر، هەر قەت قەت نایخۆیتەوە؟ دەڵێت: نەخێر، هەر نەت خواردۆتەوە؟!

دەڵێت: هەر دەستم لە شوشەكەشی نەداوە تا ئێستا، دەڵێن: لە ڕۆژانی پشویش هیچ ناخۆیتەوە؟ دەڵێت: نەك ڕۆژانی پشوو هەر هیچ كاتێك.. دەڵێن: نەخۆشی لەبەر نەخۆشی نیە؟ من هیچ مەبەستێكم نیە، بەس من مسوڵمانم، لە دینی ئێمەدا حەرامە عارەق خواردنەوە، هەر ئەوەندە، ئەینا مەسەلە نەنەخۆشیە، نەترسە، نەمەسەلە بێ پارەییە.. لە دینەكەی مندا حەرامە، ڕاست هەر ئەوەیە، ئێوە منتان دەوێت وەكو حەرەس لەم كۆمپانیایەدا دامبمەزرێنن، ئەوە منیش واقیعەن جوابی پرسیارەكەی ئێوەم دایەوە كە عارەق ناخۆمەوە..

دەڵێن: زۆر باشە وەلامەكەی ئەویش بنوسن، عینوان و ژمارە تەلەفونی لێوەربگرن، دوای چەند ڕۆژێك ئیعلان دەكرێت.. تەنها و تەنها هەر ئەو كوڕە مسوڵمانە وەردەگیرێت.

ئەوانی تر هی واهەیە وتوویەتی: بەس شەوانە یان بەس حەفتانە، هی واهەیە یەك دووجاری دەخۆمەوە، یان بەس شەوانە دەیخۆمەوە، بۆ ئەوەی نەڵێن مسوڵمانێکی توند ڕەوە، یان لەگەڵ دیموکراسی ئەم وڵاتەدا ناگونجێت.. یان بڕوای بە دینی ئێمە نیە، بە مەنهەجی ئێمە نیە، درۆی بۆ خۆی کردووە، بێی ناو ناخی نەشکاندووە..

دواتر دەچێتە پێشەوە و شوکری خودای پەروەردگار دەکات کە لە بێکاری ڕزگاری کردووە، کۆمپانیایەکی خاوێنە، شەریکاتێکی سەیارەیە و حەرەسێکی دەوێت، ئەم بۆخۆی لە کابینەدا حەرەسە و هیچی تر، پارەیەکی باش و خاوێنیش وەردەگرێت..

دواتر دەڵێت: وەڵاهی من سەیرم لێدێت، ئێوە لە ناو ئەو هەموو خەڵکەدا منتان وەرگرت، من زۆر بە دڵنیاییەوە هاتمە دەرەوە، وتم: وەرناگیرێم، بەڵام وەڵاهی دڵ و دەروونی خۆم ئارام کرد کە خیانەتم بە بیر و باوەڕی خۆم نەکرد.. وتی: برا ئێمە حەرەسمان دەوێت، کەسێك دایمە بە ئاگابێت و سەرخۆش نەبێت.. هەرچی لێمان پرسی کە عارەقی دەخواردەوە، یەك قومیشی بخواردایەتەوە ڕۆژێك هەر مەترسی ئەوە بوو سەرخۆش بێت.. جا کابرا سەرخۆش بێت، دوور نیە خۆی کارگەکەی نەسوتاندایە، بەسەرخۆشی بە جێی بهێشتایە، بهاتایە بەسەرخۆشی کەسێکی تری بکوشتایە، سەیارەیەکی بفڕاندایە..

لەبەرئەوە ئێمە بەس لە تۆ دڵنیا بووین کە تۆ عەقڵ لەدەست نادەیت.. کە تۆ سەرخۆش نیت، ئێمە کەسێکمان دەوێت کە عەقڵی لەسەر خۆی بێت، کە عارەق خۆر نەبێت، خودای گەورە کارەکەی بۆ ئاسان کرد، وە بەڕێز و حورمەتەوە وەرگیرا.. لەبەرئەوە دایمە شانازی بە دینەکەتەوە بکە، خەڵکی بێ دین دەیەوێت تۆ موجادەلەی بکەیت.. نەخێر تۆ باوەڕی خۆت چەسپاو بێت.

## ماڵەکەی دەستنیشان کرد..

ئیمامی (عمر) (ڕەزای خودای لێبێت) لە شاری مەدینەدا دەگەڕا، لە کاتی گەڕاندا غەڵبە غەڵب و ژاوەژاوێك لە ماڵێك دەهات.. لە دڵی خۆیدا وتی: وەڵاهی لەوانەیە ئەم دەنگە دەنگە، لەوانەیە کۆمەڵە گەنجێك بن عارەق بخۆنەوە، ئەم دەنگ و هەرایان دێت بەسەر ئەم هەموو دەرو دراوسێیەدا، ویستی بچێتە ژوورەوە، بەڵام نا لەدینی ئیسلامدا بۆت نیە بچیت لەدەرگای خەڵك بدەیت و موراقەبەی خەڵك بکەیت.. ئەها ئەوە ئیسلام دایهێنا، ئاسایشێك کە بۆی نیە بچێتە ماڵی خەڵکەوە و خەڵك بهێنێتە دەرەوە دەبێت لەڕێی دادگاوە بانگی بکەیت..

ئیمامی (عمر) ئەم ماڵەی دەست نیشان کرد، نابێت لەشەودا بچیتەسەر ماڵی خەڵکی، بڵێیت ئەوە چ کارەی؟ دەبێت لەڕۆژدا بچیت.. ماڵەکەی دەست نیشان کرد، بە خەڵوزێك بازنەیەکی بەسەر دەرگای ماڵەکەدا هێنا، بۆ ئەوەی بەیانی ئەم ماڵە لەڕێی پۆلیسەوە بانگهێشتی دادگا بکرێت. پێیان ناڵێت جارێکی تر مافی ئەوەتان نیە دەنگ بەرز بکەنەوە دەر و دراوسێ عەزیەت بدەن.. ئا ئەو قانونە کە ئێستا لە ئەورووپا جێبەجێ دەکرێت لە وڵاتی مسوڵمانانندا ئیمامی (عمر) و خەلیفەکانی پێشتر وەکو ئیمامی (أبوبکر) دایانهێنا، ئەویش پەروەردەی دەستی پێغەمبەری خودایە ﷺ..

بەڵێ خۆشەویستان: دەرگاکەی نیشانە کرد، ئیمامی (عمر) ڕۆشت و کابرا میوانەکانی ڕۆشت، عارەقیان خواردبوویەوە، بەبێ گومان بەس ئیمامی (عمر) گومانەکەی نەکرد، بەڕاست لە خۆیەوە لە دەرگای نەدا و لەسەر دیوارەوە بچێتە سەرەوە بۆیان.. بەڵکو لەڕێی دادگاوە دەیویست بانگیان بکات.

کابرا ئاوا سەیری کرد بازنەیەکی ڕەشە لە دەرگاکەی دراوە.. وتی: وەڵاهی ئەوە شوێنی خەلیفەی مسوڵمانانە، بەیانی دەنێرێت بە شوێنمدا، بەڵام نا، من دەبێت خۆم لە دادگا ڕزگار بکەم.. چوو بازنەی بە تەواوی ماڵەکانی ئەو گەڕەکەدا کێشا، بەهەموو دەرگاکاندا، بە هەمان نەوع بە خەڵوز کێشای، بەیانی کە پۆلیس هات سەیر دەکات

هەموو درگاکان بازنەی ڕەشی پێوەیە، لەبەر ئەوە دەبوایە ئەم گەنجە، ئەم خاوەن ماڵەکە، کەهاتە دەرەوەو سەیری کرد بەس ماڵی ئەو ڕەش بووە، دەبوو وەکو ئەو خەڵکە خۆی سپی بکردایەتەوە..

بەڵام ئەو کەسەی لە تاواندایە حەزدەکات هەموو کەس وەکو خۆی تاوانباربن، هەموو دەرگاکان ڕەشبوون، لەبەرئەوە مەڵێ خەڵکان زۆرن خراپە دەکەن.. چونکە ئەو خەڵکانە خوا خوایانە تۆش وەکو ئەوانبیت.. ئەی قورئان نافەرمووێت: ﴿فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾﴾القلم.

هەرگیز شوێن ئەو کەسانە مەکەوە کە ئەم دینە بە درۆ دەزانن، ئەوان دەیانەوێت بچیتە سەر ڕێبازیان، ئەوانیش تۆزێك شل بن بۆ بیر و باوەڕەکەی تۆ، نەخێر تۆ بە شانازییەوە دینەکەی خۆتت قبوڵ بێت.. ئەمە وانەی ئەمشەومان بوو: بتی ناو ناخی خۆمان بشکێنین.. چونکە هەر کەسێك بتی ناو ناخی نەشکێنێت، لە بەردیش، لە داریش، لە مرۆڤێکیش، لە پەڕۆیەکیش، لە شتێکیش دەترسێت..

یارەبی خودایە بیر و باوەڕمان سەلامەت بکەیت.. بیر و باوەڕ و عەقیدەمان سەلامەت بکەیت.. لەسەر ڕێبازی ڕاستی ئیسلام بمان مرێنی و بمان ژیێنیت..

هەتا شەوێکی تر و بەرنامەیەکی تر بە خوداتان دەسپێرم..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ) .

# وانەی بیست و پێنجەم

## بەرپرسیارێتی

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى : ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ص : ٢٦ .

* عَنْ عبدالرحمن بنِ سَمُرَةَ ، قالَ : قالَ لي رَسُولُ اللهِ ﷺ : يا عَبْدالرَّحْمنِ لا تَسْأَلِ الإمارَةَ ، فَإنَّكَ إنْ أُعْطيتَها عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إلَيْها وَ إنْ أُعْطيتَها مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْها) ـ رَواهُ البُخاري : (٧١٤٦) وَ مُسْلِم : (١٦٥٢) .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إنَّكُمْ سَتَحْرِصُونَ عَلى الإمارَةِ ، وَسَتَكُونُ نَدامَةً يَوْمَ القِيامَةِ ، فَنِعْمَ المُرْضِعَةُ ، وَ بِئْسَتِ الفاطِمَةُ) ـ رَواهُ البُخاري .

* عَنْ أَبي ذَرٍّ ، قالَ : قُلْتُ : يا رَسُولَ اللهِ ﷺ ألا تَسْتَعْمِلُني ؟ قالَ : يا أَبا ذَرٍّ ، إنَّكَ ضَعيفٌ ، وَ إنَّها أَمانَةٌ ، وَ إنَّها يَوْمَ القِيامَةِ خِزْيٌ وَ نَدامَةٌ ، إلاّ مَنْ أَخَذَها بِحَقِّها ، وَ أَدَّى الّذي عَلَيْهِ فيها) ـ رَواهُ مُسْلِم : (١٨٥٢) .

* قالَ رَسُولَ اللهِ ﷺ: (إنْ شِئْتُمْ أنْبَأْتُكُمْ عَنِ الإمارَةِ ماهِيَ ؟ أَوَّلُها مَلامَةٌ ، وَثانيها نَدامَةٌ ، وَ ثالِثُها عَذابٌ يَوْمَ القِيامَةِ ، إلاّ مَنْ عَدَلَ ، فَكَيْفَ يَعْدِلُ مَعَ أَقْرَبيهِ ؟)

ـ رَواهُ أحْمَد : (٢١٧٩٧) . الصَّحيحَة : (١٥٦٢) .

## سەرچاوەکان :

١) رَوْضَة المُتَنَزه ، شَرْح بِدايَة المُتَفَقِه ، أيْمَنْ علي موسى ، ج٣ ، ص٥٣٤ ، ط : ١ ، ٢٠١٠ .

٢) کارگێڕی بە چیرۆك ، عادل شێخانی ، ل٦٥ .

٣) گۆڤاری (ژیار) ژمارە : ٥ ، ل٤٢ ، لە نوسینی : جمال محمود صالح .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أَصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز دانیشتنی ئەمشەومان لە خزمەت پێغەمبەری خودادا ﷺ، لە زنجیرە باسی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشە و گرفتم هەیە هاتوومەتە خزمەتت، دەچینەوە کۆڕ و مەجلیسی خۆشەویستمان و، هەروەکو شەوان خۆمان بۆن خۆش دەکەین، دەم و زمانمان پاراو دەکەین بەسڵاوات لێدان لەسەر ئەو خۆشەویستە و شەفیعی مەحشەرمان کە ﴿محمدی موصتەفایە ﷺ﴾:

(اللّهُمَّ صَلی عَلی سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلی عَلی حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)
(اللّهُمَّ صَلی عَلی شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

صەحابەیەکی بەڕێزی پێغەمبەری خودا ﷺ ناوی (عبدالرحمان ی إبن سمره) دەبێت، ئەم بەڕێزە یەکێکە لەو کەسانەی سەرەتاکانی هاتنە خوارەوەی ئاینی ئیسلامدا مسوڵمان بوون، لەو سەردەمەدا کە ئیسلام زۆر زەحمەت و موشەقەت بوو، وەکو پشکۆیەکی ئاگر وابوو لە ناو دەستدا، ئەو زەمەنەی کاتێك مسوڵمانان وەکو (بیلال) بەرد ئەخرایە سەرپشتیان، و وەکو (خەباب) دەخرانە سەر پشکۆ..

پیاوێکی وەکو (خبابی إبن أرَت) گەنجێك بوو، هێنایان داری ووشکیان هێنا، داری شاخیان هێنا سوتاندیان، ئەمجا ئەم جلانەی لەبەر داکەند.. بەڕووتی خستیانە سەر ئەو پشکۆیانە، هەتا چوونە پشتیەوە، هەتا بە چەورایی پشتی ئاگرەکە کوژایەوە، هێشتا ئەم صەحابە پەشیمان نەبوویەوە لە صەحابەتیەکەی خۆی، هێشتا دانی نەدەنا بە بت پەرستیدا.. لە تەوحید و یەکتاپەرستی خۆی وازی نەهێنا، هەتا ئەوان لێی وەڕەس بوون لە تەعزیب دانی..

## پێغەمبەری خودا.. بمخە سەر پۆستێکی بەرز

(عبدالرحمان ی إبن سمره) یەکێکە لەو صەحابە دێرینانەی کەلەسەرەتای ئاینی ئیسلامەوە لەگەڵ پێغەمبەری خودادا بووە ﷺ، لە هیجرەتدا، لەدوای ئەوە لەشەڕی (بدر)دا، لە شەڕی (ئوحود)دا، لەشەڕی (خندق)دا..

ڕۆژێك ئەم پیاوە هێشتا هیچ پلەیەکی سەربازی پێنەدرابوو، هیچ وەزیفەیەکی نیە، هەوەکو کەسێکە سادە تەماشا دەکرێت.. دێتە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەر ﷺ، من زۆر دەمێکە لەخزمەتی جەنابتدام لەسەرەتای ئەم ئیسلامەوە من لەگەڵتدام.. بەلاّم تا ئێستا هیچ پۆست و پلە و پایەیەکم نیە، هیچ مەسئولیەتیەکم نیە، ئایا من موستەحەقی ئەوە نیم؟ منیش وەکو هاوڕێکانم، هاوڕێبازەکانم، پلەیەکم هەبێت، مەسئولیەتم هەبێت.. پلەیەك بەرز بکرێمەوە، موچەیەکی تایبەتم هەبێت؟.

پێغەمبەی خودا ﷺ دەستی خستە سەرشانی و فەرمووی: تۆ خۆشەویستی ئێمەی، تۆ پیاوێکی ڕاستگۆی، لەگەڵ ئەم دینەدا، (یاعبدالرحمن) بەلاّم ئەی (عبدالرحمان)ی خۆشەویست (لا تَسأل الأمارَة) هەرگیز داوای بەرپرسیاریەتی و مەسئولیەت مەکە..

(فأنّك إن أعطَيتها عن غَيرِ مَسألةٍ أعنت عليها) چونکە بەرپرسیاریەتی خۆی تەبیعەتی وایە ئەگەر بۆ خۆت داوای نەکەیت، بە موستەحەقی خۆت پێت ببەخشرێت، خودای گەورەش یارمەتی دەرت دەبێت، خەڵکیش لێت ڕازی دەبن و کارەکەیشت دەچێتە سەر..

(وَإن أعطَيتها عَن مَسألةٍ وكِلتَ إِليها) ئەگەر خۆشت داوای بکەیت و بەدوایدا بگەڕێیت، بڵێیت پێم ببەخشن، خەڵك پێت ببەخشێت، ئەوە دڵنیابە کارەکەبە خۆت دەسپێردرێت، خودای گەورەش پشتیوانت لێ ناکات.. سەرەنجام سەرکەوتوو نابیت..

ئەم صەحابەیە ئەم ئامۆژگارییەی بەسبوو.. دیارە تۆ زۆر بەرێزیت، بەس لەوە ناچێت بەرپرسیاریەتی و مەسئولیەتت پێ هەڵبگیرێت.. لەبەرئەوە وازبهێنە و داوای

مەكە، هەر كەسێك بەرپرسیاریەتی زۆر مەبەست بوو، كوتا هەوڵی بۆدا، بەزەحمەت بەدەستی كەوت، ئەوە دڵنیابە سەركەوتوو نابێت. چونكە مافی ڕەوای خۆی نەبووە، خۆی هەوڵیداوە، بەڵام ئەگەر پێیان بەخشیت، بە حەقی خۆت پێت بەخشرا، خەڵكی دوعای خێریان بۆ دەكردیت، لەلایەن خودای پەروەردگارەوە پشتیوانت دەبێت..

پێغەمبەری خودا فەرمووی (إنَّكم سَتُحرَصُونَ على الأمارة) وەلأهی ئەی خەڵكینە ئێوە زۆر حەزتان لە بەرپرسیاریەتی و مەسئولیەتە(وستكون ندامة يوم القيامة) بەلأم وەلأهی لە ڕۆژی دوایدا ئەم بەرپرسیاریەتی و مەسئولیەتیە پەشیمانیە..

ئەم فەرموودە لە صەحیحی (بوخاری)دا هاتووە، وەلأهی خەڵك زۆری حەز لێیە، پلەیەكی هەبێت، مەسئولیەتی هەبێت، بەرپرسیاریەتی هەبێت، بەلأم وەلأهی لە ڕۆژی دوایدا پەشیمانیە، چونكە خاڵ بە خاڵی ئەو پلەیەت لێدەپرسرێتەوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: لە صەحیحی (بوخاری) و (موسلم)دا (متفق علیه)ە (إنَّا وَاللهِ لا نُوَلِّي هذا العَمَل أحَدا يَسألُهُ أو أحداً حَرَصَ عَلَيه) فەرمووی:

وەلأهی سوێند بە پەروەردگار ئێمە ئیش و كاری ئەم ئیسلامەتیە نادەینە كەسێك كە خۆی داوای بكات.. یان بزانین كەسێك سورە لەسەری، واستەی بۆ دەكات، بەرتیلی دەداتیّ، هەوڵی بۆ دەدات، ماستاوی بۆ دەكات.. نایەڵین بەرپرسیاریەتی بكەوێتە دەستی ئەو كەسانە، چونكە ئەوانە كاروباریان پیّ بەڕێوە ناچێت..

كاتێكیش كار بەدەست مەسئولیەتیەكەی خۆی بەڕێوە نەبرد، ئەو میلەتە سەرگەردان دەبێت. میلەت ئەگەر سەركردەكانی لێپرسراوەكانی وولأتەكەی، جا لەوەزیفەی بچوكەوە تا سەرۆك وەزیران، شایستەی ئەو پۆستە نەبوو، ئەو میلەتە پەنا بە خودای پەوەردگار زایە دەبێت.. بۆیە ئینسان ئەگەر زانی شایستەی ئەو پۆستە نیە، چاكتر وایە خۆی وازبهێنێت، یان هەر وەرینەگرێت..

## باڵوڵ و هارونە ڕەشید

دەگێڕنەوە دەڵێن: (باڵوڵ) هەبووە، (بهلول)ی ناوبووە، لە زمانی عەرەبیدا، بەڵام بە کوردی پێی دەڵێن: (باڵوڵ) (باڵوڵ)ی شێت، بەڵام پیاوێکی زۆر فەیلەسوف و دانا بووە.. کارەکانی زۆر سەرسوڕهێنەر بوون.. ڕۆژێك (هارونەڕەشید) خەلیفەی عەباسی لە شاری بەغداد، بەغدادی پایتەختی عێراق، لە کۆشکی خەلافەت و لە کۆشکی ئەمارەتی خۆیدا، خەڵکێکی زۆر کۆدەکاتەوە، جەماوەر کۆدەکاتەوە، لە هەموو ئاست و چین و توێژەکان..

دەڵێت: من ئەمڕۆ خەلیفەم قسە بۆ ئێوە دەکەم، کێ پێشنیارێکی هەیە، کێ قسەیەکی هەیە، با قسەی خۆی بکات و با بێتە پێشەوە قسەی خۆی بکات..

بێ گومان هەتا ئەم لەحزەیە سەرکردەکان ئەوە بۆتە دەستووریان، ئەوەش مەسەلەکە چاك تێبگەن ئەوەیە: بەردەوام خەڵك کۆدەکەنەوە لە شوێنێك، ئەمجا خۆیان دەچن بۆ ئەوەی خەڵك لەبەریان هەڵبسێت، بە عومری خۆت نابینیت کاتێك بەرپرسێکی وڵات چاوی بە میلەت بکەوێت ئەو لە ژوورەوە بێت و ئەمجا میلەتەکە بچێت، ئەو دانیشێت و میلەت بچێت لەبەری هەڵسن، بە پێچەوانەوە، خەڵکەکە دەبەنە ژوورێك دادەنیشێنن، بۆ ئەوەی ئەو مەسئولە بێت.. کە هات، ئەمجا دەبێت هەموو خەڵکەکە لەبەری هەڵسن، هەڵناسی پێت عەیبە، هەڵناسیت تۆمەتبارت دەکەن..

نیوەی خەڵك هەڵدەستێت و نیوەی هەڵناسێت، ئاژاوە دروست دەبێت.. ئەو ناچارت دەکات دەڵێت دەبێت بە گەورەم بزانیت، ئەها هەموو خەڵکەکە لە ژوورەوە کۆدەکەنەوە، ئەمجا جەنابی تەشریف دێنێت، ئەوە لەو زەمانەشدا هەر وابوون..

(هارونە ڕەشید) هاتە ژوورەوە، بەڵام پێش ئەوەی بێت کورسیەك دانرا بوو، لەلای پێشەوە شوێنێکی تایبەت بوو، خەڵکەکەش هەمووی بەڕیز لەسەر فەرش دانیشتبوون، (باڵوڵ) ڕایکرد چوو لەسەر کورسیەکەی (هارونە ڕەشید) دانیشت.. دەستی کرد بە قسە

کردن، خەڵکینە بەخێربێن و چ کارێکتان هەیە؟ دار و دەستەکەی (هارونە ڕەشید) هاتن وتیان: ئەوە چی دەکەیت؟! هەستە، هەستە، ئەوە خەلیفە هات..

وتی: بە خودا هەڵناسم، خۆی بە کورسیەکەوە جوت کردبوو.. هەرچەندە هەوڵیاندا سودی نەبوو.. وەلاّ بە زلە و لێدان و کەلەپچە کردن بە ستیانەوە، بە ناچاری تێیان هەڵدا و بردیان..

دەڵێت: خەلیفە هات و وتی: وازی لێبهێنن، ئەم داماوە کاری وادەکات، ئینسان سەری دەسوڕدەمێنێت، ئەمە بۆ واتکرد؟ بۆ خۆت بە تیّ هەڵداندا؟ ئاخر ئەمە کەی شوێنی تۆیە؟! ئەم خەڵکە کەی ئیشی بە تۆیە؟ تۆ ئیشی ئەو خەڵکەت پیّ ڕابی دەبێت؟! تۆ کابرایەکیت بۆ خۆت دەڕۆیش..

وتی: قوربان یەك دەرسم بۆتۆ پێیە.. نەوەلاّ بۆ ئەو خەڵکە دەرسم پیّ نیە، بەس بۆ تۆ یەك شتم پێیە، ئەی (هاروون) ئەوە بۆ ئەوەی دەرسی تۆ دابدەم، قەینا لێیان دام، بەس بۆ ئەوەی دەرسی تۆ دابدەم، من لەسەر ئەو کورسیە دانیشتم، چونکە شایستە نەبووم چاوت لێیە، چۆن لێیان دام؟ بەلاّم لێدەنەکەی من بەس دوو شەق و زلە بوو، لەبیرم دەچێتەوە، کەلەپچەکەش لەو دیوی ئەو دەرگایە لێم دەکەنەوە، فرێم دەدەن.. بەلاّم ئای قوڕ بەسەر تۆ، ئەگەر لەسەر ئەو کورسیە دانیشتویت و شایستە نەبیت، ئەگەر لەم دونیایەش لێت نەدەن، ئەوا لەو دونیایە ئەوەندەت شەق تیّ هەڵدەدەن.. بەلاّم لە جەهەنمدا شەقی زەریانیت لێدەدەن..

جا لەبەرئەوە ئاگاداربە، ئەها من لەسەر ئەو کورسیە دانیشتم چونکە شایستە نەبووم چیان لێکردم؟ ئەگەر تۆش شایستە نەبیت، ڕۆژێك ئەو میلەتە بە شەق دەرت دەکەن و، ئەگەر لەم دونیایەش خەڵك پێت نەوێرێت، بزانە زەبانیەکانی جەهەنم لێت دەدەن.. ئای بۆ تۆ ئەو حاڵەتەی خودای پەروەردگار دەفەرموویّت:

﴿فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾﴾ بیبەستنەوە﴿ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾﴾الحاقە،

بە گوریسێك کە حەفتا مەتر درێژە دەست و قاچی ببەستن، من یەك تەوقەیە ئاوا دەکەن دەیکەنەوە، دواتر ئازاد دەکرێم، ئەو شەق و زلەیەش دواتر لەبیری دەکەم بەلاّم ئاگاداری خۆت بە ئەگەر دەزانیت شایستەی ئەو کورسیە نیت لەسەری دامەنیشە..

دەڵێت: (هارونە ڕەشید) گریا کوڕەکە بە تاڵبوو.. وتی: وەلاّ ڕاست دەکەیت، خۆ دەرسێکی گەورەیە، ئەوەی شایستەی کورسی نەبێت و لەسەری دابنیشێت، دەبێت ڕۆژێك لابچێت. جا یان میلەت لای دەبات، دەڵێن تۆ شایستە نیت. یان لەم دونیاش نەوترێت قیامەت هەیە کە دەچێتە بەردەم خودای پەروەدگار، فەرمووی ئەوەی بە حەقی خۆی وەرینەگرێت پەشیمانە، دەڵێت ئای خۆزگە ڕۆژێك لەم دونیایەدا بەرپرسیاریەتم بەدەست نەبوایە، خۆزگە هیچ نەبوومایە ئیمزایەکم بەدەست نەبوایە..

بەلاّم ئەگەر ئینسان زانی پۆستێکی پێ بەڕێوە دەچێت، زانی دەتوانێت خزمەت بە میلەتەمەی بکات، بە هاونیشتیمانیەکانی بکات، ئەمە چاکە بمێنێتەوە، لە ئیسلامدا زوهد نیە لەوەرگرتنی پۆستدا، یەعنی ئەوەی هانی خەڵکی بدەیت بڵێیت کەس با پۆست وەرنەگرێت، ئەوە ئەگەر حەقت نەبێت وەریمەگرە..

ئەها ئەم صەحابانە چەند بەڕێز بوون، چەند لە خودا نزیك بوون، چەند پێغەمبەری خودایان خۆشدەویست، بەلاّم کار و باری ئیداری پەیوەندی بە عیبادەتەوە نیە، هی واهەیە زۆر عیبادەت کاری چاکە، بەلاّم ناتوانێت کار و باری خەڵك بەڕێوە بەرێت.. خەڵك لە شەونوێژەکانی من و تۆ چ سودێك وەردەگرێت، ئەمە بۆ خۆمانە بەلاّم خەڵك دەیەوێت لە کار و باری ئیداریدا لێزان بێت..

ئەی ئەگەر زانیت پێت دەکرێت کورسیەکە چۆڵ مەکە، مەیەڵە ناشایستەیەك بێت، گەنجێك خوێندنی تەواو کردووە لە زانستی ئەکادیمیای خۆیدا پێشکەوتووە.. دەزانێت ئەگەر بچێتە سەر ئەو کورسیە خزمەت دەکات، با هەوڵی بۆ بدات، بۆ تۆ خراپ نیە، هەوڵبدە ببیتە کاربەدەستێکی باش، چونکە لە غیابی تۆدا ناشایستەیەك دەچێتە سەر ئەو کورسیە، بەلاّم ئەگەر تۆ بە حەقی خۆت چوویت، خزمەت بە ولاّتەکەت دەکەیت..

## حەزرەتی یوسف داوای وەزیری کرد

نمونەیەکی قورئانی، کێ دەتوانێت نمونەیەکی قورئانیم بداتێ؟ ئەگەر زانیت پۆست و پلەیەکت پێ بەڕێوە دەچێت؟ عەیب نیە هەوڵی بۆ بدە.. هەوڵیشی بۆ بدەیت هێشتا کارێکی شەریفانەیە، کارێکی شایستانەیە، کێ دەزانێت لە کوێی قورئاندا هەیە؟ بەڵێ، لە چ ئایەتێکدا؟ بەڵێ، کێ ئایەتەکەمان پێ دەڵێت: لە باسی حەزرەتی (یوسف)دا، سەلامی خودای لێبێت.. کێ دەزانێت کام ئایەتە؟ ئەها قورئان هەموو شتێکی تێدایە، ئەگەر پۆست و پلەیەکت پێ وەردەگیرا، دەتزانی دەتوانیت خزمەت بکەیت، لەخۆت ڕادەبینی ئەم کارە بۆتۆ شیاوە.. بەڕێزان: داوای بکەن، هەوڵی بۆ بدەن، هیچ عەیب نیە، چونکە ئەگەر تۆ نەبیت، ناشایستەیەك دەچێتە سەر ئەو کورسیە..

کێ ئەو ئایەتە قورئانیەی لەبەرە؟ دەی نا بەبێ ئایەت نابێت.. ئەوە شعری عەرەبی نیە، بەڵێ ئەو بەڕێزە بۆی چوو ﴿ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾﴾ وتی: ئەی پاشا، پاشا خۆ پیاوێکی مسوڵمان نەبوو، یەعنی دروستە لە حکومەتێکی بێ دیندا، حکومەتێك کە عەلمانی بێت بێ دینیش بێت. تۆ وەکو مسوڵمان دروستە کاری تێدا وەربگری، بەبەڵگەی ئەم ئایەتە، بۆ؟ چونکە تۆ دەتوانیت خزمەت بکەیت.. یا نا شایستەیەك نەیەت، حەزرەتی (یوسف) کاتێك زانی بەوەحی خودای پەروەردگار کەوڵاتی مسر بەرەو هیلاك چوونە، بە خەوەکەی دیارە، هەموومان ئاشناین، حەوت هەرزانی دەبێت، دواتر حەوت گرانی دەبێت..

ئەوەی کەوا دەستێکی ئەمینی نەبێت ئەم میلەتە لەو حەوت ساڵە گرانیەدا دەفەوتێن، چونکە کەم کەس هەیە لە کاتی هەرزانیدا پاشەکەوت بکات، ئینسان کە حەوت ساڵی هەرزانی بوو، لێ دەخورێت بە ئارەزوی خۆی، بە ئارەزوی خۆی ئیسراف دەکات.. لەو کاتەدا قەومی (یوسف) پێغەمبەر سەلامی خودای لێبێت، بت پەرستیش بوون، یەعنی ئەمە دینی ئێمەیە، تۆ هەوڵبدە گیانی بت پەرستێك ڕزگار بکەیت. گیانی

میلەتێك ڕزگار بکە، حەقت نەبێت ئەمە مسوڵمانە، کافرە، بیرو باوەڕی چیە، حەقت نەبێت بەسەر ئەوەوە خزمەت بکە، خزمەت جا ئەو خزمەتە بەڵکو بە جوانی خزمەتەکەی تۆ هیدایەت وەربگرێت..

مەڕوانە بیر و باوەڕی خەڵك چیە، هەر وەزیفەیەکت بەدەستەوە بوو، سەیری بیرو باوەڕی خەڵك مەکە، مسوڵمانە، یەزیدیە، کافرە، فلانە.. شەیتان دەپەرستێت، ئاگر دەپەرستێت، مولحیدە.. تا بە قەدەر توانای خۆت خزمەتی بکە، موهیم ئەوەیە ئینسانێکە، باهەموو ئەو ڕەفتارە جوانانەی تۆ هیدایەتی خەڵك بدات..

وتی: ئەی پاشا ئەها پاشا خۆ مسوڵمان نەبوو، بمکە بە وەزیری مالیە، بە خەزێنەداری ئەم وڵاتە، چونکە من پیاوێکم دوو سیفەت لە خۆمدا شك دەبەم، (حَفِيظٌ) زۆر دەست پێوە دەگرم، زۆر پارێزەرم، پاشان (عَلِيمٌ) زۆر شارەزام لە کاروباری ئابوریدا، هەیە زۆر ئەمینە، زۆر دەست پاکە، بەڵام پارەکانی بدەیە دەست بەس ئەوەیە نایەڵێت بفەوتێت.. بەڵام (عَلِيمٌ) ئەوەیە: ئەم پارانە بخاتە بواری خزمەت کردنەوە..

(یوسف) هەر ئەوەنەبوو لەو حەوت ساڵەدا شت کۆبکاتەوە، بڵێت بۆ حەوت ساڵی گرانی، (حَفِيظٌ ) ئەوەیە بەڵام گرنگ ئەوەیە عەلیمیش بێت..

وتی: من فیکرەیەکم هەیە لەو حەوت ساڵەدا، ئەوەبوو فیکرەکەی وەحی خودای پەروەردگار گوڵەگەنمەکان بەقەدەر ئەوەی کە دەخوران لێدەکران لە ئاشدا، ئەوانەی تری بە گوڵەکەوە هەڵدەگیرا، جا گوڵە گەنم ئەگەر گوڵەکەی تێدا هەڵگیرا..

ئەوە یەکەم تەعبیری قورئانیە بۆ بواری جوتیاری، چەند ساڵ بمێنێتەوە؟ حەوت ساڵ دەمێنێتەوە، ساڵی هەشتەم بەرەو خراپی دەڕوات.. تا حەوت ساڵیش تەقریبەن خۆی دەگرێت بە گوڵەگەنمەکانەوە هەڵیگرت. ئەینا لە یەك دوو ساڵدا ئەسپێ دەیدا لەو گەنمە، ئەها عەلیمیش بوو نەك هەر حەفیز..

ئێستا هی واهەیە لە دائیرەیەکدا زۆر دەست پاکە، زۆر ئەمینە، بەس کاروباری خیبرەی نیە، بەس ئینسان کە بەرپرس بوو دەبێت عالم بێت، عادل بێت، بە توانا بێت، توانای جەستەی هەبێت، کابرایەکەی بێ توانا دەبێت توانای عەقڵی و فکری هەبێت.. بێ حەوسەڵە نەبێت، هی واهەیە پیاوێکی زۆر چاکە، چوار پێنج کەس بچنە سەر مێزەکەی یەکسەر تورە دەبێت. دوو ئیمزا زیاد بکات یەکسەر پەست دەبێت.. یەکسەر بچۆدەرەوە تاقەتی خەڵکی نامێنێت، دەبێت قادر بێت بە جەستە بە توانا، ئینجا ئەمین بێت، ئەمجا دادپەروەربێت لەبەینی خەڵکدا..

حەزرەتی (یوسف) خۆی داوای کرد، بۆ؟ چونکە ئەگەر خۆی داوای نەکردایە ناشایستەیەك بچوایەتە ئەو شوێنە، ئەوە ئەو خەڵکە هەمووی بەیەکجار بەهیلاکدا دەچوون، چۆن بوو بە خێر و بەرەکەت و وڵاتی میسر و دەوروبەری لەو گرانیە ڕزگار کرد، ڕزگارکەری میصریەکان و کەنعانیەکانیش بوو..

بەڵێ خۆشەویستان: وەزیفە و پلە و پایە ئەگەر بە دەستی ئینسانێکی شایستەوە بێت، هەروەختێك زانی کە بەکەڵك نایەت خۆی وازدێنێت، دەزانێت پۆست و پلە و پایە یەعنی خزمەت کردن، جا خزمەت کردن وەزیرێك دەتوانێت خزمەت بکات، کەناسیش دەتوانێت خزمەت بکات..

## لەوەزیریەوە بووە بەکەناس!

لەوڵاتی یاباندا وەزیرێك کێشەیەکی سیاسی لە ڕاپۆرتێکدا بۆ وڵاتی یابان دروست کرد لەگەڵ وڵاتانی دراوسێدا، یەك تەسریحێکی دا لە تەلەفزیۆنەوە، وڵاتەکانی دەرەوە و وەزیرە خارجیەکان لێی تورەبوون، حکومەت بڕیاری دا ئەم وەزیرە دەست لەکار بکێشێتەوە.. چونکە کێشەی سیاسی بۆ وڵاتەکەی دروست کردووە، زەرور نەبوو ئەم تەسریحە بدات بە ناوی وەزیری دەرەوەی وڵاتەوە، ئەم ئاژاوە، ئەم گرژیە لەبەینی وڵاتی

یابان و وڵاتانی دراوسێدا دروست بکات.. زۆر بەدڵێکی فراوانەوە وتی: ڕاست دەکەن من ئاژاوەم بۆ وڵاتەکەم دروست کردووە.. دەست لە کاردەکێشمەوە..

کاتێك دەستی لە کارکێشایەوە گەڕایەوە بۆ ئەو پیشەی کەیەکەم جار پیشەی بوو، یەکەم جار ئەم پیاوە پاك کەرەوەی سەرشەقامەکان بوو، کەناس بوو، دواتر لە هەڵبژاردنی شارەوانیدا چووە پێشەوە، بوو بە سەرۆك شارەوانی، دواتر لە پۆستی شارەوانیەوە بوو بە پارێزگا، لە پۆستی پارێزگاوە بوو بە وەزیر، گەڕایەوە بۆ ئەو پۆستەی یەکەمجار کە کەناس بوو، پاك کەرەوەی سەرجادەکان بوو..

دەڵێت: لەو کاتەدا وتیان زۆر سەیرە تۆ لەوەزیرەوە بوویت بە پاك کەرەوەی سەرجادەکان. ئەو پیاوە قسەیەکی زۆر بەهێزی کرد.. وتی: هیچ بەلامەوە گرنگ نیە من ئەم وڵاتەی خۆمم خۆش دەوێت، ئەم وڵاتە خزمەتی کردووم و خزمەتی دەکەم، خزمەتکردن لە وەزیریدا بێت هەر خزمەتە، لە جادە پاك کردنەوەبێت هەر خزمەتە، من کەوەزیر بووم خزمەتی هاوڵاتیەکانی خۆمم دەکرد.. ئێستا خزمەتی تەندروستی هاوڵاتیەکانی خۆم دەکەم، جادە پاك دەکەمەوە.. بۆ ئەوەی مێش و مەگەز و میکرۆب دروست نەبێت، نامەوێت وڵاتەکەم ناشرین بێت و هاوڵاتیەکانم نەخۆش بێت.. وەزیر بم هەر خزمەتە کەناسبم هەر خزمەتە، لەبەرئەوە بەلای منەوە گرنگ نیە..

## بە شکاندنی لقە گوڵێك.. دەستی لەکار کێشایەوە

یەك نمونەی جوان لە عالەمدا نازانم جەنابتان موتابەعەتان کردبێت یان نا، ڕوداوێکە ڕەنگە هەرگیز بیرم نەچێتەوە ئەوەیە کە: وەزیری پەروەردەی یابان دەستی لەکار کێشایەوە، کاتێك لێیان پرسی تۆ وەزیری تەربیە، وەزیری پەروەردەی وڵاتێکی وەکو یابان، وڵاتێکی پێشکەوتووی سەنعەتی ئەلیکترۆنی جیهانی، بۆ دەستت لە کارکێشایەوە.. ناتوانیت کار بکەیت؟

وتی: بڕواتان بێت غەڵەتێکم لە خۆمدا شك نەبردووە، یەك نوقسانی ئیداریم نیە، بەڵام ڕۆژێك کە دەچووم بۆ وەزارەت منداڵێکم بینی، دواتر بۆم مەعلوم بوو سێ ساڵە لە قوتابخانەیە، لە پۆلی سێی سەرەتاییە، بینیم لەملا و لەو لای جادەکانەوە پارك و حەدیقەی جوان کراوەتەوە، ئەو منداڵەم بینی لە ڕێگای قوتابخانەدا گوڵێکی شکاندەوە گوڵێکی گوڵەباخی شکاندەوە، وردی کرد و شکاندی.. کە ئەو دیمەنەم بینی، وتم ئەو منداڵە گوناحی نیە کە ئەو گوڵە دەشکێنێتەوە.. ئەوە وەزارەتی پەروەردەیە گوناحبارە کە ئەم منداڵەی باش پەروەردە نەکردووە، کە نرخی گوڵێکی وڵاتەکەی بگرێت..

جا من وەزیری ئەو پەروەردەیەم ئەوە گوناحی منە کە منداڵێکی سەر جادە، تەلەبەی وەزارەتەکەی منە نرخی گوڵێکی وڵاتەکەی نازانێت ئەوەندە ئازاری ویژدانی دام کە چوومە وەزارەت یەکسەر ئیستیقالەم کرد.. لەبەرئەوە باوەزیرێکی لەمن شایستە تر بێت خزمەتی وڵاتی یابان بکات!!

سەیری بەڕاستی ئەمە نمونەیە، مادام ئەو منداڵە گوڵێك دەشکێنێت و درکێك دەچێنێت.. ئەوە منی پەروەردەکارم کە نەمتوانیوە وەزارەتەکەم بەکار بێت ئەوە مامۆستاکەی باشی تێنەگەیاندووە، مامۆستاکەشی خەتای وەزیرەکەیە کە بە باشی چاودێری قوتابخانەکانی نەکردووە، ئەو وەزیرە هەرچەند لەگەڵیان وت سەرۆك وەزیران وتی دەست لەکارکێشانەوەکەت قبوڵ ناکەین.. وتی: ویژدانم لێم قبوڵ ناکات منداڵێك گوڵی وڵاتەکەی بشکێنێت و من وەزیری و پەروەردەکاری ئەو بم، لەبەرئەوە دەستی لەکار کێشایەوە.. هەر ئەو ڕۆژە چوویەوە بۆماڵەوە..

بەڕاستی نمونەیە بۆ وڵاتێکی وەکو یابان کە پێش دەکەوێت. لێرەش دەڵێی کابرا بە سیکۆتین بەو کورسیەوە بەند بووە، هەتا شەرواڵەکەی لەگەڵیدا دەدڕێت بەری نادات. ئەها ئەو شەرقی ئەوسەتە ئەو سوریایە چون دەهەژێت، کابرا ئامادەیە بە هەزاران خوێن بڕێژێت، پەنا بە خودا لە پێناو ئەو کورسیە شڕەدا، کە هەر دەبێت بەجێی بهێڵێت..

کاتێك کە (حسن ی بصری) ئامۆژگاری یەکێك لە کاربەدەستانی کرد وتی: ئامۆژگارم بکە، وتی: یەك کەلیمەت پێدەڵێم، ڕۆژێك لە قصورەوە دەچیت بۆ قبور، قصور و قبور دوو وشەن لەسەر وەزنی یەك، زۆر نزیکن لەیەکەوە..

وتی: لە قەصرەوە بۆ قەبر، قەسر و قەبر لەسەر یەك وەزنن، هەر سێ پیتن قەبر لەگەڵ قەسر، لەبەرئەوە لەبیرت بێت ڕۆژێك ئەو قەسرە بەجێ دێڵیت.. دەچیتە ناو قەبرەوە، ئەگەر بە گەنجی نەڕۆیت بە پیری دەڕۆیت، مردن هەر یەخەت دەگرێت، کەس هەیە بڵێت نامرم ڕۆژێك ئەم قەصرە دەبێتە قەبر، بەس پیتی (ص) دەبێت بە (ب) قەصر بۆ قەبر.. وتی: یەك وشەی تر ئامۆژگاریت ناکەم..

دەڵێت: کابرا لە پشت سەریەوە نوسی قەسر بۆ قەبر یەك وشە ماوە (ص)دەکە بێتە (ب)، یەلا کورسیەکە ڕاکێشنە خوارەوە.. ئا لەو کاتەدا لە قەبردا کەست لەگەڵدا نیە، نە سکرتێر، نە حەرەس، نەدام و دەزگا، نە شەهادە، هیچت لەگەڵدا نیە.. هەر لە قەبردا دەستت خاڵیە، یەك کفنی سپیت پێوە دەپێچن، لەبەر حورمەتی بەشەری ئەو وتی (ص)دەکەم بۆ بکەن بە (ب) وەرە لە ناو قەبرەکەدا ڕاکشێ، وتی ئەو ئامۆژگاریەت دەکەم و هیچت پێ ناڵێم، بۆ ئەوەی دەرسی لێوەربگریت.. ئەگەر دەرسی لێوەرنەگری ئیتر ئەمە بەسە..

ئەمە دەرسی ئەمشەومان بوو کە پێغەمبەری خودا ﷺ نیشانی داین. هەر میلەتێك بەختەوەر دەبێت، ئەگەر سەرکردەکانی زۆر عەشقی کورسی و پلەو پایە نەبن.. ئەگەر حەقی خۆت بوو، شایستەی خۆت بوو، موبارەکت بێت و ئەو کەسەش کە خزمەت دەکات خودای پەروەردگار پایە داری دەکات. هەتا شەوێکی تر و بەرنامەیەکی تر لەم زنجیرە باسەدا، بە خوداتان دەسپێرم..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ) .

# وانەی بیست و شەشەم

## ئاگاداری ژیانی هاوسەریت بە

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى : ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ۝ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْ ۖ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔى وَلَدْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ۝﴾ المجادلة .

* أَخْرَجَ أحمد وَ أبو داود وَ غيرهما ، عَنْ يوسف بن عبدالله بن سَلام ، قالَ حَدَّثتني خولَة بنت ثَعْلَبَة ، قالَتْ : (فِيَّ وَاللهِ وَفِي . أَوْس بن الصامت . أَنْزَلَ الله صدر سورة المجادلَة . قالَتْ : كُنْتُ عِنْدَهُ وكانَ شَيْخاً كَبيراً ، قَدْ ساءَ خلقُهُ ، فَدَخَلَ عَلَيَّ يَوْماً ، فَراجَعْتُهُ بِشَيْءٍ فَغَضِبَ فَقالَ : (أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي) ، ثُمَّ رَجَعَ فَجَلَسَ فِي نادی قومِهِ ساعَةً ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَيَّ فإذا هُوَ يريدني عن نَفْسي ، قُلْتُ : كَلاّ وَ الَّذي نَفْسُ خَوْلَة بيده ، لا تصل إِلَيَّ وَقَدْ قُلْتَ ما قُلْتَ ، حَتَّى يَحْكُمَ اللهُ وَ رسوله فينا ... ثُمَّ جِئْتُ إِلى رَسُول اللهِ ﷺ فذكرت لَهُ ذالِكَ فَما برحتُ حَتَّى نَزَلَ القُرآن) ـ حَسَنٌ ، صَحيح سُنَن أَبي داود : (١٩٣٤) .

* وَ أَخْرَجَ إِبْنُ ماجَة وَ الحاكم وَ صَحَّحَهُ وَ غيرهما ، مِنْ عائِشَةَ ، قالَتْ : تَبارَكَ الَّذي وَسع سمعه كُلَّ شَيْءٍ ، إِنِّي لَأَسْمَعُ كَلام (خولَة بنت ثعلبَة) وَ يَخْفَى عَلَيَّ بَعْضُهُ ، وَ هِيَ تَشْتَكي زَوْجَها إِلى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَ هِيَ تَقُول : يا رَسُولَ اللهِ : أَكَلَ

شَبابي ، وَ نثرت لَهُ بَطْني ، حَتَّى إذا كبر سِنِّي وَنْقَطَعَ وَلَدي ، ظاهَرَ مِنِّي ، اللّهُمَّ إنِّي أشْكُوا إلَيْكَ ، فَما برحت حَتَّى نزل جبريل ...

* وروي أنَّها قالَتْ : (إنَّ لي صَبِيَّةً صِغاراً ، إنْ ضَمَّهُمْ إلَيْهِ ضاعُوا ، وَ إنْ ضَمَمْتُهُمْ إلَيَّ جاعُوا ... ) قالَتْ خَوْلَة : فَما برحتُ حَتَّى نَزَلَ القُرْآن ، ثُمَّ قَرَأ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا) إلى قوله : (عَذَابٌ أَلِيمٌ).

المجادلة : (١ ـ ٤) .

فَقالَ لي رَسُولُ اللهِ ﷺ : (مُرِيه فَلْيُعْتِقْ رَقَبَةً) . قُلْتُ ما عِنْدَهُ ما يعتق . قالَ فَلْيَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتابِعَيْنِ ، قُلْتُ واللهِ إنَّهُ شَيْخٌ كَبير ما بِهِ مِنْ صِيام . قالَ : فَلْيُطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكيناً ، قُلْتُ : ما عِنْدَهُ مِنْ شَيْءٍ يَتَصَدَّقُ بِهِ .

قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (فَإنّا سَنُعينُهُ بعرق مِنْ تَمْر) قُلْتُ : يا رَسُولَ اللهِ ، فَإنِّي أُعينُهُ بعرَقٍ آخَرَ ، قالَ : (قَدْ أَحْسَنْتِ ، إذْهَبي ، فَأَطْعِمي بِها عَنْهُ سِتِّنَ مِسْكيناً وَ ارْجِعي إلى إبْنِ عَمِّكَ ، ثُمَّ اسْتَوْصي بِإبْنِ عَمِّكَ خَيْراً . قالَتْ : فَفَعَلْتُ .. ـ صَحيحٌ رَواهُ أبو داود : ٢٢١٤ .

* عَنْ إبْنِ عَبّاس : أنَّ رَجُلاً أتَى النَبِيَّ ﷺ قَدْ ظاهَرَ مِنِ امْرَأتِهِ فَوَقَعَ عَلَيْها ، فَقالَ : يا رَسُولَ اللهِ ﷺ ، إنِّي قَدْ ظاهَرْتُ مِنْ زَوْجَتي فَوَقَعْتُ عَلَيْها قَبْلَ أنْ أكَفِّرَ ، فَقالَ : (وَما حَمَلَكَ عَلى ذالِكَ يَرْحَمُكَ الله ؟) قالَ : رَأَيْتُ خَلخا لَهافي ضوءِ القَمَرِ ، قالَ : (فَلا تَقْرَبْها حَتَّى تَفْعَلَ ما أَمَرَكَ اللهُ بِهِ) ـ صَحيحٌ ، رَواهُ أبو داود : (٢٢٢١) . وَ التِرمذي : (١١٩٩) . وَ صَحَّحَهُ الألْباني .

## سەرچاوەکان :

١) زَوْجات وَ صَحابيات حَوْلَ الرَّسُول ﷺ سَعد يوسف أبو عَزيز . ، ص٣٦٥ ـ ٣٦٩ .

٢) بەختەوەر بژی ، د. محمد عبدالرَّحْمن العريفي ، و : هێمن محمد علي ، ل٤٠ ، چاپی یەکەم ، ٢٠١١ ، کتێبخانەی (نارین) هەولێر .

٣) رَوْضَة المُتَنَزِّه ، شَرْح بِدايَة المُتَفَقِه ، أيْمَن علي موسى ، ج٣ ، ص٢٠٦ ، ١ ، ٢٠١٠ ، دار إبْنُ رَجَب .

٤) پایزە برا ، مەلا ئەحمەدی شەریعە ، بەرگی یەکەم ، ل٥٢ ، چاپی یەکەم ، ٢٠١١ ، چاپخانەی ڕێ نوێ ، سلێمانی ، کوردستان .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز دانیشتنی ئەمشەومان لە خزمەت مەجلیسی پێغەمبەری خودادا ﷺ لە زنجیرە باسی ﴿ئەی پێغەمبەری بەڕێز و خۆشەویست هاتوومەتە خزمەتت کێشە و گرفتم هەیە﴾ دانیشتنی ئەمشەومان بە سڵاوات لێدان لەو خۆشەویستەمان، لەو شەفیعی مەحشەرەمان دەست پێدەکەین و دەڵێین:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

پێغەمبەری خودا ﷺ دانیشتووە لەناو هاوەڵانیدا و هەر وەکو شەوانی ڕابردوو ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خودادا بووین ﷺ، ئەم جارەیان کەسێك موشکیلەی هەیە، ئەمجارە ئافرەتێك دێت، ئافرەتێك چۆتە تەمەنەوە، دایکی چەند منداڵ و چۆتە تەمەنەوە و گرفتێکی خێزانی ژیانی هاوسەری بۆ دروست بووە، دێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من گرفتێکم هەیە، من بێ دەرەتانم، من موشکیلەم بۆ دروست بووە..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: خوشکی بەڕێزم، بڵێ موشکیلەی تۆ چیە؟

دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من (خَولە ی إبنت ثعلبە)م..

دەفەرمووێت: دەتناسم، تۆ ئافرەتێکی ناسراوی، ئافرەتێکی ئەنصاری خەڵکی مەدینەیت، ئێوە بنەماڵەیەکی خانەدانن، ئێوە بنەماڵەیەکن کەس نیە نەتان ناسێت و لە ڕێز و حورمەتی ئێوە بەهرەمەند بوو بێت..

دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خۆ دەشزانیت من خێزانی (أوسی إبن صامت)م

دەفەرموویت: بەڵێ مێردەکەشت لە پیاوە ناسراوەکانە، لەو کەسانەیە کە لەو ڕۆژەی من هاتوومەتە شاری مەدینە باوەڕی بە ئیسلام هێناوە..

مێردەکەی تۆ ئەو پیاوەیە کە لە جەنگی (بەدر)دا قارەمانانە و پیاوانە جەنگا..

مێردەکەی تۆ ئەو پیاوەیە کە لە جەنگی (ئوحود)دا ئازایەتی نیشاندا.. مێردەکەی تۆ ئەو پیاوە بەڕێزەیە کە لە هەمووکاتێکی ناڕەحەتیدا لەگەڵ پێغەمبەری خودادا بووە.. بەڵام ئێوە گرفتەکەتان چیە؟ دادەکەم، خوشکەکەم؟

## مێردەکەم وتی: وەکو دایکم وایت!

دەفەرموویت: ئەی پێغەمبەری خودا ئێمەش وەکو ئەو خێزانانە بەختەوەربووین، لە سایەی ئیسلامدا، بەڵام وەڵاهی گرفتی نەداری، گرفتی نەبوونی، زۆرجار ژن و مێرد زەمەنێك بەیەکەوە دەژین.. قسەیەکیان لەیەك هەڵدەبەزێتەوە.. ئەمڕۆ (ئەوسی کوڕی صامت) هاتەوە بۆ ماڵەوە، هاتەوە ماڵەوە و قسە کەوتە بەینمانەوە، لەپاشان لە گفتوگۆی ژیانی هاوسەری ڕێك و پێك ترازا و دەمەقاڵێ و موناقەشە و موجادەلەیەك لە بەینماندا دروست بوو.. ئەو هاوسەرەی ژیانم توڕەبوو، وتی:

برۆ (أنتِ عَلَيَّ كَظَهرِ أُمّي) برۆ تۆ وەکو دایکم وایت، وەکو پشتی دایکم وایت، ئەم قسەیە لە زەمانی پێش ئیسلامدا تا ئەو لەحزەیەش، هەر کەسێك بە ژنەکەی بگوتایە: تۆ وەکو دایکم وایت، یان لە کوردەواریدا تۆ وەکو خوشکم وایت، هی واهەیە پەنا بە خودا دەڵێت تۆ وەکو خوشك و دایکم وایت لێم حەرامیت. هەرکەسێك ئەم قسەی بگوتایە، سێ بە سێ تەڵاقی دەکەوت.. فڕی بەژنەکەیەوە نەدەما..

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هاتومەتە لای خزمەتت، ئەم پیاوە ئەم قسەی کرد و بە توڕەیی ڕۆشت و سەعاتێکی پێچوو لەلای دۆست و برادەرانی ئەمجا شەیتان وازی لێهێنا، ئەهوەن بوویەوە، هاتەوە سەر خۆی، هاتەوە ویستی دەستی بۆ دەستم بەرێت، بەڵام من وتم: (كَلا وَالَّذي نَفسُ خَولة بِيَدِهِ) قەسەم بەو خودایە کە نەفسی ئەم ئافرەتەی

بەدەستە کە (خەولە)یە، ئافرەتەکە دەڵێت: من وتم: (لا تصل إليَّ وقد قلتَ ما قلتَ) دەستت بە دەستم ناکەوێت چونکە تۆ قسەیەکی ئاواتکرد، (حتى يحكم الله و رسوله فينا) هەتا خودا و پێغەمبەری خودا حوکم نەدەن.. من نایەڵم تۆ بە حەرامی دەستت بەر دەستم بکەوێت، چونکە ئەم قسەیە تەلاقە، ئەم قسەیە حەرام بوونی ژیانی هاوسەریە، هەتا خودا و پێغەمبەری خودا بڕیار لەسەر ئەمە نەدەن، من نایەڵم دەستت بەر دەستم بکەوێت..

سەیری ئافرەتی ئیماندار، ئەو خەمی قیامەتی خۆیەتی! بەڵام وەڵاهی مێردەکەم دانیشتووە لە ماڵەوە، دەست لەسەر ئەژنۆ، بەڕاستی زۆر مەحزوونبوو.. من هاتمە خزمەتت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، من هاتووم و چارەسەرێك، حەلێکی ئەم موشکیلەمانی بۆ بکە.. (يارسول الله أكل شبابي) ئەم پیاوە گەنجێتی خواردم، من بە گەنجێتی شووم پێکرد، وا پیر بووم، سەرم ڕەش بوو سپی بووە..

(ونَثَرتُ لَهُ بَطني) ورگم نەبوو ئێستا ورگم شۆڕبۆتەوە هێندەم منداڵ بۆ بەسك هەڵگرت.. (حتى إذا كَبِرَ سني) تا ئێستا پرچی سپیم هۆنیوەتەوە و چاوم کز بووە.

(وانقَطَعَ وَلَدي) دوا منداڵمە، ئێستا من منداڵی ساوام هەیە، لەوەناچێت ئیتر منداڵم ببێت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، (إن لي صبية صغيراً)من منداڵی وردم هەیە، منداڵی بەر مەمکانم هەیە، (إن ظَمَّهُم إليه ضاعوا) ئەگەر لێك جیاببینەوە وەڵاهی منداڵەکانم بە هیلاك دەچن، منداڵ کە دایکی نەما بە فیڕۆ دەچێت، دەفەوتێن..

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر منداڵەکان لای باوکیان بن، منداڵەکانم دەفەوتێن. (وإن ضممتهم إليَّ جاعُوا) ئەگەر لەلای من بن، منداڵەکان من بیانگرمە ئامێز، وەڵاهی چونکە کەسێك نیە کارمان بۆ بکات لە برسان دەمرن، سەیری ئەم تەعبیرە جوانە، ئەم دیفاعە، وەکو محامیەکی شارەزا ئافرەتی ئیماندار چەند بە سەلیقە بووە، چەند زمان ڕەوان بووە، ئەگەر لای باوکیان بن بێ دایکیان پێوە دیار دەبێت..

ئەگەر لای من بن بێ باوکی و برسیەتیان پێوە دیار دەبێت.. ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من چوومەتە ساڵەوە تازەتەمەنی شووکردنم نەماوە، سکم شۆڕبووە، پرچم سپی بووە، منداڵی ساوام لەباوەشدایە.. ئەی پێغەمبەری خودا هاوارم هێناوە خودایە بەهاوارمانەوە بێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: وەڵاهی من نازانم بڵێم چی، من هیچ حکومێکم پێ نیە، دەبێت ئیلا تۆ و هاوسەرەکەت لێك جیاببنەوە..

حەزرەتی (عائیشە) دەفەرموێت: ئەم ژنە کە پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەی وت، وەکو ئەوەی موچوڕکەیەك بەلەشیدا بێت.. وتی: خودایە من هاواری خۆم دێنم بۆلای تۆ، لەسەر منداڵی خۆم دانەبڕێم و، خودایە ماڵ و حاڵم لێ تێك نەچێت..

دەفەرموێت: ئەمجار لەبەینی خۆی خودا دەپاڕایەوە خاتوو (عائیشە) دەفەرموێت: (تبارك الذي وسع سمعُهُ كلَّ شيءٍ) پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە گوێی خودای گەورە بیستی خودا لەسەر هەموو بیستن و بیسەرێکەوەیە (إني لأسْمَعُ كَلام خَولة بِنتُ ثعلبة و يخفى عليَّ بعضه) هەندێك قسەم گوێ لێ دەبوو، بەڵام لە هەندێکی حاڵی نەدەبووم، لەبەردەمی خۆیەوە چی دەگوت، من گوێم لێ نەبوو، قسەکانی بە تەواوەتی چین بەڵام خودا لەسەر و عەرشی عەزیمەوە، قسەکانی ئەم خەولەیەی بیست.. خودا بەدەنگیەوە هات و یەکسەر (جبریل) دابەزیە خوارەوە:

﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَـٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ ﴿١﴾﴾

المجادله، هەتا ئاخیری ئایەتەکە و سورەتەکە، خودای پەروەردگار فەرمووی:

بەڕاستی (قَد) چۆتە سەر فیعلی مازی بەڕاستی و بەدڵنیاییەوە ئەی پێغەمبەری خۆشەویست، خودا دەنگی ئەو ژنەی بیست کە دەمەقاڵێ لەگەڵ تۆدا دەکات. کە لەگەڵ تۆدا قسە دەکات، هاواری خۆی دەبات بۆ لای خودا، (وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ) خودا بە هاواری ئەو ژنەوە هات و دەنگی ئەو مەزڵومەی بیست، ئەم ئافرەتە نابێت لەسەر

منداڵەکانی بڕوات، نابێت ژیانی لێ تێك بچێت.. ئەها خودا چەند پێی خۆشە خێزان هەڵنەوەشێت، ئەی خودا چەندی پێ ناخۆشە منداڵ سەرگەردان بێت، ژن و پیاو لەیەك جیاببنەوە.. خودا دەنگی ئەم ئافرەتەی بیست و چارەسەری بۆ دانان و خودا بڕیاری دا لەمەو دوا ئەم قسەیە هەر کەسێك بە ژنەکەی خۆی بڵێت: تۆ وەکو دایك و خوشکم وایت، ئەمە تەلاقی پێ ناکەوێت و حکومی تایبەتی هەیە، ئەم ژن و مێردە لەیەك حەرام نابن، زیهارە، زیهاریش ئەوەیە کەفارەتەکەی بەو شێوەیە..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئایەتەکە دیاری کردووە، بڕۆ بە مێردەکەت بڵێ، ئالێرەدا سەرنج بدەن بەڕێزان: پێغەمبەری خودا ﷺ چەند ڕێزی ئافرەتی گرتووە، نەیفەرموو: من قسە لەگەڵ ئافرەت ناکەم، بڕۆ با مێردەکەت بێت، مێردەکەت بۆ نەهاتووە؟! پێغەمبەر ﷺ وانافەرمووێت.. ئەم ئافرەتە شایەنی ڕێزە، ئەم ئافرەتە خەمی ماڵ و مێردی خۆیەتی، ئەم ئافرەتە خەمی جگەرگۆشەکانیەتی..

پێغەمبەر ﷺ ڕێزی لە هەڵوێستی ئەو ئافرەتە نا، پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو: بڕۆ مێردەکەت بانگ بکە، من لەگەڵ ئافرەتاندا قسە ناکەم، ئەوە ئێستا مەلا بوایە، لەوانەیە وای بگوتایە، نا پێغەمبەر ﷺ گوێی بۆ گرت.. خودای پەروەردگار وەڵامی داوەتەوە..

پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو: بڕۆ مێردەکەت بهێنە، ئەمجا من چارەسەرت بۆ دەکەم.. فەرمووی: تۆ بڕۆ بە مێردەکەت بڵێ، جاری واهەیە ئافرەت ئامۆژگاری مێردەکەی دەکات ڕێی نیشان دەدات.. ئەمە لە ئیسلامدا هیچ مانیعێك نیە..

### سێ ڕێگا بۆ چارەسەری (ظهار):

## ڕێگای یەکەم: کۆیلەیەك ئازاد بکە

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بڕۆ تۆ بە مێردەکەت بڵێ با کۆیلەیەك ئازاد بکات (مُريه فَلیَعتِق رَقبَة) بڕۆ ئەمری پێ بکە، ژن بۆی هەیە ئەمر بەسەر مێردەکەیدا بکات. بڕۆ بە مێردەکەت بڵێ و ئەمری پێ بکە، با کۆیلەیەك بکڕێت و ئازادی بکات.. (الله) لە بەندە

ئازاد کردن چەند خێرە.. ئیسلام دینی ئازادیە، هەرکەسێك ئەم هەڵەیەی کرد، دەبێت بەندەیەك ئازاد بکات. کەسێك کەلە ئینسانیەت شۆراوەتەوە وەکو ئاژەڵ موعامەلەی لەگەڵدا دەکرێت، تۆ بیهێنە لە بەندایەتی ڕزگاری بکە و بڵێ لەمەو دوا تۆ بەندەی کەس نیت، تۆ بەندەی (الله)یت، ئازادانە بۆخۆت بژی، خودا لەو گوناحەی خۆش دەبێت.. (سبحان الله) ئیسلام چەند دینی ئازادییە، هەرکەسێك گەردنی کەسێك ئازاد بکات لە کۆیلایەتی، خودا گەردنی لە ئاگری جەهەنم ڕزگار دەکات.. بڕۆ خودا لەم گوناحەت دەبورێت یەك بەندە ئازاد بکە..

ژنەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ (ما عنده ما يعتق) وەڵاهی ئەوەندە نەدارە پارەی نیە کۆیلە بکرێت و ئازادی بکات، ئێمە خزمەتکارمان لە کوێ بوو، عەبدمان لە کوێ بوو؟ کوا پارەشمان نیە کۆیلە بکڕین و ئازادی بکەین..

## ڕێگای دووەم: دوومانگ بەڕۆژوو ببە

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دوو (فليصم شهرين متتابعين) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی بڵێ با دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێت. دوو مانگ نابێت یەك ڕۆژی بەین بێت..

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ (وَاللهِ إِنَّهُ لَشيخٌ كَبير مابِهِ مِن صِيام) بە خودا ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تەمەنی ڕۆژووی پێوە نەماوە، ئەوە پیاوێکی بەساڵدا چووی پیرە، ئەها ژنی دڵسۆز بۆ مێردەکەی دەپاڕێتەوە.. نافەرموویت ئەی دەستت خۆش بێت، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، (إنشاء الله) لەژێر ئەم ڕۆژووانەدا دەمرێت، قوڕ بەسەرت ئەوە ژنی واهەیە ،دەڵێت بە خودا چاك تەمێیان کرد..

ئەها ژنی صاڵیحە بۆ ژنەکەی دەپاڕێتەوە وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو پیاوە چۆتە تەمەنەوە، بە خودا تەمەنی صیحەتی دوومانگ ڕۆژووی پێوە نیە.. بە خودا بەرگەی ناگرێت دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بێت..

## ڕێگای سێیەم: خواردنی شەست فەقیر بدە

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: ئەمجا بڕۆ پێی بڵێ، خوشکەکەم با خواردنی شەست فەقیر بدات، فەرمووی: (فليطعم ستين مِسكينا، ستين مسكينا وِسقا من تَمرِ)

بڵێ با خورمای شەست فەقیر بدات.. عەلاگە گەورەیەکی، ئەها حەلەکەی خورما هەبوو هەمووومان بینیومانە لە پوشی خورما دەچنرا، ئێستا کەمتر هەیە، یەك عەلاگەی گەورە ئەوا ئەو حەلەگە خورمایانە بهێنێت، بیدات بە شەست فەقیر، شەست فەقیر لەسەرئەوە تێر دەخوات.. یەکی چەند خورمایەك پێی تێر دەخۆن، خورمای مەدینە تەڕ و تازە بە قوەتە، ئینسان بە مشتێك تێر دەخوات، نیو کیلۆ زیاتر دەکات.. ئەوە دەوری سی کیلۆ دەگرێت شەست فەقیر لەو خورمایە تێر بکات.. خودا لە گوناحەکەیان دەبورێت، ئێوە خێزانتان هەڵنەوەشێت..

وتی: وەڵاهی (ما ذاك عِندَهُ) قەسەم بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، وەڵاهی پارەی لەکوێ بوو بچێت عەلاگەخورمایەکی وابکرێت، بە خودا خورماشی نیە، پێغەمبەری خودا سەیری ئەو ڕەحمەت و میهرەبانیە! ئێمە بین دەڵێین جا داماو تۆ ئەمەت نیە ئەم زمان درێژیەت لەچیە.. ئەوە حەق وایە کرێکاری بکات، نا..

پێغەمبەری خودا، ئەوە پێغەمبەری ﷺ ڕەحمەتە، دەیەوێت خێزانەکان موشکیلەکانیان حەل بێت، نا فەرمووێت: لۆمەی بکات، قسەی پێ بڵێت، بڕۆ بۆم بانگ بکە، با دوو قسەی تەڕ و تازەی پێ بڵێم، نا.. پێغەمبەر دەفەرمووێت: خۆمان چارە سەری دەکەین..

فەرمووی: (فانا سنعينه بعرق من تمر) من و هاوەڵەکانم بەهەرهەمووومانەوە نیوەی عەلاگە خورماکەی بۆ پەیدا دەکەین، من دەڕۆمەوە ماڵی خۆمان (ابوبکر) و (عمر) تۆ، هەمووومان دەوری پانزە کیلۆ خورمای بۆ پەیدا دەکەین.. ئافرەتەکەش وتی:

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ (وأنا يا رسول الله سأعينه بعرق اخر ) شەرت بێت منیش بە ماڵی باب و برا و خوشکەکەم، خزمان پێوە دەگەڕێم، (إنشاء الله) نیوەکەی تری پەیدا دەکەم.. ئەها سەیری بکە ئەم ژنە صاڵیحەیە!!

پێغەمبەری خودا ﷺ چەند بە ڕەحم بوو، فەرمووی: ئێمە هاوکاری دەکەین بەنیوەی، ژنەکەش وتی: دەمنیش دەڕۆم بۆ ماڵی باب و خوشك و برا و کەس و کارم (إنشاءالله) پەیدای دەکەم. ئینجا دەیدەینە پیاوەکە دەبێت پیاوەکە خۆی خێرەکە بکات. پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو: کچم حەقت نەبێت بەسەریەوە، ئەو هەڵەی کردووە تۆ بۆ باجەکەی بدەیت.. ئەها ئەوە لەوانەیە ئێمە بووینایە بەداخەوە وەڵامی جاری وامەیە ئێمەی مەلاش لێی حاڵی نەبووین، کابرا جاری وامەیە هەڵەیکی بەدەمدا هاتووە، دەچێتە بەردەمی مەلایەك، فتوا دەرێك، جارێ کۆمەڵێك فەزیمەت بە ئەو پیاوە دەکات..

برا ئەم پیاوە (بەدر)ی بینیوە (ئوحود)ی بینیوە، نزولی قورئان هاتۆتە خوارەوە، بەلام بەشەر هەڵە دەکات. ئەم هەڵەیەی بەدەمدا هات.. ئەم قسەیەی لەدەم دەرچوو، بەلام گرنگ ئەوەیە ئینسان هەموو کات هەڵە نەکات.. پیاوێك نەبوو بەیانی تەلاق بخوات نیوەڕۆ بۆی چاك بکەنەوە، دوای عەسر وەك خۆی لێبێتەوە.. ئەمە خراپە ئەمە مرۆڤە مادام ئینسانە بۆی هەیە هەڵەبکات.. ئەو صەحابە گەورە هەڵە دەکات.. بەڕێزان.

ئەی پێغەمبەری خودا منیش نیوەی خورماکەی بۆ دەدەم..پێغەمبەری نەیفەرموو: تۆ حەقت نەبێت تۆ بۆ باجی ئەو دەدەیت.. فەرمووی: (فقد اصبتِ و احسنتِ) ئەی دەستت خۆش بێت خوشکەکەم، وەلامی چاك دەکەیت، کە یارمەتی مێردەکەت دەدەیت.. وەڵامی بیرو ڕایەکی زۆر جوانت هەیە، دەستت خۆش بێت، بڕۆ تۆ نیوەی پەیدا بکە لە ماڵی خۆت و کەس و کارت، منیش نیوەیت بۆ پەیدا دەکەم..

(فتصَدَّقي بِهِ عَنهُ) لە جیاتی ئەو تاوانە با ببیەخشێتەوە بەسەر هەژاراندا، ئەمجا نەیفەرموو: ئەمجارە لێی قبوڵ نەکەیت، وا ئەمجارە بۆمان پینە کردیت، نەچیت

دووبارەی بکەیتەوە.. بە پێچەوانەوە ئامۆژگاری ژنەکەی کرد، فەرمووی: ئەی (خەولە) (إستوصي بأبنِ عَمِّكَ خَيراً) لەگەڵ ئامۆزاکەتدا باش بە، لەگەڵ ئامۆزاکەتدا، لەگەڵ مێردەکەتدا باش بە کچم، خوشکم، لەمەودوا تۆش بێ ئەمری مەکە، ناچاری مەکە، ئەم پیاوە قسەی هەڵە بکات..

یەعنی ئەگەر پیاو قسەیەکی کرد ئەگەر ژن جوابی نەداتەوە پیاو توشی ئەو هەڵەیە نابێت، لەمەودوا کچی خۆم تۆش لەگەڵ ئامۆزاکەتدا ڕێك و پێك بە، هەوڵبدە کارێکی وابکە نەیەڵیت توڕە بێت و وشەی تەلاق و تۆ وەك دایك و خوشکم وایت، ئەو قسانە بکات. سەیری ئەو ڕەحمەتە چۆن ئامۆژگاری ئەو خوشکە بەڕێزەی کرد..

ئەم ئافرەتە بەڕێزە ڕۆشتەوە و خورماکە ئامادەکرا و شەست دانە فەقیر، خەڵك زۆر برسی بوو، خەڵك ئێستا زۆر تێرە.. بەڕێزان ئەم دەنگ و باسە بڵاو بوویەوە، ئەم عەلاگە خورمایە هەیە، ئەو گوناحە بەو خورمایە لاچووە لەسەری، یەکسەر شەست دانە فەقیر پەلاماریاندا، لێك و پێکیان کردەوە، عەلاگە دڕاو تێریان لێخوارد..

(سبحان الله) خودا چەندی پێ خۆشە نەفسێك تێر بکەیت، کابرا بە ژنەکەی وتووە تۆ وەکو دایکم وایت، ئەمە بوختانە، دایك ئەو کەسەیە تۆ لەدامێنی هاتیتە خوارەوە، نەك ئەو کەسەی جیماعی لەگەڵدا دەکەیت!! ئەمە وشەیەکی گەلێك گەورەیە (بُهْتاناً وَزوراً) بەڵام چونکە شەست دانە فەقیری موعیدە برسی، لەسەر ڕۆژی ئەو، نەفەقەی تۆ تێر بوو..

خودا دەفەرمووێت: لەبەر خاتری ئەو شەست سکە برسیە، من لە گوناحی ئەو کەسە خۆش دەبم.. (سبحان الله) هەر کەسێك خۆی بە گوناحبار دەزانێت با صەدەقە زۆر بکات، بە تێر کردنی هەزاران خودای گەورە چەندین گوناحت لەسەر ڕەش دەکاتەوە.. (إنشاء الله) بەبەرەکەتی ئەو بەخشینە ئەو پیاوەی ئازاد کرد لەو گوناحە، (الحمد لله) ئەوانیش سەریان بەیەکەوەنا، تەمەنێکی زۆر بەیەکەوە ژیان، دواتر هەر یەکەو لەمەوعیدی خۆی مرد، کە (إنشاء الله) جێگایان بەهەشتە..

## خەولە.. ئامۆژگاری ئیمامی عومەری کرد..

ئەم ئافرەتە پیر بوو مایەوە، پێغەمبەری خوداش ﷺ وەفاتی کرد هەرنەمرد، ئیمامی (ابوبکر) بوو بە خەلیفە دوای دوو ساڵ و شەش مانگ وەفاتی کرد، ئەم ئافرەتە هەر مایەوە.. پشتی چەمایەوە، گۆچان بەدەست و دەلەرزی..

ڕۆژێك توشی ئیمامی (عمر) بوو، ئەو (عمر)ەی کە سامدار سامی لێدەکرد، لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلاتدا، بەلاَم بۆ هاولاَتیانی خۆی، بەرامبەر مسوڵمانانی خۆی، زەلیل و مل کەچ بوو، داخی گرانم بۆبەرپرسانی ئێستا، بە نەیاران و خەڵکی بێگانە زەلیل، کەچی بۆ هاولاَتیانی خۆمان شێری مەیدانن، (عمر) بە پێچەوانەوە بوو، کە دەنگ و ناوی (عمر) بهێنرایە کیسرای فارس دەلەرزی، قەیسەر لە ڕۆژئاواوە دەلەرزی، بەلاَم پیرە ژنێکی گۆچان بەدەست دێتە ڕێی، دەفەرموێت: بوەستە.. حەزرەتی (عمر) لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ دەگەڕێتەوە، کۆمەڵێك گەورە پیاوی صەحابە، ئەنجومەنی ڕاوێژکاری لە خزمەتی دان، (عمر)، نایشلێت خەلیفەی مسوڵمانان، ئاوڕی بۆ دەداتەوە، ئەو پیرە ژنە بەلەرزە لەرز گۆچانێکی بەدەستەوەیە..

دەفەرمووێت: دایە گیان ئەوە تۆی، ئەی (خولە ی إبنت ثعلبە) ئەوە تۆی؟!

دەڵێت: وەرە.. گوێشی گران بووە، ئیمامی (عمر) گوێی دەباتە بەردەمی ئەم ئافرەتە، دەفەرمووێت: (یاعُمر قَد کنت تُدعی عُمیراً) ڕۆڵە گیان بیر بکەرەوە، ڕۆژێك پیان دەگوتیت (عومەرە بچکۆل) تۆ ڕۆژێك (عومەرە بچکۆل) بویت.. من بەبیرم بێت لەم شاری مەدینەدا تۆ (عمیر) بوویت لە مەککە (ثم قیل لك عمر) ئەمجا خودا ڕەحمی پێکردیت، تۆزێك گەورە بوویت، بوویت بە پیاو، پیان دەوتیت: (عومەر)

(ثم قیل لك امیرالمؤمنین) ئێستا بە فەزڵی ئەم دینی خودایە پێت دەڵێن ئەمیری مسوڵمانان، ئەوت لەبیر نەچێتەوە تۆ، هەر (عومەرە بچکۆلەی) جارانی، ئەوە بە فەزڵی خودا بوویت بە (عمر)ی ئەمیری مسوڵمانان.. (فاتَّقِ اللهَ یا عُمر) لە خودا بترسە، لە خودا بترسە و بیری قیامەتت بێت ئەی (عمر)..

(فأنه من أيقَنَ بالموتِ خاف الفوت) هەر کەسێك مردنی لەبیر بێت، دەزانیت بەردەمی خودا و لێپرسینەوە هەیە، (ومن أيقن بالحساب خاف العذاب) کەسێکیش بزانێت ڕادەگیرێت و لەبەردەمی خودادا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکەن، دەشزانێت حیساب و کیتاب و لێپرسینەوەی بەدواوە هەیە.. ئەی (عمر) ئاگات لە خۆت بێت، ئەم کورسی و دەسەلاتە نەوخەڵەتێنێت، خزمەتی میلەتەکەت بکە..

جا ئافرەتەکە چونکە گوێی گران بوو، وایدەوانی ئیمامی (عمر) ئاگای لێ نیە، بە هاوار بۆ ئیمامی (عمر)ی باس دەکرد.. ئەوانەی لە خزمەتی دابوون، وتیان: قوربان زۆر درەنگە، ئێمە ئیشمان هەیە، تۆ ئەم پیرە ژنە بۆ ئەوەندە لەگەڵیدا دەوەستیت..

(يا أمير المؤمنين أتقف لِهذهِ العجوزِ هذا الوقُوف) ئەم هەموو وەستانە بۆ ئەم پیرە ژنە، بۆ ئەم قسانەش!! ئەو ئامۆژگاریت دەکات. ئەو دەڵێت لە خودا بترسە.. تۆش ئەمیری مسوڵمانانیت، تۆ جێنیشینی پێغەمبەریت، قابیلە بۆ خۆت ئەم قسانە نەزانیت؟!

فەرمووی: (والله لو حبستني من أول نهار الي اخره لا زلت إلا الصلاة المكتوبه) فەرمووی: **﴿ئەوە ئێوە دەڵێن چی؟ بەو خودایە لە سپێدەی بەیانەوە ئەم ژنە منی بوەستاندایە، هەتا بانگی مەغریبی دەدا.. گوێم لێدەگرت و بەجێم نەدەهێلا، ئیلا بۆ نوێژە فەرزەکە دەچووم و دەهاتمەوە خزمەت ئەم ژنە پیرە!!﴾**

(أتدرؤن من هذه العجوز؟) ئێوە دەزانن ئەم پیرە ژنە کێیە؟ (هي خَوله بِنت ثعلبه) ئەمە (خەولەی کچی سەعلەبە)یە (سَمِعَ الله قولَها مِن فوق سَبع سَموات) خودا دەنگی ئەم ژنەی لە حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە بیستووە (أيَسمَعُ ربُّ العالمين قولها ولا يَسمعُ عمر) خودای گەورە گوێ بۆ ئەم پیرە ژنە بگرێت لەسەروی ئاسمانەکانەوە، بەندەیەکی زەعیفی وەکو (عمر) کە کاربەدەستی مسوڵمانانە دەبێت پێی شەرم بێت لەگەڵ پیرە ژنێکی ئاوا بوەستێت؟!

وەڵامی لە ئەوەڵی بەیانیەوە تا ئێوارە بیوەستاندمایە، بە جێم نەدەهێشت، ئەمە خودا گوێی بۆ گرتووە، دەبێت کاربەدەست ئاوا بێت.. جا ئەمە خودا نەك گوێ بۆ

(خەولە) دەگرێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: هەر کەسێك مەزڵوم بێت خودای گەورە گوێ بۆ مەزڵوم دەگرێت، لەسەرو حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە، هەتا مەزڵوم شەکوای حاڵی خۆی دەکات..

ئەی کاربەدەست ئەی تۆ بۆ گوێی بۆ ناگریت؟! دەبێت کە ئەو کەسانەی پیرە ژنن دەبێت کاربەدەست وەکو حەزرەتی (عمر) سەردابخات گوێ بەرێتە بەردەمیان، هەتا ئەو لە قسەکە نەبێتەوە قسەکەی پێ نەبڕێت.. کە ئەمە ئیسلامە بەڕێزان، ئیسلامی ئێمە ئەمەی هێنا، ئەم ڕێزەی دا بە پیرەژن، ئەم ڕێزەی دا بە ئافرەت.. ئێستا ئەو ئافرەتەی دەڵێن ئافرەت داوای مافی دەکات. وەڵاهی لەو ئەورووپا و ئەمریکا و ئوستوڕالیا و ڕوسیایە.. قەسەم بە خودا ئافرەت هەر ئەوەندە مافی هەیە کە ئافرەتێکی کیژی جوانە، کە هەتا بەر چاوە، کە بوو پیرە ژن، کەس ئاوڕی لێناداتەوە، کەس حیسابی بۆ ناکات. بەڵام بە پێچەوانەوە لە ئیسلامدا دەبێتە پیرە ژنێکی گۆچان بەدەست، گەورەی هەموو مسوڵمانانی هەموو مەشریق و مەغریب چۆکی لەبەردادەدا..

تو خودا کامیان مافی ئافرەتی داوە؟ ئیسلام یان بێ دینی؟ ئەم وەڵامە ئاشکرایە، ئیتر بۆ خەڵك خۆی دەخەڵەتێنێت.. هیچ کاتێکیش ئیسلام نەبێت ڕێزی مرۆڤ ئاوا ناگیرێت..

## دوای تەڵاق درانی.. خزمەتی مێردەکەی دەکرد !

لەکۆتایی ئەم وتارە، یەك مەوعیزەی کورتی خۆماڵیانە دەگێڕمەوە و کۆتایی پێدەهێنم. کە ئافرەتی بەڕێز کە مێردەکەشی هەڵەی کرد، تو خودا با هەوڵبدات کێشەکە گەورە نەکات، با بچوکی بکاتەوە.. ئەی ئافەرین بۆ ئافرەتی لێبوردە..

مامۆستا مەلا خالد هەبوو کاتی خۆی، مەلا خالدی مەعهەدی ئیسلامیان پێدەگوت، بەڕێوبەری پەیمانگای ئیسلامی سلێمانی بوو.. ئەم پیاوە بەڕێزە، زانایە لەسەرەتای هەشتاکانەوە، تا کۆتای نەوەدەکان مودیری مەعهەدی ئیسلامی بوو.. دواتر ماستەری

خوێند و بوو بە مامۆستای جامیعەی سلێمانی.. لە دوای ساڵی نەوەد و چوارەوە بوو بە مامۆستای زانکۆ..

لەگەڵ خێزانەکەیان ناکۆکیان کەوتە بەین و مامۆستا خالد و ژنەکەی لەیەك جیابوونەوە.. ئەو دواتر بوو بەمامۆستای زانکۆ و لە ژنەکەی جیابوویەوە.. (سبحان الله) دواتر جەڵتە دای لە مامۆستا مەلا خالدی مودیری مەعهەدی ئیسلامی، کە مامۆستای زانکۆی سلێمانی بوو، هەر چوار پەلی لەکار کەوت. بەس دەمی دەکردەوە، پارچە گۆشتێك لەوێ کەوت..

ئەم پیاوە کەس نەما خزمەتی بکات، کوڕ و کچ بەجێیان هێشت، خوشك و برا کەس و کار دەرودراوسێ بە تەنها مایەوە، ئەو ژنە تەڵاق دراوە کە بیستی ئەو پیاوە ئاوا زەلیلە و کەس نیە پەرداخێك ئاو بەدەمیەوە بکات. پاکی بکاتەوە و پیسایی لەبەر بگرێت.. دەچێتە لای مامۆستایەکی مزگەت دەڵێت:

هەرچەندە من و ئەو بەشەرعی خودا هیچ پەیوەندیەکمان بەیەکەوە نەماوە، من لە مەحکەمە تەڵاقی خۆم وەرگرتووە، ئێمە بەیەکەوە ژیانمان کۆتایی هاتووە، بەس هەر وەکو وەفاداری کە ڕۆژانێك من و ئەو هاوسەری حەڵاڵی یەکتر بووین، زۆرجاریش خزمەتی کردووم، لە ژیان زۆر شتی بەدڵ کردم، ڕەنگە من تاوانی جیابوونەوەم هەبێت.. ئەگەر شەرع ڕێگە بدات لە دوا ساتی تەمەنی ئەم پیاوە، کە هیچ جوڵەیەکی نەماوە، وەکومەیتێك لەوێ ماوە، ئەگەر من لە پێشی ئەوەوە ئەوە خودا دەزانێت، یان هەتا ئەو دەمرێت من دەچمەوە خزمەتی دەکەم..

(سبحان الله) ئەم ژنە دوای تەڵاق دان دەچێت، مامۆستاش دەڵێت: یاڕەبی خودا جەزات بداتەوە، خۆ ئەو نە ئارەزووی جنسی ماوە، نەهۆشی ماوە، نە عەقڵی لەسەر خۆی ماوە، یەك پارچە گۆشتە لەوێ کەوتووە.. تۆ کە ئەم کارە بکەیت (إنشاء الله) بەهەشتی خودا بەدەست دەهێنیت..

ئەم ئافرەتە دەچێت وەکو منداڵێکی ساوا خزمەتی دەکات. خزمەتی دەکات بە باشترین خزمەت، دەڵێت: وەکو وەفاداری بۆ ڕۆژێك کەمن و ئەو ژن و مێرد بووین، چەند ساڵ ژن و مێردبووین، دوای تەلاق گەردنی ئازاد بێت، مادام ئالەوێدا کەوتووە با زەلیلی خەڵك نەبێت، باوەڕکە ئەوە لە میلەتی کوردا هەڵدەکەوێت، باوەڕناکەم لە هیچ قەومێکی تری ئەم عالەمە هەڵکەوێتەوە..

من بۆیە باسم کرد ئەوانە دەست خۆشیان لێبکرێت، نەك ئەگەر جارێك مێرد هەڵەیەکی کرد، ژنەکەی لێی لەقاو بدات، ماڵ و کەس و کار و بار و برا و دراوسێ و هەمووی لێ تێبگەیەنێت.. ئاخر وەڵاهی ئەوە غیرەتە ژنێك تەلاق بدرێت لەمەحکەمە، دواتر پارچە گۆشتێك بەخێو بکات. دەست لە پیسایی بدات.. وەکو وەفاداریەك بۆ ڕۆژانێك کەمن و ئەو هاوسەری حەلاڵی یەکتر بووین.. هێشتا ڕەنگە من مەحرەم تریم، چونکە ئەو ئارەزووی بەرامبەر بە ئافرەت نەماوە..

ئومێدەوارم کە (انشاء الله) خێزانی مسوڵمانان بەختەوەر بێت.. خودایە لەبەلا و موسیبەت بەدوورمان بکەیت.. هەتا شەوێکی تر و بەرنامەیەکی تر بە خوداتان دەسپێرم (وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ) .

# وانەی بیست و حەوتەم

## با شەوی قەدر بکەینە قەدر و حورمەتی ناو خێزانەکان

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾﴾ الرُّوم .

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى : ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾﴾النِّساء.

* وَ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى : ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾البَقَرة : ١٨٧ .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (نِساء وُكُمْ مِنْ اَهْلِ الجَنَّةِ : الوَدود ، العؤود على زَوْجِها ، الّتي إذا غَضِبَ جاءَتْ حَتَّى تَضَعَ يَدَها في يَدِ زَوْجِها وَ تَقول : لا اَذُقُ غَمْضاً حَتَّى تَرْضى) ـ حديث صَحيح . صَحَّحَهُ الألباني في الصَّحيحَة (٢٨٧) .

* عَنْ عائِشَةَ ، قالَتْ : كانَ الحَبَشُ يَلْعَبُونَ بِحَرابِهِمْ ، فَسَتَرَني رَسُولُ اللهِ ﷺ وَ اَنا اَنْظُرُ ، فَما زِلْتُ اَنْظُرُ حَتَّى كُنتُ اَنا اَنْصَرِفُ ، فاقدُرُوا قَدرَ الجارِيَةِ الحَديثَةِ السِّنِ تَسْمَعُ اللَّهْوَ) ـ رَواهُ البُخاري : (٥١٩٠) .

* عَنْ عائِشَةَ : خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَ اَنا خَفيفَةَ اللَّحْم ، فنزلنا مَنْزِلاً فَقالَ لِأصْحابِهِ : تَقَدَّمُوا ، ثُمَّ قالَ : تُسابِقِيني يا عائِشَةَ ؟ فَسابَقَني ، فَسَبَقْتُهُ . فَسَكَتَ عَنِّي حَتَّى إذا حملت اللَّحْمَ وبدنت وَ نَسيتُ ، ثُمَّ خَرَجْتُ مَعَهُ في سَفَرٍ آخَر ، فنزلنا

مَنْزِلاً ، فَقالَ لِأصْحابِهِ : تَقَدَّمُوا ، ثُمَّ قالَ لي : تَعالِي أُسابِقُكِ ! .. وَنَسِيتُ الَّذي كانَ ، قَدْ حملت اللَّحْمَ ، فَسابَقْني فَسَبَقَني ، فَضَرَبَ بيدهِ كتفي ، وَجَعَلَ يَضْحَكُ وَقالَ : هذهِ بِتِلْكَ) - رَواهُ أحمد في مُسنَدِهِ : (٢٤١١٩). وَ أبُو داود : (٢٥٧٨) . (٧٠٠٧).

* أَنَس ، قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (يا بُنَيَّ إذا دَخَلْتَ على أَهْلِكَ فَسَلِّمْ ، يَكُنْ بَرَكَةً عَلَيْكَ وَعَلى أَهْلِ بَيْتِكَ) - رَواهُ الترمذي : (٢٦٩٨) . وَ قالَ : حَسَنٌ صَحيحٌ غَريب .

* عَنْ عائِشَةَ : ما غِرْتُ لِلْنَبِيِّ ﷺ عَلى إمْرَأَةٍ مِنْ نِسائِهِ ما غِرْتُ عَلى خَديجَةَ لِكَثْرَةِ ذِكْرِهِ إيّاها وَما رَأَيْتُها قَطُّ) - رَواهُ البُخاري وَ مُسلِم .

* عَنْ عائِشَةَ : (إنْ كُنّا لَنَذْبَحُ الشّاةَ ، فَيَبْعَثُ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِأَعْضائِها إلى صَدائِقِ خَديجَةَ) - رَواهُ البُخاري .

* عَنْ صَفِيَّةَ ، قالَتْ : كُنْتُ أَلقى مِنْ أَزْواجِ النَبِيِّ ﷺ يفخرنَ عَلَيَّ ، يقلنَ : يا ابنَةَ اليَهُودِي ، وَ كُنْتُ أرى رَسُولَ اللهِ ﷺ يلطف بي وَ يكرمني ، فَدَخَلَ عَلَيَّ يَوْماً وَ أنا أَبْكي ، فَقالَ : مالَكِ ؟! فَقُلْتُ : أَزْواجكَ يفخرنَ عَلَيَّ وَ يقلنَ : يا ابْنَةَ اليهودي ، قالَتْ : فَرَأَيْتُ رَسول اللهِ ﷺ قَدْ غضبَ ، ثُمَّ قالَ : (إذا تعالوا لَكَ ، أَوْ فاخَرُوكَ ، فَقولي : أَبي هارُون ، وَ عَمِّي مُوسى ، وَ زَوْجي محمد) ...

## سەرچاوەکان :

١) الزَّواج في القُرآنِ وَ السُّنَة الصَّحيحَة ، محمد ملا فائق الشهرزوري ، ص١٧٧ ، ط : ١ ، ٢٠١١ .

٢) الحقوق الإسلامِيَّة ، الشَّيْخ محمد حَسّان ، ص٦٤٣ ، ط : ٢ ، ٢٠٠٦ ، مكتبَة فياض .

٣) ليلة في بَيْتِ النَبِيِّ ﷺ محمود المصري ، ص٥٤٣ ، ط : ١ ، ٢٠١١ . مكتبَة الصَّفا .

٤) گۆڤاری : (ئاینده سازی) ژماره : ٢ ، ئابی ٢٠١٢ . بابەتی (ژن له بەریتانیا) ، بەشی یەکەم .

٥) رَقائق العريفي ، د . محمد عبدالرَّحْمن العريفي ، ص٤٧٢ ، (قُمْ فَأَنْذِرْ) . ط : ١ ، ٢٠٠٩ ، شركة (ألفا) لِلْنَشر وَ الْإنْتاج الفَني .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ لله رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیمانداران و خوداناسانی بەرێز: لەم شەوە پیرۆزەدا لە ماڵی خودای پەروەردگاردا دەچینە خزمەت پێغەمبەری ﷺ پێشەوامان، لەکاتی چوونە خزمەت پێغەمبەری پێشەوادا ﷺ، جوانتر وایە ئینسان بە ئەدەبەوە لە خزمەت خۆشەویستدا بێت وە لە کاتی باسکردنیدا سلاوات لەسەر ئەو خۆشەویستە بدات و بڵێت:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

ژیانی ئەمڕۆ کاتێك سەیری مسوڵمانان دەکەیت (الحمد لله) زۆریان ڕێك و پێکن، بەڵام گەلێك ماڵیش هەیە ئاژاوەی تێدایە، گەلێك ژن و مێردیش هەیە ناکۆکن، کە دیندارن لە ڕووی عیبادەتەوە، ڕۆژووی ڕەمەزانیش دەگرن، تەراویحیش دەکەن، بەڵام زۆر جار دەبینیت ژن و مێردی واهەیە وەکو پێویست ژیانیان خۆش نیە، تەبا و ڕەبا نین..

ئێمە بۆ چارەسەری کێشەکانیان با بچینە خزمەت دایکی ئیمانداران و لێی بپرسین: حاڵی ئێوە چۆن بوو لە خزمەت پێغەمبەری خودادا ﷺ؟ چونکە لەم زنجیرە باسەی ئێمەدا ئەمە بیست و حەوتەم ئەڵقەی ئەم زنجیرە باسەیە، هەموو شەوێك باسی کێشەیەکمان کردووە.. ﴿ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێشە و گرفتم هەیە﴾ هەمان کێشە بۆ خێزانەکانی ئەمڕۆ دروست دەبنەوە، دەڵێی هەمان سەردەمە، چونکە ئەم دینە کۆنی بەسەردا نایەت..

## دوو نمونە لەژیانی پێغەمبەرﷺ :

## یەکەم: پێغەمبەرﷺ و عائیشە سەیری یاری دەکەن..

بۆ چارەسەری کێشە خێزانیەکان با بچینەوە خزمەت پێشەوا و چاو ساغ و قودوەمان کە حەزرەتی ﴿محمدە ﷺ﴾ دایکمان خاتوو (عائیشە) دەفەرمووێت: گوێم بۆ بگرن رۆڵەکانم، دوو نمونەتان لە ژیانی خۆم لەگەڵ پێغەمبەری خودادا ﷺ وەکو هاوسەر بۆتان دەگێڕمەوە.. بزانین خۆشەویستمان لەگەڵ خێزانی خۆیدا چۆن بووە؟

خاتوو (عائیشە) دەفەرمووێت: (أن النَّبيَّ كانَ جالِساً) پێغەمبەری خودا لە ژوورەکەی مندا دانیشتبوو، جا بەرێزان ژوورەکەی خاتوو (عائیشە) کە ماڵی پێغەمبەرە ﷺ، دیارە ئەمەش هەر ماڵی خودایە، تەشبیە نەبێت با ئەو و دەرەوە، وەکو لە دیوی دەرەوەی ژوورەکە کە ئێستا قەبری پێغەمبەرە ﷺ، لە وێدا بە خاك سپێردراوە، وەکو ئەو پەنجەرەی بۆی بڕۆی ئاوا لەویادا بووە..

دەفەرمووێت: دانیشتبوو پێغەمبەر (فسمع فوضاء الناس) گوێی لێبوو لە ناو مزگەوتدا بوو بە هەرا، وەك گریانی منداڵ هاواریان دەکرد و قاو قریشك، پێغەمبەر ﷺ لە ژوورەکەی خۆیەوە، خودایە ئەم دەنگە دەنگە و هاوارە چیە، لە ناو مزگەوتدا بەرز بوویەوە؟! (فأذا حبشية ترقص الناس حولها) دەفەرمووێت:

سەیری کرد ئەوا حەبەشیەکە، کابرایەکی خەڵکی حەبەشەیە، کابرایەکە یاری بە تیر و رم دەکات. رمتان بینیوە؟ بەقەدەر کلکە خاکەنازێك دەبێت و سەرەکەی شتێکی تیژی پێوەیە، کەلەکاتی جەنگدا بەکاردێت، لەسەر یەك پەنجەئەو رمە ڕادەگرێت و هەڵی دەدات بۆ ئاسمان و دەیگرێتەوە.. ئەوە شتێکی زۆر غەریبە، ئەو هەموو خەڵکە هاوار دەکەن.. بەرزی دەکاتەوە دەیخاتە سەرسەری نایەڵێت بکەوێت، بە چواردەوری خۆیدا پێچ دەخوات وەکو وەرزشێك..

یەعنی ئەمڕۆ چۆن ئێستا لەو ساحە و مەیدانانەدا ئێستا ئەو وەرزشانە دەکرێت، لە ناو مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ ئەو وەرزشە دەکرێت، ئەو وەرزشە دەکرێت، ئەو هەموو خەڵکە هات و هاواریان دەکرد و دەیان وت بە خودا عەجیبە! ئافەرینیان لێ دەکرد و دەست خۆشیان لێدەکرد و بە پشتە پێی ڕمەکەی دەگرتەوە و جارێك هەڵی دەدایە سەر لەپی دەستی، جارێك ئاوای دەکرد و لەسەر سنگی دەیچەقاند، یەعنی بەو هەموو شێوازە خەڵکەکە دەنگەدەنگیان دەکرد (فَسمع فَوضاء النّاس و الصِّبيان) دەنگی منداڵ و گەورە تێکەڵاو بووبوو.. خاتوو (عائیشە)دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (یاعائیشە) ئەی (عائیشە) (تعالي فَنظري) وەرە سەیر بکە چ دیمەنێکی غەریبە، دەفەرمووێت: لە ژوورەکەی خۆمانەوە ئاوا تاقەیەکی پێوە بوو، پەنجەرەیەکی بچکۆلە فەرمووی وەرە سەیر بکە ئەو پیاوە چۆن یاری بەو ڕمە دەکات و خەڵکی چی بۆ دەکەن.

دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ ئاوا دانیشتبوو، وەکو ئەوەی بڵێیت بە چیچکانەوە، دەفەرمووێت: منیش چەناگەم خستە سەر شانی پێغەمبەر ﷺ، خستمە سەرشانی و لە کونەکەوە دەمڕوانی، لە پەنجەرەکەوە..

دەفەرمووێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (أما شَبَعتِ؟) تێر بوویت لە تەماشاکردن؟ نیو سەعات چل دەقیقەیە، ئەوە هەر یاری بەردەوامە و منیش سەیر دەکەم.. وتم: (لا) نەوەڵا تێر نەبووم..

دەفەرمووێت: (لأ نظر مَنزلة عِندَهُ) وتم: بزانم پێغەمبەر ﷺ تا چەند منی لا بەنرخە، تا چەند حەزەکانی من جێبەجێ دەکات. جا سەیری ئافرەت چۆنە مێردی تاقیدەکاتەوە، بزانم ئەم پیاوە هاوسەری ژیانمە و پێغەمبەرە ﷺ، چەند منی لا بەنرخە و ڕێزم بۆ دادەنێت و کاتی خۆیم پێدەبەخشێت؟ (فَلقَد رَأيتهُ يُراوِحُ بَينَ قَدميهِ) وەڵاهی بینیم پێغەمبەر ﷺ یاری بە قاچەکانی دەکرد، قاچی سڕ بووبوو، ئەم قاچەی ئاوا لێدەکرد و ئەو قاچەی ئاوا لێدەکرد.. نەیفەرموو: دەتەواو بەسە وەڕەس بووم..

هەر یەکێك لە ئێمەمانان بوایە تەحەمولی نەدەکرد. بەڵام دەفەرموویێت: هەتا خۆم وتم: بەسە، پێغەمبەری خودا ﷺ قاچی سڕ بووبوو، قاچی ئاڵوگۆڕدەکرد.. ئەوهەر دەیفەرموو: تێر بوویت لە تەماشاکردن؟ دەموت (لا)، نەوەڵا تێر نەبووم..

خاتوو (عائیشە) ئەم دیمەنە ئەو ئەم ڕێزگرتنەی پێغەمبەری خودا ﷺ، لەیاد ناکات. دوای چەندین ساڵ لەدوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، هەر دەیگێڕێتەوە، ئەمڕۆ ئێمە لە خزمەتی داین و ئەم دەرسە گەورەی لێوەردەگرین، کە: ژیانی خێزانی ژیانێکی پڕ بەختەوەریە، لە ژیانی ئەمڕۆدا ئەگەر ببینین سەرکردەیەکی عالەمی ژنەکەی خۆی لەگەڵدایە، بچن سەیری یاریەکی نێو دەوڵەتی بکەن، کوڕە بابە ئەوە جیهانی دیموکراسیە! ئەوە جیهانی پێشکەوتنە، سەیری ئەو سەرکردە ژنەکەی خۆی لەگەڵ خۆی بردووە؟! هیچ بەشەرێك لەسەر ئەم زەمینە، ئەو زەمەنە بیری ئەوەی نەدەکرد ژنەکەی بەرێت و سەیری یاریەکی عەجیب بکات و، دڵی ئینسانیش بە یاری دەکرێتەوە، بەڵکو خەڵك لەوانەیە پێی عەجیب بوایە شتێکی وا لەسەرکردەیەکی وا، من سەیری ئەو منداڵ و پاڵ و هینەی بکەم؟! چۆن شتی وا دەبێت؟!

یان ئەمڕۆ ئێمە لەتەلەفزیۆندا نیشان بدرێین بڵێن: سەرکردەیەکی نێو دەوڵەتی دانیشتووە ژنەکەی چەناگەی خستۆتە سەر شانی، خەڵك دەڵێن غەریبە، کاکە مسوڵمانیەتی، هەی نەعلەتی خودای لێبێت! کوا مسوڵمانیەتی شتی وای تێدایە؟!

بە پێچەوانەوە ئەوە پێغەمبەری پێشەوای ئێمەیە، پێغەمبەری میحراب بوو، پێغەمبەری میمبەر بوو، پێغەمبەری ساحەی قیتال و جیهاد بووﷺ ، پێغەمبەری ناو ماڵ و منداڵیش بوو، ئاواش لەگەڵ خێزانی خۆیدا دەژیا و ئاوا هەڵسوکەوتێکی جوان و مەدەنیانە و ئاشتی خوازانە و ڕێك و پێکی لەگەڵ خێزانی خۆیدا دەکرد..

## دووەم: پێغەمبەرﷺ و عائیشە پێکەوە ڕادەکەن..

ئەمجا خاتوو (عائیشە) دەفەرمووێت: نمونەی دووەمتان بۆ باس بکەم، جارێکیان لە غەزا دەگەڕاینەوە، عادەتەن لەشەڕ گەڕانەوە بۆ خۆی ناڕەحەتیە، شەڕ مەینەتیە، بریندار بوونە، خوێنە، ماندوو بوونە، یەعنی تۆ دەڵێیت شەڕ. هەر لەتەلەفزیۆندا دەیبینیت لێی بێ تاقەت دەبیت.. جاوەرە بۆ خۆت لەمەیداندا بیت، جاوەرە شەڕێت کە لە چاو ڕم و شمشێر و تیر و کەواندا هەر هیچ نیە، شەڕی ئێستا زۆر ئاسانە، کابرا قومبەلەیەك دەتەقێنێت بە پێنج دەقیقە دەی کوژێت، یان نا..

ئەوە بەردەوام ئەو هەموو تەپ و تۆز و بریندار بوون، نەخەستەخانە هەبووە، نە ئیسعاف فەوری هەبووە، نە عەمەلیات هەبووە.. یەعنی بەڕاستی گاڵتەنیە گەڕانەوە لە غەزا، یەعنی بەڕاستی گەڕانەوە لە ئەوپەڕی ناڕەحەتیدا، کەچی پێغەمبەر ﷺ لەم کاتەدا حەقی خێزانی دەدات.. دەفەرمووێت: ئەی (عائیشە) با ئەو صەحابانە تۆزێك لێمان دوور بکەونەوە، جەوەکەی خۆشە و کات فێنك بووە، دەمەو ئێوارەیە و بۆ ڕاکردنێك ئەنجام نەدەین؟ موسابەقەیەك بکەین؟ سەرکردە عەسکەریەکان خەڵك ناوێرێت قسەیان لەگەڵدا بکات. ئەوانەی فەرماندەی سەربازین هەتا ژن و منداڵیش ناتوانن قسەیان لەگەڵدا بکەن.. ئەمر دەکات و دەبێت تەحیەی بۆ بکرێت و قاچ بەعەرزدا بدرێت..

پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی نەبوو، باشترین فەرماندەی سەربازی و خوتەی عەسکەری دادەنا، بەڵام کاتێك دەگەڕایەوە ناو ماڵ و خێزان، باشترین هاوسەری ژیان وەکو ئەوەی هەر جەنگی نەبینیبێت، ئەو لاپەڕەی هەڵدەدایەوە.. فەرمووی: وتم زۆر باشە.

جا دەفەرمووێت: من لەو کاتەدا سوکەڵە بووم، هەر سێ چوار چڵ ئێسقان بووم، خاتوو (عائیشە) دەفەرمووێت: من لەو کاتەدا سوکەڵە بووم، هەر ئاوام کرد پێشی پێغەمبەر ﷺ م دایەوە.. شوێنێك دیاری کرا بوو، ئەو بەردە گەورە هەتا ئەوێ ڕادەکەین

و دێینەوە.. وەلاّ هەتا پێغەمبەری خودا ﷺ ئاوای کرد، من گەشتمە شوێنەکە و هاتیشمەوە..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بردتەوە، چەند ساڵێك دوای ئەوە من لە سەفەرێکدا لە خزمەتی دابووم، دەفەرمووێت: من ئەوەم لەبیر نەمابوو.. بەلاّم پێغەمبەر ﷺ هەر لەبیریەتی، دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕاکردنێك ئەنجام نەدەین، بۆ خۆمان موسابەقەیەك بکەین؟

هەر یەکێك لە ئێمە تەحەدا ئەکەم .ئائەم زروفە شتی وامان لەگەڵ خێزنمان نەکردووە، لەو دەشتەدایە کابرا دەچێت بۆ سەیران دێتەوە، شەرپەتی بڵێ وەرە بابۆخۆمان لەو دەشتە ڕاکردنێك ئەنجام بدەین..

دەفەرمووێت: صەحابەکان دوور بکەونەوە بۆ ئەوەی ئێمە ئیسراحەتی خۆمان زیاتر وەربگرین. دەفەرمووێت: ڕاکردنمان کرد. بەس دەفەرمووێت: من قەڵەوبووبووم، دوای چەند ساڵ خاتوو (عائیشە) دەفەرمووێت: دایکم زۆری پێخۆش بوو قەڵەوببم و ئافرەتێکی جوانترم لێدەربچێت، ترۆزی و خورمای دەدامێ.. جا لەڕووی زانستیەوە ترۆزی و خورما ئینسان پێی قەڵەو دەبێت..

دەڵێت: دایکم دایمە ترۆزی و خورمای بۆ دەهێنام.. دەڵێت: منیش زۆرم لێ خواردبوو، تەواو قەڵەو بووبووم، جەستەم گۆشتن بوو.. ئا لەو کاتەدا قورس بووبووم.. پێغەمبەر ﷺ هەر ئاوای کرد و پێشی دامەوە.. من لە ڕێگا تەنگەنەفەس بووم..

دەفەرمووێت: فەرمووی: (هذه بِتِلك السَّبْقَة) ئەمجارە بردنەوەکەم، بەو جارە دۆڕاندنەم، ئەو جارە تۆ بردتەوە، ئەمجارە من بردمەوە.. ئێستا پاك لەپاك، کەسمان قەرزاری کەسمان نین.. خاتوو (عائیشە) دەفەرمووێت: ئەمە ڕێز لێنانە، بۆیە ئەمەی لەبیر دەمێنێت..

جا سەیری قورئان بکەن بەڕێزان، وەلاّهی ژیانی ناو خێزان گرنگ ترین ژیانە، ئینسان ئەگەر لە ناو ماڵ و منداڵی خۆیدا ڕێك و پێك بێت.. تام و لەزەتیش لە عیبادەتیش

دەکات. ئەگەر لە ناو ماڵ و منداڵی خۆی ئاژاوە و شەڕ و شۆڕ بوو.. نە عیبادەتیش لەزەتی لێ نابینێت، بە خودا جومعە و جەماعەتیش خۆش نیە.. حەج و عەمرەش خۆش نیە.. ژیان ئەو ژیانەیە کەلە ناو ماڵ و منداڵەکەی خۆی بە ڕێك و پێکی، بە ئەمن و ئەمان بەسەری بەرێت.. بۆیە قورئان دەفەرمووێت:

﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾﴾ الروم.

دەفەرمووێت: لە نیشانە و دەسەلآت و عەزەمەتی خودایە ئائەم هەموو مرۆڤەی لەم خاکە دروست کردووە، ئەم گڵەی ئێمەبەسەریدا دەڕۆین ئێمە لەوە دروست بووین.. (سبحان الله) ئەم هەموو خەڵکە دەڵێی مێروەستانە، بەسەر ئەم زەویەدا دەسوڕێتەوە، هەر هەمووی لەم خاکە دەخوات. خودای گەورە لەو گڵە ڕەقە دروستی کردووە، لە نەفخەی خۆی ڕۆحی بەبەردا کردووە، ئەوەتا ئەم بەشەرە جوانە، ئەو گڵە دوای دەبینەوە ئەو گڵە، لە هیچ شوێنێك جێمان نابێتەوە، ئەم ئینسانە کە مرد، لە هیچ شوێنێك جێی نابێتەوە ئەگەر ئاڵتون بێت، دەبێت ئیلا بیخەیتە خاکەوە.. چونکە سەرەتا خاکە، ئیلا لەناو خاکدا نەبێت ئیسراحەت ناکات، دەبێت تەسلیمی بەدایکی یەکەمی بکەیتەوە، ئەینا ئارام ناگرێت..

دەفەرمووێت: دوای ئەوە بوون بەو هەموو بەشەرە و بەسەر ئەو زەویەدا بلآو بوونەوە.. ئایەت و بەڵگە و نیشانەی خودایە، لە نەفسی خۆتان هاوسەرانی بۆ دروست کردوون.. ئینجا سەیری ئەم وشەیە بکەن: (لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا) جا ژیانی ژن و مێردایەتی دوو جۆرە، وشەی (سکن) لە زمانی عەرەبیدا ئیماندارانی بەرێز دوو مانای هەیە، ئەگەر وشەی (سکن) وەربگرێت، یەعنی (وقف) یەعنی وەستا، ژیانی واهەیە لە ژن و مێردایەتیدا دەوەستێت، هی واهەیە لەماڵی باوکی هیچ عەیبی نیە، کە بوون بە ژن و

مێرد لە جیاتی سوکنابن بۆ یەکتر دەبنە (سکن) دەبنە (وقف)، ژیانی یەکتر دەوەستێنن، ژیانی یەکتر تاڵ دەکەن..

پەنا بەخودا ژیانی هاوسەری ئەو دوو حاڵەتەیە: یان دەبێت (لِّتَسْكُنُوٓا) بێت، یان بە داخەوە (سکن) لەسەر مانای (وقف) دەبێت.. واتە: ژیانیان دەوەستێت. ژیانیان دەژین بە هەناسە، بەڵام مردوو لەناو جەستە و رۆحدا..

چەند ژن و مێر هەیە مردوون بەس بە هەناسە زیندوون، ئەینا ژیانیان هەمووی تاڵیە، بەڵام ژن و مێردیش هەیە (لِّتَسْكُنُوٓا إِلَيْهَا) (لِّتَسْكُنُوٓا) یەعنی (للإستراحةً عَلَيها) ئیسراحەت دەکەن بەیەکەوە، ژن و مێرد ئیسراحەت دەکەن..

ئەی (إستَئنَثَ) ئەها تەعبیرە قورئانیەکە چۆنە؟ (إستراحه) و (إستَئْنَثَة) هاودەمیان بۆ پەیدا دەبێت.. ئارام دەگرن وەکو ژیانی سەڵتی ناکەن ،هەست بە ئارامی بکەن.

بەڕێزان: کاتێك ئینسان سەڵتە پێی دەڵێن: (أعْزَب)، واتە: زگوردیە، لە کوردەواری خۆمان کە ژنی هێنا پێی دەڵێن (متزوجه) پێی دەڵێن (زوج)، ئەها ئێستا کە دەڵێن ژن و مێرد (زوج) (زوجه) لە زمانی عەرەبیدا باشە خۆ ئەم هەر بەتەنهایە، ئەی بۆ پێی دەڵێن (زوج)؟ (زوج) یەعنی جوت، (زوجه) یەعنی جوت، واتە دوان، بۆ هەر بەتەنهاشە و، کەچی لەسەر تەسکەرەکەی دەنوسرێت دوانە، واتە هەر بۆخۆی نیە، سەیری ئەم وشەیە بکە، ئەو وشەیە زۆر بە مەعنایە:

(أعْزَب) کاتێك بە تەنهایە..بەڵام کاتێك ژنی هەبوو، یان مێردی هەبوو، (زَوج و زوجة) ئەوە دژی فەردە، واتە پێچەوانەی فەردە، تاکە، واتە: تۆ بەتەنها نیت.. تازە تۆ بوویت بە دوو کەس، مرۆڤ تەنهایەکەی خۆی دۆزیەوە..

دکتۆر (علی) شەریعەتی دەڵێت: ﴿مرۆڤ ونبووی هەیە بەردەوام بەدوویدا دەگەڕێت﴾. بەڕێزان هەتا تەنانەت غەریزەی جنس، خەڵکێك پەنا بەخودا بە دوای غریزەی جنس و سێکس و ئەوانەدا دەگەڕێت بۆ تێرکردنی حەزەکانی، بەڵام خودای گەورە ئەم

غەریزەیەی بۆ دروست کردووە لە مرۆڤدا، هەوەکو غەریزەی ئاو و خواردنی دروست کردووە، ئەگەر غەریزەی برسێتی نەبوایە، تو خودا کەسمان زەرعاتمان دەکرد؟ کشتوکاڵمان دەکرد؟ نانمان پەیدا دەکرد؟ پارەمان پەیدا دەکرد..؟ نا.

ئەوە غەریزەی برسیەتیە وات لێدەکات پارشێوت لەبیرە، هەوڵدەدەیت شتێك لە ماڵتدا هەبێت.. غەریزەی ئەو جنسەش کە خودای پەروەردگار ئەو سێکسەی لەلەشی ئینساندا دروست کردووە، بە خودا بۆ هەوەس بازی و وئارەزوو بازی نیە، بۆ ئەوەیە ئینسان بە دوای ونبووەکەیدا بگەڕێت..

ئەگەر ئینسان غەریزەی تێدا نەبێت، ئەها کە عازەب بوو ئەمجا بە دووی ونبوەکەی خۆیدا دەگەڕێت.. دەڵێت نوقسانیەکم هەیە، ئەم گەنجە هیچ نوقسانی نیە، سەیارەی هەیە، پارەی بە دەفتەر هەیە، خانووی هەیە، بەس یەك شتی نوقسانە.. دەڵێت: هاوسەری ژیانم نیە.. خوێندنی هەیە، شەهادەی هەیە، جامیعەی تەواو کردووە.. بەلأم لەیەك شتی کەمە کچێك کە لەماڵی باوکی وەکو گوڵ بەخێو دەکرێت.. نەبرسیە، نە تینوە، نەبەرگی نیە، وانیە؟ کچی واهەیە، سەیارەی هەیە، خانووی هەیە، ڤێلای هەیە.. کەچی یەك شتی نوقسانە هاوسەری نیە، بەدووی ون بوەکەیدا دەگەڕێت.. ئەم کچە دایمە بیر دەکاتەوە ونبوەکەی خۆی دەگەڕێت، بیدۆزێتەوە.. کوڕەکە لە هیچی کەم نیە، بەس ونبویەکی هەیە، کە هاوسەری ژیانی نیە..

## ئادەم بەدوای ونبوەکەی دەگەڕێت

بەڕێزان: بۆیە (ئادەم) لەبەهەشتدا، لەبەهەشتدا ئینسان هیچ نوقسانی هەیە؟ نەخێر، لەبەهەشتدا ئینسان چی هەیە؟ کێ دەزانێت؟!

فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ باسی وەسفی بەهەشت دەکات، چ بەڕێزێك لەبەریەتی؟ وەسفی بەهەشت، بەڕێزان یەك فەرموودەی شیرین هەیە، دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أعْدَتُ لِعِبادي الصالحين ما لاعَينٌ رأت وَلا أُذُنٌ سَمعتْ وَلا خَطَر

علی قَلب بَشَر) لە پەروەردگار دەپاڕێینەوە و دەڵێین: یارەبی خودایە بەنسیبمان بکەیت..

خودای گەورە فەرموویەتی: ئامادەم کردووە بەهەشتێك بۆ بەندەکانم، هەتا ئێستا، هەتا ڕۆژی قیامەت، هیچ چاوێك نەیبینیوە.. هی واهەیە زۆر دونیا گەڕاوە، دەڵێت چوومە سوید و باشوری نەرویج و مامۆستا دانیمارك هەر سەوزاییە، ئای وڵات ئەوێیە، وەڵاهی هیچ چاوێك ئەوەی نەبینیوە، کەلەبەهەشتدایە هیچ چاوێك هیچ حەدیقە و پارك و سەوزایی و خۆشاییەك، چاوی مرۆڤێك، هەتا قیامەت لەسەر ئەم زەویە نەیدیوە..

چەندی گوێ خۆشی بیستبێت، هیچ گوێیەك ئاوازەکانی بەهەشتی نەبیستووە، هەرچەندە دڵت خەتەرە بکات ئەم شەوی (قدر)ە بۆخۆت دابنیشە، بڵێ چ خۆشە لەژیاندا، یەك قائیمەی گەورە، تەسبیحێکی یەك هەزار و دەنکیت پێ بێت شت بیژێرە، ئەمە خۆشە و ئەوە خۆشە، ئەمەم هەبێت و ئەوەم هەبێت..

وەڵا ئەوەی لەبەهەشتدا هەیە، بەخەتەرەی دڵتدا نەهاتووە، هێشتا بەخەتەرەی دڵیشتدا نەهاتووە، هەرچی بەخەتەرەی دڵی تۆدا بێت لەبەهەشتدا خۆشتر هەیە، ناتوانی بەخەتەرەی دڵیشتدا بێت.. دەفەرمووێت: ئەوەم بۆ بەندەکانم ئامادە کردووە، (ئادەم) پێغەمبەر لەو بەهەشتەدا بوو، کە ئینسان ناتوانێت و تەوەقوعی لێ ناکات و خەیاڵیشی لێ ناکات.. کەچی (سبحان الله) ئەو (ئادەم)ە لەو بەهەشتەدا وەڕەس بوو، هیچ ئینسانێك لەبەهەشتدا نەبووە.. یاخودا لەبەهەشتدا بیت کەچی لەبەهەشتدایە و دڵی ئارام نیە، کاتێك کە هاوسەری ژیانی بۆ دروست بوو، دایکە (حەوا) ئەمجا حەسایەوە، ئەمجارەکانێ هەستی بە ئارامی کرد، حەوایەوە..

بۆیە (مەحوی) شاعیر ڕەحمەتی خودای لێبێت (مەحوی) شاعیر زۆر جوان فەرموویەتی:

(لەکن من ئەصلی نیە و نەبووەعەیشی تەنها خۆش

نیە بەهەشتی خودا هەم بەبێ ئەحیبا خۆش)

هەتا بەهەشتی خودا بەبێ هاوسەر خۆش نیە، بۆیە لە قورئاندا کە باسی بەهەشتمان بۆ دەکات ﴿هُمْ وَأَزْوَاجُهُمْ﴾یس. خۆتان و هاوسەرەکانتان لەبەهەشتدان لەبەهەشتیشدا نابێت ژیانی زگوردی هەبێت، لەوێدا هاوسەرەکان بەیەك شاد دەبنەوە، چونکە چۆن لە دونیادا دابڕان ناخۆشە، لەبەهەشتدا لەهیچت کەم نیە، بەلام لەژنەکەت کەمە، ژن لە مێردەکەی کەمە، بۆیە دوای ئەوەی لەبەهەشتدا هاتنە خوارەوە بۆ تاقیکردنەوەکانی سەر زەوی، (ئادەم) لە (هندستان) کەوتە خوارەوە، (هندستان) لانکەی یەکەمی مرۆڤایەتی، دایکە (حەوا) لە (جِدە)ی عەرەبستانی (سعودیە)، (جِدە) لە دایە گەورەوە هاتووە، لە کێوی (عرفات)دا (عرفات) شاخی یەکتر ناسینەوە..

بەلام (سبحان الله) سروشتی ئافرەت و پیاو لەوێدا دەردەکەوێت، (ئادەم) لە (هندستان)ەوە شار بە شار و دۆڵ بە دۆڵ گەڕاوە لە دوی ونبووەکەی، بەلام ژن خۆڕاگرترە (حەوا) هەر لە (جِدە) وە چۆتە (عەرەفات) و ئەوانەی جەنابتان چوونە حەج و عەمرە بینیوتانە، بەینی(جیددە) و (عرفات) نازانم چەندە، خودای گەورە بەنسیبی ئێمەشی بکات.. (إنشاءالله) ئالەوێدا سەیر بکە (ئادم) زۆرتر گەڕا، لەتەفسیردا بینیومە دەفەرمووێت: (ئادەم) وتی: حەوا بیرت دەکردم؟ دەڵێت: سەرێکی داخست و وتی: نەء..

دەڵێت: ژن دەیشارێتەوە، زۆر جار مێردەکە بە ژنەکە دەڵێت خۆشتدەوێم؟ دەڵێت: نەء، بەلام لە ناخەوە بۆی دەسوتێت، ژن دایمە وایە، بەلام پیاو زیاتر خۆشەویستی دەردەبڕێت، ژن کەمتر، ژن کەمتر خۆشەویستی بۆ پیاو دەردەبڕێت.. بەلام لە ناخەوە زیاتر بۆی پەرۆشە، بەلام بە سروشتی خۆی وایە، پیاو زیاتر موشتاقی ئافرەتە، ئافرەت ڕەنگە شەرمەکەی زیاتربێت و ئیتر ئەوە قەدەری خودای پەروەردگارە..

مێژووی ئیسلام بەڕێزان پڕە لە خۆشەویستی، پڕە لە ڕێز و حورمەت، ئائەم زەواجەی ئێستا کەئێمە هەمانە، تو خودا چ بەرەکەتێکە؟!

ئەم ئیسلامە ئەها ئەم شەو شەوی قەدرە، شەوی قەدر، رێز، وەلاّمی بەرێزان شەوی قەدر گەورەترە لەوەی کە ئێمە بیری لێبکەینەوە.. ئەم (لیلە القدر)ەئەمشەو رێزی بە مرۆڤ بەخشی، شەوی قەدر بۆ بەرێزە؟ کێ دەزانێت؟ بۆ ئەمشەوە بەرێزە لەناو هەموو شەوی ساڵدا؟ بەڵێ، لەبەر نزولی قورئان ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ۝١﴾ القدر.

ئەمشەو بۆیە بەرێزە، لەبەر دابەزینی قورئان.. دەی نزولی قورئان هەر دوعاو و نوشتە و ئەوانەیە؟ نەخێر بەرێزان، قورئان کە هات رێزی بە مرۆڤ بەخشیەوە.. جارێکی تر مرۆڤ مرۆڤایەتی لەدەستدا بوو، قورئان هات گێرایەوە بۆ ڕەسەنایەتی خۆی، بۆ بەشەریەتی خۆی، بۆ ئاسودەیی خۆی، بۆ قەدر و رێزی خۆی..

ئێستا کە بەشەریەت پشتی لە قورئان کردووە، خۆشەویستان جارێکی دیکە مرۆڤایەتی پێویستی بە شەوی قەدرە، بەشەوی نزولی قورئانە.. نزولی قورئان بۆ ناو ماڵەکانمان، بۆ ناو دڵەکانمان، قورئان هاتە سەر زەوی، بەس ئێمە جارێکی تر زەرورە، نازڵی قورئان بۆ ناو دڵەکانمان بکەینەوە، بۆ ناو کردەوە کانمان، بۆ ژیانی هاوسەریمان، بۆ ماڵ و حاڵمان..

من تکام وایە شەوی قەدر بەس بەوە تێمەگەن، دوو سێ سەعات نەخەوتوون، کوڕە هی واهەیە شەو ناخەوێت.. ئەمە هیچ گرنگ نیە نەخەوتن، گرنگ ئەوەیە ئێمە لەم شەوەدا بڕیار بدەین، یانزدە مانگی داهاتوو قورئان نازڵ بکەینەوە ناو ماڵەکانمان.. ئەمشەو (الحمد لله)خۆمان تێدا گۆڕیوە، زۆر موشتاقین، هەموو حیزبێك هەموو پرۆگرام و یادێك، ڕێکخراو، نازانم چی.. ڕۆژی دامەزراندنی خۆی هەیە، ئەها هەموو موشتاقەکانی ئەندام و ڕێکخراوەکان، لایەنگرەکانیش خۆیان ئامادە دەکەن..

ئەوە تەپڵ و دەهۆڵ و زوڕنا لێدەدەن، سرود دەخوێننەوە، وتار دەخوێننەوە، (الحمد لله) ئێمە یادی دامەزراندنی ئیسلامەکەمان ئەم شەوە، ئەم شەوی نزولی قورئان.. ئێمە یادی دامەزراندنی ئیسلام دەکەینەوە، دەبێت زۆر بە شەوق و زەوق بین. بەڵام بە چی؟ بە زیکری: (سبحان الله الحمد لله ولا إله إلا الله و الله أكبر)

قورئان خوێندن بە رێز و حورمەتەوە لەیەکتر، بەوەی کە چوونەوە ناکۆکی لابەن نێوانی خۆتان، ئەی ئەو ژنە بەرێزەی گوێت لە دەنگمانە، تۆش لەگەڵ مێردەکەتدا ناکۆکیت، هەر ئەمشەو داوای گەردن ئازادی لێبکە.. بڵێ پیاوەکە با ئەو ژیانە کۆتایی پێ بهێنین، با قەدر بگێڕینەوە، چونکە خەڵکێك ئەمرۆ موشتاقە بەم قەدرەی ئێمە.

## دوای منداڵ بوون زەواج دەکەن !!

من ئێستا ئەو ئامارەم لەبەردەستدایە، ئەمە تازەترین ئامارە، خوشکێکی بەرێزمان مامۆستای زانکۆیە دکتۆرە (نەزاکەت)، ئەمە لەبەریتانیا مامۆستای زانکۆیە و کوردە، خەڵکی سلێمانیە، ئا ئەم راپۆرتەی ئامادە کردووە.. دەڵێت:

لەوڵاتی بەریتانیا، کە بۆ خۆی ئێستا لەوڵاتی بەریتانیایە، لە شاری لەندەن مامۆستایە، مامۆستای زانکۆیە بەرێزان: دەڵێت ژیانی خێزانی لەوێ هەڵوەشاوە، ئەم بۆ خۆی رۆژانە لە ناو خەڵکەکەدا دەژی، دەڵێت کوڕ و کچم بینیوە چەند ساڵ بەیەکەوە لەشوقەیەکدان تا ئێستا ژن و مێرد نین، بەیەکەوە رادەبوێرن.. ئەگەر یەکترمان بە دڵ بوو دوای چەند ساڵ دەیکەین بە هاوسەرایەتی و عەقدی زەواج دەبەستین.. ئەگەر یەکترمان بە دڵ نەبوو، تۆ رۆژێك بچۆ کاسپی بکە و منیش کاسپی دەکەم. شەوێ بەیەکەوە دەخەوین.. تۆ قاپێك بهێنە، من کەوچکێك، تۆ قاپێکی شلە من بەلەمێکی برنج، تۆ پشتیەك و من سەرینێك، ئەگەر هەر وەختێك لەیەك وەرەس بووین، هەر یەکەمان بۆ ماڵی خۆی، تۆ بۆ شوقەیەکی دیکە، منیش بۆ شوقەیەکی تر..

دەڵێت: رۆژێك کە دەچووم بە دوای منداڵە بچوکەکەمدا کە لە رەوزە بیهێنمەوە، دەڵێت منداڵێکم بینی دوو ساڵانە، بە باوەشی دراوسێیەکمانەوەبوو، منداڵەکە دیار بوو زۆر نارەحەتی کردبوو.. ئافرەتەکە بە ئینگلیزی دەیوت: ئافرەتێکی ئینگلیز بوو وتی: منداڵێکی چەند ئیزعاجە.. وتم: دیارە دایك و باوکی بۆ تۆیان بەجێهێشتووە وریای بیت. وتی بەڵێ ئەمرۆ چوون زەواج بکەن، ئەمرۆ لە مەحکەمە لەیەك مارە دەکرێن!!

ئەی وتم: تۆ نالێیت ئەو منداڵەیان بە جێهێشتووە؟! وتی: ئەوە ئەم منداڵەشیان بووە دوو ساڵە، ئەمڕۆ بڕیاریان داوە ببن بە ژن و مێردی ڕەسمی، یەکتریان تاقیکردۆتەوە، ئەو منداڵە تا ئێستا دایك و باوکی نیە، لە تەسکەرەدا وجودی نیە، هەر حکومەت بۆ خۆی ئاوا بەخێوی دەکات. ئەمڕۆ بڕیاریان داوە..

دەڵێت: خەڵکم بینیوە من لە کۆنگرەدا، ئەو مامۆستا بەڕێزە، دکتۆرە نەزاکەت دەڵێت: دەعوەت کراوم بۆکۆنگرەی لاوان، خەڵکی لێبووە هەژدە ساڵ، منداڵەکەی وتوویەتی ئەمڕۆ لەگەڵ دایکمدا دەچم بۆ مەحکەمە، ئەمڕۆ عەقدی زەواجەکە ئیمزا دەکەن، تا ئێستا بە ناشەرعی بەیەکەوەن، هەژدەساڵە منداڵەکەی عەقدی زەواجی نیە! بۆ ئەوەی هەر وەختێك لەیەك وەڕەس بووین، کێشە نیە، تۆ بڕۆ منیش دەڕۆم!

دەڵێت: چەندین منداڵ هەن لە وڵاتی بەریتانیا، کە وڵاتێکی پێشکەوتووی عالەمیە، ئەم منداڵانە کوڕ و کچ، هەیانە باوکی دیارە دایکی دیار نیە، لە تەسکەرە نوسراوە فلان کەس کوڕی فلان کەس، کچی فلانە کەس، بەڵام نازانن دایکی ناوی چیە؟ هەیە دایکی دیارە، بەڵام تا ئێستا باوکی دیار نیە.. لەسەر تەسکەرەش، ئەوە لە بەریتانیا بەڕێزان پێیان دەڵێن: (سینگڵ پارێنت)، واتە: ئەو منداڵانەی یەك باوانیان هەیە، باوکی هەیە بەڵام کەس نازانێت دایکی کێیە؟ دایکی هەیە بەڵام نازانن لە کام باوکە؟! گرتوویەتی پەنا بە خودا، هەر پێشیان عەیب نیە..

دەڵێت: بەئامار لە ساڵی (٢٠١١) دا، کۆتایی دوو هەزار و یازدە، واتە: ساڵی ڕابردوو، دوو ملوێن (سینگڵ پارێت) هەیە، دوو ملوێن لەتەسکەرەدا، باوکی هەیە و دایکی نیە، دایکی هەیە و باوکی نیە.. "پەنا بە خودای پەروەردگار" تۆ سەیر ئەی ئێمە چەند بەختەوەرین، لەسەر تەسکەرە ناوی باوك و کورە باپیرت و حەوت پشتت بخوێنەوە.. حەفتا پشتت دەزانیت. ئەی دایکت دایە گەورەت دایە گەورەی هینت، بنەماڵەی فلانە کەست، حەوت پشتی خۆت دەناسیت..

وەڵاهی بەرەکەتی شەوی قەدرە، بەرەکەتی ئەو قورئانەیە، کە لەم شەوەدا نزول بووە، قەدری بۆ مرۆڤایەتی گێڕایەوە، بەڕێزان: ئەوە بەرەکەتی قەدرە، ئەوە شەوی قەدر ئەم بەرەکەتەی بەئێمە بەخشیوە.. تو خودا ئەمە بەختەوەری نیە؟!

## هەواڵێکی سەیر!

دەڵێت لە کەناڵی (بی بی سی) کوڕ و کچێکی نیشان داوە، چەند ساڵێك بەیەکەوە بوون، پێیان دەڵێن بە داخەوە ئەو وشە ناشرینە (کەپڵ) کەپڵی بووە.. دوای ئەوە بڕیاری هاوسەریان داوە، ئینجا فەحسی خوێن، لەبەر نەخۆشی و ئەوانە، لەئەنجامی پشکنینی پزیشکیدا دەکەوتووە ئەم کوڕ و کچە خوشك و بران.. خوشك و بران! ! ئەوە کەناڵی (بی بی سی)، لە ئەرشیفدا هەیە، خوشك و بران! !

بەڵام چۆن خوشك و برایەك؟ کاتی خۆی دوانە بوون، بە یەك سك لەدایك بوون ئەم خوشك و برایە، بەڵام ئەمانە چونکە دایك و باوکیان زەواجی شەرعیان نەبووە، بۆ ڕابواردن بەیەکەوە بوون، کە منداڵەکانیان بوون، داویانن بە حکومەت، حکومەتیش داویەتی بە کەسێك، یەکێك حەوزی لە کوڕ بووە، ئەویش حەزی لە منداڵی کچ بووە، وەرە ئەمانە ناوی دایك و باوکیان نەبووە، لە پشکنینی خوێندا فەحس کراون.. ئەمجا ئەصڵەکەی خۆیان دۆزراوەتەوە، کاتی خۆی بەیەك سك لەدایك بوون، خوشك و بران، چەند ساڵ بەیەکەوە ڕادەبوێرن، زینا دەکەن، پەنا بە خودا، لە وڵاتی ئێمە ئەو شتانە نیە، ئەوە قەدرە، قەدری مرۆڤ، بەس تو خودا پێم بڵێن ئاژەڵ و ئەوە فەرقی چیە؟! هیچ فەرقێکی هەیە؟ ئاژەڵ شتی واناکات..

## توتی تەعزیە دەگێڕێت

دەزانن بەڕێزان: ژیانی توتیم خوێندەوە.. توتی ئەوەیە کەدەڵێن دوو سێ وشە فێر دەبێت، دەزانن ئەو توتیە چەند بەوەفایە، قەت ئەو مرۆڤانە بەقەدەر توتی وەفادار نین. دەڵێت توتی کە مێیەکەی مرد، چل دانەشەو مەگەر تۆزێك ئاو بخواتەوە، ئەینا تەعزیە

بار دەبێت!! چل دانە شەو ئەو توتیە خەریکە خۆی دەکوژێت لە تاوی هاوسەرەکەی! جا مێیەکە بێت یان نێرەکە، ئەمجا بە هیچ شێوەیەك قبوڵی نیە، دەڵێت نێرەکە قبوڵی نیە مێیەیەکی تر بێتە قەفەزەکەیەوە! بەیەکەوە هین بن..

دەڵێت من یەك ژنم بەسە، مێیەکە قبوڵی نیە نێرەیەکی تری بۆ بخەیتە ئەو قەفەزەوە، قبوڵی نیە، دەڵێت بەیەکەوە یەك ژیانی هاوسەرین..

ئەها سەیری ئەو توتیە، ئەوە دەزانێت ژیانی هاوسەری چیە، ئەوانە ئەوەشیان لەبیر چۆتەوە، چونکە لە ڕێبازی ڕاستی مرۆڤایەتی، لە پەیامی خودا دوور کەوتوونەتەوە، دەی ئێمە بەڕێزان ئەمە قەدری ئیسلامە کە پێی بەخشیوین..

ئەها پێغەمبەری خودا ﷺ بەڕێزان وەکو مرۆڤ، پێغەمبەری ئێمە یەك ژنی هێناوە، بەس خاتوو (خەدیجە)، دوێنێ کابرایەك پرسی وتی: زۆر جار بێ دینەکان هەموومان دەوروژێنن.. ئەی پێغەمبەری خوادا ﷺ نۆ ژنی هەبوو، بەڵێ پێغەمبەری ئێمە یانزە ژنی هەبووە، بە کوێرای چاوی دوژمنانی ئیسلام، ئیتر هیچ پێشمان شەرم نیە و ئەوەی فەرموویەتی لەسەر سەرمانە..

کاتێك کە وەفاتی کردووە لە بوخاریدا دەفەرمووێت: پێغەمبەری خودا ﷺ نۆ ژنی لە دوا بەجێ ماوە، هەر کەسێك پێی خۆش نیە پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر کەس پەکی نەکەوتووە، ئێمە بە هەموو شتێکەوە قبوڵمانە، ڕابەر و تاجی سەرمانە..

### ٢٥ساڵ، یەك خێزانی هەبوو

بەس بەڕێزان ڕوونکردنەوەش باشە پێغەمبەری خودا ﷺ وەکو پیاو، وەکو ئینسانێکی ئاسایی، وەڵاهی لەیەك ژن زیاتری نەبووە، کە خاتوو (خەدیجە)یە، ئینسانێکی ئارەزوو باز نەبوو، بە پێچەوانەوە، نرخی هاوسەرایەتی دەزانی، پازدە دانە ساڵ خاتوو (خەدیجە) لە خۆی گەورەتر بووە، پێشتر دوو شووی کردووە،چرچ و لۆچ لە دەم و چاویدا پەیدا بووە..

پێغەمبەر ﷺ جوانترین گەنجی بیست و پێنج ساڵی، تو خودا ئەگەر ئینسانێکی ئارەزوو پەرست بوایە، بێوە ژنێکی چل ساڵی دەهێنا؟! ڕۆژێك لە ڕۆژان بیری لە ژن هێنان نەکردەوە، تا خاتوو (خەدیجە)ش وەفاتی کرد، چەند ساڵ لەگەڵ خاتوو (خەدیجە)دا ژیا؟ کێ دەزانێت؟ بەڵێ.. بەڵێ.. بیست و پێنج دانە ساڵ!!

ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ بیری لە ژن هێنان نەکردەوە، بڵێ ژن دێنم، ئەو هەموو کچە خۆی پێشکەش کرد، پێغەمبەر ﷺ هەموو ڕەفز کردەوە.. فەرمووی:

خاتوو (خەدیجە) بەهیچ ئافرەتێك ناگۆڕمەوە، پازدە ساڵ لەخۆی گەورەترە، بەڵێ بەڕێزان بیست و پێنج دانە ساڵ ئەمانە ژن و مێردبوون!! چەند کوڕی لێبوو؟ یەك کوڕ، نا.. بە پێچەوانەوە شەرم مەکەن، تو خودا مەڵێن ژیانی پێغەمبەر ﷺ نازانین.. چەند کوڕی لێبوو لە خاتوو خەدیجە بەڵێ نەخێر ناوەکانیانم بۆ بڵێ (ابراهیم) بەڵێ دوا منداڵی (ابراهیم) (قاسم) پێی وتراوە (ابوالقاسم).. بەڵێ (عبد الله)، کێی کە؟ (طیب و طاهیر)، هەردوو ناوەکەی هەبووە، چوار دانە کوڕی هەبووە..

تو خودا بەڕێزان شەرم دەمانگرێت لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ بێ ئاگاین، ئێستا بپرسم کام یاریزان بردویەتیەوە ئەمشەو لە یانەی سلێمانی، هەموومان دەزانین، سلێمانی بردەیەتیەوە.. گۆڵچیەکەی کێ بووە؟ یاری کەرەکە کێ بووە؟ تو خودا حەیفە، تو خودا ژیان نامەی پێغەمبەری خودا ﷺ بخوێننەوە..

## فاتمە چی پێغەمبەرە ﷺ ؟

باوەکو ئەو باسەمان لێ نەیەت کە (محمدی عورەیفی) دەڵێت: عارەقی شەرمەزاریم کرد لە زانکۆیەکی ئیسلامیدا کە لە تەلەبەی جامیعەی خۆمم پرسی لە قۆناغی دووی کولیەدا وتم (فاطیمە) چی پێغەمبەی خودایە ﷺ؟ وتی: ژنیەتی.. (نَعوذُ بِالله) کوڕی مسوڵمان لە جامیعەی ئیسلامیدا!! لە پۆلی دووی کولیە! وابزانێت (فاطیمە) ژنی پێغەمبەری خودایە ﷺ، دەڵێت: یەکسەر تەزووی شەرمەزاری بە دەممدا هات، وتم: ئەی

هاوار ڕۆژێك چۆن ئەم ئومەتە بچێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، نەزانێت کچەکەی ناوی چیە؟ و ژنەکەی ناوی چیە؟!

بەڕێزان: ئەی کچەکانی؟ ناویان (زەینەب) ڕەحمەتی خوداتان لێبێت بەڵێ (ئوم کەلسوم)، بەڵێ.. بەڵێ.. (زەینەب)مان وت، (فاطیمە)، بەڵێ (ڕوقیە)، چوار کچ بەڵێ ئەم منداڵانە بەس (ئیبراهیم)ی لێ دەربکە، هەموویان لە (خەدیجە) بوون، لەو دایە گەورەمان..

پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆژێك لە ڕۆژان بیری نەکردەوە ژن بهێنێت، ئەی بەڕێزان بۆ ئەم ژنانەی تری هێنا، ئەوە پێغەمبەری خودا ﷺ پێشەوایە، پێشەوا پێشەوایە بۆ پیاوانی ئومەتی پێشەوایە، بۆ ئەو کەسانەی ئافرەتێکی وەکو (أُمّ سلمە) کۆمەڵێك هەتیوی هەیە.. دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: با ئەم منداڵانە بێ باوکیان پێوە دیار نەبێت. ئافرەتێك نەچێت کاسپی بکات.. لەبەر خاتری منداڵەکانی، ئەم منداڵانە دەبێت سەرپەرشتیان هەبێت.. باوکیان لە غەزادا شەهید بووە، پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم پیرە ژنە دەهێنێت..

دەڵێت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بە خودا من کەڵکی سەرجێگایم پێوە نەماوە، وەلاهی من ئارەزووی جنسم نەماوە.. پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: من لەبەر خاتری ئەو منداڵانە ژیانی هاوسەری لەگەڵ تۆدا دەکەم. ئەی پێغەمبەری خودا غیرەم هەیە و توڕەیم هەیە.. دەفەرمووێت: (إنشاء الله) خودای گەورە لەسەرت لادەبات. منداڵەکان با هەست بەبێ باوکی نەکەن.. ئایا ئەمە شەرمەزاری نیە یەکێك بڵێت ئایا پێغەمبەری خودا ﷺ چەند ژنی هەبووە؟! نەخێر.. ئەمەی هێنا کەسێك بڵێت خەزورم دوژمنمە، ئەگەر خودا نەخواستە لەگەڵ خەزورتدا توشی دوژمنایەتی بوویت، دەبێت ژنەکەت تەڵاق بدەیت.. ئەها ئەمە بیرکردنەوەیە، ئەگەر ڕۆژێك لەگەڵ خەزورتدا شەڕە تەقەت لەبەیندا دروست بوو، دەبێت ژنەکەت تەڵاق بدەیت؟ نا..

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کابرای جولەکەدا، یەکێك لە ژنەکانی پێغەمبەر ﷺ باوکی جولەکەبوو.. کێ دەزانێت کێ بووە؟ ناوی چی بووە؟ دەی بەڕێزان: خاتوو (صەفیە)، خاتوو (صەفیە) باوکی جولەکە بوو، لە دوژمنانی پێغەمبەر ﷺ بوو.. پێغەمبەر ﷺ ژیانی هاوسەری لەگەڵ ئەم کچە جولەکەدا پێکهێنا.. دروستە خەزورت دوژمنت بێت و ژنەکەت لەماڵی خۆتدا بێت. ژیانیش هەبێت..

بەڵێ چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ نمونەی ئەوانەشە، باوکی لەشەڕدا کوژرا، کچەکەشی هاوسەری پێغەمبەری خودا ﷺ بوو، جا دەفەرمووێت: وتی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەزانیت جاری واهەیە ژنەکانت تەعلیقم لێدەدەن، پێم دەڵێن تۆ جولەکەیت..

فەرمووی: تۆش جوابیان بدەوە، خۆ تۆش زمانت نەبەستراوە، بڵێ من باوکم ﴿هاروون﴾ە، مامم ﴿موسا﴾یە، مێردەکەشم ﴿محمد﴾ە، من سێ پلە لە پێش ئێوەوەم. من باوکم پێغەمبەرە، مامم پێغەمبەرە، مێردم پێغەمبەرە، ئێوە بەس مێردتان پێغەمبەرە.. بڵێ من سێ جار پلەی پێغەمبەرایەتیم هەیە.. ئێوە یەکجار پلەی پێغەمبەرایەتیتان وەرگرتووە، کە هاوسەرەکەتانە!! (سبحان الله)، وتی: بەوە ڕەدیان بدەوە..

بەڕێزان: ئیسلام ئەو قەدرەی هێنا، ئایا دروستە پیاوێك تەمەنی هەبێت و ژنی گەنج بهێنێت و خۆشبەختیش بن بەیەکەوە؟ بەڵێ.. وەکو پێغەمبەری خودا و خاتوو (عائیشە) هیچ گرفت نیە، ئایا دروستە ژنێك بهێنیت و کاتێك کە چویتە ژوورەوە بۆ ژیانی هاوسەری یەکەم شەوی پەردەت بێت.. بڵێ پەنات پێدەگرم لەبەر خودا وازم لێبهێنە، تو خودا ئەمە فیتنەی لێ ناکەوێتەوە لە ناو ئەم عەشایریەی ئێمەدا؟ وەڵا ئەمە پیاو کوشتنی لێ پەیدا دەبێت.. دەڵێت مەعلوم نیە ئەمە کچ بوویێت؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ ئافرەتێکی هێنا، کە چووە ژوورەوە، وتی: پەنات پێدەگرم تو خودا وازم لێبهێنە، حەزم لە ژیانی هاوسەری نیە، هەر پەشیمان بوومەوە لە شووکردنم پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (اِلحقی باهلِك) ئاساییە، بڕۆرەوە بۆ لای کەس و کارت، یەك

قسەی ناخۆشی پێ نەوت.. ئایا ئەمە ئەگەر پیاوێك ئەمەی لێ قەوما، دەبێت خەڵك لۆمەی بکەن؟ نا.. ئەمە بەسەر پێغەمبەرەکەتدا هاتووە..

ئەها پێغەمبەر ﷺ بەڕێزان ئەو ژنانەی هێناویەتی ئاوا بووە، بۆ ئەوەی نمونە بێت. هەر یەکێك قەدری هێنایەوە بۆلای خێزانەکان، شەوی قەدرە، شەوی ڕێز و حورمەتە..

## هۆکارەکانی کێشەی خێزان:

### هۆکاری یەکەم

بەڵێ خۆشەویستان: کاتێك کێشەی خێزانی دروست دەبێت، خەڵك پەنا دەبات بۆ **نوشتەی ناشەرعی**، نوشتەیەك بەقەدەر قۆڵێك دەبێت، پێی دەڵێن نوشتەی باڵا، خەڵك هەبووە، ژن هەبووە، وتوویەتی: مامۆستا بە داخەوە دەڵێم وشەی مامۆستا و شێخ و ئەوانە دروست نیە بۆ ئەوانە بەکار بێت.. ئەوانە فاڵچین، نوشتە نوسن، تێکدەری خێزانن.. حەق وایە حکومەت ئەوانە کەلەبچە بکات، ڕسوایان بکات.

ژن چووە وتوویەتی مێردەکەم بۆم خراپە، وتوویەتی: نوشتەی باڵات بۆ دەکەم، بەڵام بە پێنج وەرەقە و بەشەش وەرەقە!! نوشتەی باڵا! لەبەر پێیەوە دەپێورێت بەوەرەقە، هەتا تەپڵی سەری بۆ پڕ دەکەمەوە.. جا وتوویەتی حەفتەیەکم پێدەچێت جا کەهاتیتەوە، دە وەرەقە بهێنە، ئەمجا لە کوێ داینێ؟! لە قەبرێکی ڕزیو!! مێردەکەت بۆ چاك بکاتەوە.. تو خودا ئەمە یاری کردن نیە بە مرۆڤایەتی، بەناوی نوشتە و هینەوە، خەڵك ئەی پەنا نابەن بۆ خودا، پەنا نابەیت بۆ ژیان نامەی پێغەمبەری خودا ﷺ، بزانیت پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ خێزانەکانیدا چۆن بووە..

### هۆکاری دووەم:

بەڕێزان: **ڕەفیقی خراپ**، چەند ژن ڕەفیقی خراپ سەری لێ تێکدا، ژن هەبووە وتوویەتی ئەوەندە دەم مەدە بە مێردەکەتەوە، مێرد چیە؟ ئەوەندە ڕووی دەدەیتێ، پیاو هەبووە بە پیاوی وتووە: ژن چیە؟ ئەوەندە قەدر و حورمەتی دەگریت.. ئەها ئەوە

ڕەفیقی خراپە، ﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ۝٦﴾ شەیتان وەسوەسەیە، بەڵام مرۆڤی خراپ ڕاستەوخۆ دێتە ژیانی هاوسەریتەوە، تێکی دەدات..

ئیمامی (عوسمان) دەفەرمووێت زیناکار، حەز دەکات هەمووکەسێك وەکو خۆی زیناکەر بێت.. هی واهەیە ماڵی شێواوە حەز دەکات لە هەموو کەسێك بشێوێت، لەبەرئەوە ژنی مسوڵمان دەبێت، وریا بێت، پیاوی مسوڵمان دەبێت وریا بێت.. دەبێت خۆش باوەڕ نەبیت.. بە هەموو کەسێك..

### هۆکاری سێهەم:

ژینگەی دەوروبەر، پیاو لە بازاڕدا زەرەری کردووە، لە دائیرەدا تووڕەیان کردووە، موعامەلەکەی بۆ نەکراوە، ڕەفیقێك قسەی ناشرینی پێ وتووە، کە هاتەوە هەمووی بەسەر ژنەکەیدا دەڕێژێت.. ژنە لە ماڵەوە منداڵەکانی تووڕەیان کردووە، بێ گوێیان کردووە، ژنە دراوسێکە قسەیەکی کردووە، نەبوونی و نەداریەك هەیە، کابرای داماو دێتەوە ئاگای لە هیچ نیە، هەموو ڕقەکەی خۆی بەسەردا دەڕێژێت.. نا، با ئەو ڕقانە بەسەر یەکدا نەڕێژین..

دکتۆر (عبداللە) پەشێو قسەیەکی زۆر جوانی هەیە دەڵێت: ﴿ئەگەر سێوێکم هەبوو لەتی دەکەم، لەتێك بۆ من لەتێك بۆ تۆ، ئەگەر بزەیەکەم هەبوو، بەشی دەکەم، بەشێك بۆ من بەشێك بۆ تۆ، ئەگەر خەمێکم هەبوو، بەشت نادەم، هەموو بۆ خۆم﴾

بەڵام بە داخەوە مێردی واهەیە بەس لە خەمدا ژنەکەی شەریکیەتی، ڕۆژ تا ئێوارە لە خۆشی بێت ئەم ژنە نازانێت، یەك ڕۆژ لەو خۆشیە بەشی نادات، بەس خەمێکی هەبێت لەگەڵ ژنەکەیدا بەشی دەکات. ژنی واهەیە هەزار خۆشی هەبێت، لەگەڵ مێردەکەیدا بەشی ناکات، بەڵام خەمی هەبێت دەبێت نیوەی بۆ مێردەکەی بێت.. لە بزەکاندا بەشی بدە، لە سێوەکاندا بەشی بدە، بەس ئەگەر خەمت هەبوو، هەمووی بۆ خۆت بخۆ، بەشی

هاوسەری ژیانت مەدە.. ئەو شیعرەی (عبدالله) پەشێو دەبوایە هەمووماں لەبەرمان بوایە..

## چونە ماڵەوە سەلام بکەن

چارەسەر گەڕانەوەیە بۆ خزمەت پەروەردگار، بۆ خزمەت پێغەمبەری نازدار ﷺ، کە فەرمووی: هەر کاتێك چوویتەوە ماڵەوە سەلام بکە.. سەلام کردن یەعنی ژنەکە ئەگەر من تورەش بم هیچم لەدڵدا نەماوە، (سلام علیك) ژنەکە چۆنی، ژنەکە بڵێت: یا خودا بەخێر بێیتەوە، ئەوە پەرداخێك ئاوی ساردە، بزانە یەکسەر موشکیلە نامێنێت..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕۆڵە (ئەنەس) (یا بنی) ڕۆڵەکەم، کوڕە شیرینەکەم، (ئەنەس) دەدانە ساڵ لە ماڵی پێغەمبەردا بووە ﷺ، دە دانە ساڵ هاوڕێی شەو و ڕۆژی، فەرمووی: (ئەنەس) گیان (إذا دخلت الي أهلك) وەختێك چوویتە ماڵەوە، هەر وەختێك چوویتە ماڵەوە (فسلم) یەکسەر سەلام لە خێزانەکەت بکە..

(یَکونُ بَرکَة علیك و علی أهل بَیتك) خودا بەرەکەت بەسەر تۆش و خێزانەکەشتدا دەڕێژێت.. قەت بە بێ سەلام کردن مەچۆوە، پیاوی واهەیە کوڕە حاجی، ئەهلی مزگەوت دین، وەڵاهی پیر بووە لە عومریدا نازانێت سەلام کردن چیە؟! هەر دەڵێت: خاتە و فاتە و عائیشە ئەوە نەبوو هینەکە، نانەکە حازر نەبوو؟ دەك کوێر بیت، سوێر بوو.. دەی برام جارێ سەلامێك، کەلامێك.. ئەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

ئەگەر چوویتە ئەوودیوی دەرگاکە، سەلام بکە، ئەگەر ڕۆژی دە جار هاتوو چوویت سەلام بکە، چونکە بەرەکەتە، بەرەکەتەکە بڕێژە، چونکە ئەوە چارەسەری کێشەکانتە، بەو سەلامە هەموویمان کۆتایی پێهێنا..

## پۆشاك بن بۆ یەکتری

پیاوان و ژنان لیباسن بۆ یەکتر، ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾البقرە:١٨٧. ئەی پیاوان ئێوە لیباسن بۆ ژنەکانتان، ئەی ژنان ئێوە لیباسن بۆ پیاوەکەتان.. وەڵاهی من لەسەر

ئەولیباسە حەزدەکەم قسە بکەم، کاتێك کەسێك هاوسەری ژیانی هەڵبژارد با باش بزانێ کێ هەڵدەبژێرێت.. ئێستا تو خودا مەعقولە منی مەلا بچم بە فالینەی عەلاگە و شۆرتی یاریەوە بچمە دەرەوە؟ نا، نابێت، برا خۆ ئەوەش هەر جلە، برا ئەی تو خودا مەعقولە یاریزانێك لە ناو ساحەدا جبە و مێزەری لەبەردا بێت؟ خۆ ئەوە هەر جلە، وەڵاهی دەبێت بزانیت کام جلە هەڵدەبژێریت.. هاوسەر، ژنەکەت هاوسەری ژیانتە، جلەکەتە، لەبەر ئەوە دەبێت بزانیت کامە بۆ تۆ دەشێت، هەر ئارەزووت لێ بوو بڵێیت: وەڵا ئەم کراسە سورە لەبەر دەکەم. ئەو نیو قۆڵە عەیب نیە بۆ تۆ زۆر شیاوە، بەس بۆ من نابێت، بۆ من شیاوە بەس بۆ تۆ نابێت.. وانیە؟ بەڕێزان ئەها بزانە، کام جلە هەڵدەبژێریت..

خوشکەکەم بزانە کام کوڕە بۆ تۆ دەشێت، کام لیباسە؟ چەند تەعبیرێکی جوانە!! خۆ هەمووی هەرجلە، بەڵام دەبێت بە خودا بزانیت کام جلە بۆ تەمەنی تۆ باشە، تۆ خودا مەعقولە مام حاجیەکی پیر بە گۆچان بڕوات و کراسێکی سوری لەبەردا بێت؟. برا هەر جلە، خۆ داشی پۆشی، بەڵام بۆی دەشا؟! هەموو خەڵکەکە گاڵتەی پێ ناکات؟

ئەی مەعقولە کابرایەکی حەفتا ساڵ، کچێکی بیست و پێنج ساڵی بهێنێت؟ بە خودا هەر ئەوە دەشێت، یەعنی هەبووە تەمەنی شەت ساڵە، کچێکی بیست ساڵی دەهێنێت.. وەڵاهی وەکو ئەو پیرە مێردەم دێتە بەر چاو، کە بە کراسی سورەوە دەڕوات بۆ بازاڕ!!

﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ﴾ جلەکەت هەڵبژێرە، کامە جل بۆ تۆشیاوە، پاشان تو خودا مەعقولە جلەکەی بسوتێنێت؟ بە دەستی خۆت داخی بکەیت؟ بیدڕێنیت؟ هەر کەسێك جلەکەی لەبەر خۆیدا بدڕێنێت دەڵێن شێتە، وانیە؟ ئێستا هەر یەکێك لە ئێمە پەنا بە خودا خودا نەکردە لەو مەجلیسە هەڵسێت و جلەکانی بدڕێنیت، دەڵێن: وەڵا فلانە کەس تێك چووە.. دە وەڵاهی هەر کەسێك پەلاماری ژنەکەی بدات و جل بەبەریەوە نەیەڵێت، ئەوە پەنا بە خودا شێت بووە، چونکە ئەو ژنەت جلی تۆیە بەرگی تۆیە، نابێت بەرگەکانی

بەری خۆت بدڕێنیت چەند ناشرینە؟ ئەوەش ئەوەندە ناشرینە.. جل پیس دەبێت، بەڵام فڕێ نادرێت.. ئەرێ مەعقولە ئەم جلەی بەری من یەك پەڵەی پێوە بێت، فڕێی بدەم؟! نا برا پەلاماری بدە بیشۆرە، یەك پەڵە بە تۆزێك شتی پاك دەبێتەوە، ژیانی ژن و مێردیش پەڵەی تێدەبێت.. بەڵام فڕێی مەدە، تەڵاقی مەدە، هەوڵبدە بیشۆ، بەیەك دەست شتی خاوێن دەبێتەوە.. ئایا کێ هەیە جلەکانی چڵکن نەبووبێت لە ژیاندا؟

خودا دەفەرموێت: ژن و مێرد بەرگن بۆ یەکتر، (سبحان الله) ئەم تەعبیرە قورئانیە! وەڵاهی ئەوەی قورئان دەیفەرموێت بە هەموو فەیلە سوفەکانی دونیا دانانرێت.. بەس بیر لەم ئایەتە بکەرەوە، شەوی قەدر بەس بیر لەیەك ئایەتی قورئان بکەوە، جلەکەت کە پەڵەی لێ پەیدا بوو یەکسەر تەڵاقی مەدە، فڕێی مەدە، خۆت ڕووت مەکەوە.. قەیچێکە دەچم دەیشۆم لە شوێنێکدا، دادەنیشم بە کەمێك تایت و سابون یەکسەر بۆ خۆی پەڵەکە لێ بۆتەوە، هەر پێوەشی دیار نیە، هەڵە دابپۆشە جل و بەرگ دەتپارێزێت لە عەیب و عار.

ئەها ئێستا گەنجی واهەیە دەڵێی فریشتەیە، بە خودا گەنجی (یوسف) ئاسامان هەیە، بیخەرە ناو سەد ئافرەتەوە، لێی ئەمین بە، هەر دەڵێی (یوسف) پێغەمبەرە، کەچی ئەو گەنجە بێتە دراوسێکەی منەوە، بڵێ ئەم زگوردیە مامۆستا خانووی کرێکەی بدەمێ؟ دەڵێم: وەڵاهی حەزم پێی نیە، چونکەمادام بە تەنهایە، کەچی کابرا جاری واهەیە سەر سەریە، دوور لە ڕووی جەنابتان، وەڵاهی عارەق خۆرە، قومار چیە.. کەچی ژن و منداڵی هەیە، قەیچێکە کاکە خانووی بدەیە، ژن و منداڵی هەیە، ئەها چۆن داپۆشرا ئەو گەنجە فریشتە (یوسف) ئاسایە، چونکە بە تەنهایە، خەڵك خۆی لێ دەپارێزێت.. ئەو کابرایە چونکە ژن و منداڵی هەیە، دەڵێن جلی لەبەردایە، حەیا و حورمەتی هەیە، بێت ببێت بە دراوسێت خەمت لێی نیە، چاوت لێیە، ئەوە لیباسە داپۆشیویت، دەی جل و بەرگەکەت بپارێزە..

مەلای گەورەی کۆیە ڕەحمەتی خودای لێبێت فەرموویەتی:

﴿ژن زینەتی دونیایە، ئەمانەتی خودایە، حەبیبی موستەفایە، قەلاّتن لە بۆ مێردان﴾ بە ئافرەتی بەڕێزیش دەڵێم: پێغەمبەری پێشەوامان فەرموویەتی، تو خودا ئەی ئەو خوشکانەی (لیلةُ القدر) دادەنیشن، کە نوێژ دەکەن، سەلاّت و تەسبیح دەکەن، تو خودا ئەمفەرموودەیەتان بەسە: (أیما إمراة ماتت زوجها عنها راض دخلت الجنة) هەر ژنێك مرد و مێردەکەی لێی ڕازی بێت، جا جاری واهەیە ژنەکە زوتر لە پیاوەکە دەمرێت، کەوەختێك مرد، پیاوەکە بڵێت: یارەبی ڕەزا و ڕەحمەتی خودات لێبێت. وەڵاهی لێت ڕازی بووم.. یان وەختێك جاری واهەیە پیاوەکە دەمرێت، ژنەکە دەمێنێتەوە ئەو وەختە کە پیاوەکە مرد، لەو ژنەی ڕازی بووبێت، جا ژنەکەش بمرێت دواتر قەیناکە، وەختێك مێردەکت مرد و لێت ڕازی بێت، دڵنابن ئەو ژنە جێگای بەهەشتە، لێی ڕازی بووبێت جێگا و مەئوای بەهەشتە..

وەڵاهی خوشکی بەڕێزم: بەهەشت زۆر ئاسانە، ئەو خوشکانەی گوێیان لە دەنگمانە، دواتر ئەو شریتانە دەبینن، ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ کافیە بۆ ئێوە، با ڕێزی یەکتر بگرین، با دوور بکەوینەوە لە موشکیلە خێزانیەکان، باوەکو پێغەمبەر ﷺ پێشەوا بین.. پێغەمبەری ئێمە ئاخر لەحەزاتی ژیانی کێ دەزانێت لە کوێدا ڕۆحی دەرچوو؟ نەك لەبەینی ڕانی پێغەمبەری خودا ﷺ، لەسەر سینەی..

خاتوو (عائیشە) دەفەرموێت: ئەو وەختە خۆشەویستی خودا ﷺ، دوا لە حزەی ژیانی دونیای بەجێهێشت، سەری لەسەر کوێم بوو؟ لە خوار چەناگەم، لەسەر مەمك و سنگم بوو، نەك لەسەر ڕانیشی، حەساس ترین شوێنی ئافرەت کوێیە؟ ئەو شوێنەیە، ئەو مەوقیعەیە، پێغەمبەری خودا ﷺ ڕوومەتی لەسەر ئەو شوێنەم بوو.. ئاخر لەحەزاتی ژیانی بە پەنجەی شایەتمانی فەرمووی: (بل الرفیق الأعلی) فەرمووی: دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ لای دۆستانی سەروو، بۆلای خودای پەروەردگار، بۆلای فریشتەکان، بۆ لای پێغەمبەرانی خودا، و کۆتا لەحەزاتی ژیانی لەو شوێنەدا بەجێهێنا..

ئەمە دەستوری پێغەمبەرە، ئەمە شەوی قەدرە، (إنشاء الله) قەدر و حورمەتمان دەبێت بە شەوانی قەدر.. خودایە بێ حورمەتمان نەکەیت.. قەدر دارمان بکەیت.. قەدرمان هەبێت لای تۆ.. قەدرمان هەبێت لای پێغەمبەرانی خودا.. خودایە بێ حورمەت نەبین لەلای پێغەمبەرەکەت.. کاتێك کە چووینە سەر حەوزی کەوسەر فەرمووی وەرە ئومەتەکەم تۆ ئومەتی منی، نەیفەرمووێ: (سحقا بُعداً) دوور بکەوە لێم، چونکە لە دوای من ڕێبازەکەت گۆڕی، خودایە پێغەمبەری خودا بفەرمووێت: وەرە، وەرە، تۆ شەوانی قەدر باسی منت کرد، ئا لەو مزگەوتەدا، لەگەڵ مەلا فلانەکەسدا بەیەکەوە باسی من و خێزان و ئالو بەیتی منتان کرد.. وەرە تۆش ئالو بەیتی منی، وەرە پەرداخێك لە حەوزی کەوسەر بخۆرەوە..

یارەبی خودایە تینوێتیمان بۆ دواجار لەسەر حەوزی کەوسەر بشکێنیت.. خودایە بەر شەفاعەتی خۆشەویستمان بخەیت.. شەوی دوعا قبولْ بوونە دوعا بۆ نەخۆشەکان بکەن. خودایە شیفایان بدەیت.. ئەو ژن و مێردانەی ناکۆکن ئەو کەسانەی موشکیلە و ئاژاوەیان هەیە، یارەبی خودایە ئیصلاحی حاڵیان بکەیت.. یارەبی خودایە ئەمساڵ ئێمە ئەمە بیست و حەوتەمین وتارە باسی موشکیلە و گرفت دەکەین، هەموو کەسێك هەر جۆرە موشکیلەیەکی هەیە، یارەبی خودایە تۆ چارەسەری گرفتەکان بە دەستی تۆیە، گرفتەکەی بۆ چارەسەر بکەیت.. بە دڵی خۆی ئاسودەی بکەیت.. ئەوەی منداڵی نیە پێی ببەخشیت.. ئەوەی هەیەتی بۆی صاڵح بکەیت.. ئەوەی منداڵی لار و لەوێرە خودایە منداڵەکانی بۆ صاڵح بکەیت.. خودایە بەختەوەرمان بکەیت.. دەرگای ڕزق و ڕۆزی فراوانمان لێبکەیتەوە..

ئەم شەوە شەوی قەدرە، زۆر عولەما دەفەرموون، واتە: تەقدیری شتەکانی تێدا دەکرێت بۆ ساڵی داهاتوو، یارەبی خودایە چی چاکە، چی خۆشیە، چی بەرەکەتە چی فەرەحیە؟ ئێمە نایزانین و هەمووی لە عیلمی تۆدا تۆمار کراوە.. تۆ لەم شەوەدا

ئەوەمان بۆ بنوسیت.. یارەبی چی بەلآیە، چی ناخۆشیە، چی نەهامەتیە، چی بێ دینیە، چی گرفتاریە، ئێمە هیچ نازانین، هەمووی لە عیلمی تۆدایە..

(یا الله) لەم شەوەدا لە هەموو ئەوانەمان بپارێزیت.. (یا الله) ئیسلامەتی عەزیز بکەیت.. بە ئیسلامەتی سەر بڵندمان بکەیت.. ئیسلام لە ناو دڵ و دەروونماندا شیرین بکەیت.. ماڵەکانی تۆ هەر گەرم و گوڕ بن.. خودایە لە بەلآ و موسیبەت، لەشەڕی شەیتان، لە فیتنەی ئاخر زەمان، لە بەلآی ناگەهان، لەرەفیقی خراپ، لە شەیتان سیفەتان، بمان پارێزیت.. لە پیلانەکانیان بە دوورمان بکەیت.. بەگەورەیی خۆت بمان پارێزیت.. ئێمە و هەموو مسوڵمانان، سەرجەم لە هەموو دونیادا، ئامین ئامین.. (وَصَلَى اللهُ عَلَى سَيِّدِنا مُحمَّدٍ و آخِر دَعوانا الحَمدُ لله) (اللَّهُم إِنَّكَ عَفوٌ تُحِبُ العَفوا فَعفُو عَنَّا)

یارەبی خودایە تۆ نەك لێخۆشبووی گوناحەکانیت، تۆ سڕەوەی گوناحەکانیت.. لەمشەوەدا لە کاتەکانی ئێمە بە ناوی خۆمان و خێزان و منداڵمان، یارەبی خودایە لە هەموو دۆستان و خۆشەویستانمان، لەبەر خودا خۆشمان دەوێن، ئەوەی کە ئەهلی ئەم مزگەوتەی ڕاسپاردووە بۆ دوعای خێر، یارەبی خودایە تەواوای گوناحەکانمان لەسەر ڕەش بکەیتەوە.. نەك هەر لێمان خۆش بیت، ئاسەواری گوناحمان لەسەر نەهێڵیت.. بە پاك و خاوێنی لەم ماڵەی تۆدا لە پارشێو بڕۆینە دەرەوە..

یارەبی خودایە لێت دەپاڕێمەوە، بۆ خاتری ناوە جوانەکانت، بۆ خاتری سیفەتە بەرز و باڵاکانت، بۆ خاتری کەمال و جەمالی خۆت، (یا الله) خودایە لە گوناحەکانمان خۆش بیت.. یارەبی خودایە لە گوناحی ڕابردوومان خۆش بیت.. لە داهاتوودا لە گوناح بمان پارێزیت.. (یا الله) خودایە لێت دەپاڕێینەوە شیفای نەخۆشەکانمان بدەیت..

یا ڕەبی خودایە هەر نەخۆشیەك لە جەستەی ئێمەدا هەیە، هەر نەخۆشێك دانیشتوە، کەهیچ مەبەستێکی ترمان نیە لەم مزگەوتەدا یارەبی خودایە لەبەر ناوە پاکەکانت، لەبەر ئیخلاص و دڵسۆزیمان شیفا بۆ ئەو نەخۆشانەش بنێریت، کە حوسنی زەنیان هەیە و

ئێمە بە پیاو باش دەزانن.. یارەبی خودایە حوسنی زەنیان بە فیڕۆ نەچێت و شیفا بۆ نەخۆشەکانیان بنێریت.. (یا وهاب) ئەی ئەو کەسەی کە خۆت فەرمووتە:

﴿ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ۝ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ ۝﴾ الشورى .

(یا وهاب) منداڵ ببەخشیت بەو کەسانەی منداڵیان نیە.. بە کچ و کوڕ منداڵی صالح ببەخشیت بەو کەسانەی کە تا ئێستا، منداڵ و دەنگی گریانی منداڵ لە ماڵیاندا نیە.. منداڵ ببەخشیت بە بێ منداڵەکان.. یا ڕەبی خودایە دڵخۆشیان بکەیت.. بەڵام یارەبی خودایە منداڵی صاڵحیان پێ ببەخشیت.. ئەومنداڵانە کە هەمانە یارەبی خودایە صاڵحیان بکەیت.. پڕ لە خێریان بکەیت.. لەبەلاَ و موسیبەت بە دوورمان بکەیت..

یارەبی خودایە هەر کەسێك منداڵەکەی ناصاڵحە کچ و کوڕەکەی گوێ ڕایەڵ نیە. دوور لە دینە، (یاهادی) ئەی ئەو کەسەی هیدایەتت بەدەستە، یارەبی هیدایەتمان بدەیت.. یارەبی خودایە هیدایەتیان بدەیت.. یارەبی ئەوەی چاکە چاکتری بکەیت.. ئەوەی خراپە، یارەبی خودایە لە خەزێنەی ڕەحمەتی تۆ کەم نابێتەوە، هیدایەتی بدەیت.. خودایە غەزەبمان لێنەگریت.. هیچ کەسێك لە ئێمە خودایە بۆ جەهەنم نەبێت.. بەهەشتی تۆ ئەوەندە فراوانە، جێگای هەموو بەندەکانی بە زیادەوە دەبێتەوە، ئەی پەروەردگارا، هەموومان بکەیت بە ئەهلی بەهەشت..

یارەبی خودایە عیزەتی ئیسلام و مسوڵمانان بدەیت.. یارەبی خودایە قەت نەبینین ئەم ئیسلامە بێ عیزەتی بێتە سەر.. یارەبی خودایە قەت مسوڵمانان زەلیلی دەستی کافران نەکەیت.. یارەبی خودایە وڵاتمان بە پیت و بەرەکەت بکەیت..

یارەبی خودایە ڕزق و ڕۆزیمان لێ نەشاریتەوە بۆمان زیاد بکەیت.. هەر هەموو وڵاتی کورد و مسوڵمانان قەت گرانی بەسەردا نەیەت.. قەت سفرەکانمان نەبوونی بەسەردا نەیەتەوە.. قەت ماڵەکانمان بێ ئاردی و بێ خۆراکی بەسەردا نەیەتەوە..

یارەبی خودایە ئەو گیرفانانەی خاڵین، ئەو دەستانەی کە دەستی قەرزارن، ئەو دەستانەی کە وەرگرن، یارەبی خودایە تۆ بۆ خۆت رەزاقیت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ﴾ الذاريات. خەزێنەی تۆ ئەوەندە فراوانە، قەت لێی کەم نابێتەوە، یارەبی دەرگای رزق و رۆزیان لێ بکەیتەوە.. دەرگای رزق و رۆزی لە هەژاران، لە قەرزداران، لە نەداران، لە بێ باوکان، لە کرێچیان، لەو کەسانەی کە بەردەوام چاویان لە خێری خەڵکە، ئەوەندەیان پێ ببەخشیت، رۆژێك خۆیان خێر بکەن.. ئەو کەسانەش کە ماڵی خۆیان دەبەخشن بە پارەی حەڵاڵی خۆیان، بە رەنج و کەسابەت و عارەقی نێوچەوانی خۆیان، ئەو پارە نازدار و ئازیزەی گیرفانی خۆیان، کە بەبێ دەنگ دەیخەنە گیرفانی داماوانەوە، سوپاسی لەسەر دەکەن، یارەبی قەت گیرفانیان خاڵی نەبێت.. ئەو دەستە هەر بەخشندە بێت.. قەت موحتاج نەبێت.. ئەو دەستە دایمە سەلامەت بێت و شەلەلدار نەبێت و نەخۆش نەبێت.. ئەو ماڵە هەردەم ئاوەدان بێت و کە هەردەم لێی ئاوەدان بێت.. کە لێی سەرف دەکرێت و لێی دەخورێت، ئەو کەسابەتە هەردەم پڕ بەرەکەت بێت.. ئەو دوکان و بازاڕە لە ئافات بەدوور بێت..

یارەبی (یا الله) یارەبی خودایە لێمان خۆش بیت.. عاقیبەتمان بە خێر بگێریت.. لەبەلاّ و موسیبەت بەدوورمان بکەیت.. یارەبی خودایە لە ریا بەدوورمان بکەیت.. ئیخلاصمان زیاد بکەیت..

(یا الله) ئیخلاصمان پێ ببەخشیت.. یارەبی خودایە لەهەر وشەیەك، لەهەر کردارێك، لە هەر رەفتارێك بمان پارێزیت، کە موخالیص بۆ تۆ نەبێت.. یا رەب یارەبی ئەوەی کەوا کردومانە کەم و کوڕی زۆرە، بەلاّم تۆ خودایە گیان، (أرحم راحمین)یت، بە کەم و کوڕیەکانمانەوە لێمان قبولّ بکە و لەلای خۆت بۆمان تەواو بکە.. چاکەکانمان کەمە، بەلاّم تۆ (إنشاءالله) ئەوەندەمان بەسەردا برێژە، چونکە ئەهلی رۆژوو بەس پاداشتەکەی

لای تۆیە.. یارەبی خودایە لە قیامەتدا سەرسام بین بەو هەموو پاداشتەی کەلەم شەوە موبارەکەدا بۆت نوسیوین.. ئامین.. ئامین.. وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ..

﴿ سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾﴾



# وانەی بیست و هەشتەم



## بابەت

## ئاگاداری دایك و باوكت بە



# وانەی بیست و هەشتەم

## ئاگاداری دایك و باوكت بە

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى : ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾﴾ لقمان.

* وَ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى : ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ﴾الأحقاف : ١٥ .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (ألا أُنَبِّئُكَمْ بِأكْبَرِ الكَبائِرِ ؟ ثَلاثاً ، قالُوا : بَلى يا رَسُولَ اللهِ ﷺ قالَ : الإشْراك باللهِ ، وَ عُقُوقُ الوالِدَيْنِ ، وَ جَلَسَ . وكانَ مُتَّكِئاً . ألا وَقَوْلُ الزُّوُرِ ، ما زالَ يُكَرِّرُها حَتَّى قُلْنا ، لَيْتَهُ سَكَتَ .) ـ رَواهُ البُخاري في الأَدَب المُفْرَد : (١٥) . وَ قالَ الألْباني : صَحيحٌ .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (لَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ ، ولَعَنَ اللهُ مَنْ سَرَقَ مَنارَ الأَرْضِ ، لَعَنَ اللهُ مَنْ لَعَنَ والِدَيْه ، لَعَنَ اللهُ مَنْ آوى مُحْدِثاً) ـ رَواهُ مُسْلِم : (٣٥) .

مُحْدِثاً : مَنْ يَأْتي بِفَسادٍ في الأَرْض . أي : مَنْ نَصَرَ جانِياً أَوْ آواهُ وَ أَجارَهُ مِنْ خَصْمِهِ . وَ حالَ بَيْنَهُ وَ بَيْنَ أَنْ يقتص مِنْهُ ...

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (ثَلاثَةٌ لا يَقْبَلُ اللهُ لَهُمْ صَرْفاً وَلا عَدْلاً : عاقٌّ ، وَ مَنَّانٌ ، وَ مُكَذِّبٌ بالْقَدَرِ) ـ صَحيح الجامع ، لِلألْباني : (٣٠٦٠) .

الصرف : التوبَة .

العَدْل : أي لا يقبل الله تَعالى مِنْهُمْ فِداء ، وَاللهُ أعْلَم .

## سەرچاوەکان :

١) موسوعَة الآداب الإسْلامِيَّة ، أيْمَن المزين ، ص٥٤٠ ، ط : ١ ، ٢٠١٣ ، مكتبَة فياض .

٢) پایزە برا ، مەلا ئەحمەدی شەریعە، بەرگی یەکەم ، ل٦١ . چاپی یەکەم ، ٢٠١١.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی خۆشەویست: ئەمشەوە پیرۆزە کە شەوی جومعەیە لەم مانگی پڕ بەرەکەتی ڕەمەزاندا (إنشاء الله) لە زنجیرە باسی ئەی پێغەمبەری پێشەوا و خۆشەویست، منیش موشکیلە و کێشە و گرفتم هەیە، ئەمشەویش بە فەزڵی خودای پەروەردگار بەیەکەوە سەرێك لە شارە پیرۆزەکەی مەدینە دەدەینەوە.. لە خزمەت ئازیز و خۆشەویست و شەفیعی مەحشەرماندا، کاتێك کە دەچینە خزمەتی لەم کاتە پیرۆزەدا سلاّوات بۆ ڕۆحی هەمیشە زیندووی سەروەر و سەردارمان دەنێرین و دەڵێین:

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

## بەهۆی دایکیەوە شایەتومانی بۆ نەدەهات

لە شاری پێغەمبەری خودادا ﷺ سەروەر و گەورەمان پێغەمبەری خودا ﷺ دانیشتووە و کۆمەڵێك هاوڕێ و صەحابە لە خزمەتی دان، لەو کاتەدا کەسێك بە ئەدەبەوە دێتە خزمەتی و سلاّوی لێدەکات و دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ شتێکی گەورە هەیە، دەنگ و باسێکی گەورە هەیە..

دەفەرمووێت: چیت لێ قەوماوە؟ تۆ چ موشکیلە و گرفتێکت هەیە؟ با هاوکاریت بکەین و گوێت بۆ بگرین و یارمەتیت بدەین.. دەفەرمووێت: وەلاّهی من موشکیلەیەکم نیە، بەلاّم من دراوسێیەکم هەیە، گەنجێك دراوسێمە لە هەرەتی لاوێتی و گەنجێتیدایە، چەند ڕۆژێکە نەخۆشە، بەلاّم بەڕاستی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە چەند ڕۆژێکە کە

نەخۆش بووە، زۆر هیلاکە، لەوە دەچێت لەسەرە مەرگدا بێت، ژیانی بەرە و کۆتایی بڕوات.. منیش بە حکومی ئەوەی کە دراوسێمە و ئەرکی مسوڵمانیەتی و دراوسێیەتی لەسەرمە، چووم بەلایەوە، وازم لە کار و کەسابەت هێناوە، پێم جوان نەبوو من بڕۆم بۆ ئیش و ئەم پیاوە بمرێت و من لە ماڵ نەبم..

خەڵك ئەو زەمەنە ئاوا بیری دەەکردەوە لە مافی دراوسێیەتی و مسوڵمانیەتی و بەدەمەوە چوون، لەبەرئەوە من بەڕاستی لەلای سەری بووم، ئەم ئینسانە وا هەست دەکەم خەریکە ڕۆح دەدات، هەموو ئەندامی لەشی سارد دەبێتەوە و جارێکی تر ڕۆح دەکرێتەوە بەبەریدا، دیسان ڕۆحەکەی دێتەوە و خەریکە دێتە سەر سنگی..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: یاڕەبی خودایە ڕەحم بە ئەو و بە ئێمەش بکات، دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمەش هەر بۆ ئەوە هاتووینەتە خزمەتت، جەنابت فەرمووتە کە هەر کەسێك (من کان اخر کلامه لا اله إلا الله، دخل الجنة)، هەر ئینسانێك لە دوا ساتەکانی دەرچوونی لە دونیا بڵێت (لا اله إلا الله) (إنشاء الله) جیگای بەهەشتە، ئەوەی هەرچەندە تاوانبار بێت، هەرچەند گوناحبار بێت، هەر کەسێك خودا ڕەحمی پێ بکات، لە دواساتەکانی ژیانیدا بڵێت: (لا اله إلا الله)، (إنشاءالله) جیگای بەهەشتە..

## لای نەخۆشی سەرە مەرگ، .شایەتومان بهێنن

بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی و صەحابەکانی فێر کردبوو ئەم پیاوەش ئەو حەدیسەی بیستبوو، کە فەرمووی: (لَقِّنوا مَوتاكُم لا إله إلا الله) لەلای ئەو کەسانەی لەسەرە مەرگدان و زاهیری دونیا خەریکە دەمرن، هەر خودا دەزانێت کەی کاتی مردن و کۆتاییە، بەڵام بە زاهیری دونیا سەیرتان دەکرد ئەم ئینسانە بەرە و کۆتایی ژیانە، بەڕاستی لەوە دەچێت ئاخیر لەحزەی ژیانی بێت..

دەفەرموێت: تەلقینی (لا إله إلا الله)ی بکەن، مەڵێن پێی بڵێ (لا إله إلا الله)، نا.. چونکە دینداری بە زۆر ناکرێت، بەس لەلای بڵێن (لا إله إلا الله)(لا إله إلا الله) بۆ ئەوەی ئەویش بیڵێتەوە، ئەویش بیری بێتەوە، ئەویش لە دواتەوە بیڵێ..

فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئێمە لە دوێنێ شەوەوە خەریکین، بەردەوام لە دەوری ئەم گەنجە دەڵێین، (لا إله إلا الله)(لا إله إلا الله) کەچی ئەو دەیەوێت بیڵێت، هەست دەکەین دەیەوێت بیڵێت، دواتر سەر بادەدا و چاوی ئەبڵەق دەبێت و هاوار دەکات کە بۆم ناگوترێت، (لا إله إلا الله)کەم بۆ ناگوترێت، بەڕاستی خەمی گەورەی ئێمە ئەوەیە ئەم گەنجە دەیەوێت (لا إله إلا الله) بڵێت بۆی ناوترێت..

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ فریا بکەوە، چارەسەرێك، دەرمانێك بۆ ئەوەی ئەم ئینسانە دوا ڕۆژی ڕەش نەبێـت، بۆ دەبێت شایەتمان لەسەر زمانی کەسێك کە مسوڵمانە و لەشاری مەدینەدا دەژی لە خزمەت پێغەمبەری پێشەوادا بووە ﷺ شایەتمانی بۆ نەیەت؟ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: با بڕۆین، دەچێتە لای سەریەوە دادەنیشێت و دوعای خێری بۆ دەکات.. ئەویش دەفەرموێت: (لا إله إلا الله)(لا إله إلا الله) بەڵام سەیر دەکات عەینن شت کابرای دراوسێی بۆی باسکردووە، ئەم گەنجە دەیەوێت شایەتمان بهێنێت، بەڵام هەست دەکات دەڵێت، ناتوانم ناتوانم دەری ببڕم، ناتوانم زمانم بۆ ئەوە کار ناکات..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ئەم گەنجە کێی هەیە لەم ماڵەدا؟ دەڵێن: قوربان خێزانی هەیە و دوو منداڵی هەیە، دەفەرموێت: ئەی دایکێك؟ باوك؟

دەفەرموێـت: وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ باوکی وەفاتی کردووە، بەس دایکی ماوە، ئەی کوا دایکی بۆ لێرە نیە؟ ئەوە ژنەکەیەتی، ئەوە منداڵەکانیەتی، ئەی کوا دایکی؟ دەفەرموون: وەڵا دایکی مەیلە و عاجزن لەیەك تر و ماڵەکەی وا لەو سەرەوە چەند گەڕەکێك بەولاترەوە، لە کوخێکدایە بۆ خۆی..

دەفەرمووێت: بڕۆن پێی بڵێن با بێت ئەگەر نەیتوانی بێت من دەچم بۆلای ئەو، ئەوانیش دەچن دەڵێن: پێغەمبەری خودا ﷺ لە دوی ناردووی، دەفەرمووێت: من بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ ئامادەم، بەلاَم بۆ لای ئەو کوڕەم نا، لەبەر فەرمانی پێغەمبەری خودا ﷺ حەیا دەمگرێت، شەرم دەمگرێت، بڵێم پێغەمبەری خودا ﷺ بێت بۆلای من، بەلاَم بۆ ماڵی ئەو کوڕەم بە دڵنیاییەوە نەدەهاتم، ئەگەر بیشمرێت و جەنازەکەی لەوێ بێت، بەلاَم لەبەر حورمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ دێمە خزمەتی، دێت و پشتی چەماوەتەوە، گۆچانی بەدەستەوەیە، سەلام دەکات و پێغەمبەری خودا ﷺ لەبەری هەڵدەستێت و ڕێزی لێدەگرێت.. دەفەرمووێت: ئەمە کوڕتە، دەفەرمووێت: بەڵێ قوربان کوڕم بوو.. دەفەرمووێت: ئاخر دەی کوڕت بوو ئەی ئێستا بۆ کوڕت نیە؟

دەفەرمووێت: بەینی من و ئەو کوڕەم کۆتایی پێهاتووە، لەبەرئەوە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، من ئەم منداڵەم زۆر بە نازداری، زۆر بە ئازیزی بەخێوم کرد، تەمەنی گەنجێتی خۆمم تێدا سەرف کرد، وەلاَمی پاروم لەدەمی خۆمەوە دەخستە دەمی ئەمەوە، خزمەتکاری ماڵانم دەکرد، لەبەرئەوەی ئەم ڕەش و ڕووت نەبێت، بەلاَم کاتێك ئەو پارە و پولەی بە بە چیلکە، بە عارەقی نێو چەوان پەیدام کردبوو.. بۆ ئەم دام بەژنێك ماڵ و حاڵێکم بۆ پێکەوە نا، هەر ئەوەندەم خۆش بوو کە ماڵ و حاڵی خۆی بینی، بە نوێژی نیوەڕۆ لەگەڵ خێزانەکەیدا منیان کردە دەرەوە.. ئێستا خەڵك دەبێت خێرم پێ بکات، ئێستا بۆخۆم داماو لە کوخە خانوویەکدا وەکو کولانەی مریشك وایە، لەبەرئەوە لەو ڕۆژەوە منیان کردە دەرەوە..

وتی: دایە گیان هیچ پەیوەندیەکمان نەماوە، با ژیانی منیش بە هۆی تۆوە تێك نەچێت، لەو وەختەوە من هەست ناکەم کوڕم هەبێت، هەست ناکەم ئەولادم هەبێت، من تەنها هاتوومەتە خزمەتت پێم شەرم بوو جەنابت بفەرمووی ئەو پیرە ژنە بێت و یان من دەچم بۆ لای، تۆ بهاتیتایە من تەریق دەبوومەوە، من حەدی ئەوەم نیە کە پێغەمبەری

خودا ﷺ تەشریفی لە شوێنێك بێت و بفەرمووێت چاوم پێی بکەوێت و نەچم، ئەینا من وانازانم کوڕێکم هەبێت و ناوی کوڕبێت، لەبەرئەوە من بە ئەولادی خۆمی نازانم..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: وەلاهی سەبەبەکەی هەر ئەوەیە کە شایەتومانی بۆ نایەت، ئەوە شوێنەکەی خەلەلەکەیمان دۆزیەوە، چونکە (رِضَى اللهِ في رِضَى الوالِيدِين وَ صخته في صُختِهما) رازی بوونی خودا لە ڕازی بوونی دایك و باوکیەوەیەتی، توڕەبوونی خودا و غەزەبی خودا لەسەر ئینسانێك لەسەر ئەوەیە کە دایك و باوکی توڕەبن و غەزەبی لێبگرن.. فەرمووی: ئەمە غەزەبی خودای لەسەرە، پەنا بە خودای پەروەردگار، غەزەبی خودای لێگیراوە، شایەتمانی بۆ نایەت، چونکە دایکی لێی توڕەیە، دایکی غەزەبی لێگرتووە..

دەفەرمووێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی ئەم گەنجە پێویستە لەم دونیایەدا بسوتێنرێت، بۆ ئەوەی لە ئاگری جەهەنمدا نەسوتێنرێت و عەزابی دونیا هەر هیچ نیە، ئادەی دار و چیلکە بهێنن، حەوشەکە پڕ بوو لەدار و چیلکە، یەك دوو ماڵە دراوسێش، کەس نەیوت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ؟! ئەو صەحابانە ئەوەندە مولزەم بوون. بەڕێزان ئێستا بە ئێمە دەڵێن، دەڵێن: ئەرێ ئەو حەدیسە وا وایە، دەبێت حیکمەتی چی بێت؟! صەحابەی پێغەمبەری خودا ﷺ بەدوای حیکمەتەوە نەبوو..

پێغەمبەر ﷺ بفەرمووێت وابکە، تۆ وابکە، ئیتر حەقت چیە بەسەر ئەوەوە، داروچیلکە بهێنن.. کەس نالێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ داروچیلکەت بۆ چیە؟ یەکسەر هەر کەسە و ڕادەکات چی دەست بکەوێت، پوشکەیەك بێت دەیهێنێت، یەك ئەوەندە کۆمەڵ بەقەدەر ئەو مێزە بەرز بوویەوە، پیغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئاگری بدەن، قریشکە ئاگرێکیان لە تەندورێکەوە هێنا و ئاگریان دا، چیلکە بەرز بوویەوە، فەرمووی ئەو کوڕەم بۆ بهێنن کە لەسەرەمەرگدایە، بیهێنن و بەحاڵ جلێکی ژێرەوەی لەبەردا بهێڵن، لەبەر حورمەتی بەشەری، بۆم بخەنە سەر ئەو ئاگرەوە بۆم فڕێ بدەنە سەر ئەو ئاگرە.. هیچ کەسێك نالێت بۆ ئاوا؟

دوو سێ گەنجی وەکو ئەم کوڕە باشانە پەلاماری گەنجەکەیان داو لە ناو جێگادا هێنایانە دەرەوە، نزیکی ئاگرەکەیان کردەوە، پیرە ژن هاواری لێ بەرز بوویەوە: نەکەن.. دەتانەوێت کوڕەکەم بسوتێنن؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەم کوڕەی تۆ جێگای جەهەنمە، دەمانەوێت لەم دونیایەدا بیسوتێنین، چونکە ئەوە هەر دەچێتە جەهەنم.. وتی: ئەی پێغەمبەری خودا بە خودا نابێت.. من لێرەم نابێت کوڕەکەم بسوتێنن، ئەها جەرگ لەو کاتەدا هاواری لێ بەرز بوویەوە، نا بێت قبوڵم نیە، ئەها ئەمە حیکمەتی پێغەمبەرە ﷺ دەزانێت ئەم دایکە دڵی وا ڕەش بووە، لە ئاستی ئەم ئەولادە، هەموو قورئانی بەسەردا بخوێنە سودی نیە، هەموو ئامۆژگاری و بەسەرهات و چیرۆك دادی نادات، چونکە وادڵی هین بووە.. بەڵام لە کاتێکدا سوتان و قرچان دێتە گۆڕێ بە فیعلی دەبینێت پێغەمبەری خودا ﷺ دەزانێت دڵی دایك تەحەمولی ئەوە ناکات.. دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خودا نابێت..

دەفەرمووێت: دە باشە، دەتەوێت نەسوتێت، گەردنی ئازاد بکە، تۆ گەورە بە، تۆ لێبوردەبە، دەڵێت لەبەر خاتری خودای پەروەردگار کە کوڕەکەم نەچێتە ئاگری جەهەنم وامنیش لە حەقی خۆم خۆش بووم..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: داینێنەوە، دایان نایەوە، ئەو کوڕە بە هەموو دەنگی خۆی هاواری کرد، ئەوەی لە دەرێش بوو گوێی لێبوو، وتی:

(أَشْهَدُ أَلا إِلَهَ إِلا الله، وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَداً رَسُول الله) چاوی زەق بوویەوە و دەمی کرایەوە، ڕۆحی دەرچوو، دەفەرمووێت: ئەمجارە دایکەکە زۆر بۆی پەرۆش بوو، واش ئەمجارە هەستی دەکرد ڕۆڵەیەکی لە دەست چووە..

بەڵێ بەڕێزان: ئەمە موشکیلەی کەسێکە، ڕەنگە موشکیلەی زۆر بێت، خەڵك ئەهلی مزگەوتە لە کوڕان لە کچان، کە بەڕاستی دڵی دایکیان ئێشاندووە، بەرە جەژنانە فرسەتێکی زێڕینە، هەر کەسێك ئەو هەڵە کوشندەی کردووە.. چونکە پێغەمبەری خودا

ﷺ فەرمووی: ڕازی بوونی خودا لە ڕازی بوونی دایك و باوك دایە، توڕەبوونیش لە توڕەبوونیاندایە، ئەمە لە زەمانی پێغەمبەردابوو..

## قێزی لەدایکی کردەوە ..خۆیشی توشی بوو!!

من بەسەرهاتێکی ئەم سەردەمەشتان بۆ دەگێڕمەوە، چونکە شەوەکانی ئێمە، ڕابردوو و ئێستا تێکەڵ دەکەین بە فەزڵی خودای پەروەردگار، ئێمە لە ڕابردوودا ناژین، هەرچەندە لە ڕابردوودا لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ هەر ئێستایە، ئێستا کە ئەم باسانەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەخوێنمەوە (سبحان الله) ئەم پێغەمبەرە زیندووە، لە ناوماندایە، هەر دەڵێی ئێستا لە شاری مەدینەی، هەست ناکەیت ئەمە کۆن بێت، بەڵام هەر بۆ مەجلیس و گوڵاو پرژێنی مەجلیسەکەمان و، لەگەڵ واقیعی بوونی ژیانی ئێستاماندایە، دەچینە خزمەت مامۆستا (عبد العزیز)ی هەولێری، کە پیاوێکی زانا و مەلایەکی گەورەیە، لە ئەنجامی ستەمی بەعس و ئەوانەدا، ساڵەکانی پێش نەوەد ئەمری قەبزی دەبێت و ڕادەکات بۆ دەرەوەی وڵات، لە ئێران بۆ پاکستان، لە پاکستان بۆ ئەمەریکا، لە ئەمەریکا حەوت ساڵ نیشتەجێ دەبێت.. ئەم پیاوە بەڕێزە دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت:

لە ئەمەریکا زۆر هەستم بە غوریبەتی دەکرد، هەر کوردێکم ببینیایە، لە شارێك، لە جادەیەك، لە ڕیستۆرانتێك، لە مەتعەمێکدا، هەر جلی کوردی لەبەردا بوایە، یان بە کوردی قسەی بکردایە، وامدەزانی برای حەوت پشت بابمە، یەعنی وامدەزانی ئەمە دڵسۆزە بە تایبەت ئەگەر لە مزگەوتدا بمبینیایە، ڕوو لە خودا بوایە ئەوە زۆر زۆر، میلەتی کورد لە ناو خۆدا خۆ خۆرە، کە چوونە دەرەوە یەکتریان خۆشدەوێت..

دەڵێت: من ئەو کوردانەی ئەوێم بەسەرکردەوە و هەستم زۆر بە غەریبی دەکرد، یەعنی ناڕەحەت بووم بە تایبەتی ئەو کاتانەی لە ئەمەریکا بووم، حەوت ساڵ لە ئەمەریکا بووم، ئەم پیاوە دەڵێت: کۆمەڵێك دۆست و برادەر لەدەوری یەکتر کۆبووینەوە و بەیەکەوە دەچووینە مزگەوتێکی بچکۆلە، ئاوا لەژێر زەمینێکدا، دووکان بووکرابوو بە

مزگەوت، عیبادەت و خوداناسیمان دەکرد و ئاشنایەتیمان پەیدا کرد، لەوێ هیچ سیلەی ڕەحم و شت نیە، کابرا نەدراوسێ دەناسێت، نە کەس حەقی کەسی هەیە..

دەڵێت: ئێمە لەسەر کلتوری کوردی خۆمان و مسوڵمانیەتیمان هاتوچۆی یەکترمان دەکرد، لە ئەنجامدا درێژی نەکەمەوە دەڵێت یەکێك لە برادەرە کوردەکانم خەڵکی هەولێر بوو، ئەوە بوو کە دواتر یەکترمان ناسی باوباپیرمان بە ناسراو و خزمی یەکتر دەرچوو، دایکیان هەبوو، دو برا بوون، دایکیان هەبوو دەڵێت (سبحان الله) کاتێك کە من چوومە ماڵیان ئەو دایکە تووشی نەخۆشیەك بوو بوو، کە لە نەخۆشیە دەگمەنەکانە، لە عالەمدا پەنا بە خودا، بۆنی ئەم دایکە هیچ کەسێك خۆی لەبەر نەدەگرت، پەنا بەخودا ڕۆژی چەند جار بتشۆردایە وەکو ئەوە وابوو دوو ساڵ خۆی نەشۆردبێت، ئەوەندە بۆنی چڵك و عارەقی لێدەهات، ژوورێکی بۆ تەرخان کردبوو ئەم پیاوە، زۆر پیاوانە، مەردانە، کولی ڕۆژێك بەیانیان پێش ئەوەی بڕوات بۆ ئیش دایکی دەشۆرد، ئێواران کە لە ئیش دەگەڕایەوە بەو ماندوویەتیە کە تا ئێوارە بە پێوە لە مەعمەلێك کاری دەکرد..

پێش ئەوەی خۆی ئاوێك بە خۆیدا بکات ڕایدەکرد دایکی دەشۆرد، عەتری پێدا دەکرد، جلی لەبەر دەکرد، بەڵام (سبحان الله) ئەم دایکە وەکو ئەوە وابوو دوو ساڵ بێت خۆی نەشۆردبێت، لە شوێنێکدایە هەرچی لەشیەتی بۆگەنی لێدەهات، ئەو عارەقەی کەلەلەشی دەهاتە دەرەوە..

وەڵاهی خۆشەویستان ئێمە شەو و ڕۆژ سەرمان لەسەر سوجدا بێت، هێشتا فەزڵی ئەوە فەزڵی خودامان لەسەرمان ناتوانین شوکرانەی بکەین، کە بۆنی لەشمان بۆگەنی لێ نایەت، باشە ئەگەر ئێمە وەکو ئەو پیرە ژنەمان لێ بێت، چ دەسەڵاتێکمان هەیە، هیچ دەسەڵاتمان هەیە؟ هەر ئەو عارەقەی لەو لەشە دێتە دەرەوە بۆگەنی لێدەهات..

بەڵێ خۆشەویستان: دەفەرمووێت کەس خۆی نەدەگرت بە تەنها لەو ژوورەدا، بەس ئەم کوڕە مەردانە و پاڵەوانانە بەخۆی و بە خێزانی خزمەتیان دەکرد، منداڵەکانی وا لێنەکردبوو بێزی لێبکەنەوە، بەڵام برای دووەمیان دەڵێت وتم براکەت هیچ نابینم؟!

دەڵێت: وتی بە خودا ئەم دایکەی ئێمە بۆنی ناخۆشە و ناتوانم بێم بۆلای و خێزانم و منداڵەکانم قیزی لێدەکەنەوە، ڕۆژێك پێم وت تۆ مسوڵمانیت، کورە قیامەتت هەیە، ئاهو نزولەی دایکت تێت دەوەستێت، تۆ بە حاڵ دەستت بەرز دەکەیتەوە جا خۆ من ئەولادیشی نیم هەر وادەکەم، من دەچمە ژوورەوە مەرحەبای دەکەم..

وتی: من بە خودا بە دەست خۆم نیە، تەبیعەتم زۆر خراپە هەر ئەو بۆگەنەم بۆ دێت خەریکە دەرشێمەوە، کورە برا ئاخر ئەوە دایکتە، ئەوە براتە، ئاخر چۆن وا دەبێت؟! وتی: بە خودا ئەوە بە من ناکرێت، بە خودا ژن و منداڵەکانم وتویانە تو خودا نەوەکو منداڵەکانم لەو عارەقە پیسەی ئەو بگرنەوە، ژنەکەم نایەڵێت منداڵەکانم هەر بە حەوشەشدا بێت.. دەڵێت: نەوەکو ڤایرۆس و میکرۆبەکەیان لێ بنیشێت، توشی ئەو نەخۆشیە ببن.. دەڵێت: زۆرم بۆ گوت سودی نەبوو، بەڵێ ئەم دایکە لەسەرەمەرگدا بوو، ئەم برادەرەم تەلەفونی بۆ کردم وتی: دایکم لەسەرەمەرگدایە، ئەگەر بێیت لەم دیویشەوە تۆ قورئان و (یس)یشت لەبەرە، سورەتی (یس)ی بەسەردا بخوێنیت..

وتم: بەسەرچاو.. خێزانم و کچەکەم برد، کۆمەڵێك ماڵی کوردم ئاگادار کردەوە، وەکو چۆن ئێستا کەسێك مردووی لەسەرەمەرگدایە دەڵێت عەینن کوردستانی خۆمان لێی کۆبووینەوە، من لەم دیو قورئانم دەخوێند و ئەویش لە پشت سەری دایکی بوو، کەس خۆی نەدەگرت لەو ژوورەدا، دەڵێت ناردیشیان بە دوای ئەو کورە هات لەسەرووی میوانەکانەوە دانیشت!!

وتیان: کورە هەڵسە برۆ دایکت لەسەرە مەرگدایە، برۆ بۆلای.. وتی: بە خودا ناتوانم، یەکسەر دڵم دێتە دەرەوە دڵم دەشێوێت، چۆن شتی وادەکەم.. ئێستاش دایکی نەبینی!

دەڵێت: هاواریان لێبەرز بوویەوە لەو دیو وتیان وەڵا دایکی مرد.. دوو سێ ئافرەت وەڵا خێرا کفن و شتمان بۆ هێنا و پەڕۆی سپی لێبوو، بۆیان دووری..

وتمان: بیشۆن لەو حەمامەدا، دەڵێت دەیان شت (سبحان الله) دانیشتبوون لە مەجلیسدا، چاوەڕێ دەکەین ئافرەتەکان کفن بەبەر ئەم دایکەدا بکەن و لە گۆڕستان بەخاکی بسپێرن، بیبەین لە مزگەوت نوێژی مردووی لەسەر بکەیت..

دەڵێت: (سبحان الله) یەك بۆگەن هات، ئەی خودایە ئەم بۆگەنە چی بوو؟! هەموو پەنجەرەیەك کراوەتەوە، ئەوە چیە؟! دەڵێت سەیر دەکەین بۆنی ئەو کوڕەیە کە بە حیساب نەچووبوو بۆلای دایکی!! بەڕاستی دایکی ڕۆحی دەرچوو، ئەم نەخۆشیەکەی گرت، هەر هەمووومان ڕۆشتینە دەرەوە، ئەها بۆنی وا هەیە تەحەمولی ناکەیت..

وتیان کێیە؟! وتیان وەڵا بابە ئەم کوڕەیە.. کابرا هاواری دەکرد بۆ خۆی دەرشایەوە لە بۆگەنی خۆی، دایك مرد.. ئەم یەکسەر نەخۆشیەکەی گرت!!

دەڵێت: سەرەنجام ژنەکەی وتی بە خودا من لەگەڵ ئەم پیاوە بۆگەنەدا ئیدارە ناکەم، با منداڵەکانم نەیگرن، ژوورێکیان بۆ بەکرێ گرتبوو لە ڕێی خودا، دەڵێت من و برادەرەکانم ئەوا سەفەرتازێ خواردنمان بۆ دادەنا و دەرگاکەمان پێوە دەدایەوە، ئیتر دەڵێت من لە ئەمریکا هاتمەوە، ئیتر نازانم دوای ئەوە چی بوو، چەند ساڵ دوای ئەوە ژیا بە زەلیلی لەو ژوورەدا بەجێ ما..(سبحان الله)!!

چی گاڵتەی بە دایکی دەکرد، لە دایکی وەڕەس بوو، بۆگەنی کرد، هەمان نەخۆشی گرتەوە، لە دونیادا نەیبردە قیامەت، ئەو برایەی کەش دەستی لە پیسی دایکی دەنا، ڕۆژی دوو جار دەیشت، نە دڵی بەخەیاڵیدا دەهات بڵێ نەخۆشی دەگرم، نە ژن، نە منداڵی، سەربەرزی دونیا و قیامەت بوو، یارەبی خودایە سەربەرزی دونیا و قیامەتمان بکەیت.. نە خۆمان نە دایك و باوکمان زەلیلی سەر جێگا نەبن.. ڕەحم بە حاڵمان بکەیت.. ئیمانمان سەلامەت بکەیت.. تاعەت و عیبادەتمان قبوڵ بکەیت..

تا شەوی داهاتوو بەرنامەیەکی تر لە زنجیرە باسەکەمان بە خوداتان دەسپێرم..

(وَالسَّلامُ عَلَيكُم وَ رَحمَةُ اللهِ وَ بَرَكاتُهُ) .

# وانەی بیست و نۆیەم

## ستەم مەکە

* قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾﴾ إبراهيم .

* وَ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾﴾ الشورى .

* وقَالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾﴾الشُّعَراء.

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (مَنْ كانَتْ لَهُ مَظْلَمَةٌ لِأَخيهِ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ شَيءٍ ، فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ اليَوْمَ ، قَبْلَ أَن لا يَكونَ دينارٌ وَلا دِرْهَمٌ ، إِنْ كانَ لَهُ عَمَلٌ صالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ ، وَ إِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَناتٌ ، أُخِذَ مِنْ سَيِّئاتِ صاحِبِهِ ، فَحُمِلَ عَلَيْهِ) .

ـ رَواهُ البُخاري : (٢٤٤٩) وَ مُسْلِم : (٢٥٨١) .

* عَنْ عائِشَةَ قالَتْ : جاءَ رَجُلٌ فَقَعَدَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقالَ إِنَّ لي مَمْلُوكِينَ يُكَذِّبُونَني ، وَ يُخَوِّنُونَني ، وَ يَعْصُونَني وَ أَشْتِمُهُمْ وَ أَضْرِبُهُمْ ، فَكَيْفَ أَنا مِنْهُمْ ؟! فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : إِذا كانَ يَوْمُ القِيامَةِ يُحْسَبُ ماخانُوكَ وَ عَصَوْكَ وَ كَذَّبُوكَ ، وَ عِقابُكَ إِيّاهُمْ ، فَإِنْ كانَ عِقابُكَ إِيّاهُمْ بِقَدْرِ ذُنُوبِهِمْ كانَ كَفافاً ، لالَكَ وَلا عَلَيْكَ ، وَ إِنْ كانَ عِقابُكَ إِيّاهُمْ فَوْقَ ذُنُوبِهِمْ إِقْتَصَّ لَهُمْ مِنْكَ الفَضْلُ ... فَتَنَحَّى الرَّجُلُ ، وَ

جَعَلَ يَهْتِفُ وَ يَبْكي ، فَقالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ : أَما تَقْرَأُ قَوْلَ اللهِ : ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾﴾ الأنبياء .

فَقالَ الرَّجُلُ : يا رَسُولَ اللهِ ما أَجِدُ لي وَ لِهؤلاءِ خَيْراً مِنْ مُفارَقَتِهِمْ ، أُشْهِدُكَ أَنَّهُمْ كُلُّهُمْ أَحْرارٌ) .. ـ صَحيحٌ ، أَخْرَجَهُ الترمذي : (٣١٧٦) وَ صَحَّحَهُ الألباني في صَحيح سُنَن الترمذي .

* قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إتَّقُوا دَعْوَةَ المَظْلوُم ، فَإِنَّها تَصعدُ إِلى السَّماءِ كَأَنَّها شَرارَة) . صَحيحٌ ، رَواهُ الحاكم ، وَ صَحَّحَهُ الألباني في صَحيح الترغيب وَ الترهيب: (٢٢٢٨).

* قالَ إبْنُ تيمِيَةَ : إنَّ النّاسَ لَمْ يَتَنازَعُوا في أَنَّ عاقِبَةَ الظُلْمِ وَخيمَةٌ ، وَ عاقِبَةُ العَدْلِ كَريمَةٌ ، وَ يُرْوَى : (اللهُ يَنْصُرُ الدَّوْلَةَ العادِلَةَ وَ إِنْ كانَتْ كافِرَةً ، وَلا يَنْصُرُ الدَّوْلَةَ الظّالِمَةَ وَ إِنْ كانَتْ مُؤْمِنَةً) ـ مجموع الفتاوى ، ج٢٨ ، ص٦٢ .

سەرچاوەکان :

١) الخُطَب المِنْبَرِيَّة في المَناهي الشَّرْعِيَّة ، سَعد يوسف أبو عَزيز ، ج٢ ، ص٦٩ ، ص١١٩ . ط : ١ ، ٢٠١٢ ، دار التوفيقيَّة لِلتُراث ، القاهِرَة .

٢) مِنْ قِصَصِ نِهايَة الظّالِمينَ ، محمود المصري ، ص٥٣ ، ص٥٥٢ . ط : ١ ، ٢٠١٢ ، مكتَبَة الصَّفا ، القاهِرَة .

٣) موسوعَة نَظْرَة النَّعيم ، مجموعَة مِنَ المُخْتَصِّينَ ، ج١٠ ، ص٤٩٢٥ . ط : ٨ ، ٢٠١٢ ، دارُ الوَسيلَة ، السعوديَّة .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا وَ حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ على آلهِ وَ أصْحابِهِ أجمَعين)

ئیماندارانی بەڕێز: دانیشتنی ئەمشەویشمان لە دوای سوپاس و ستایش بۆ خودای تاك و تەنها کە هیدایەتی داین، کە ڕێنمای کردین، کە پشتیوانی کردین، کە بەرچاو ڕوونی کردین ڕێگای مزگەوتمان دۆزیەوە، ڕێگای ئیسلامەتی و خوداناسیمان هەڵبژارد، هەزار جار سوپاس بۆ تۆ ئەی خودای پەروەردگار، ئەوە هەمووی هیدایەتی تۆیە، سەڵات و سەلامی خودا لەسەر ڕۆحی پێشەوا و و ڕابەری دونیا و قیامەتمان:﴿محمدی موستەفا﴾

(اللّهُمَّ صَلى عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى حَبيبِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

(اللّهُمَّ صَلى عَلى شَفيعِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَ صَحبِهِ وَ سَلِّم)

## کە ستەمیان لێکردی ..تۆ ستەمیان لێ مەکە

پیاوێك دێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من پیاوێکم خودای پەروەردگار بەسەری کردمەوە بەسەروەت و سامانێکی زۆر، لە ئەنواعی ڕەشە وڵاخ و مەڕ و بزن و حوشتر هەمە، پاشان مەزرای گەورە و کێڵگە و باخ و باخاتی زۆرم هەیە، بیرە ئاو، کانی ئاوی زۆری تێدایە، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من کۆمەڵێك کرێکارم هەیە، کۆمەڵێك خزمەتکارم هەیە، کۆمەڵێك جوتیارم هەیە، ئەمانە بە ژن و منداڵەوە لە لای منن، ڕۆژانە ئیشم بۆ دەکەن، کرێیان دەدەمێ..

بەڵام ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر جار هەست دەکەم ئەمانە تەمەڵی دەکەن لە ئیشەکەدا، وەك پێویست کارم بۆ ناکەن.. وەڵاهی جا خۆم بەدیاریانەوە نەبم ڕزقەکە بە فیڕۆ دەدەن، ئیشەکە بە جوانی ئەنجام نادەن، جاری واهەیە لێیان پەست دەبم ئەی

پێغەمبەری خودا ﷺ، گۆچانێك، دارێکم پێیە پێیان دەکێشم، بە شانی یەکێك دەکێشم، بە ملی یەکێك دەکێشم، دارێك دەکەم بە کەلەکەی یەکێکاندا، ئایا من گوناحبارم؟

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: تۆش و ئەوانیش ئاوا لەبەردەمی خودای گەورەدا ڕادەوەستێنرێن، ئەوان بەقەدەر قیاسی ئەوەی کە گەندەڵیان لە ئیشەکەدا دەکەن حەقی خۆی نادەنێ، کرێ لە تۆ وەردەگرن و ئیشەکە بە ڕێك و پێکی ناکەن، خودای گەورەموحاسەبەیان دەکات، تۆش بە ئەندازەی ئەوەی ئازارت بەوان داوە، خودای گەورە موحاسەبەت دەکات..

جا ئەگەر هاتوو بەقەدەر قیاسی ئەوەی کە ئەوان زوڵمیان لە تۆ کردووە، تۆش زوڵمت لێکردن، گوناحەکانتان بەرامبەری یەك دەبێت، تۆ گوناحت لەسەر نابێت.. بەڵام ئەگەر ئەو زوڵمە کە تۆ لەوانت کردووە، ئەوەی تۆش هەر زوڵمە کە ئازارت داون، لێت داون، سوکایەتت پێکردوون، کە عەزیەتت داون، ئەوە ئەگەر ئەو لێدانەی تۆ، ئازاردانەی تۆ لە ئەوەی ئەوان زیاتر بێت، ئەوەی ئەوان موستەحەقی ئەوەیە بە حاڵ ئاوای لێبکەیت، تۆ دارێکی بە هێزت لێداوە، ئەوە خودای پەروەردگار تۆڵەی ئەوانت لێدەکاتەوە لە قیامەتدا..

دەڵێت: پیاوەکە وتی: تۆبە بێت خودایە، وڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بە شاهید بە، لەمەودوا ئەوەی خۆیان و ویژدانی خۆیان، با ئەوان قەرزدار باری قیامەتی من بن، وەڵاهی من دەستیان بۆ نابەم و جارێکی تر زوڵمیان لێناکەم و دەستیان لێ نادەم.. نەوەکو لە ڕۆژی قیامەتدا، من ستەمەکەم لەوان زیاتر بێت و من سەرەڕای ئەم هەموو سەروەرت و سامانە حەقی کرێکار و خزمەتکارم لەئەستۆ بێت..

کەواتە: دەرسی ئەمشەومان لە خزمەت پێغەمبەری خودادا ﷺ باسی ستەم کردنە، باسی زوڵم کردنە، لە عەبدەکانی خودا، ئیماندارانی بەڕێز: ئەگەر ئینسان زوڵمێك بکات، لە نەفسی خۆی بکات، گوناحێك بکات لەبەینی خۆی و خودادا بێت.. بۆ نمونە: کەسێك

پەنا بە خودای پەروەردگار زیانی لێ ڕوویدات، کەسێك چەند ساڵ عارەقی خواردبێتەوە، کەسێك چەند ساڵ نوێژی نەکردبێت، ئەم کەسە بە مەرجێك تەوبەیەکی نەصوحی پاك و خاوێن بکات، تەوبەیەکی نەصوح ئەوەیە:یەکەم: هەروەختێك ئەم گوناحەت بەبیر هاتەوە شەرمەزاربیت لای خودای پەروەردگار.. دووەم: نەچێتەوە سەری. سێهەم: هەوڵبدات لە جیاتی خراپە چاکەکار بێت، نوێژی نەکردووە ئێستا نوێژکەرێکی چاکە، قەت جومعەی نەدەکرد، جاران حەزی لە دین نەبوو، ئێستا گوێ هەڵدەخات بۆ دین.. جاران حەزی لە گورانی بوو، ئێستا حەزی لە قورئان و حەدیسە، یەعنی گۆڕانکاری بەسەر ناخی ئەم مرۆڤەدا هات.. ئەمە نیشانەی تەوبەی نەصوح و قبوڵ کراوە..

جاران پەنا بە خودا زینای کردبوو، ئێستا لە نەزەر خۆی دەپارێزێت.. جاران عارەقی دەخواردەوە، ئێستا ئەو شوێنانە نازانێت، ڕۆی تەواو بوو.. دەفەرموویت: یەك لاپەڕەی سپی بەسەر ئەم ئینسانەدا هەڵدەدرێتەوە.. خودا دەفەرموویت: هیچی لەسەر نەماوە، تەواو بەینی من و ئەو عەبدەم پاك بوویەوە.. بەلام پەنا بە خودا ئەگەر ئینسان زوڵم لە عەبدێکی خودا بکات.. سەد هەزار جار تەوبەی نەصوح بکات، خودای گەورە لە حەقی ئەو عەبدە نابورێت، ئیلا دەبێت گەردنت ئازاد بکات.. ئەو عەبدە حەقی خۆی بدەیەوە، یان ئەگەر نەتزانی کاتی خۆی..

لە حەدیسدا دەفەرموویت: زوڵمت لەیەکێك کردبوو، ماڵی یەکێکت خوارد بوو، ئێستا تەوبەت کردووە، نازانیت نازانیت، ئەم پیاوە ئێستا لەکوێیە؟ خودایە چۆنی بدۆزمەوە؟! چۆن ماڵەکەی بدەمەوە؟ (الحمد لله) من ئێستا هەست دەکەم خەڵك بەرەو مسوڵمانی دەڕوات.. یەعنی چەند جار لێی پرسیوین دەڵێت: ساڵی نەوەدەکان شتم خواردووە، دزیم لە فلان کەس کردووە، ئێستا چومەتە گەڕەکی فلانەکەس، سەیر دەکەم لەو گەڕەکە نەماوە.. کەس نایناسێت، نازانم بۆ کوێ ڕۆشتووە، بە دوویدا گەڕاوم زۆر، بۆ ئەوەی ئەو ماڵەی بدەمەوە، لەم کاتەدا بۆ ئەوەی ئەو تەوبەت دروست بێت، خودا لێت خۆش بێت، ئەو پارەیە بۆ خاوەنەکەی بکە بە خێر، یا ڕەبی خودایە دەیکەم بە

صەدەقە و خێر، ئەگەر خودا ڕەحمی کرد ڕۆژێك دۆزیمەوە، ئەو فلاّن کەسە هاتەوە (إنشاء الله) من بە ئیزنی خودا ئەو پارەیەی دەدەمەوە، ئەویش گەردنم ئازاد دەکات، ئەگەر نەشبوو، ئەم پارەیەم بۆ خستۆتە کاری خێریەوە کە (إنشاء الله) لە قیامەتدا فریای دەکەوێتەوە.. بەڵێ خۆشەویستان: ئەمە باسی زوڵمە، ئامان خۆمان بپارێزین لە ستەم، قەت ستەم لەکەس مەکە، لە کاتی دەسەلاّتدا، لە کاتی پارەداریدا، لە کاتی هەبوونیدا، چونکە دونیا هەمووی تاقیکردنەوەیە..

## ستەمی لەهەژارێك کرد.. خۆیشی زەلیل بوو

پیاوێکی بەڕێز یەکێك لە ئەولیاکان و صالّحان و خوداناسان دەفەرمووێت: بە بازاڕێکدا دەڕۆشتم، کابرایەك لەشانیەوە دەستی لێ بوویوویەوە، پەنا بە خودا دەستی ڕاستی لە شانیەوە داتاشرابوو، دەیویست شتێك هەڵبگرێت، شتی دەکڕی، بە دەستێك پەنا بە خودای پەروەردگار هیچی پێ ناکرێت.. دۆخینەکەی(بەنەخوێن) لاسیك بوو، جار جارە ئاوای لێدەکرد(بەرزی دەکردەوە بۆ سەرەوە) چونکە دۆخینی پەڕۆی پێنەدەبەسترایەوە عەلاگەی کرپیوو، هەرچەندی دەکردە پێی هەڵنەدەگیرا.. دەڵێت: پیاوێك وتی یارمەتیت بدەم؟ وتی: یارمەتیم بدە و ماڵت ئاوا بێت. بەلاّم تۆش و خەڵکی دیکەش با گویان لێبێت، ڕەحمەتی خودا لەو کەسە بێت کە دەرس لە من وەردەگرێت..

ئەو پیاو چاکە چوو وتی: وەلاّهی چاك نیە ئینسان خۆی لە کاروباری خەڵك هەڵبقورتێنێت، برینی تۆ بکولێتەوە، بڵێین ئەوە بە چی قۆڵت وای لێهاتووە؟ هەر لەسەرەوە هیچی پێوە نەماوە داتاشراوە؟ بەلاّم تۆ خۆت دەڵێیت ڕەحمەتی خودا لەو کەسەی دەرس لە من وەردەگرێت.. تو خودا بەسەرهاتی تۆ چیە؟

وتی: وەلاّهی بەڕێزەکەم من پیاوێکی حکومەت بووم، چەکداری حکومەت بووم، لە ئەوجی دەسەلاّتدا بووم، قامچیم پێ بوو، تفەنگم لە شاندا بوو، کولفی کول خۆم بووم.. چۆنم خەڵك ئازار بدایە، کەس نەیدەوت وا مەکە، شکاتیان لێبکردمایە بەرپرسەکەم منی

هاندابوو ئەیوت خەڵك بترسێنە، ئەم میلەتە لێت نەترسێت دەتخوات.. لەبەرئەوە چەند جار لە خەڵکم دابوو، کەس نەبوو موحاسەبەم بکات.

ڕۆژێکیان نزیکی نیوەڕۆبوو، کابرایەك ڕاوچی ماسی بوو، ڕاوە ماسی دەکرد.. ئەوەی کە ئیشی ڕاوە ماسیە، ماسیەکی زۆر گەورە و جوانی گرتبوو، مەترێك بە دەستیەوە بوو، سەرنجی ئینسانی ڕادەکێشا، چووم بەلایەوە وتم: ئەو ماسیەم بدەیە..

وتی: برام ئەو ماسیە ڕزقی ئەمڕۆی ماڵ و منداڵمە، وەڵاهی لەشەوەوە تۆڕم تێ هاویشتووە، ئائەم دانە ماسیەی گرتووە، گەلێك دڵم پێی خۆشە، زۆر موحتاجیمان هەیە بە ئومێدی خودا کە ئەم ماسیە گەورە جوانەم گرتووە.. دەڵێم (إنشاءالله) خودا ڕەحمی پێکردووین ئەو پێویستیانەی ئەمڕۆ هەمانە لە ماڵەوە بۆ ژن و منداڵەکەمی دەکڕم، لەبەرئەوە وازم لێبهێنە، تکات لێدەکەم ئەمە ڕزقێکە خودای گەورە بۆ منی ناردووە، خودا ڕزقی تۆش دەدات.. تۆش معاش و موچەی خۆت هەیە..

دەڵێت: من ئەوانەم نەك نەبیست، بەزەیم پێدا نەهاتەوە، بە هەموو ئارەزووی خۆم زلەیەکم لێدا، زلەیەکم لێدا پیاوێکی بەهێز بووم، کابرا ملی سوڕا..

وتم: دەی ئەو ماسیە دابنێ، داینەنێیت ئێستا یەك فیشەك دەنێم بەسەرتەوە..

دەڵێت: لە ترسا لەڕۆحی خۆی دەزانێت هیچ مانیعێکم نەبوو بیکوژم، هیچ کەس نەبوو لێم وە پرسێت، ئەو بێ دەسەڵات و من دەسەڵاتدار، ئەو بێ کەس و من دەسەڵات لە پشتمەوە، لەبەرئەوە ماسیەکەی لە ترسا فڕێ دا.. منیش ئاوا لێی ورد بوومەوە..

ئەها ماسی تازە و گەورە دیمەنێکی جوانی هەیە، تازە لە ئاو هاتبوویە دەرەوە، زۆر دیمەنێکی جوان و غەریبی هەبوو، زۆر گەورە و قەڵەو بوو، پەنجەم کرد بە ڕیشۆکەیدا، هیچم پێ نەبوو، قولاپێك، شتێك پێی هەڵبگرم، پەنجەم هێن کردوو زۆر قورس بوو.. بەڵام (سبحان الله) ماسی هیچ دانێکی وای نیە، هەر قورقوڕاگەی هەیە، هەستم کرد کزەیەك لەو سەری پەنجەمەوە هات، ئەو دانەی چووە دەستمەوە، کە چووە دەستمەوە یەك ئازاری زۆر بەشیدەت لێی دام.. خۆم گەیاندە ماڵەوە، وتم: دەرزیەکم بۆ بهێنن، ئەو

درکەی پێ دەربهێنم، لە ناو گۆشتەکە چەقی بوو، تێیدا بە جێ نەمابوو.. وتیان نەوەڵا هیچی تێدا نیە، ئەو شەوە هەتا بەیانی ماسیان برژاند.. منداڵ تێریان خوارد بە دەوروبەریدا هەڵدەپەڕین.. دەیان وت شتێکی جوانە، من لە تاوی ئازاری پەنجەم خۆراکی چی و ماسی برژاوی چی، هیچم لە بیر نەما بوو، لە تاوی ئازار..

وتیان: پیازی پیشاوی لێ بنێ، بۆیان پێچام، دەرمان و مەڵحەم هیچ سودی نەبوو.. دەوری چەند شەوڕۆژ ئاوا بووم، شەوڕۆژم نەبوو، قەرارمدا وازم لەوەزیفەکەم هێنا، نەچوومەوە بۆ دەوام، بۆیان کردم بە ئیجازە.. چوومە لای دکتۆرێکی جەڕاح بەناوبانگ، وتی: برا ئەم پەنجەیە لەکەیەکەوە وایە؟ وتم: وەڵا دوو سێ ڕۆژە..

وتی: ئەوە تووشی خۆرکە بووە، ئێستا پێی دەڵێن: (گاگرینە) شتێکی ئاوا لەسەرەتان پیسترە.. وتی: ئەمە ڕەش بۆتەوە، برا ئەمە دەماری شاخوێن بەرە کە دێت بۆ ئەم پەنجەیە، گەستوویەتی، ئەوە سەرەتانەکە داویەتیە ناوی، گاگرینە، خێرا پەنجەت ببڕەوە..

دەڵێت: ڕێك پەنجەیان بڕیمەوە، پەنجەیان بڕیمەوە.. ئازاری پەنجە بڕینەوە پەنا بەخودای پەروەردگار، هەر شوێنێك کە دەبڕدرێت ئەو کەسەی کە دەستی دەبڕدرێتەوە، کە پەنجەی دەبڕدرێتەوە.. خودای گەورە کە دڵی دروست کردووە.. بەڕێزان ئەم دڵە هەر یەکێك لە حیکمەتی دڵ ئەوەیە: خوێن فڕێ دەدات بە قیاسی لەشی ئینسان، کەسێك باڵای زۆر بەرزە، کەسێك باڵای کورتە، کەسێك قۆڵی زۆر درێژە، کەسێك قۆڵی کورتە، دڵی من لەگەڵ دڵی تۆ ڕێژەی خۆێن فڕێدانی فەرقی هەیە، بە قیاسی ئەو دەستەی من کە خودا دروستی کردووە. کە دڵ ئەم خوێنەی فڕێ دا بە قیاسی ئەوەی کە دەگاتە ئەم پەنجەیە، ئاخر خانە خوێنەکە فڕێ دەدات.. لەوە زیاتر بەهێز بێت، سەری پەنجەت دەتەقێت.. ئەگەر تۆزێك لەوە کەمتر بێت، خوێنەکە قۆڵت وشك دەبێت..

(سبحان الله) ئەمە بەس بە خالق دەکرێت، یەکێکی دیکە تۆزێك پەنجەکانی درێژترن، هی ئەو تۆزێك لێدنی دڵی بەهێزترە، خوێنەکە تا ئێرە ڕەوان دەکات، ئەو کەسەی

پەنجەی دەبڕنەوە پەنا بەخودا، تا ئەم دڵە ڕادێت.. تا ئەم دڵە کۆمپیتەرەکەی وەریدەگرێت کە ئەم پەنجە بڕاوەتەوە، ئیتر خوێن مەنێرە بۆ ئەویێ، مێشك پێی دەڵێت، دواتر ئەم خوێنە دەنێرێت بە سورعەتێك دەینێرێت کە بگاتە سەری پەنجەی، بەلاّم لێرەدا بەستراوە، ئەم خوێنە کە بە تەوژم دەگەڕێتەوە ئازار بەدڵی ئەو ئینسانە دەدرێت.. کابرا دەڵێت: دڵم ئازاری پێگەشت، ڕاست دەکات.. چونکە خوێنەکە هاتووە لە دڵەوە دەبێت بگاتە سەری پەنجە، بەلاّم ئالێرەدا بەربەستێك هەیە نایەڵێت، ئەویش بەو تەوژمە ناردوویەتی کە لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ دڵ، یەکسەر ناخی دڵی ئینسان دەتەزێنێت.. پەنا بەخودا بۆیە ئەوەی کە پەنجەی دەبڕدرێتەوە هیچ ئارامیان نیە، هەتا خودای گەورە ڕەحمیان پێدەکات وردە وردە ئەم دڵە ڕادێت، دەڵێت ئەمجارە خوێنەکە بە قیاسی ئەو پەنجەیە بنێرە.. یەعنی کولی شوێنێك دەماری تایبەتی خۆی بۆ دەچێت، بە قیاسی خۆی نزیك و دوور..

وەلاّ ئەم پیاوە دەڵێت: پەنجەیان بڕیمەوە، ئازاری بە تەواوەتی نەشکا بوو، وەلاّ ئازار هاتە مەچەکم، ئەمجا دەستم دەستی پێکرد.. پەنا بە خودای گەورە هیچ دەرمانێك نەما، عیلاجێك، بەنج کەرێك سوودی نەبوو، چوومە لای هەمان جەڕاح لیجنەیەکی تریان بۆ گرتمەوە.. وتی: وەلاّهی برا بەداخەوە ڤایرۆسەکە سەرکەوتووە، چۆتەناو لەپی دەستەوە، یەکپارچە ئەمە لە ناوەوە ڕەشە، دەبێت لە مەچەکتەوە بیبڕینەوە، ئەمجارە سەرلەنوێ ئەو خوێنە هەستم دەکرد کە دێت بەرەو پەنجەکان بڕوات.. بەلاّم کە لێرەدا گروژمی دەبەست و دەهاتەوە، خەریکبوو چاوەکانم دەردەپەڕی لە تاواندا..

دەڵێت: ئەمجارەش بڕیانەوە لە مەچەکمەوە، هاتە ئانیشکم، درێژی نەکەینەوە هەتا دواجار هاتە سەرشانم، هەموو خەڵك ئەوەندەیان سەردان کردبووم، هەموو جارێك بە چوار مەرحەلە هەتا لە شانمەوە لێیان کردەوە.. دایان تاشی..

دەڵێت: ڕۆژێك برایەك، مامۆستایەکی دڵسۆز وتی: برام وەلاّ ئەم نەخۆشیە سەیرە، هەتا دکتۆریش سەری سوڕماوە، بۆ ئەمە قەتع نەبوو، بۆ بیر ناکەیتەوە بزانە غەدرت لە

کێ کردووە، کێ دوعایەکی لێ کردوویت.. ئاهو نزولەی کێت تێ وەستاوە، زۆر خۆت بپارێزە لەو کاتەی کە پەنابە خودا یەکێك دوعات لێ بکات، هەتا نەفسی کەسێکت پێ بوەستێت.. بەردەوام بەرێزان کەشتێکت بۆ ماڵەوە کڕی، ئێستا ڕاستە عەلاگەی ڕەش زۆر پیسە، بەس چاك وایە زۆربەی دوکاندار، من ئەوەی کە تێم ڕادەبینێت وتومە هەردوو لات لابێت، عەلاگەیەکی سپی لە ژێرەوە شتەککەی تێبکەیت، بۆ ئەوەی میکرۆباوی نەبێت، ئەم مادە سامیە هەڵنەمژێت.. دواتر لە عەلاگەیەکی ڕەشی هەڵبکێشە..

چونکە عولەما فەرموویانە: جاری واهەیە خواردنێکت بەدەستەوەیە، کەسێك برسیەتی، پارەی پێ نیە، حەزی بۆی دەچێت، دوور نیە ئا لەو کاتەدا، ئاهونزولەی ئەو کەسەت بۆ بچێت و توشی بەلایەك ببیت.. دوور نیە ئەو خواردنە کە خواردت ببێت بە یەك پارچە نەخۆشی لەناو لاشەتدا، بۆیە ئەوانەی لەبەردەرگاکان دادەنیشن گوناحبارن، لەبەرئەوەی سەرنجی خەڵك دەدەن، نەفسیان لە خەڵك دەوەستێت، خەڵك موبتەلا دەبێت پێیان..

بەڵێ دەڵێت: بیرم کردەوە وتم وەڵاهی ڕاست دەکەیت، وەڵاهی ئاخیر لەحزەی خۆشی ژیانی من ئەو کاتەبوو کە ئەو ماسیەم لەو پیاوە سەند!! ڕۆشتمەوە بۆ هەمان شوێن، بە قۆڵی داتاشراوەوە، ئەو پیاوە ماسی فرۆشەم بینیەوە خەریکی ڕاوە ماسی بوو، ماسی گرتیوو بە دوکاندارێکی دەفرۆشت، لێبوویەوە چاوەڕێ بووم هەتا لێبوویەوە و پارەی خۆی وەرگرت.. پێم وت: براکەم من ئێشم پێتە، من لاواز بوو بووم، ئەو پیاوە دەسەلاتدارە نەمابووم.. نە سیلاحم پێ مابوو.. نە قامچیم پێ مابوو.. لاواز کۆمابوومەوە ئەوەندە عەمەلیات و شت کرا بووم..

وتی: کاکە گیان فەرموو ئەوەندەی خودا بەنسیبی بکات، (انشاء الله) یارمەتیت دەدەم.. وای دەزانی سواڵکەرم (سبحان الله)!! لە دەسەلاتداریەوە خەڵك وابزانێت سواڵکەریت!! قەت لە خودا غافڵ مەبە..

دەڵێت: وتی (انشاءالله) ئەوەی خودا بەنسیبی کرد ئێستا پارەی ماسیەکە وەردەگرم، ئەوەی خودا بەنسیبی بکات یارمەتیت دەدەم، برا چاوەڕێ بکە.. وتم: برا سواڵ ناکەم وەلا سواڵ کەر نیم.. وتی: دەوەلا برا وامدەزانی دەست کورتیت، دەست کورتیش عەیب نیە، جەنابت دەستێکت لەدەست داوە، پێویستت بە هاوکاری هەموو لایەکمان هەیە.. وتم: نا من پێویستم بەیەك شتی تۆ هەیە، لەبیرتە ساڵ زیاتر، لەمەو پێش، ڕۆژێکی دەمەو نیوەڕۆ بوو، تۆ ماسیەکی زۆر گەورەت گرتبوو، من ئەو کابرا جەلادەبووم کە ماسیەکەم لێ سەندیت..

سەیری کردم وتی: تۆ! ! باوەڕ بە تۆ ناکەم ئەو پیاوە کەتە زلە، ئێستا ئاوا بچوك بوویتەتەوە، ئەها جاری واهەیە دەچین بۆ لای نەخۆش، دەڵێت بەو خودایە نایناسیتەوە.. ئەو زەلامە جوانەی جاران ئەها چۆن بچوك دەبێتەوە! دەڵێی منداڵە!

وتی: وەڵاهی عەقڵم نایبڕێت تۆ فلانە کەس بیت.. وتم: وەلا فلان کەسم بەس خودای پەروەردگار دەردێکی داومێ من ئێستا بەس عیلاجم لای خودایە، پاشان گەردنم ئازاد بکە، تو ئەو خودایە کە ماسیەکەم لە تۆ سەند هیچ دوعایەکت لێکردم؟

وتی: وەڵاهی کە تۆ دوورکەوتیتەوە من ڕێك ڕوو لە قیبلە وەستام دەستەکانم بەرز کردەوە.. وتم: خودایە ئەو پیاوە بە هێز و دەسەڵاتی خۆی نازی، زلەی لێدام لەبەرچاوی ئەو خەڵکە صەمعەی شکاندم، ڕزق و ڕۆزیەك کە لە بەحرەکە ماسیەکەم دەرهێنا بە تۆڕەکەوە بوو، وامزانی هەموو دونیام هەیە، ئەوەی ڕاوە ماسی کردبێت لەوەخۆشتر نیە کە ماسیەکە دەهێنیتە دەرەوە، لەبەرچاوی تۆ زۆر گەورە و عەجیب و غەریبە..

دەڵێ لەو کاتەدا ئەوەندە دڵم شاد بوو، وامدەزانی هەموو دونیام هەیە کە ئەو ماسیەم گرتبوو، بەڵام تۆ هەموو شادیەکانت لێ تێك دام..

وتم: خودایە ئەو بەدەسەڵاتی خۆی دەنازێت.. من ئەم پیاوە دەدەمە دەست تۆ، خودایە دەسەڵات و عەزەمەتی تۆ ببینم لەم پیاوەدا، کەوای زەلیل بکەیت بە زەلیلی

بێتەوە بەر دەستم، ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە خودا دوعاکەی قبوڵ کردم، تۆ بە زەلیلی من وامدەزانی سواڵکەریت، دەپاڕێیتەوە..

وتم: بە خودا ڕاست دەکەیت.. ئەوە خۆبەچاوی خۆت بینیت بە دەسەڵات و عەزەمەتی خودا من چیم لێهاتووە!! بەڵام تو ئەو خودا باڵەمەدا بوەستێت و گەردنم ئازاد بکە، لەبەرخاتری خودا لێت دەپاڕێمەوە، داهاتمەوە قۆندەرەکانی ماچ بکەم.. بەس ئەم جارە بە دڵ گەردنم ئازاد بکە، بەڵکو نەجاتم بێت، ئیتر چیتر زەلیل نەبم..

وتی: ئیتر لەوە دەچێت منیش ویژدانم نائارام بێت کە تۆ ئاوا بە زەلیلی دەبینم، بڕۆ لەڕای خودا حەقێکی دونیا و قیامەتم لەسەر تۆ نەماوە، منیش هیچم لەدڵدانەماوە گەردنت ئازاد بێت..

دەڵێت: کە ئەو وتی گەردنت ئازاد بێت، هەستم دەکرد برینەکانم سارێژبوون، ئازارم کەم بوویەوە، برین لەوێدا کۆتایی پێهات، نەجاتم بوو..

بەڕێزان ستەم زۆر خراپە، هەرچەندە عیبادەتمان هەبێت، هەرچەندە خوداناسیمان هەبێت، پەنابگرین بە خودا لەوەی کە ستەم لە هیچ عەبدێك بکەین لەدەسەڵاتدا، لەوەی کە دەوڵەمەدیت بەسەر هەژاردا، لەوەی کە دەسەڵاتت هەیە و خەڵك دەتناسێت دەچیتە دائیرەیەکەوە خەڵك دەستی بەسنگەوە بۆ دەگرن.. فلاَن کەس ئیمزایەکی بۆ ناکرێت ئەمە بە شان و شەوکەتی خۆت مەزانە، بە هی رب العالمین بزانە..

خودایە ڕەحمان پێ بکەیت.. یاڕەبی خودایە لە ستەم بمان پارێزیت.. خودایە بمان پارێزیت لەوەی کە زوڵم لە خەڵك بکەیت.. یان خەڵك زوڵمان لێبکات.. ڕەحم بە حاڵی هەموو لایەکمان بکەیت..

تا شەوی داهاتوو تا بەنامەیەکی داهاتوو، لەوە دەچێت بڵێم تاساڵی داهاتوو، لەو زنجیرە باسی ڕەمەزاندا، کە ئیمساڵ لە خزمەت پێغەمبەری پێشەوادابووین، هەموو لایەکتان بە خودای گەورە و میهرەبان دەسپێرم.. (إنشاء الله) دواعای خێرمان بۆ بکەن..

هەمووومان یارەبی ئاوا بە دەستە جەمعی، ئاوا لە خزمەت پێغەمبەری پێشەوادا کۆببینەوە لەگەڵ صەحابەکاندا..

(وَصَلَى اللهُ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّد وَ آخرُ دَعوانا أنِ الحَمدُ لِلّهِ رَبِّ العالَمِين) .

کۆتایی

## چەند بابەتێکی ئەم کتێبە

* بەچی لە کێشەو گرفت ڕزگار دەبین؟
* هاوسەری ژیانمم خۆشناوێت!
* چ ئافرەتێك بکەمە هاوسەرم؟!
* شوو بە کێ بکەم؟!
* مەردبەو بتی ناو ناخت بشکێنە!
* ئاگاداری دایكو باوکت بە!
* جیاوازی مەکە لە نێوان منداڵەکانتدا!
* ئاگاداری هاوسەری ژیانت بەو تەڵاقی مەدە!
* نابێ دینداری ببێتە هۆی ئازاردانی کەسانی تر!

* بۆ سەرنجو تێبینی یان بۆ دەستکەوتنی ئەم بەرهەمە پەیوەندی بکەن بەم ناونیشانانەوە:

Marewan_ah@hotmail.com

0750 121 47 73 - 0748 123 99 33